## بە ناوی ئەهۆرا مەزدای دلۆڤان

چاکە تۆیی، ئەی ئاگری خاوێن..!
ئەی گەورەترین بەخشێنراوی ئەهۆرا..!
ئەی بڵێسەی سوور، کە بایەخی پەسنیت..!
لە بەرت ڕادەوستم بۆ پاڕانەوە.
ئەی ئەهۆرا..!
هێوەری و هێمنی و دڵنیایمان پێشکەش بکە،
فرەیی ڕۆژیی،
پاکی و ڕاوەستان لە سەر باوەڕ،
زبانی بێگیر و دەنگی خۆشمان دەیە و پاشانیش زانست،
زانستێ کە بەرەو ژیانێکی چاک ڕابەریمان بکات.
ئەی ئەهۆرا..!
باشترین ئاکار و دلێری و جەنگاوەری و بەهێزی و زارۆڵەی وەکار و چاکمان بدەرێ،
تا ڕێگای دۆستایەتی و ئاشتی و زانست و
بیر و گوتن و ڕەوشتی چاک تێ بکۆشین،
گیان و ڕەوانمان بەدی بێنە،
تا باکمان نەبێ و
دڵمان هێوەر و هێمن بێت،
تاکوو ڕێگای پاکی و یەکێتی بگرینە بەر.
ڕێز و سپاس بۆ تۆ ئەی ئاگری ئەهۆرا..!

**سپاست ئەکەین بۆ ئەم گڕ و پرشە و ڕووناکییە کەوا بۆ ئێمە ئاشکرایە،**
**هێزمان دەیە تا خاوێنترین هزر و چاکترین وتن و ڕێکترین ئاکارمان هەبێت،**
**یارمەتیمان بدە تا بەرهەڵستی پیسی و ناڕاستی بدەینەوە و لەتەکیدا بە جەنگ بێین،**
**ڕەوانی ئێمە، لە پیسی و ڕێگای بێئاکام بپاڵێوە،**
**تا بە ئەو پەڕی باوەڕ ئەهۆرای مەزن بپەرستین.**

**پیر.ی.بل:**
هیچ ئەمرازێک بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، بە هێزتر لە ئایین نییە. دین ئەمرازێکی مەعنەوییە کە هێزی بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، لە هێزی هەموو مرۆڤ زیاترە.

**پیر.ی.بل:**
لە ڕێگای دینەوە بە ئاسانی دەتوانرێت خەڵک فریو بدرێت، بەڵام لە فریو دەرهێنانی خەڵک لە دین، کارێکی سەخت و ئاستەنگە.

**جان مورلی:**
هەر دینێک بە نەخۆشییەک لەناو دەچێت، و کاتێک ئەو نەخۆشینە ڕوو دەدات کە ئەو دینە بۆ خەڵک بناسرێیت.

**ڤولتێر (ولتێر):**
سەپاندنی دین بە سەر دڵ و گیانی خەڵک لە ڕێگای زەبر و زەنگ و هەڕەشە، نیگەرانی و ترس دروست دەکات، نەک دین.

**ماکیاولی:**
لە ڕێگای دینەوە دەتوانرێت سوپایەکی بەهێز دروست بکرێت، بەڵام لە ڕێگای سوپاوە ناتوانرێت دین دروست بکرێت.

**زەردەشت:**
ڕێگە لە جیهاندا یەکێکە، ئەوەش ڕاستییە.

## بە ناوی ئەزدانی دلۆڤان
## بە ناوی کوردستانی مەزن
## بە ناوی گیانبەختکەرانی ڕێگای ئازادی و سەرفەرازی کوردستان

کاتێک لە ڕۆژئاواوە بمانەوێت لە چۆنیەتی هزر و ئەندێشەی مرۆڤ بە درێژایی دیرۆکی پڕ لە هەوراز و نشێوی ئاگادار بین، ئەگەر بڕوانینە پەرتووکەکانیان لەمەڕ فەلسەفە و یا خود دیرۆکی فەلسەفە و رامان، لە هەموو شوێنێک لەتەک ناونیشانی زانایان و "پیاوە" ناودارانی یۆنانی کۆن ئاشنا دەبین. پاشانیش مشت و مڕە ڕەشەکانی دەورانی سەدەکانی ناوەڕاست و لە کۆتاییشدا، سەردەمی لەدایکبوونی بیری نوێ و بەرەو ژێریی‌چوونی مرۆڤ دەگەیین کە تا ئێستاش بەردەوامە.

بەڵام بابەتی باڵکێشی ئەم مژارە ئەمەیە کە کاتێک مرۆڤ دەڕوانێتە پەرتووکەکانی ڕۆژئاوایی، ئەم هەستەی پێی دەست دەدات کە تەنیا مرۆڤی نیشتەجێی وڵاتانی ئەورووپی توانیویانە رامان لە بارەی مرۆڤ و پەیوەندی ئەو لەتەک سروشت و جیهان و گەردوونەوە بخەنە کار و خەڵکانی شوێنی تر هیچ بەشدارییەکیان نەبووە، یاخود میراتێکیان بە یادگار بەجێ نەهێشتووە.. کە ئەمەش چەواشەکردن و گۆڕاندنی چێهرە مێژوو و شێوەی فەلسەفە و مرۆڤی زانایە.

مرۆڤ، لە هەموو جیهاندا و بە تەمەنی درێژی دیرۆکی خۆی، بۆ ناسینی گێتی و بۆ دۆزینەوەی جێگا و شوێنگەی خۆی لە جیهاندا، تێکۆشاوە و بیر و رامانی خستوەتە کار. بۆیە ئەم توانا و تایبەتمەندییە ناتوانێت بەس بۆ مرۆڤی نیشتەجێی وڵاتانی ئەورووپی بێت، بەو مەرجە لە دیرۆکی ئایینەکان، ئێمە نابینین کە پەیامبەرێک لە ئەورپا یا ئەفریقا یا ئەمریکا هاتبێت. بە گشتی زۆربەی

پەیامهێنەران لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە مەزرۆبۆتان (میزوپاتامیا) و لە کوردستانی مەزن سەریان هەڵداوە، بێجگە لە «موسا» و «محمد» نەبێت کە لە دەرەوەی جوگرافیایی پیرۆزی کوردستان هەڵکەوتوون، ئەگینا هەر هەموویان لە کوردستان و هەرێمی دەوروبەری کوردستانی مەزن لە دایک بوون و سەریان هەڵداوە و ئێستاش ناو و شوێنیان بە سەر خاک و زێدی پیرۆزی کوردستان هەر ماوە.

بۆیە دەبێت سەر لە نوێ، مێژووی بیر و فەلسەفە و رامانی مرۆڤایەتی بە تایبەت ڕێکوپێککردنی دیرۆکی مرۆڤایەتی و زاگۆنەکانی زاڵی بە سەریدا، بنووسرێتەوە و هەموو بەڵگەکانی پێویست، بە ڕێزنان لە هەموو نەتەوەکان، دووبارە پێدا بچەنەوە و لە سەر بنەمای ڕاستی و دوور لە بەرژەوەندی نەتەوەیەکی تایبەت و یا ئایینێکی دیاریکراو بنووسرێتەوە و کاری بۆ بکرێت.

ئەگەر لە ڕەواڵەتدا ئەوروپا لە سەدەی 15 زایینی، لە بەر دەم سەرەڕۆیی و ستەم و پاشڤەرۆیی کلیسای خاچپەرست، کەسایەتی و ڕەگ و ڕیشەی خۆی لە ناو فەرهەنگی یۆنانی کۆن و ڕۆم دەپشکنی و شۆڕش و ڕاپەڕینی «ڕێنسانس»ی ڕێک دەخست و گەیشتە سەردەمی رووناکی گەشەکردن، کورد و گەلانی مەزرۆبۆتان، بە هەبوونی بەرجەستەترین چاند و فەرهەنگی مێژوویی خۆیان، تا بە ئێستا نەیتوانیوە ڕابێت و هەستانەوەیی تازەگەری لە چاند و فەرهەنگ و ڕامیاری و جیهانبینی و ژیانی خۆی بەدی بێنێت.

باوەڕم وایە ئێمەی کورد بۆ ڕێکخستنی ئەم ڕاپەڕین و هەستانەوە و ئەم تازەگەری و وەرچەرخانە، چارەیەکمان نییە بێجگە لەوە کە وەک ئەوروپییەکان، بچینە ناو دڵی مێژوو و فەلسەفەی خۆمان و نرخە نەتەوەییەکان و ئەرزشە باڵاکانی فەرهەنگی و مرۆڤانەی خۆمان، کە بە هەزاران ساڵە لە ژێر خەرواری خۆڵەمێشی دیرۆکی بندەستی داگیرکەران گۆڕ کراوە، هەڵیانجێنین و لە

تەپوتۆزی زەمانە پاکیان بکەینەوە و پەلکێشی سەدی 21ی بکەین و ناسنامە و کەسایەتی چاندی و ئایینی و نەتەوەیی خۆمانی پێ بنیات بنێینەوە.

زۆر بە دڵنیایی، گەر تا ئەو تازەگەریی و نەوژەنسازییەی کەسایەتی و ناسنامەیی مێژوویی و چاندی، نەیەتە دی، ئەوە بندەستی و خۆ بەکەمزانین و بەلەنگازی فەرهەنگی و رامیاری و نەتەوەیی و زاڵبوونی ئایین و کلتوری بێگانە، هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە و زەمینەکانی پاشڤەرۆیی بە تاک و بە کۆ و لەخۆبێگانەبوون و خۆ بە مرۆڤی میوان و یا بە پلەی دووهەم و سێهەم زانین لە شار و وڵاتی خۆمان بنبڕ و ڕزگارمان نابێت.

لە سەرنجدانێکی سادە و سەرپێی لە فەرهەنگ و ئایینی کوردان و گەلانی ئاری دەبینرێت کە فەلسەفەی زەردەشتی (بەهدینی) بۆ دەیان سەدە بە شێوازی جۆراجۆر، ئەم بەشەی سەر گۆی زەوی، لێی سوودمەند بووە. هەر چەندە ئێستاش لە ناو ڕەوشتی مرۆڤی کورد بە گشتی و لە ناو ئایینەکانی کوردی «ئێزیدی، کاکەیی، یارسان و ئەلەویی» بە تایبەتی، پاشکۆ و رامان و فەلسەفەی زەردەشت، بە چەشنێکی کەمڕەنگ دەبینرێت و زیندوو ڕاگیراوە.

لە سەدەی 7ی زایینی، هێرشی بێبەزیی و بەربڵاوی عەرەبی موسوڵمان بۆ نیشتمانی ئاری، فەرهەنگی ڕەسەنی کوردی و بەهدینی خستە ژێر مەترسی نەمان و ئایین و فەرهەنگی خێڵەکی، عەرەبی، ئیسلامی، بە سەر کوردستاندا سەپا، بەڵام لە ئەوروپا هزر و فەلسەفەی زەردەشت لە ناو هۆگری خۆی ڕەگی داکوتابوو و هیچ کاتێک حەز بە لێکۆڵینەوە لە رامانی زەردەشت کەم نەبووە، ئەگەریش بەرفراوان و بەرجەستە نەبووبێت، بەڵام لای هۆگرانی خۆی، فەلسەفەی زەردەشت هەر جێگای بایەخ بووە.

ئیمڕۆ بە سەدان پەرتووک بە زمانی بێگانە لە سەر فەلسەفە و رامان و جەوهەر و ناوەڕۆکی زەردەشت نووسراوە. کە ئێمەی کورد دەتوانین بە هۆشیاری سوودیان لێ وەرگرین. ئەمە ڕاستییەکە کە لە ناو زۆربەی ئەم پەرتووکانە، ناوی کورد و

شوێنی لەدایکبوونی زەردەشت و زەمان و زوبان و ناسنامەی زەردەشت، تا ڕادەیەک بە دەستی ئەنقەز و بە هۆی تایبەتی ئایینی و ڕامیاری یا نەزانی بێت، پشت گوێ خراوە، بەڵام دەکرێت بە دروستبوونی ناوەندی لێکۆڵینەوە، هەموو ئەم بەرهەمانە جارێکی دی بخرێتە ژێر ڕاژەی بەرژەوەندی چاندی و نەتەوەیی و ببێتە هۆی زیندووکردنەوە و ناساندنی فەرهەنگی ڕەسەنی کوردی بە گەلی کورد خۆی و گەلانی جیهان. بۆیە دەبێت لە هەموو هەل و دەرفەتەکان کەڵک وەرگیرێت و هونەرمەندان و ڕووناکبیران و هەلبەستوانان و شانۆکاران و نووسەران قۆڵیان هەڵماڵن بۆ ئەم ئەرکە نەتەوەییە.

بە پێچەوانەی کورد کە زێدی شوێنی لەدایکبوونی زەردەشتە، بێگانەکان بە تایبەت ئەورووپییەکان، مێژووی ڕاهێنان و لێکۆڵینەوەی زانستی لەم گەنجینە پڕبەها و بەنرخە، بۆ جیهانی ڕۆژئاوا تەنیا بۆ 250 ساڵ پێش دەگەڕێتەوە. زانستی زەردەشتناسی و ئاڤێستاناسی لەم دوو سەدەیە بە هۆی دۆزینەوەی بەڵگە و توێژینەوەی نوێ، پێشکەوتنی زۆری بە خۆییەوە دیوە. بەو جۆرە کە شوێنی خۆی لە ناو زانستگاکانی ئەم وڵاتانە کردووتەوە. بەڵام نابێت چاوەڕوانی ئەوەمان هەبێت کە تەنها لە ڕێگەی زانستمەندانی ڕۆژئاوایی و تەنانەت ڕۆژهەڵاتیش، کە برێکیان لە ژێر کاریگەری توند و تیژی ئایینی و یا ڕەگەزیی دان، ئاڤێستا بە گشتی و گاتاکان بە تایبەتی و هزر و ڕامانەکانی مەزنی فەلسەفی زەردەشت بکارێت، بناسرێت. بیروڕا و بۆچوونی بەشێک لە زمانەوانان و زانستوانان کە ویستوویانە لەمەڕ ئاڤێستاناسی، بیروڕاێک بنوێن، هەرچەندەش بۆ ماوەیەک لە لایەن کۆمەڵێکی فرەوە پێشوازیان لێ کردبێت، بەڵام لە دوای ماوەیەکی کەم، ئەرزش و بڕوایی خۆی لە دەست داوە.

ئێستاش زۆربەی ئەو بیروبۆچوونانە و ئەو بیردۆزانە کە لە لایەن زمانەوانەکانی بە تایبەت ڕۆژئاوایی باس دەکرێت، چونکە ناخوازن و یا ناتوانن بە بنیاتی «تئولۆژی» خواناسی و ریشەکانی فەلسەفی ئەندێشەکانی زەردەشت بایەخ

بدەن، بۆیە بەشێکی زۆری بیروبۆچوونەکانیان لە سەر بناغەی گومان دامەزراوە و نیشاندەری مەزنی رامانەکانی زەردەشت نییە.

بە گشتی ئەمە ئەرکی مرۆڤی کوردە، چونکە زەردەشت لە ناو نیشتمان و زمانی خۆمان هەستاوە، بۆیە دەبێت لە ڕێگەی ناسینی کەسایەتی نەتەوەیی خۆمان بۆ ناساندنی زەردەشت و ڕیشەی ئەندێشەکانی میدیایی بکۆشین. دەبێت ئەوەش بوترێت کە نابێت بەس لایەنی دینییەکەی هەڵبسەنگێنرێت، چونکە لەوانەیە بە چەوتی تووشی گەرمە و کێشە و ململانەی ئایینی بین.

ڕاستە فرەتر لە 4000 ساڵە ناوی زەردەشت وەک ناوێکی پیرۆز لە ناو ناخ و دەروون و ڕەوانی کورد و گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست جێگیر بووە، بەڵام هەر ئەم ناوە زیاتر لە 2500 ساڵە کە وەک بەرزترین و سەرتۆپی زانست چووتە ناو فەلسەفە و هزری ڕۆژئاوائیان. «فیساغورس» زانای ناودار یۆنانی خۆی بە قوتابی زەردەشت دەزانێت و «ئەرەستو» کە شاگردی «ئەفلاتۆن» بوو لە پەرتووکی خۆی بە ناوی «فەلسەفە» دەنووسێت کە کاکڵەی زانستی ئەفلاتۆن لە فەلسەفەی زەردەشت وەرگیراوە. بە تێکڕایی و گشت زانایانی یۆنانی لە فەلسەفەی زەردەشت سوودیان وەرگرتووە و نووسراوەکانی خۆیان بە هزری زەردەشت بەند کردووە. بۆ زانیاری فرەتر دەکرێت سەیری ئەم پەرتووکانە بکرێت:

1 ـ وەڵامی ڕۆژئاوا بە زەردەشت. دوشن گیمەن. ئۆکسفۆرد. 1958

2 ـ کاریگەری زەردەشت لە سەر ئەندێشەی یۆنان. ر. م. ئەفنان. نیویورک 1965

3 ـ کاریگەری زەردەشت و رامانی زەردەشت لە سەر فەرهەنگی ڕۆژئاوا. ز. فرل. سدنی. 1977

لە پەرتووکی (مێژووی فەلسەفەی زەردەشت. بل دوبرۆی. پاریس.1984) نووسراوە کە لە هیچ لاپەڕەیەکی پەرتووکی مێژوویی، مرۆڤ ناتوانێت ئەم خاڵەی

بەر چاو بکەوێت کە مرۆڤێک بە زەبر و زەنگ کرابێت بە زەردەشتی، ئەگینا کاتێک میدیاکان بە سەر گەلانی ئاشووری، قبتی (ئەگێبت)، هیندی، یۆنانی سەرکەوتن، دەبوایە ئەو گەلانە و هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بڕوامەندی ئایینی بەهدینی ببووایەن.

حەز بە رامان و فەلسەفەی زەردەشت تا ڕادەیەک لە ڕۆژئاوا پەرەی سەند و تەنانەت لە پاش لەناوچوونی یۆنان و دروستبوونی ئیمپراتۆری رۆم، زانایانی رۆمی وەک فیلسوفەکانی یۆنانی بۆ متمانەدان بە بابەتەکانی خۆیان لە نێوی زەردەشت سوودیان دەبرد. هەروەها کە دەزانین ئایینی میترائیسم کە ئایینێکی کوردی بوو و هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ڕۆژئاوایی تەنیبوو، پاشان کە دینی زەردەشت هات، ئەم دینە لە ناو زەردەشت توایەوە. هەر چەندە کاریگەری ئایینی ڕۆژپەرستی لە ناو دینی ئێزدی دەبینرێت.

ڕۆژی 25 دسامبر کە ڕۆژی لەدایکبوونی میترا بوو، جەژنی گەورەی بۆ دەگیرا ، کە ئێستا ئەو جەژن و ڕۆژە بە ناوی جەژنی «شەوی یەلدا» لە ناو کوردان دەگیرێت. پاشان خاچپەرستان (مسیحی) لە بەربەرەکانی دینی میترائیسم هاتن و ڕۆژی لەدایکبوونی «عیسا، مەسیح»یان کردە 25 دسامبر، هەروەهاش داری سەوزی سنەوبەر لە ناو گەلانی ئاری بە گشتی و گەلی کورد بە تایبەتی زۆر پیرۆز دەژمێریا و لە کاتی شەوی یەلدا دەیانڕازانەوە، هێنایانە ناو داب و نەریتی خۆیان و زۆر شتی دیکە...

تێکەڵبوونی دین و سیاسەت هەمیشە زیانمەند بووە، کاتێک لە سەردەمی ساسانییەکان بڕێک لە بەڕێوبەرانی ئایینی بەهدینی بۆ بەرژەوەندی تەسکی خۆیان و دەستەڵاتداران، لە جەوهەری هزر و رامانی زەردەشت دوورۆ کەوتن و جەنگە درێژخایەنەکانیان لەتەک ئیمپراتۆری رۆمەکان، زمینەکانی هێرشی عەرەبی موسڵمانی ئامادە کرد. بۆیە لە دوای هێرشی بەربلاو و دڕندانەی سوپای عەرەب،

وردە وردە سۆمای دینی بەهدینی کز بوو و کلتور و دین و چاندی عەرەب شوێنی بە دینی زەردەشت لێژ و لەق کرد و خۆی وەک ئاینێکی داگیرکەر سەپاند.

ئەگەر لە خاک و نیشتمانی کوردان، هزری زەردەشت کز و لاواز کرا، لە ڕۆژئاوا هیچ کاتێک لێکۆڵینەوە ڕانەوێستا. تەنانەت لە سەدە ڕەشەکانی دەستەڵاتداری کڵێساشدا. ڕووناکبیران و زانایانی ڕۆژئاوایی بۆ بەربەرەکانی کڵێسا، چەکی هزر و رامانی زەردەشتیان دژی دواکەوتوویی و دەسەڵاتی ڕەشی کڵێسا بەرز کردبوو.

لە سەدەی 15 زایینی، یەکێک لە فیلسوفانی مەزنی سەردەمی ڕەنسانی ئەوروپا، بە ناو «گەرگۆری پلۆتن» کە لە ئیمپراتۆری بیزانس دەست ڕۆیشتوو بوو، ویستی رامان و فەلسەفەی زەردەشت جێنشینی، سێ دینی «جوو، فەلە، ئیسلام» بکات، کە هەمیشە لە جەنگێکی وێرانگەر لە دژی یەکن، لەتەک ئەوە کە هەر چەندە زۆربەی کەسانی دەستەڵاتداری ئەو سەردەمە لەتەکی هاوبیر و هاوڕێیان دەکرد، بەڵام نەیانتوانی سەرکەوتوو بێت. بەڵام ئەنجامی خەباتی بوو بە هۆی ئەوە کە رامانی زەردەشت بهێنێتە ناو قوتابخانەی ئەفلاتۆنی فلۆرانس «ئیتالیا» و ببێتە بەردی بناغەی ڕاپەڕین و شۆڕشی ڕنسانسی ئەوروپا و بیری مرۆڤایەتی «هۆمینیزم» داڕێژێت. لە دو پەرتووکی (وەڵامی ڕۆژئاوا بە زەردەشت. دوشن گیمەن. ئۆکسفۆرد. 1958. لاپەڕەی 4) و (ئەنجومەنی زەردەشت لە ئیمپراتۆری ڕۆم. هـ. لوویی. 1958. لاپەڕەیی 99) بە جوانی ئەم بابەتە گفتوگۆ کراوە.

لە پێڤاژۆی ڕنسانسی ئەوروپا، سەرنجدان بە هزری زەردەشت کەمەوە نەبوو، بەڵام کێشەی تێگەیشتن لە زمانی ئاڤێستا ببوو بە هۆی ئەوە کە بابەتەکان لە دەمی ئەم و ئەو باس بکرێتەوە، بۆیە لە سەدی 17 زایینی، زمانەوانی بەناوبانگی فەرانسەویی «ئەنکیتل دوپرۆن» دوای هەوڵ و کۆششێکی 20 ساڵە، توانی کلیلی زمانی ئاڤێستا بکاتەوە و لە دوو بەرگدا بە چاپی بگەیەنێت.

هەروەها کە دەزانین، ئاڤێستا لە دوو بەش درووست بووە، ئاڤێستای کۆن و ئاڤێستای نوێ. ئاڤێستای کۆن سروود و هۆرەکان خودی زەردەشتە و ئاڤێستای نوێ لە سەدەکانی پاش زەردەشت نووسراوە. لە ناو ئاڤێستای نوێ زۆر بابەتی تێدایە کە لەتەک جەوهەر و فەلسەفەی زەردەشت ناگونجێت و یەک ناگرێت.

بەڵام ئەم دۆزینەوە دەنگ و هەرایەکی زۆری لە ڕۆژئاوا دروست کرد. ڕووناکبیرانی ڕۆژئاوا ئاڤێستایان وەک چەکێک پەیدا کردبوو و لە دژی زەبر و زەنگ و سەرەڕۆیی و تاکڕەوی قەشەی کڵێسا بە کار دەهێنا. بۆیە دروشمیان ئەوە بوو کە «ڕاستی» بەس لە کڵێسا نییە، بەڵکوو دەکرێت لە ناو رامان و هزرێکی ئاری و میدیایی پەیدا بکرێت.

لەم خەباتە، ڕووناکبیر و فیلسوفانێکی مەزن وەک: «ڤەلتێر، ڤولتێر»، «برناردن دوسن پیەر» (36)،«میشیلە» (37)، «شۆپێنهاور» (38)، «گۆتە» (39)، «گریم»، «دیدرەو»، «وونکلیست»، «بایرۆن»، «وورتسمیت»، «شێلی» (40)، «نیچە» (41)، «ئەنگلس» و «مارکس» و زۆری دیکە هاتنە ناو گۆڕەپانی خەباتەوە. هەروەهاش کۆمپۆزیتۆر و ئاهەنگسازانێک وەک «رمۆ»ی فەرانسەویی، «مۆزارت»، «ریچارد ئەشتراوس»ی (42) ئۆتریشی کە بەرهەمی دیرۆکی خۆی بە ناوی (زەردەشت ئاوای گوت) لە ساڵی 1894 چێ کرد (43) و «چایکۆفسکی» رووسی هەموویان کەوتنە پەسنی زەردەشت و ئاهەنگ و ئۆپرایان بۆ دروست کرد.

ئەمجۆرە پێشوازییەی ڕووناکبیران و زانایانی ڕۆژئاوایی، بوو بە هۆی بەرهەڵستی قەشەکانی کلیسا لە هەمبەر ئاڤێستا و بڵێن وەرگێڕانی «ئەنکیتل دوپرۆن» ناڕاست و درۆیە. لە بەرانبەری هەڵوێستی کوێرانەی قەشەکانی مەسێحی، زمانەوانەکان تێکەڵ بەم جەنگە هزری و رامانییە بوون. پاش 3 ساڵ زمانەوانی ئاڵمانی «کلوکرز» دەستی بە وەرگێڕانی نوێی ئاڤێستای کردەوە. ڕەوا بوون و مافداربوونی «ئەنکیتل دوپرۆن» لە وەرگێڕانی ڕاستی ئاڤێستا سەلمێندرا، بەڵام

ئەم بەربەرەکانێی کلیسا 30 ساڵ درێژەی کێشا، تا لە ئەنجامدا ڕاستبوون و دروستبوونی ئاڤێستا بۆ هەمووان سەلمێندرا و ئەم پەرتووکە بۆ هەمیشە هاتە ناو ناوەندی زانستگاکانی ڕۆژئاوا بۆ فێربوون.

هەر چەندە ئەم سەرکەوتنە گرینگ بوو، بەڵام هێشتا ناوەخن و هزر و رامانی زەردەشت ئاشکرا نەبوو. لە ساڵی 1861 زمانەوانی بەناوبانگ «مارتین هۆگ» لێکۆڵینەوەیەکی بەربڵاو و قووڵی لە ناو ئاڤێستا کرد و تێگەیشت کە 17 بەش لە 72 بەشی ئاڤێستا بە زمانێک نووسراوە، کە لە بەشەکانی دیکە فرە جیاوازە. جیاوازیی لە بەکارهێنانی وشەکان و چەشنی داڕشتنی سروودەکان کە کۆنترە لە بەشەکانی دیی ئاڤێستا. بە سەدان ساڵ بەڕێوبەرانی ئایینی بەهدینی ئەم 17 هاتەیان لە بەر دەخوێنەوە، لەوانەیە بە بێ ئەوە لە واتەی ئەو سرووده پیرۆزانە تێ بگەن.

«مارتین هۆگ» توانی بە یارمەتی زانستی زمانەوانی ئەم 17 بەشەی، لە بەشەکانی دیکەی ئاڤێستا جودا بکاتەوە و بە «گاثا، گاتا» بەناوبانگن. پاشان لێکۆڵینەوەکانی دیکە ئەم ڕاستییان سەلماند کە گاتاکان، هۆرەکانی خودی زەردەشتە و مێژوویەکی بە لانی کەمەوە 4000 ساڵەی هەیە کە هۆنراوەی خودی زەردەشتە. بێگومان هەموو ئەم لێکۆڵینەوانە و ئەم شیمانە و مەزەنەکردنانە، بە بێ شارەزای لە زمانی کوردی و بێئەوە لێکۆڵینەوەک لە زمانی دێرینی کوردی بکرێت. بەڵام هەر بەم کەموکووریشەوە، گاتاکان دەرگایەکی مەزنی لە مێژووی هزر و رامان و فەلسەفە و شارستانیەتی میتسوپاتامیا و ڕیشەی زۆربەی دینەکان و فەلسەفەکان، کە چاند و شارستانیەتی جیهانی دروست کردووە، خستە سەر پشت.

ئەم بەرهەمە هەر چەندە کاڵ و کرچە و کاری تاکە کەسییە، ئەما هیوادارم کە بتوانێت وورووژاندنێک دروست بکات و مرۆڤی کورد ڕاچڵەکێنێت بەرەو دۆزینەوەی ڕاستی و ناسینی خۆی. لە هەمان کاتیشدا پێویستە مرۆڤ هەموو ئەم شتانە و

شتی دیی، بە چاوی گومان سەیر بکات و دەرفەت بۆ شتی نوێتر و تازەتر، کراوە بهێڵێت.

هەموو مرۆڤی کورد پێویستە ئەم سێ پرسیارە لە خۆی بکات، سەرەتا هەوڵ بدات کە بزانێت کورد کێ بووە؟ کاتێک توانی وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە کە کورد کێ بووە و لە دیرۆکی 6000 ساڵەی خۆی، جێ دەست و پەنجەی لە شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بدۆزێتەوە و هەموو لایەنەکانی بەهێز و لاوازی بناسێتەوە. ئینجا پرسیاری دووهەم دەست پێ دەکات، کە کورد ئێستا کێیە؟ لە سەدەی 21، کورد لە چ گوزران و بارۆدۆخێکدایە؟ ئینجا کە وەڵامی ئەم پرسیارەشی بۆ ڕوون بووەوە و زانی کە چەن دوا کەوتووە لە ڕەوڕەوەی ژیاری مرۆڤایەتی، پرسیاری سێهەم دەست پێ دەکات، بەرنامە و پلانی دواڕۆژی کورد بۆ داهاتووی خۆی و بۆ شارستانییەتی مرۆڤایەتی چییە؟

باوەڕم نییە کە لە سەدەی بیستویەکدا، نەتەوەی کورد بگەڕێتەوە سەر کۆکی خۆی، بەڵام پێویستە مژاری دینی بەهدینی، بە لانی کەمەوە وەک لاپەڕەیەکی دیرۆکی یان وەک بەشێک لە مێژوو و فەلسەفەمان، بۆ ڕۆڵەکانی ئەم نیشتمانە پیرۆزە، زوڵاڵ بکرێتەوە و بکەوێتە بەر لێکۆڵینەوە. بەشکم وەچەکانی داهاتوو، ئەم ئازار و دەردەی بێ ناسنامەیی و بێکەسییەی ئێمە، نەکێشن.

*1– Xantus*
*2– Diogenes Lartius*
*3– Hermodoros*
*4– Troya*
*5– Alkibiades*
*6– Euduxus*
*7– Hermodoros*
*8– Plinius*
*9– Naturalis Historial*
*10– Plutarkhos*
*11– Theopompus*
*12– C. De. Harleze*
*13– Khios*
*14– Suidas*
*15– Baron Bunsen*
*16– Place In Universal Historys Egypt*
*17– Volter*
*18– H. S. Spencer*
*19– The Aryan Ecliptic Cyele*
*20– Se. I. Pien Nien–Pao*
*21– Pai Houo*
*22– Tao Koan*
*23– Time and Homeland,s Zoroaster, Naples, 1980*
*24– Dwghada*

*25– Purvashasp*
*26– Spentman*
*27– Zarathavashtarai*
*27– Ushidareno*
*28– Avider*
*29– Huger*
*30– Hajir*
*31– Kangshah*
*32– Shaindezh*
*33– Bakterita*
*34– Zanty*
*35– Lawrence Heyworth Mills*
*36– Bernardin De Saint Pierre*
*37– Michelet*
*38– Schopenhauer*
*39– Goethe*
*40– Shelly*
*41– Nietzsche*
*42– Richard Strauss*
*43– Also Sprach Zarathustra Sinfonia Domestica*



# خەونەکەی دەغدۆ*

" ئای! چ خەونێکی ترسناک و ناخۆشم بیبنی. پوورشاسپ* یارمەتیم بدە."
"چییە دەغدۆ؟ بۆچی ڕەنگت هەڵبزرکاوە و شڵەژاویت؟ بۆچی هەڵدەلەرزیت؟ چی ڕوویداوە وادەترسیت؟"
" خەونێکی ترسناکم دی... ترسناک!."
" ببێژە خەونەکەت چی بوو، چ خەونێکە ئاوا پێی پەشۆکاویت و ئارامی لەبەر هەڵگرتوویت؟"
" لە خەومدا هەورێکی کوڵکن و ڕەش بەری ئاسمانی گرتبوو. ڕۆژی ڕۆشنی کردبووە ئەنگوستەچاو و چاو چاوی نەدەدی. لەو دیمەنە سامناکە لەشم دەلەرزی و زمانم گۆی نەدەکرد. لە پڕ، لە ناکاو، لە نێوان برووسکە و هەورەکەوە، لە بری بەفر و باران و تەرزە، جۆرە گیانلەبەرانێکی ترسناک دەبارین و
دەکەوتنە سەر زەوی وەکوو (شێر، گورگ و کەمتیار). هەر یەکەیان بە لاشە زل و ترسناک بوون. لە لایەکەوە پڵنگێکی ددانتیژ و دڕ، وە لە لایەکی دی نەهەنگێکی ئاوی و لە دوورەوە ئەژدیهایەک. بەبر و یووز و جانەوەری جۆراجۆر، هەموویان ددان و چنگیان تیژ بوو. مرۆڤ زراوی لێیان دەچوو..."
" لە ناو هەموویاندا یەکێکیان شالاوی بۆ هێنام و بە نینۆکە تیژەکانی چنگی لێگرتم و سکمی هەڵدری و منداڵەکەمی دەرهێنا و دەیویست بیخوات و نەیدەتوانی. هەر لەو کاتەدا منداڵەکەم هاتە زمان و ڕووی تێکردم و گوتی دایکە هیچ ترست نەبێت و هیچ دڵنیگەران مەبە، ئەم دڕندانە هیچ گەزەند و زیانێک بە

من ناگەیێنن، خودای مەزن و شکۆدار ئاگادار و یاوەری* منە. هێڤی و بڕوات بە خواوەند هەبێت..."

" بە بیستنی ئەم قسانە لە کۆرپەکەم، کە جانەوەران بەو زیان ناگەیێنن، کەمێک هێوەر بوومەوە. پاشان لە ئاسمانەوە، چیایەکی بەرز بەرەو ڕووم هات و تیری تیشکی ڕۆژ هەورەکەی ڕەواندەوە. کێوەکە هاتە نزیکی من، لە داوێنیەوە لاوێکی جوانچاک و کەڵەگەت هاتە دەرەوە کە لە جوانیدا شانی لە شانی مانگی چواردە و فەڕی جەمشیدی* ئەدا، شاخێکی بەدەستەوە بوو لە شاخی گا دەچوو. ڕۆشن و پڕشنگدار تیشکی دەهاویشت. بە دەستەکەی تریەوە نامەیەکی سپەند* و پیرۆز. نامەکەی بۆ جانەوەرانی دڕندە و ترسناک هاویشت، هەر یەکەیان بە لایەکدا هەڵاتن و نەمان، تەنها سیانیان نەبێت ئەوانیش گورگ و پڵنگ و شێر بوون. لاوەکە شاخە تیشکدارەکەی گرتە ئەوانیش و هەرسێکیان سووتان. پاشان لاوەکە لێم نزیک بووەوە و کۆرپەکەمی لە سەر زەوی هەڵگرتەوە و خستییەوە ناو سکم، فوویەکی لێ کرد و زامی سکم سارێژ و جێ چنگە تیژەکانیان چێ بووە و پێ گوتم: لە هیچ مەترسە خەم مەخۆ دڵت بە کۆرپەکەت شاد دەبێت، پەروەردگار خۆی ئاگاداری دەبێت... ئەم منداڵەی تۆ، پەیامی خودای بۆ مرۆڤایەتی پێ دەبێت و هەموو جیهان چاوەڕوانی ئەو دەکات. بە وتنی ئەم مژدە و مزگێنیانە، لاوەکەش لە پێش چاوم ون بوو و منیش لە خەو ڕاپەڕیم. پوورشاسپ دەترسم، خواوەند بریکارمان بێت."

کاتێ کە خێزانی پوورشاسپ ئەم خەونەی بینیبوو، دووگیان و سکی پێنج مانگان بوو. پوورشاسپ زۆر ژیرانە ئەو ترس و لەرزەی لە دڵ و گیانی دەرکرد و هێمنی کردەوە و پێی گوت: "بە ڕاستی دایکێکی بەختیار و شاد دەبی، خەمت نەبێت بەیانی زوو دەچین بۆ لای پیری ئەختەرناس* کە ئەو خەونەمان بۆ لێک بداتەوە..."



" ئەی پیری ئەختەرناس یارمەتیمان بدە، خێزانم دوێنێ شەو خەونێکی بەسام و سەرسوڕهێنەری دیوە، لەو کاتەوە خەم دایگرتووە و منیش زۆر دەترسم."

" پیری ئەختەرناس و فەرزانە* بە دەغدۆی گوت: ئەی هاوسێی داوێن پاک و بەڕێزی من، کە هەمیشە ناوی چاکەت لە سەر زاری خەڵکە، خەونەکەتم بۆ بگێڕەوە تا بزانم چیت دیوە."

دەغدۆ دەستی کرد بە گێڕانەوەی خەوەکەی. پیری زانای ئەستێرەناس بە وردی گوێی بۆ بەسەرهاتی خەونەکەی دەغدۆ شل کردبوو... کاتێ دەغدۆ لە گێڕانەوەی خەونەکەی بووەوە پیری زانا سەری هەڵبڕی و گوتی: " بەڕێزان ئەی پوورشاسپ وئەی دەغدۆ، هاوسێیانی هێژا و خۆشەویستم، مزگێنیم بدەنێ، کە لە لایەن ئەستێرەکانەوە مژدەیەکی خۆش بەڕێیوەیە. ناوتان دەکەوێتە گشت گوند و شارێک و بەختێکی گەورە ڕووتان تێ دەکات. ئەی دەغدۆ ئەو منداڵەی تۆ، کام و ئاوات و ئارەزووتان دێنێتە دی و ناوی دەگاتە ئەستێرەکان و وەکوو تیریژی خۆر لە جیهاندا دەدرەوشێتەوە و ناودار دەبێت. هەستن بڕۆنەوە و دوای چوار ڕۆژی دیکە وەرنەوە کنم."



" سەردانتان بۆ ماڵەکەم پیرۆزە، فرە شاد و بەختیارم بە هاتنتان. چاوەڕوانتان بووم، فەرموون دانیشن جوان گوێ بدەنە قسەکانم: بە سەر بوونی ئەم مناڵە تا

ئەمڕۆ پەنج مانگ و بیست و سێ ڕۆژ تێپەڕی کردووە. لە ئەستێرە و نیشانەکانی ئەو خەونە دەبینم کە ئەم منداڵەی ئێوە شیرینترین ئەرمەغانی* پێ دەبێت بۆ مرۆڤایەتی و دەبێتە ڕابەر و گەورە و ئەفسەری* هەموو لایەک، ناوی پیرۆزی سیمیار* دەبێت. ڕۆژی لەدایکبوونی خۆردادڕۆژ* لە مانگی فەروەردین* یەکەم مانگی بەهار دەبێت. لە کاتی لەدایکبوونیدا خەندە لە سەر لێو و پێکەنین لە ڕوویدا دیار دەبێت، کە نیشانەی شکۆمەندی و پایەبەرزی و پیرۆزییە. هەموو جیهان شادتر و ڕۆشنتر دەبێت. پاکان و خاسان بەم ڕۆژە پیرۆزە، بەزم و ئاهەنگ دەگێڕن و دەیکەن بە جەژن و ساڵانە یادی پیرۆزی دەکەنەوە. زارۆکەکەی ئێوە نەیار و دوژمنی زۆری دەبێت..."

" ئەو دوژمنانە هەموو تێکۆشانیان بۆ خامۆشکردنی ئەو چرا ڕۆشنە پڕ لە زانستییە کە لە بیر و رامانی ئەودا ڕەچاو دەکرێ، بەڵام دژایەتی و پیلانی چەوتی ئەوان لە ئەنجامدا هەمووی شکست دەخوات و پووچەڵ دەمێنێتەوە. تیشکی چرای داگیرساوی ڕۆڵەکەی ئێوەش هەردەم گەشتر و ڕۆشنتر دەبێت و سەرئەنجام هەر بیر و رامانی ئەو دەبێتە هەتاوی هەمیشە جاویدانی* تیشکهاوێژ.."

"ئەو شاخە زێرینەش کە بە دەست لاوەکەوە بوو، ئەوە نیشانەی هێز و توانای داداری* مەزن بووە، کە مرۆڤ لە هەموو خراپەکار و بەدکردار و ناڕێکێک دوور دەخاتەوە و هەروەهاش ئەو شاخە زێڕینە نیشانەی پەیامێکە کە لە دادارەوە پێی دەدرێت. ئەم منداڵەی دەبێتە خاوەنی ئەو فەڕە یەزدانیەی کە ئەو لاوە جوانچاکە، جانەوەرە دڕندەکانی پێی سووتاند. هەروەها ئەم زارۆکەی تۆ نامەی پیرۆزی خواوەند بڵاو دەکاتەوە و تۆوی* ڕاستی و دروستی لە هەموو کووچە و کۆڵان و کەلەبەرێکی ئەم جیهانەدا دەچێنێت. بە بوونی ئەم منداڵەی ئێوە، هەموو دڵڕەش و بەدکار و بەدرەفتاری  دەپەشۆکێ و جێگایان پێ لەق دەبێت و ناوی منداڵەکەی ئێوە بۆ هەمیشە بە نەمری لە جیهاندا دەمێنێتەوە. ئەو سێ گیانلەبەرە دڕندەیەی تریش کە لاوەکە بە شاخە زێڕینەکە سووتاندنی، سێ

دوژمنی گەورەی ڕۆڵەکەی تۆ دەبن، کە لە زیانبەخشترین کەسانی ئەم سەردەم و ڕۆژگارەن. بە هەموو جۆرە هەوڵ و کۆششێک، پیلان دادەنین بۆ لەناوبردنی، بەڵام هەر جارە بە جۆرێک شکست دێنن. ئەو منداڵەی تۆ دەبێتە پەیامبەری ڕاستی و ڕێگەی ڕاست نیشانی گەلان دەدات. بەدئەندێشانی بەدکردار، بیروڕا و بەرژەوەندییان لەتەک ئەودا ناگۆنجێت. بە پیلانی ڕەشیان و ڕەشبینی دڵی خۆیان، دژایەتیی ڕاستی دەکەن و لە ئاکامدا مەرامی پیس و بۆگەنیان پووچەڵ دەمێنێت، هەروەک تاریکایی هەموو جیهان ناتوانێت ورشەی مۆمێک بشارێتەوە، ئاوا ئەوانیش ناتوانن فوو لە تریفەی مۆمێک بکەن و بێ ئومێد و ئاوات لە تاریکیی دڵی خۆیاندا وێڵ و سەرگەردان دێن و دەچن و بە ڕەنجەڕۆیی سەر دەنێنەوە و ئەم جیهانە پان و بەرینەش بە ژیلەمۆی رامانی ڕۆڵەکەی ئێوە سەر تا پا ڕووناک دەبێتەوە و ڕاستی و دروستی پەل دەهاوێتە هەموو پەنا و پاسارێک، بە شێوەیەک کە مرۆڤایەتی و جیهان بە خۆیانەوە نەیاندیبێت. ژیانی جاویدان و ڕاستی و سەرفەرازیی بۆ ئەوانە دەبێت کە هاوشانی ڕۆڵەی ئێوە تێدەکۆشن بۆ نەهێشتنی زۆرداران و جادووگەران. بریا من هێندە بەختەوەر دەبووم تا ئەو کاتە بژیامایە و سەرکەوتنی ئەندێشە و رامانی ڕۆشن و پاکی ئەوم بە چاوەکانی خۆم بدیایە و گیانم لە ڕێگا و پێناویدا بەخت بکردایە.."

(لە سەر ناوی زەردەشت منیش بڕوام وایە کە پێشتر زەردەشت ناوی ڕاستەقینەی «سیمیار» بووە و نازناوی «زەردەشت» لە دواییدا پێی دراوە. پیری شالیاری زەردەشتی لە بەرهەمی خۆی «ماریفەت» ناوی زەردەشت، بە «سیمیار» ناو دەبات، پیرشالیاری زەردەشتی دەفەرمێت: **(گۆشت بروانە پیر شالیار بۆ هۆشت جە کیاستەی زانای «سیمیار» بۆ)**، مانای: "بە وتەی پیری شالیار گوێ بگرە و هۆشی خۆت بدە بە نووسراوەی زانای سیمیار". فەرهەنگی دێهخودا. بەرگی 13. لاپەڕەی 665. «سیمیار» لە دوو واژەی «سیم» و «یار» دروست بووە، دەزانین سیم بە واتەی زێوە (زیو) و بەشێک لە ناوی

زەردەشت، واژەی زێڕی (تەڵا) تێدایە، کە ئێستاش نرخی زێڕ لە زێو زیاترە، بۆیە ڕێی تێدەچێت کە ناوی سیمیار بۆ زەردەشت کەم بووبێت، بۆیە لە پاشان نازناوی زەردەشتیان پێ داوە).

زستان* کۆڵ و باری پێچایەوە و سەرپۆشی سپیی سەر چیاکانی زاگرۆسی لەگەڵ خۆی برد. سەرما و زوقم و تۆف بەستەڵەکیش بنە و بارەگایان بۆ ساڵێکی تر هەڵگرت. وەرزی وەهار دەستی پێ کرد. هەتاو دەستی گەرم و پرچی زێڕینی بە سەر شاخ و دۆڵ و دەشت و نشێوی هێنا. باران باری. گوڵ و گیا و سەوزەڵانی جوانترین بەرگی هەمە جۆرەیان کردە بەر زێدی میدیا و بە هەزاران جۆر باڵندە وەک کەو و کۆتر و قومری، غەزەڵخوانی ئەو دیمەنانە بوون و چەرخی ژیان بە بار دەبوو بۆ لەدایکبوونێکی نوێ. شەشەم ڕۆژی بەهار لە ساڵی نوێ، ئەو منداڵە چاوی پرتیشکی هەڵهێنا و بە جیهان شاد بوو.

ڕووداوەکان وەک ئەو پێشبینییەی کە پیری ئەختەرناس و فەرزانە کردبووی، وەک یەک دەرچووبوون و هاتبوونە دی. لەدایکبوونی زەردەشت لە هەموو گوند و ئاوایی و ناوچە و بازێڕێک دەنگی دابوەوە و پیاوچاکان بە یەک دڵ و بە یەک گیان هۆگر و پارێزگاری ئەو منداڵە بوون. ناپاکان و جادووگەرانیش بە دوای هەل و دەرفەتێکدا دەگەڕان بۆ لەناوبردنی ئەو کۆرپەیە.

لەو ڕۆژگارانەدا، ستەم و بێدادی هەموو نیشتمانی ئاریی* داگرتبوو. لە هەموو شار و جێگایەکدا جادووگەرانێکی فرە هەبوون کە بە جۆرێ فێڵ و تەڵەکەی، خۆیان سەپاندبوو بە سەر گیان و مێشکی هەژاراندا و ئەیان چەوساندنەوە و نانی دەمی خۆیان و ماڵ و مناڵیان لێ ئەستاندن. خۆنەزانی، خۆویستی، ڕەشبینی، فریوکاری، درۆزنی، نادروستی، بەدکاری و ستەمکاریش سواری شانی هەموو خێڵ و تیرە و بەرەیەک ببوو. بە شێوەیەک کە جادووگەران و دەستەڵاتدارانی خاوەن زێڕ و دارایی دەیانتوانی هەزاران ژن و پیاو بکەنە بەندە و کۆیلەی خۆیان و بە ئارەزووی خۆیان بیانڕوتێننەوە و فەرمانی مەرگ و زیندەگیشان هەر بە دەست

خۆیان بێت. ئەمانە بۆ کۆمەڵگا بێجگە لە گێلی و نەزانی و گومڕایی و خەم و خەفەت و شیوەن و سیابەختی هیچ شتێکی تریان نەدەویست. ئەمانە خەڵکیان ئاوا دەترساند کە گوایە ئەوان خاوەنی هێز و دەستەڵاتێکی زۆرتر و تایبەتین، بۆیە لە جیهانێکی نادیارەوە پێیان ڕاسپێراوە و پەیوەندییان لەتەک خواوەندەکانی جۆراوجۆری باوی ئەو سەردەمە وەک ڕۆژ و برووسکە و زەروان*.. هەیە. ئەمانە چەشنێک درۆ و دەلەسەی خۆیان لە مێشکیاندا چەسپاندبوو کە گوایە توانای کردنەوەی هەموو گرێ و گیر و گرفتەکانی ژیانیان هەیە و بێ ئەمان خواوەندەکان فەرمانی چاکبوونەوەی نەخۆش و شادی و بەختیاریی مرۆڤ دەرناکات. زۆربەی زۆری ئەم زۆردار و خوێنمژانە لەو کەسانە پێک هاتبوون کە مامۆستا یان ئایینزان و ڕابەری دینی ڕۆژپەرستی بوون و بە کەرپان* ناویان دەرکردبوو. کەسانی نەزان و فریوخواردوو کە ترسی خواوەندەکان و ژەهری بیر و باوەڕی ڕۆژانەی کەرپانەکان لە دڵیاندا بوو، بۆ هەر کار و پرسیار و ڕاوێژێک، دەچوونە لای جادووگەران و داوای یارمەتییان لێ دەکردن. جادووگەران لە گێژی و نەزانینی مەردوم* کە لە هەموو جێگایەکدا پەرەیان پێدابوو، سوودیان وەردەگرت. ئەوانە کە خۆیان بە نوێنەری خوداکان دەناساند، خەڵکیان دەخستە ناو تۆڕی فریوی خۆیان و لە گێژاوی بێ کۆتایی نەزانی و ترسدا دەیانتۆقاندن و ڕێگەی شاش و چەوتیان بۆ دەستنیشان دەکردن. بە کردنی هێندێ کاری پڕوپووچ و وڕینەکردن ، یان بە نواندنی هێندێ ڕەفتاری فڕوفێڵاوی، بەری ڕەنجییان، بە خواستی خۆیان لێ دەستاندن. ئەم کۆمەڵە دەستبڕ و ساختەچییانە، ژیانێکی پڕ لە ئاسوودەیی و ئاسایشێکی پڕڕەنگ و خۆشیان لە سایەی نەزانینی ئەواندا دەبردە سەر. بە درێژایی ساڵ ئەمانە مێردەزمەی کۆڵی هەژاران و لانەوازان بوون.



لە هەمبەر کەرپانەکان و دەسەڵاتداران و میرانی ستەمکار، هێزێکی دیکە هەبوو. کۆمەڵێک مرۆڤی زانا و دڵسۆز و خاوەن بیر هەبوون کە بەرامبەری هێزی جادوو و چەواشەیی، خەڵکیان هان دەدا و پێیان ڕادەگەیاندن کە ئەمانە چەواشەکار و چەوسێنەرن و هیچ فرێکیان بە جیهانی نادیار و ناپەیداوە نییە و ناشتوانن بە ناوی هیچ خودایەک قسە بکەن، بێجگە لە فریوودان و خاپاندن نەبێت، هیچی تریان لە باردا نییە. ئەو شتانەی کە لە ناو کۆمەڵدا بڵاوی دەکەنەوە، بەس بۆ بەرژەوەندی و پارێزگاریی تەختی فەرمانڕەوایی و حەسانەوەی خۆیانە.



هۆیەکی سەرەکی کە جادووگەران، کۆمەڵانیان هاندەدا کە ڕوو لە خەم و شین و تاریکی بکەن ئەوە بوو کە تەنیا پێویستییەکانی سامان و دەسەڵاتیان بەجێ بهێنن. کەرپانەکان ئارمانجیان ئەوە بوو کە هەر چی نەزانی و خەم و خەفەت زۆرتر بێت، کاری ئەوان گەشاوە و پڕ دەرامەدتر دەبێت. جادووگەران لەتەک زانا و ڕووناکبیر دژ بوون. لە هەر جێگایەک دانایەکیان وەگیر کەوتایە بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵی لەناوبردن یاخود هەڕەشەی مەرگیان بۆ دەمکوت کردنیان دەکرد. چونکە لە بەرامبەری هزر و ئەندێشەی بەرز و ڕۆشنیان، توانای ڕاوەستان و مانەوەیان نەبوو. بۆیە ستەمکاران لە یەک ڕێگا و یەک شێوە زۆرتر بۆ دژایەتیی هێزی ڕووناکبیر ئاشنا نەبوون، ئەویش کوشتن و لەناوبردن.

لەم بارودۆخەدا کە جەنگ لە نێوان بەرەی ڕووناکی و تاریکی، دانایی و نادانی، زانست و جادووگەری، بەو پەری خۆی گەیشتبوو، ئەستێرەناسی بەناوبانگ، پێشبینیی لەدایکبوونی جیهانسازێکی مەزنی کردبوو، بۆیە کەرپانەکان ترسیان لێ نیشتبوو. باسی ئەو زارۆکە ساوایە پێش لەدایکبوونی دەماودەم باس کرابوو. جادووگەران بە لەدایکبوونی ئەو زۆر سەخت لە ترس و پەستیدا بوون. خەژارە و نیگەرانی دڵیانی گوشی بوو. مەترسیی ئەوەیان لێهاتبوو کە نەوەک بەم لەدایکبوونە پیرۆزە، ئەو ژیانە بێ ماندووبوونەیان لە دەست بچێت و خەڵک لێیان ڕاست بێتەوە و بازاری گەرمی دەستبڕین و فرتوفێڵیان سارد ببێتەوە و خەڵکیان لێ پەرتەوازە ببن. خەم و پەژارە و نیگەرانی بەری دڵی گرتبوون. بۆیە جادووگەران بە پیشەی خۆیان، کۆششی پیلانی کوشتنی ئەو منداڵەیان کێشابوو، بەڵام دایک و باوک و کەسوکار و دۆست و زانایان، وریا و هۆشیار، بێ وچان ئاگادار و چاودێریی منداڵەکەیان گرتبووە ئەستۆ و بە دڵ و گیانیان دەیانپاراست و پیلانی نەیارانیان پووچەڵ دەکردەوە.

زەردەشت لە ناو ستەم و زۆرداریی ئەو چەرخە گەورە دەبوو و پێدەگەیشت. هەر لە سەرەتای منداڵییەوە کردار و ڕەفتاری جوان و سەرسوڕهێنەری، جیاوازی لە

منالەکانی تری کردبوو. لەتەک زارۆکانی هاوتەمەنی خۆیدا، ژیرانە هەڵسوکەوتی دەکرد. لە ئاخاوتندا فرە ئارام و لەسەر خۆ بوو. دڵپاک و ڕەوشت بەرز بوو. لە پرسیار و وەڵامیدا گەورەیی و ڕابەری دەبینرا. قسەی خۆش و پڕواتا و بە چێژ بوو. لە ناو کۆڕ و کۆمەڵدا قسە لە ڕوو بوو. لە رامان و خێرەتی* دووربینی و فەرزانەیی دەبینرا. وازییان بە هۆش و هەستی خەڵک بکردبایە ئەمیش لەوێ بوو و دژایەتی دەکردن و بە دڵ لەتەک فرت و فێڵ و تەڵەکەبازی دژ ڕادەوەستا. هێندێک بویەری* سەیر روویدا. دوای ئەم ڕووداوانە بەناوبانگی و دانایی و خێرەت و هۆش و قسەخۆشیی زەردەشتی پچووک دەم بە دەم بڵاوتر دەبووەوە. لەو سەردەمەدا وا باو بوو کە کۆڕ و دانیشتنی جۆراجۆر ساز دەکرا. جادووگەران هونەر و نمایشتی خۆیان دەنواند و بە ناوی خواکانەوە، بیر و هەست و هۆشیان لە مێشکی کۆمەڵ دەسەند و توانیبوویان هەموو تۆژەکانی کۆمەڵگا بخاپێنن و بە ئارەزووی دڵی خۆیان فەرمانیان بە سەردا بەش بکەن.

ڕۆژێکیان سەرۆکی جادووگەران، کە هونەری لە هەمووان زیاتر بوو، کەلوپەلی جادووگەرییەکەی خستە سەر شانۆی نمایشت و دەستی کرد بە وتنی وڕێنە* و وتەی هەلەق و مەلەق و ڕەفتاری فریوکارانە و ئامادەی نواندنی هونەری خۆی بوو و سەرنجی خەڵکی بە تەواوی بۆ خۆی ڕاکێشا بوو، بەڵام هێشتا تاوێکی پێ نەچوو کە منداڵێکی بە تەمەن پچووک و بە ڕەوشت گەورە، لە ناو کۆڕی بینەراندا هەستایە سەر پێی گوتی: "- ئەی سەرۆکی جادووگەران! ئەی فریووکاری قەشە! تا کەی بە ڕێگای شاش و ناڕاست دەڕۆی و خەڵک دەترسێنیت؟ جادووگەری پیشەی مرۆڤی تەمەڵ و تەوەزلە و کردارێکی پڕ فرت و فێڵە. جادووگەری تۆوی نەگبەتی و هەژاری و گومڕێی دەچێنێ. لە کەلی سەختی بێ بەزییتان بێنە خوارەوە و ڕێگای ڕاست بگرن. ڕێگای دروست و جوان تەنها ڕێگای ژیری و بیر و ڕاستییە. جادوو پیشەی درۆزنان و فریوکاران و ملهوڕانە. مرۆڤی ڕاست هەرگیز توخنی ئەم کارانە ناکەوێت. رامانێکی ڕووناک کە

بنچینەکەی لە سەر ڕاستی دامەزرانبێت، هەرگیز بە دوای ئەم پیشە ناشیرین و بێهوودەیەدا ناکەوێت. ئەی جادووگەری گومڕا، ئەوە باش بزانە کە کرداری ناپەسەندی تۆ ناتوانێت من فریو بدات و بمترسێنێت. من فریوی تۆ ناخۆم و بە رامان و خێرەت، درۆ و فێڵ و کەڵەکەبازی تۆ و دەست و پێوەندەکەت ئاشکرا دەکەم. بەسە ئەم سفرە و خوانەت کۆ کەرەوە دەست لە خاپاندنی کۆمەڵان هەڵگرە. من باش دەزانم کە تۆ بە بوونی من قەڵس و تووڕە دەبیت و بۆ لەناوبردنی من هەمیشە لە هەول و کۆششدایت، بەڵام ئەوەش بزانە کە من هیچ لێت ناترسم، هەر وەکوو بینیت و گوێت لێ بوو، ئاوا هەمیشە دژی تۆم و فریو و درۆکانت ئاشکرا دەکەم.

هێشتا گوتەکانی زەردەشتی پچووک کۆتایی پێ ناهاتبوو کە جادووگەری فریوکار ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و لەرزی لێ نیشت و جادووگەرەکانی دی لە ترسان بار و بنەیان کۆ کردەو و لە بەرچاوی سەیر و سەرسووڕمانی خەڵک هەڵاتن. خەڵک واقیان وڕ مابوو. هەموو گیانیان ببوو بە چاو و گوێ. لە سەرێکەوە دەترسان کە خواکان و جادووگەران لێیان بکەونە بە کین* و دەرد و نەداری و نەخۆشی داباریێنن بە سەریاندا و لە سەرێکی تریشەوە گوتە پڕشکۆ و بەنرخەکانی زەردەشت کاری کردبووە سەر دڵ و گیانیان و لێی نەئەسڵەمێنەوە، چونکە تا ئەو کاتە ئاخافتنی پڕواتە و دلێرانەی ئاوا و ڕووبەڕووبوونەوەی ئاوا ڕاستەوخۆیان لە کەس نەدیبوو و نەبیستبوو. نەیاندیبوو لە ڕووی جادووگەراندا کەسێ ڕابەرێ و ئەوانیش کەلوپەلیان کۆ کەنەوە و لەناو خەڵک هەڵبێن. بۆیە زەدەشت لە درێژەی قسەکانیدا خەڵکی هاندا کە بڕوا بە جادوو نەکەن و فریوی چەواشەکاران نەخۆن و پاشەڕەوی مێشک و هۆش و رامانی خۆیان ببن و سەر بۆ جادووگەران نەوی نەکەن. ڕێگای ڕاست و دروست بگرن و ملخوار و دەستخواری کەس نەبن. بەری ڕەنج و ماندووبوونیان نەدەنە زۆردار و دروست و پێوندی جادووگەران.

زەردەشتی بچکۆلانە و بەتوانا و بەهۆش و خێرەت، بە هەڵسوکەوتی بەرز و بێ وێنەی خۆی، باژێری شیزی* خستبووە ناو بیرکردنەوەیەکی قووڵ و فراوانەوە. بە ئاشکرا یارمەتیی هەژاران و ڕەش و ڕووتانی دەدا. نانی دەمی خۆی دەدا بە سواڵکەران و پیر و پەککەوتووان. دەستی پاک و پیرۆزی لە ژێر باڵی هەموو لێقەوماوێکەوە بوو.

سەیر بوو، زەردەشت هێشتا لە سەرەتای لاویدا بوو کە ئەستێرەناس و زانایانی ئەو سەردەمە کە لە کار و رامان و بیری ڕۆشن و کووڵ و هەڵسوکەوتی بەرزی ئەو ئاگادار بوون و هەموویان بە دڵ تامەزرۆی دیداری ئەو بوون و تێدەکۆشان کە ئەو لاوە گەنجە ببینن و لە هۆشی مەزنی ئەو سوود و بەهرە وەربگرن و نهێنیی هەڵسوکەوتی بەرز و بڵندی ئەو بدۆزنەوە.

زەردەشت گەورە دەبوو و بالآی دەکرد و گەیشت بە تەمەنی گەنجی. هاوکات لەتەک پێگەیشتن و پێشچوونی تەمەنی، خێرەت و بیرکردنەوەی و بۆچوونەکانی گەورە و فراوانتر دەبوون. پتر و قووڵتر بیری لە ناسینی هەستی و نهێنییەکانی جیهان و ژیانی گەلان دەکرد. زەردەشت هەمیشە لێ رامان و بیرکردنەوەدا بوو و هەمیشە لە دانایان و تێگەیشتووانی شار سوودی وەردەگرت و هەوڵی دەدا کە لەتەکیاندا لەمەڕ مژاری جۆراوجۆر لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ بکات. لە هەمان کاتیشدا لەتەک جادووگەران و خۆرپەرستان و مێهرپەرستان* بێ ترس وتووێژی دەکرد و لۆمەی باوەڕ و رامان و کردارەکانیانی دەکرد.

زەردەشت دەیویست هەموو نهێنییەکانی گێتی و هۆی چارەڕەشیی کۆمەڵانی هەژار و لانەواز لە ناو کۆمەڵگا بدۆزێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە نیازی بە شوێنێک هەبوو کە لەوێ ئارام و ئاسوودە و بێ ئەوەی شیرازەی بیرکردنەوەی بچڕێت خەریکی بیرکردنەوە بێت. سرووشتی سەرزەوی میدیاش بەو هەموو دیمەن و چیا ڕەنگاوڕەنگ و گەردەنکەش و بەرزانەی باشترین دەرفەتی بۆ ڕەخساند. لە ئەنجامدا مێهراوی* چیای ئاویەر (ئەوشیندەر)ی* هەڵبژارد و چووە جیهانی

بیرکردنەوە گۆشەنشینی*، چووە جیهانی هەست و خۆزگە و پرسیارەوە، جیهانی ڕامان و چێژ و قووڵەوە.

# رامان و پرسیار



زەردەشت لە چیای ئاویەرەوە، لەو جیهانە کپ و بێدەنگەدا، لەتەک جوانیی سروشت و شۆخ و شەنگیی نیشتمانی میدیا، دەکەوتە لێکۆڵینەوەی بەرفراوان و ژەرف و کوورەوە*. هەموو بەرەبەیانێک پێش هەڵاتنی خۆر ئەو کاتەی سپێدەی بەیان ڕەنگی ئەرخوانی* دەکردە بەر چیا و کەڵەشێر* مژدەی هاتنی ڕۆژێکی نوێی دەدا، زەردەشت لە خەو هەڵدەستا و وەکوو هەموو ڕۆژێکی دیکە، وریاتر و ژیکەڵەتر، جیهانی دەوروبەری خۆی دەخستە بەر پرسیار و وەڵامەوە. بە ویناوە* سەیری جیهانی بێدەنگ و دەنگداری دەکرد و لەگەڵ خێرەت و ئەندێشەی بەراوەردی دەکردن. سەرنجی وردی لە ئاسمان و جووڵانی خۆر و مانگ و ئەستێرەکان و بە گشتی لە گەردوون دەدا و بە سالۆرەوە* لەتەک رامانی خۆی و ڕۆژپەرستان دەکەوتە جەنگێکی بێ کۆتاییەوە.

زەردەشت دەیویست بوون و ئافەرینش* و ئافەریدەگاری* هەستی بناسێت. چونکە ئەو بیر و بۆچوونانەی کە ڕۆژپەرستان و مێهرپەرستەکان لەمەڕ بەدیهێنەر و ڕۆژ و مێهر و خوداکانی دیکەوە دەیانگوت، هەرگیز نەیدەتوانی رامانی کراوە و خێرەتی پشکێنەری زەردەشت خۆشنوت* بکات. خۆی لە بارەی ئەم پرسیارانەوە بیری دەکردەوە و بە سالۆری رامانی بە کار دەهێنا. لە تاریکی شەو و رووناکی ڕۆژ و هەور و باران و سەوزبوون و پێگەیشتن و گەشەکردن و باڵاکردن، هەزاران پرسیاری هەڵدەهێنجا و وەرامیشی دەدایەوە. دەیویست خوای تاک و بەدیهێنەر و هەستی و بوون بناسێت. تەنهایی، توانای بینینی ئەو دیو شتەکانی پێدا و توانی ڕاستی و چەفتی بخاتە ترازووی پرسیارەوە. دەیویست زانا و زاڵ بێت بە سەر ئایین و داب و نەریتی جۆراوجۆری کۆنی مرۆڤدا، کە بۆ چەوساندنەوە و پاراستنی تەختی فەرمانڕەوایی هاتبوونە کایەوە و فریان بە سەر خواناسی و ڕاستی نەبوو.

زەردەشت باش دەیزانی بۆ پێڤاژۆی* ناسین، هەنگاوی یەکەم، هاتنە خوارەوە لە تەختی خۆپەسەندی و بای هەوا و بەردان و دڕاندنی تۆڕ و شەوەکەکانی* بیر و بۆچوونی کۆنە. هەنگاڤنان بۆ گۆڕانکاری لە ڕەوان و دەروونی مرۆڤدا، تەنیا بە لەخۆبردن و سەرچەماندن و خاکساربوون* نەبێت نایەتە دی. تا کەسێک لە ڕێگای ڕاستی، دڵساف، دڵفراوان، دڵڤاڵ، دڵباختە، دڵپاک، دڵدار و دڵگەش نەبێت، ناتوانێت بە ئارمانجی ڕاستینی خۆی بگات. تا کەسێک زانیاریەکانی کۆنی خۆی فڕێ نەدا و ڕوو لە فێربوون و زانینی دانش و زانستی نوێ نەکات و ڕێگای ڕاست و دروست نەگرێتە بەر و لە بیری چاک یارمەتی وەرنەگرێت، لە کاری خۆی سەرکەوتوو نابێت. لە سەرەتای بیرکردنەوە و ڕاز و نیاز و وتووێژدا لەتەک ئەهۆرا مەزدا، هۆنراوە و سروودی بەم شێوە دەیفەرموو:

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
چلۆن سەوداسەرانی تۆ،
بە خاکساری بتناسن؟
ئەی مەزدا..!
کەی ئەم ڕێگایە
بە هاوڕێیەکی وەک من
فێر دەکەی؟
کەی لە بەر تریفەی ڕاستی دڵخواز،
یارمەتیدەری من دەبێت،
تا ڕامانی پاک بەرەو ڕووی ئێمە بێت؟
گاتا*، هاتی*44، سروودی* 1

زەردەشت هەرگیز شوێن پنداری* پڕوپووچ نەکەوتووە. نەیویستووە لە پشت پەردەوە دەستەڵات و بیر و ڕامانی خۆی بە سەر مرۆڤدا بسەپێنێت، بەڵکوو کۆششی تەواوی کردووە بۆ بەدیهێنانی ژیانێکی نوێ و گەیشتن بە ژیانە هەرە باشەکان بۆ خۆی و کۆمەڵانی دی و دەشییزانی ئەو مرۆڤەی بیەوێت ژیانی بەختیاری و کامەرانی بۆ خەڵکی بەدی بەهێنێت دەبێت بە دواترۆپک و پلەی پاکی ڕاستی و دروستی بگات. زۆر بە وردی دەگەڕا بە دوای سەرچاوەی ئەو مەرجانەی کە باشترین ژیانی لێوە دێتە دی و دەیویست لە ڕێگای زانستییەوە بزانێت چۆن مرۆڤ بە دەستی بهێنێت. هەروەها شەو و ڕۆژ لە خێرەت و بیرکردنەوەدا بوو، تا بزانێت ڕابەر و سەرۆک، چۆن دەتوانێت لە بەر تیشک و

ڕووناکی ڕاستیدا، چارەسازی ژیانی کۆمەڵان و پاسەوان و پارێزەری هەموو کارەکانی مینوویی* بێت.

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
سەرەتا و سەرچاوەی باشترین ژیان چییە؟
کەسێک کە
کۆششیان بۆ بکات،
چ پاداشتێک وەردەگرێت؟
ئەی مەزدا..!
ئەو کەسەی کە هەڵبژاردەی هەمووانە،
چلۆن لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
بە پاکی
هاوڕێ و چارەسەرکەری ژیان و
پارێزەری هەموو کارەکانی مینوویی دەبێت؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 2

زەردەشت گەیشتبووە بڕوایەک کە خۆر سەرچاوە و مایەی ژیانە بۆ زەوی و مرۆڤ و باڵدار و بێباڵ و دار و درەخت و سەوزایی و پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان بە یەکەوە هەیە. بە تایبەت لەو وڵاتە ساردسێرانە وەک کوێستانەکانی زاگرۆس کە گەرمای ڕۆژ دەوری سەرەکی لە ژیانی ئەو کۆمەڵانەی هەیە. هەروەها ئاگاداری سەرسوڕماویی خەڵک سەبارەت بە هەڵاتنی هەتاو و ئاوابوونی و گۆڕانی شێوەی مانگ و وریشەدانی ئەستێرەکان بوو. لە سەر ئەم ڕاستییانە دەیویست زۆرتر ئەم

ڕۆشناییدەرە ئاسمانییانە بناسێت و سەر لە نهێنیی ڕازی گەشەکردن* و هاتن و چوون و داچوون و تیشک بەخشین و تاریکی بزانێت.

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
کێیە لە سەرەتادا،
بەدیهێنەر و سەرچاوەی ڕاستی؟
کێ ڕێگای ڕاستی خۆر و ئەستێرەکانی
دیاری کردووە؟
کێیە ئەوەی،
کە جارێک مانگ پڕ و گەشاوە دەکات و
جارێکیش کز و نادیار؟
ئەی مەزدا..!
من داواکاری زانینی ئەمانە و گەلێ شتی دیکەم.
گاتا، هاتی 44، سروودی 3

زەردەشت لە ناسینی ڕاز و نهێنییەکانی سروشت هێندە چڕ و ورد ببوو، شارەزایی تەواوی لە سەر ڕووناکی و تاریکی، هەڵچوون و داچوون و مردن و ژیان پەیدا کردبوو. کە تاریکی دادەهات سەرنجی لە کانگای ئاسمان و جریوەی ئەستێرەکان و تریفەی دەدا و گوێی بۆ بێدەنگی جیهانی تەنهایی و گەردوون ڕادەگرت و دەیخستە بەر پرسیار و وەرامەوە. دەیزانی داهێنانی تازە دەبێت لە ناو خودی شتەکانەوە لە دایک ببێت و سەر دەربێنێت و ئەونە بە توانا و بە هێز بێت، کە بتوانێت بەرگری لە بوونی خۆە و دژە سەرەکیەکان بکات.

زەردەشت بە پێچەوانەی هەڵسوکەوت و کردار و پیشەی دێڤ یەسنایان* کە دەچوونە گۆشەیەکی تاریک تا ڕێگا بۆ فرت و فێڵی خۆیان بدۆزنەوە بۆ گێل کردنی خەڵک و سەپاندنی خۆیان بە سەریاندا، زەردەشت ڕووی دەکردە دیمەنی شۆخ و شەنگی سروشتی کوردستانەوە (میدیا). بە شاخ و دۆڵ و دەشت و نشێو و دار و دەوەن و گژ و گیا و گوڵیەوە، هەور و باران و با و شەماڵ و بۆران و باڵدار و بێباڵ و گیانلەبەرە هەرە وردەکانییەوە، دواجاریش بە مرۆڤ و گەورەترین تایبەتمەندی مرۆڤ، ئەویش: "توانامەندی ڕامان و بیرکردنەوە".



زەردەشت لە ناسینی ڕاز و نهێنییەکانی ڕۆژ و ئەستێرەکان، بە وشەی "بەدیهێنەر و باوکی ڕاستی" دەستی پێ کرد. بۆچی؟

چونكە زەردەشت دەیزانی و تێگەشتبوو كە لە گەردوون و ئاسمان و لە گەڕیان و گەشەسەندن تیشكدانەوەی خۆر و ئەستێرەكان و لە كرداری كۆمەڵان، ڕێكوپێكی و سامانێك سازگار و گونجاو بەدی دەكرد، كە زەردەشت ئەوەی بە واژەی هەنجاری* ڕاستێیتی دەناساند. لە ڕوانگای زەردەشتەوە ڕاستی، هەنجار و فەرمانڕەوایە بە سەر هەستی و گەردووندا، وە هەروەهاش هەنجار فەرمانڕەوایە بە سەر دەروون و ڕەوانی و گیانی مرۆڤدا.

زەردەشت دەیویست فەلسەفە و نەهێنیی دروستبوون و داهێنانی گەردوون بزانێت. بۆیە بۆ ناسینی شتەكان لە خودی خۆیان ورد دەبووەوە و بیری لەو هێزە دەكردەوە كە بوونی پێ بەخشیوە. زەردەشت دەیویست بزانێت كە با، شەماڵ و سروە و هەور چلۆنە و چۆن ئاسمان دەپێوێت:

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
كێیە ئەوەی زەویی لە ژێرەوە و
ئاسمانی بێ هەورازی لە سەرەوە ڕاگرتووە؟
كێیە ئەوە،
ئاو و گیا و ڕووەكی ئافراندووە؟
كێ وزەی تێپەڕین و توندڕۆیشتنی
بە با و هەوری ڕەش داوە؟
ئەی مەزدا..!
كێ بەدیهێنەری رامانی پاكە؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 4

زەردەشت دەیزانی ژیان چەندها شێوەی جۆراجۆری هەیە، بەڵام ئەیخواست پترتر لە دروستکەری کە خواوەندی تاک و یەگانەیە نزیک بێتەوە و هەزارەها پرسیار لە خۆرهەڵاتن و ئاوابوونی، لە ڕەنگی سووری ئاسۆ و زەردی دەمەوئێوارە، لە تاریکیی ئاسمان و هەڵاتنی مانگ و خەرمانەی، لە جریوەی ئەستێرە و پرشنگی گەش دەردەهێنا. دەیویست لە ڕازی ڕووناکی و تاریکی، خەوتن و بێداربوون، ماندوویی و ئاسوودەیی، سپیدە و نیوەرۆ و ئێوارە و شێوان و شەو، ئەو توانا و یاسایە کە وزە و گوڕ دەدات بە ژیان و کۆتایشی پێ دەێنێت. زەردەشت دەیویست بزانێت کە بە ڕاستی ئەم شێوە جۆراجۆرانەی ژیان لە چ شتێکەوە بەدیهاتووە و بەدیهێنەر و وەستاکەی کێیە؟

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە درووستی بە من بێژە،
کێیە وەستای بەدیهێنەری
ڕووناکی و تاریکی؟
کیژان وەستا،
خەو و بێداریی دروست کرد؟
کێیە ئەوەی،
سپێدەی بەیان و نیوەڕۆ و شەوی دیاری کرد
تا مرۆڤی ژیر،
ئاگای لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی بێت؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 5

زەردەشت داوای ڕاستی و دروستیی بیر و بۆچوونەکانی لە داداری مەزن دەکرد. سووریش بوو لەوەی کە ڕۆژپەرستان دەبێژن و دەیکەن دوورە لە ڕاستی و دروستیەوە. باوەڕی وا بوو کە مێهر و هەتاو ناتوانن فەرمان دەربکەن و نە تووڕەش بن و نە دڵیشیان هەیە تا بەزییان بە مرۆڤدا بێتەوە. زۆر بە توندی دژی داب و ڕەوشتی کوشتن و قوربانیکردنی گیانلەبەران بۆ خۆر یان فەرمانڕەوایی و ستەمگەری "کەی"یەکان* و ڕەوشتی چەوتی کەرپانەکان بوو.

ڕاگرتنی خەڵک لە ناو ترس و ڕەشبینی و بە هەڵەخستنی بیر و رامانیان بە چەوت و ناڕەوا دەزانی. زەردەشت دەیویست لە وانە و گوتەکانی خۆی تەنها بە ئەندێشە و هەڵسەنگاندنی دروست و ڕەفتار و کرداری دروست و ڕاستی و رامانی پاک دەربایست بێت و کۆمەڵانی خەڵکی بۆ ئەم ڕێگایانە بانگەواز دەکرد. بە پێویستیشی دەزانی هەرچی زیاتر لەم ڕێگا و ڕەوشەدا پابەرجێ بێت.

زەردەشت پێی وا بوو کە فەلسەفەی بوونی ئەم زەوی و گێتییە و ئەم چەرخ و ڕۆژگارە بە پیت و بەرە، بۆ شادی و خۆشی گەلان بەدیهاتووە. مرۆڤ تا زیندووە دەشێت بە شادکامی و کامەرانی بژی و لەو پیت و بەهرەیانەی زەوی کە دەستیان دەکەوێت سوود وەربگرێت. ئەو دژی بیر و باوەڕی کەراپانەکان بوو کە خەڵکیان بەرەو گومڕێی و درۆ دەبرد و بە جیهانەکانی خەیاڵاوی خەریکیان دەکردن. زەردەشت دەیخواست کۆمەڵانی خەڵک زەوی ئاوەدان و دروست بکەن و لە ڕووی جیهان بە شادمانی و خۆشی و دەست ئاوالەیی و تێر و تەسەلی بژین. هەروەها دەیفرموو من ئاوا بیر دەکەمەوە و گەرەکمە لە دروستی رامانم، ئەرخایەن بم:

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،

ئایا ئەو شتەی
کە دەبێژم و فێری دەبم،
بە گشتی هەمووی ڕاستە؟
مەگەر پاکی بە کاردانەوەی خۆی،
ڕاستی پتر ناکات و
لە بەر تیشکی ڕامانی پاکیشدا،
شکۆداری تۆ بەدی دێت؟
ئەی مەزدا..!
ئەم جیهانە پڕ پیت و فەڕ و شادە
بۆ کێ پێک هێنراوە؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 6

زەردەشت دەیخواست بزانێت ئەو هێزە ڕاکێشەرە نادیارە چییە کە مرۆڤ و گشت گیا و گیانلەبەران بەرەو لای یەک ڕادەکێشێت و کۆیان دەکاتەوە. دەیویست بزانێت ئەم پەیوەندی و بەیەک بەستنەوە لە ناویدا چییە، بۆیە گەیشتبووە ئەو بڕوایە کە ڕاکێشانێکی ڕێکوپێک و تەکووز* هەیە و مرۆڤ و ئاژەڵ و پەلەوەر و سەوزایی و زەوی و ئاسمان بە یەکدی گرێ دەدات و توانای ڕاگرتنی چەرخی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە و زەوی و گەردوونی هەیە. هەروەها بۆی ڕوون بوو کە تیشک و خۆر و ڕووناکی سەرچاوەی ژیانن و هەموو بوونەوەرێکیش پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە خاک و ئاوەوە هەیە و هەر یەکەشیان تایبەتمەندی و ئاکارێکی جۆراجۆریان هەیە.

زەردەشت دەیویست ئەو توانامەندییە مینووییە لەتەک پاکی بناسێت کە مرۆڤ هاندەدات بەرەو ژیانێکی باش و باشتر و بەرەو بەختەوەریی ڕاستین. دەیفەرموو

من دەمەوێ نهێنییەکانی هەستی و ڕازی زاڵ بوون بە سەر خوو و کرداری مرۆڤدا بزانم:

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
چ کەسێک،
توانامەندی مینوویی لەتەک جوانمەردی ئافراندووە؟
کێیە بە فەرزانەیی خۆی
ڕێزی باوکی خستە دڵی کوڕەوە؟
ئەی مەزدا..!
کۆششم ئەوەیە،
بە رامانی پاک و ئەم پرسیارانە،
تۆ کە بەدیهێنەری هەموو بوونیت، بناسم.
گاتا، هاتی 44، سروودی 7

زەردەشت لە یەکدانەوەی پرسیارەکانی خۆیدا و لێکۆڵینەوەی لە ڕازی ژیان، بوون و نەبوون سەدان جاری تر ئەو پرسیارە بە کەڵک و زانستیانەی دەهێنایە ئاراوە و دەیفەرموو یەکێکیان مەبەستی بوون و ژیانە. وەک ئەم جیهانە گەورەیە لەگەڵ هەموو دیاردە و نیشانە جۆراوجۆرەکانی بەرەو کوێ دەڕوات؟ ئامانجی مرۆڤ لە ژیاندا چییە؟ گەلۆ بەڕاستی ئامانج و مەبەستی ژیان بۆ مرۆڤ هەر خواردن و خەوتنە؟ ئایا بەڕاستی مەبەست و فەلسەفەی بەدیهاتنی مرۆڤ ئەوەیە کە ستایشتی ڕۆژ و یەزدانەکانی دیکە بکات؟ گەلۆ ئارمانج و مەبەست لە درووستبوونی مرۆڤ ئەوە بووە کە تا زیندووە پشت لە هەموو خۆشی و شادی و

جوانییەکان بکات تا لە جیهانێکی تردا بە دەستی بهێنێت؟ ئایا مرۆڤ بۆ ڕەزامەندی هەتاو و مێهر، دەشێت ئەم جیهانە بە سەختی و تاڵی و ڕەنج و دەرد و سیابەختی بیباتە سەر؟ هەموو جارێک دەیفەرموو من هەموو بیر و بۆچوونە جۆراجۆرەکانی کە لەم بارەوە باوە دەناسم، بەڵام چونکە هەموویان نابینم لەتەک خێرەت و راماندا بگونجێن ڕەهام کردوون. بە بڕوای من هەستی و گەردوون لە خول و دەورێکی گەشەکردندایە و ئارمانج و مەبەستی بوون و جیهان، لە گەشەکردن و گەیشتندایە، مرۆڤیش هەر بۆ ئەم ئامانجە بەدی هاتووە، و مرۆڤ دەبێت تا مردن لە ڕێگای گەشەکردنی خۆی تێ بکۆشێت.

زەردەشت گەیشتبووە بڕوایەک کە هەموو نائارامی و ناکۆکیەکانی ڕەوان و دەروون و هەموو خەم و دەرد و ڕەنجەکانی مرۆڤ لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە بە پێچەوانەی خوو و هەنجار و چۆنیەتی خۆی پێ لە ڕێگای گەشەکردن خوار و لار دادەنێت و یا خۆ وەستاو و بێ کەڵک دەمێنێتەوە. بۆیە دەیفەرموو هەر کەس لە ڕێگای گەشەکردن هەنگاو بنێت و تێ بکۆشێت، ئەنجامی فرە مەزنی، هێمنی و شادمانی بەدی دەکات:

ئەی ئەهۆرا..!<br>
ئەمە لە تۆ دەپرسم،<br>
بە دروستی بە من بێژە،<br>
من کە لە ڕاهێنانەکانی تۆ بیر دەکەمەوە و<br>
بە رامانی پاک پرسیار دەکەم،<br>
چلۆن لە بەر رتیشکی ڕاستیدا،<br>
لە گەشەکردنی ژیان<br>
بەهرەمەند ببم؟<br>
ئەی مەزدا..!

چلۆن لە ئاسایش و شادمانیی ڕەوان
بەهرەدار و سەرفەراز ببم؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 8

هەموو گیانلەبەران و زیندەوەران دارای هۆشێکی سروشتین. گیایەک خۆی دەزانێت چۆن دەڕوێت و ڕوو لە کوێ بکات و خواردنی لە کوێ وەربگرێت. هەموو ئاژەڵە جۆراجۆرەکانی ڕووی ئەم زەمینە دۆستان و دوژمنانی خۆیان دەناسن و بە پێی یاسای سروشت لە سەر گیانی یەکدی دەلەوەڕن. ئاژەڵێکی گیاخۆر بە هەست و هۆشی سروشتی خۆی دەزانێت کام گیا بۆ ئەو سوودمەند و کام گیا بۆ ئەو زیانبارە. مرۆڤیش هەروەک هەموو گیانلەبەران و زیندەوەران دارای خێرەت و هۆشێکی سروشتییە کە بە شێوە هێزی نهێنیی ویژدان لە ئەودا دەردەکەوێت.

مرۆڤی پاک و ڕاستڕەوان ئەوەیە کە بڕوا تەمدار و تاریکەکان کەنار بدات و ڕێگای ڕاست و دروستی ژیانی خۆی لە دەست ویژدانی نهێنیی خۆی ئاسوودە بکات. کاتێ مرۆڤێک بۆ ڕێگای لار دەچێت، ویژدانی نییە و یا ئەگەر هەیەتی ناپاکە. هۆکەشی ئەوەیە کە ویژدانی بە ڕیگا لار و نادروست ڕاهاتووە. ئەو تاوانبار و خراپەکارەی کە بە مافی مەردۆم دەستدرێژی دەکات و گیانی مرۆڤێک دەستێنێت و لە کردەی خۆشی پەشیمان نابێتەوە و یا بە کردەی خۆی شانازی دەکات، هۆی ئەوەیە کە ڕاهێنانی تاریک و ناپاک ویژدانی ئەوی لە ناو بردووە.

هەموو هەوڵ و کۆششی زەردەشت بۆ ئەوە بوو کە ویژدانی کۆمەڵان لە ژێر باری ڕاهێنانەکانی کۆنی چەوت و پڕ لە هەڵە ڕزگار بکات. ئەو ڕاهێنانە کە جادووگەران و مێهرپەرستان بە سەر ویژدانی گەلاندا سەپاندبوویان. زەردەشت دەیفەرموو: "من لەوە دەترسم کە لەم بیر و بۆچوونە چەوت و ناپاکانە لە ناو ویژدانی منیشدا هەبێت، هەر چەندە من لە سەرەتای منداڵی و لاوی لە نادرووستی ئەندێشەکانی جادووگەران تێ گەیشتبووم و خۆم لەوان دوور ڕاگرتبوو و دژایەتییانم دەکرد."

هەروەها دەیفەرموو: "من گەرەکمە ڕەوان و دەروونی خۆم وەها پاک بکەمەوە کە شایستەی نیاز و ستایش بۆ بارەگای ئەهۆرا مەزدا، ئەو خێرەتی پیرۆز بم. بە بڕوای من هۆی ناپاکیی ویژدان و دەروونی گەلان، نەزانی و خراپ ڕاهێنانە. ڕێگای ڕاستی و دروستی زانینە و من لەو ڕێگادا کۆشش دەکەم تا بە دانایی و زانستی دەروون و ویژدانم لە هەموو شتە لاوەکییەکان پاک بکەمەوە. بەڵام باش دەزانم بۆ هەنگاونان لە ڕێگای گەشەکردن بەرەو بارەگای ئەهۆرا مەزدای دلۆڤان، دانش و زانیاری بە تەنهایی بەس نییە، بەڵکوو لە تەنیشتی زانستدا دەبێت تیشک و ڕووناکی و پرووسکەی چاکی لە مرۆڤ بەدی و نیشتەجێ بێت. تیشک و ڕووناکییەک کە وەک هێزی مینوویی و ڕاستی و ڕامانی پاک بێت. تەنیا لەم ڕێگایەدایە کە مرۆڤ ئەتوانێت بە دەرگای مەزدا ئەهۆرا بچێتە ژوورەوە و بە ڕزگاری و نەمری و سەرفەرازی بگات."

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
چلۆن ویژدانی خۆم پاک بکەمەوە و پێشکەشی تۆی بکەم؟
هێڤیدارم بە فەرمانبەریی لە تۆ و
بە دانشێک کە
لە بەر پرشنگی شکۆمەندی تۆ فێر دەبم و
بە هێزی مینوویی و بە ڕاستی و ڕامانی پاک،
بەرەو بارەگای تۆ ڕێگا بدۆزمەوە.
گاتا، هاتی 44، سروودی 9

ئۆل، باوەڕ و ئایینەکان دوو جۆرن: یەکەم دواکەوتووخواز و کۆنەپەرەست، دووهەم پێشکەوتووخواز و نەوژەن*. ئایینەکانی جۆری یەکەم، رامانی مرۆڤ لە چواچێوەیەکی وشک و ئاسنیندا بە بەند دەکێشێت و لە هەموو جموجووڵێک و پێگەیین و لێکۆڵینەوە و گەشەکردنێک ڕادەگرێت. فەرمان و دەستوور هەمانە کە دروستکەران و سازکەرانی ئەم ئایینانە گوتوویانە. قسەی ئەوان فەرمانی مان و نەمان بووە و کەس نەیتوانیوە لە ڕوویاندا تەنیا واژەیەک بێژێت کە لەتەک دامودەزگای ئەواندا نەگونجاو بێت. هەر کاتێک کەسێک لە دژیان ڕاوەستابێت ئەوە سزای مەرگیان زووبەزوو بۆ دیاری کردووە تا هیچ کەسێکی دیکە هاوبیری ئەو پەیدا نەبێت کە پێی لەو سنوورە زیاتر دابنێت کە بۆی دیاری کراوە. لەم دینانە لایەنگیرانیان وەک هێستری گێرە، یا هێستری ئاشی گەنم، دەشێت هەموو تەمەنی ژیانیان بە چاوی بەستراوەوە لە جێگایەکی تاریک و سنووردراردا بمێننەوە، بە بێ ئەوە بتوانن هەنگاوێک لەو بازنەیە کە بۆیان دیاری کراوە دەربچن و بخولێنەوە.



زەردەشت دەیفەرموو: "من یەک بە یەکی ئەم ئایین و باوەڕ و کیشانە کە ساڵەهای ساڵە کۆمەڵانی خەڵکی لە ناو بازنەیەکی تەنگدا بە بەند کێشاوە باش دەناسم و لە تای ترازووی زانیاریی خۆمدا لەتەک یەکدا بەراوەردم کردوون. من ئەم کالّب* و بازنانە کە مێشک و بناغەکانی بڕوا و رامانی بە یەک بەستوتەوە لە ناو مێشکی خۆمدا شاکاندوومە و پێم ناوەتە ناو جیهانێکی نوێ. من دەمەوێت هەم رامانی خەڵک بروێنم و هەم شێوەی ژیانیشان بەرەو ڕێگەی پێشکەوتن و گەشەکردن بەرم. دەمەوێت شارستانیەت و نۆژەنکاری بەدی بێنم و فەلسەفەیەکی تازە بهێنمە ئاراوە کە لەتەک هۆش و هەست و ژیریی بگونجێت. من لەمەڕ ئەوە کە چۆن و بە چ چەشنێک، باوەڕ و دینێک کە توانایەکی ئاوای بێت، زۆر بیرم کردووەتەوە و ئەمەوێ بە یارمەتیی ڕاستی و دروست بیرکردنەوە و دروست هەڵسەنگاندن و زانست، ئەم ئایینە دابڕێژم و بە کۆمەڵانی بناسێنم و بۆ پەیڕەوکردنیشی هانیان بدەم":

ئەی ئەهۆرا..!

ئەمە لە تۆ دەپرسم،

بە دروستی بە من بێژە،

چییە ئەو ئایینەی تۆ،

کە بۆ مرۆڤ باشترینە و

هاوڕێ لەتەک ڕاستیدا،

مرۆڤ بەرەو پێش دەبات و

لە بەر تریفەی خۆباختکاریدا،

کارەکان بەرەو ڕاستی ڕێنوێنی دەکات؟

ئەی مەزدا..!

من بە خواست و زانستی خۆم،
بەرەو ئایینی تۆ ڕوو دەکەم.
گاتا، هاتی 44، سروودی 10

گەلۆ دەبێت لەگەڵ خراپەکاران دوژمنایەتی و لەتەک چاکەکاران دۆستایەتی پەیڕەو بکرێت؟ ناکرێت مرۆڤ بۆ سوود و بەرژەوەندیی خۆی، دەستێکی لەتەک چاکەکاران و دەستەکەی تری لە ناو دەستی خراپەکاران بێت؟ مرۆڤێک کە بە هیچ چتێک پابەند نەبێت و هیچ بیر و بڕوا و ئایینێکی نەبێت، وەک گیایەکی ناسک و نەرمە کە بایەک یاریی پێ دەکات و دەینوشتێنێتەوە و لەتەک هەرچی بشێ و نەشێ سازی دێت.

مەردمێکی زۆر هەن کە تەنها بۆ سوود و بەرژەوەندیی خۆیان و گەیشتن بە ماڵ و دارایی، جا لە هەر ڕێگەیەک بووە، بە پێویستیی بەرژەوەندیی ڕۆژ، خۆیان بە کەسێکی دارا و زەنگین دەگەیەنن و دەبن بە کارەکەری و مووچەی لێ دەخۆن. ئەمانە ئەگەر ڕۆژێک خودانکارەکەیان لە دەوڵەت و سامان کەوت، ئەوە ڕوو لە کەسێکی دیکە دەکەن و گۆرانی بە شان و باڵی یەکێکی دی دەڵێن. ئەمانە بە پێی سوود و بەرژەوەندی لە جێگای خۆیدا درۆ دەکەن و لە جێگایەک بە بەژن و باڵای زەلامێکی دەستەڵاتدار هەڵدەخوێنن و ستایشتی دەکەن و لە جێگایەکی تر ئەو قسەیە کە کردوویانە پێشێلی دەکەن و بەرپەرچی قسەی پێشوو دەدەنەوە. زەردەشت لەم کەسانە زۆر بێزار بوو و هەمیشە لەمانە دوورەپەرێز بوو. ئەمانەی بە خراوترین مرۆڤ دەزانی. زەردەشت دەیفەرموو: "ئاواتی من ئەوەیە کە گەلان چەشنێکیان لێ بێت کە لە بەر تیشکی پاکی و ڕاستی تەنها یەک ڕیگە بناسن، ئەوەش ڕێبازی ڕووناهی، ڕێبازێک کە ئەوان بەرەو سەرفەرازی و خۆشبەختی و شادمانی و رامشی* ڕاستەقینە دەبات".

ئەی ئەهۆرا..!

ئەمە لە تۆ دەپرسم،

بە دروستی بە من بێژە،

ئەو کەسانەی کە ئایینی تۆ فێر بوون،

لە بەهرەی پاکی خۆبەختکاری،

بەهرەمەند دەبن؟

ئەی مەزدا..!

بۆ ئەم کارە من یەکەم کەسم

کە لە لایەن تۆوە هەڵبژێردراوم و

لایەنگرانی ئایینی تۆم خۆش دەوێت و

هەموو ئەو کەسانەی کە پەیڕەوی درۆزنانن،

بە چەواشەکار دەیانناسم.

گاتا، هاتی 44، سروودی 11

زەردەشت لە بیری ئەوەدا بوو کە چەواشەکارانی ناپاک و زۆربێژانی خوێنمژ، بێجگە لە ئازار و زیان و ئاژاوە شتێکیان لە سەردا نییە و هەموو ئەندێشە و کرداریان بۆ ئەوە تەرخان دەکەن کە بە شێوەیەک زیان بە کەسانی دیکە بگەیەنن. بەڵام ئایا بەرامبەر بەمانە مرۆڤ بێدەنگ بێت و ئەوان بە ئارەزووی خۆیان، پیشەی خراپەیان وەک هەمیشە ئەنجام بدەن؟ یان پێویستە مرۆڤ بەرانبەر بەم گیانلەبەرە خراپەکارانە ڕابووەستێت و بە گژیاندا بچێت؟

مەخابن هەمیشە کۆمەڵێک بوون کە ستەم و ئازاری ئەمانە دەپەژرێنن و ملیان بۆ دائەنەوێنن، و لە ژێر سێوەری شووم و ناحەز و نەیاریی ئەمانە ژیانێکی پڕ لە کزی و داماوی و سەرلێشێوای و کەساسی و چەپەری دەکێشن و هەرگیز دەمی سکاڵا و گازندەیان لە ڕووی ئەم ستەمکارانە ناکەنەوە و بەرهەڵستیان نابن.

لەم خەڵکانە زۆر بوون و هەرگیز زەردەشت بێهەڵوێستی و ڕێبازی ئەمانەی پەسەند نەدەکرد. زەردەشت دەیویست مرۆڤ لە ئاستی مرۆڤ نەنووشتێتەوە. هیوادار بوو چۆن دارێک لق و پۆ و چەتری دەکەن و کێڵگە و زەوی و بێستان دەشێت لە گیای هەرزە و بێ بەهرە بژاری بکرێت و چۆن دەبێت جانەوەرانی زیانیخوروو لە نزیکی ژیانمان دوور بخرێنەوە، ئاواش لەتەک ستەمکارانی خوێنڕژیش دەبێت ڕاپەڕێیت. پێویستە مرۆڤ لە بەرانبەریاندا ڕابوەستێت، چونکە ملنان بۆ ستەم خۆی سووچێکە کە کەمتر لە ستەمکردن نییە و بوونی ستەمکێشە کە دەرگا بۆ دەستدرێژی ستەمکار ئاواڵە دەکات. دەبێت خراپە لەناو بچێت و لەتەک زۆربێژان و ملهوڕان بەربەرەکانێ بکرێت و کاریگەری و نەخشی ئەمانە لە ژیانی خەڵک، پەراوێز بکرێت. مرۆڤی چاک و پاک دەبێت هەنگاو بنێت بەرەو پێش و بۆ ڕەوشت و ژیانی خەڵک، سامان و هێمنی بێنێت.

ئەی ئەهۆرا..!<br>
ئەمە لە تۆ دەپرسم،<br>
بە دروستی بە من بێژە،<br>
لە ناو ئەو کەسانەی کە من دەیاندوێنم،<br>
چ کەسێک ڕاستکردار و<br>
چ کەسێک چەواشەکارە؟<br>
ڕوو لە چ کەسێک بکەم؟<br>
ئەوەی خراپەی بینیوە،<br>
یا ئەوەی کە بەرەو خراپە چووە؟<br>
چلۆن ئەو چەواشەکارە،<br>
بە خراپ نەژمێرم کە<br>
لە هەمبەر بەخششەکانی تۆ،

لەتەک مندا بەربەرەکانێ دەکات؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 12

زەردەشت لەتەک ئەو کەسانەی کە درۆ دەکەن و گوفتار و کرداریان وەک یەک نییە زۆر دژ بوو. ئەمانەی بەم جۆرە ناسی بوو کە ئیمرۆ چتێک دێژن و سەیزوو چتێکی تر و هەرگیز دوو وتەیان لەیەک ناچێت. ڕەواڵەتیان پاک و خاوێن و ڕازاوە، نەرم و نیان و دەم بەپێکەنینە، بەڵام دەروونیان وەک بیابانێکی وشک، وەک ئاوێکی گەنیو و پیس، وەک گۆڕێکی سارد و بێ گیان و وەک جەنگەڵێکی ئاڵۆز و تاریکە. لە بیر و ئەندێشەی ئەمانە تەنها زیان و خراپە و گەزەند دەوەشێتەوە و بێجگە لە گومان و کین و ئازار و دەرد و خەم و خەفەت و شین، هیچ سوود بەهرەیەکیان لێ ناوەشێەوە. ئەمانە وەک مارێکی ژەهراوی و کوشەندەن، کە کاتێک نزیکیان ببیتەوە و دەست ئەخەیتە ناو دەستیان لە یەک ساتدا پەلامارت دەدەن و ژاریان دەرێژنە ناو لەش و گیانت. گوتە و قسەیان هەموو فریوە و لە ژێر وتە بەتام و چێژەکانیان سەدان فرت و فێڵ و دوژمنی حەشاراوەتەوە. ئەمانە کاتێک پا دەخەنە ناو گۆڕەپانی ژیانی خەڵکی، دروشمیان ئاوەدانی و شادییە و ئەو کات دەستەکانیان دەکەوێتە کار، تەنیا وێرانی و خراپی و خەم و پرسە و شینیان لێ دەبینرێت. ئەمانە بە نەرمی و لەسەرخۆ ئاخافتن دەکەن و فرە هونەرمەندانە و زەبەردەستانە لە باشییەکان و چاکییەکان لاف و گەزاف دەدەن و لە هەمانکاتیشدا دڕندانە و بە تووڕەیی و بێ بەزیی، جەرگی مرۆڤ داخ دەکەن و هەناوی دەخۆن.

زەردەشت زۆر بە وردی و ژیرانە لە کردار و گوفتار و رامانیان شارەزا بوو و هەموو دەمێک تووشی دەردیسەری و ئاخ و ئۆف بوو لە دەست ئەو دڵڕەشانە و هەمیشە بە مەردمی ڕادەگەیاند کە دەبێت لە نزیکبوونەوە و هاوڕێیتی ئەمانە دووری بکەن:

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
چلۆن خۆمان لە درۆ دوور ڕابگرین؟
چلۆن پارێز بکەین
لەو کەسانەی کە سەرکێشن و
تێ ناکۆشن لەتەک ڕاستی پەیوەست بن و
ڕێڕەوی ڕێگا ڕاست ناکەن و
پەیجۆری ڕامانی پاک نین؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 13

ئاشکرایە کە کاتێک پارچە زەوییەک دەستی مرۆڤی نەگاتێ، پڕە لە چەندەها جۆر گیاکەڵە و گیای هەرز و درک و پووش و پەلاش و پووار و گیای وشک و داری گەندەڵ و پووکاو و هەروەها پڕە لە خڕە بەرد و پاشماوەی پیسی و چەپەڵی و پڕە لە جانەوەرانی زیانەخروو و مردارۆبوو. بەڵام کاتێک مرۆڤ سەرنجی باخێکیش دەدا، دەبینێت باخەوان هەموو شتەکانی لە شوێنی خۆیدا چاندووە و بە ڕێکوپێکی و لە سەر بیر و ڕامان نەخشەی بۆ کێشاوە. لەو جۆرە ڕەوەکە ناجۆرانە کە زیانیان هەیە بژاری کردووە و کراسێکی ڕەنگاوڕەنگ لە گوڵ و جوانی بە بەردا کردە. درەختی میوە لە شوێن و ڕێی خۆی چاندراون. جۆگەی ئاو بە چەشنێکی جوان لە کارێزەوە بەرەو ئەستێر ڕەوانە. چڤێکی* خۆشدەنگ و جوان خەریکی خوێندن و چریکاندنن. مرۆڤ کە بیر دەکاتەوە سەردەمێکیش ئەو باخە وەک دەشتێکی بێ سوود و دڕکستانێک بوو، بەڵام لە بەهرەی دەستی بە توانا و ئازموودەی باخەوان، ئەو دڕکستانە بووەتە باغستانێک.

زەردەشت ئەم نموونانەی بۆ خەڵک باس دەکرد تا مرۆڤ لە توانامەندی و وزەی خۆی باش ورد بێتەوە و پێی بزانێت کە دەتوانێت بە هەزاران جۆر لەو باخە بۆ ژینی نوێ دروست بکات و ئاسوودەش تێیدا بژێت و دوور لە کۆیلەتی و سەرشۆڕی و کارەکەری. دەیویست بە هەر جۆرێک بێت، خەڵکی لە چەواشەکاران و ستەمکاران دوور بخاتەوە و ڕێگای ڕاست بگرنە بەر. بە لای زەردەشت پرسیار ئەمە بوو کە ئایا کۆمەڵان ناتوانن ژیانیان بەم شێوەیە بێت؟ گەلۆ چەواشەکارانی ستەمگەر کە بێجگە لە زیان و کاولی و خراپی بۆ کۆمەڵان، هیچ بەرهەمێکی دیکەیان نییە، دەتوانن بێنە سەر ڕێگای ڕاست؟ بە بڕوای زەردەشت ئەمە لە دژوارترین و سەختترین کارەکان بوو و دەبوایەت ڕێگایەک بدۆزرێتەوە، بۆ ڕاهێنان و پەوەردەکردنی دەروون و ڕەوانی جڤاک* و درۆ بسپێردرێتە دەستی ڕاستی. بەڵام بە کام ڕێگا و چلۆن؟ "تەنیا فێرکردن و فێرکردن و ڕاهێنانی چاکی و پاکییە".

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
چلۆن درۆ بسپێرینە دەستی ڕاستی؟
تا بە فێرکردنی پەیامی پیرۆز و رامانبزوێنەری تۆ،
پاک ببێتەوە و
بەم چەشنە،
شکستێکی گران بە چەواشەکاران بگات و
فریو و ئازاری ئەوان لە ناو بچێت؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 14

بە بڕوای زەردەشت دوو سوپا بەرامبەر بە یەک ڕاوەستابوون. یەکێکیان ستەمگەر و دز و درۆزن و ڕێگر و ناپاک و دەستچەپەڵ، ئەوی دیکەیان سوپایەک کە بۆ بەرگریی خۆیان و تاراندن و دوورکردن و ڕاونانی ستەمگەرانی وێرانگەر دەجەنگیان. ئەم پرسیارە بۆ زەردەشت هاتبووە ئارایەوە کە بە ڕاستی کام یەک لەم دوو هێزە دەبێت سەرکەوتوو بن و ئەهۆرا مەزدا کە ترۆپکی هەستییە، یار و یاوەری کام لایە و لە چ ڕێگایەک و چۆن ستەمگەران و خوێنمژەکان وەدەر دەنێت؟ هەروەها هەوڵ و کۆششێکی فرەی دابوو کە مرۆڤی لادەر و بە هەڵەداچوو بگەڕێنێتەوە سەر ڕێگای ڕاستی و بەرگی تەمەڵی و داماوی لەبەر دابکەنێت. هەروەها ئەو مرۆڤانەشی باش ناسیوە کە بۆ سوود و بەرژەوەندی و ئارەزووەکانی خۆیان ئاگری ناکۆکی و دوودڵییان خۆش کردووە، بەڵام ئەمانەش خۆیان فەرمانبەری کەسانێکی دیکەن.

خەلک بە چەشنێک دەستەمۆ کرابوو کە وەک گیانلەبەرێکی فێرکراو بێجگە لە فەرمانێک وەریگرتبوو، هیچ کارێکی دییان نەدەتوانی بکەن. ئەم گیانلەبەرە دەسەمۆکراوانە هۆش و هزری خۆیان لێ ون ببوو و فەرمانڕەواکان بوون کە لە جێگای ئەوان بڕیاریان دەدا و بە سەر هەست و نەستیان فەرمانیان دەدا، و بۆ جێگایەک کە مەبەستیان ببوایەت، دەیانبردن. هیوا و ئارەزووی زەردەشت ڕزگاری ئەم خەڵکانە بوو و زۆر باش دەیزانی کە تەنها بە یارمەتی و سوود وەرگرتن لە بیر و ڕامانی پاک و فێرکردن و ڕاهێنانی گەلان، دەتوانرێت بەرەو ڕێگای ڕزگاری ڕابەرییان بکات. هێڤی زەردەشت ئەوە بوو کە ڕۆژێک پشت و پەنای خەڵک بێت. زەردەشت ئاوا تێگەیشتبوو یەکێک لە هۆکانی خراپەکاریی ئەم خەڵکانە، بێ پەناهییان بوو. زۆربەی ئەم خەڵکانە بە شێوەیەک هانا و پشتیوانی خۆیان لە دەست دابوو و بۆ دۆزینەوەی یار و خەمخوارێک، ڕوویان دەکردە دەستەڵاتدارێک، بۆیە گشت هەست و بیر و سامان و کەسایەتیی خۆیان دەسپاردە دەستیان.

زەردەشت ئارەزووی دەکرد کە بە ڕاهێنانی دروست ڕێگایەک بۆ خەڵکان دەستنیشان بکات، بەڵام چ ئارەزوویەکی مەزن:

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
کێیە ئەو داوەرەی،
کە لە بەر پرشنگی ڕاهێنانەکانی تۆدا،
بە سەرکەوتن دەگات و
دەبێتە هانای مەردم؟
ئەی مەزدا..!
ئەو ڕابەرە زانا و چارەسازەی ژیانە
بە من نیشان بدە و
سرووش و رامانی پاک،
بە ئەو یا هەر کەسی دی
کە ویستی تۆیە، خەڵات بکە.
گاتا، هاتی 44، سرودی 16

دلۆڤانی، ئەمە مێهر و دلۆڤانییە کە ژیان دەڕازێنێتەوە و پەیوەندی نێوان مرۆڤ بەهێزتر و توندتر دەکات و شادی و کامەرانی دەخاتە دڵی گەورە و پچووکەوە و خەم و خەفەت دەرەوێنێتەوە. مێهرە کە دڵەکان نەرم و دۆستایەتی و خۆشەویستی پتر و برادەری و هاوڕێتی بەدی دێنێت. بە پێچەوانە توورەیی و گرژی و مۆنی و کین و بەدبینی و بەدنیهادی جەستەی مرۆڤ دادەڕزێنێت و وێرانی و خەم و برسییەتی دەکات بە دەرگای ماڵاندا و زیندەگانی تاڵ و بێ تام

دەکات. جا ئەو مرۆڤانەی کە ئەم ڕەفتارە ناپەسەند و ناشیرین و ناجۆرانەیان تێدایە، وەکوو گورگ یان دڕندەیەکی کوشندەیان لێ دێت و تەنیا بیر لە کوشتن و بڕین و داپاچین و خوێنڕژتن دەکەنەوە.

زەردەشت مرۆڤی جۆراوجۆری زۆری بینیبوو، کە پێشتر دڵنەرم و مرۆڤدۆست بوون، بەڵام کاتێک رامان و بڕوایەک لە سەر بنەمای کوشتن و بڕین و ڕفاندنیان هەڵبژاردبوو، ئیدی ئەو مرۆڤانە بۆ گەیشتن بە ئارمانجی خۆیان بە چەشنی گورگیان لێهاتبوو. زەردەشت ویستوویەتی پەیامبەر سۆز و ئەڤین و مێهر بێت و ژەنگاوی دڵڕەقی و بێبەزەیی لە دڵیان پاک بکاتەوە و دەرگای ئازادی و سەربەستی و خۆشگوزەرانی لە ڕووی هەژاراند بخاتە سەر پشت و یەکسانی و دۆستایەتی و ئەوین بەدی بێنێت.

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
چلۆن بە ڕێنوێیی‌یەکانی تۆ،
هەست بە خۆشی و شادیی دلۆڤانیت بکەم و
بە تۆوە پەیوەند بم؟
ئەی مەزدا..!
چلۆن گوتەکانم بگاتە ناو دڵان و
بەو پەیامەی کە لە ڕاستییەوە سەرچاوە دەگرێت،
گەلان بەرەو گەشەکردن و جاویدانی ڕێنوێنی بکەم؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 17

زەردەشت هەمیشە لەو کەسانە نزیک بووەتەوە کە وزە و توانای دەروون و دەرەوەیان بە کار هێناوە بۆ کرداری باش و ڕەنگین و جوان و هەروەها ژیانیان ڕازاندوتەوە و خۆیانیان نەکردووەتە دەسکەلا و بەردەستی دەست و پاوەنی پیاوی نالەبار و ستەمکار. وەک ئەو باخەوانەی کە توانیبوو باخێکی خۆش و زەریف لە داری میوە و گوڵ و گوڵزار لە زەوییەکەی دروست بکات. وەستایانە خانوو و حەوشەی خۆی هەروەک ئەندازیارێک لە هەموو کەسێکی تر، دروستتر چێ بکات. کارێزەکەی خۆی هەڵی بکەنێت و لە هەر کارێزکەنێک بە تواناتر بێت. سەدان پەزی هەبێت و بۆ هەر مەڕێکی بە هۆی ڕەنگەکەیەوە، ناوێکی قەشنگی بۆ دیاری بکات. هەموو باخەکەی خۆی ئاوەدانی بکات. خۆی درەختەکانی هەڵبژێرێت و بیچێنێت و پەروەردەشی بکات. لە هەموو کارێکی دەستیدا وەستا و کارامە بێت وپێویستی ژیانی خۆی و خەڵکی تریش دابین بکات. گڵێم و ڕاخەرەکەی بۆ خۆی بیچنێت و کاری ئاسنگەری خۆی بیکات و یا بە تۆپەڵە گڵێک کاسەیەکی جوان چێ بکات. لە هونەریشدا لە هەر هونەرمەندێک بە هونەرتر بێت. سازی جوان بژەنێت و گۆرانی و سترانی خۆش بچڕێت و لە ئامێرەکانی مۆسیقا وەستایی هەبێت. زانستی سەردەمی خۆی فێر ببێت و لە هەر بوارێکدا قسەی بکردایە شارەزایەکی زۆری هەبووایەت.

نزیکبوونەوەی زەردەشت لەم جۆرە کەسانە تەنها بۆ ئەوە بووە کە بزانێت مرۆڤ تا چ ڕادەیەک بەتوانا و بەهێزە و توانای بە کارهێنانی دە هێزی دەر و ناڤەوەوە* هەیە. بە بڕوای زەردەشت لە مێشک و خێرەتی مرۆڤ دەریایەک وزە و هێز شاردراوەتەوە، کە ئەگەر مرۆڤ باش پەروەردەی بکات و بە کاری بهێنێت، هەموو کەس دەتوانێت وەک ئەو باخەوانەی لێ بێت. جا زەردەشت دەفەرمێت: "من ئەمەوێ هەموو هێز و توانا و وزەی لەش و جەستە و گیان و ڕەوان و ناخ و دەروونم وەکار کەفێت تا لە ڕێگەی ڕاستی تەرخانی بکەم، و من دەزانم کاتێک ئەم بەهرانە ڕوو لە مرۆڤ دەکات کە هەموو وزەکان بۆ یەک ڕێگە بێت، ئەوەش

ڕێگای ڕاستی، هەمان یاسای هەستی کە بە سەر گیانیشدا فەرمان دەدات. من ئەزانم ئەگەر ڕەوانم دروست بێت و پەیڕەوی ڕاستی بم و هەوڵیش بدەم هێزەکانی شاراوەی لەش و ڕەوانم ببزوێت، دەروازەی هێزە سروشتیەکانم لە لام ئاشکرا و لە سەر پشت دەبێت".

زەردەشت هێندێک پرسیار ئاراستەی خۆی دەکات: "گەلۆ ئارمانجی من لە وەدەستهێنانی ئەم هێزانە چییە؟ دەمەوێت ئەم وزەیە بۆ چ کەسانێک بە کار بهێنم؟ ئایا ویستم ئەوەیە کە حەز و ئاوات و ئارەزووی خۆم بهێنمە دی و خۆم بگەیەنمە ئامانجێک کە هەمە؟ هەرگیزاوهەرگیز، ئارمانجی من هەمان ئارمانجی هەستی یە، باڵاکردن و گەشەکردن و گەیینە، بەڵام من دەمەوێت هێزەکانی لەش و دەروونم ڕووناک و بەهێز و فراوان و تابان و بەدیهێنەر بێت تا هەمووی لە پێناوی مرۆڤایەتی و فێرکردن و پەروەردەکردن و گەیاندن و خۆشبەختیی مرۆڤ وەک چرایەک بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگایەکی تاریک و تەماوی بەکار بهێنم، من دەمەوێت وەرچەرخان ساز بێت".

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
چلۆن لە بەر تیشکی تریفەی ڕاستیدا،
دە هێزی دەر و ناوەوەی من،
بەدیهێنەر و توانامەند و داگرساو دەبن؟
ئەی مەزدا..!
چلۆن بکەم تا بەمانە (دە هێز)
بە گەشەکردن و جاویدان بوون بگەم و
منیش ئەم دووانە پێشکەشی کۆمەڵان بکەم؟

گاتا، هاتی 44، سروودی 18

(مەبەست لە دە هێزی دەرەوەوە و ناوەوەی مرۆڤ ئەمانەن: بیستن، بینین، چێژتن، بۆنکردن، هەستکردن، تواناMەندبوون، داهێنان، خێرابوون، تێگەیشتن، دووربین بوون یان پێشبینی کردن)

بە درێژایی دیرۆکی مرۆڤایەتی مەردمی نیازمەند و بێدەسەلات و پەککەوتە و گەدا هەبووە، بۆ پەیداکردنی پێداویستیی ژیانیان ڕوویان لە خاوەنی سامان و دارایی ناوە تا نانی سکیان بدەنێ و لە برساندا نەمرن، زۆریش لەو خاوەن دارایی و دەوڵەمەندانە، لە ڕووی هەژاران بێ بەزەیی و دڵڕەق ق چاوچنۆک و پیسکە و ڕژد و چرۆک و دەست قونجاو بوون.

زەردەشت لە ئەهۆرا مەزدا پرسیار دەکات: "ئایا سزای ئەو کەسانە کە لە ژیاندا ڕووی هەژاران دەشکێنن و دەستی یارمەتی و ئالیکارییان نادەنێ چییە؟" هەروەها دەفەرمێت: "ئەز ئاوات و دڵخواز و هێڤیی مەردم دەزانم، هەم لە ڕووی پێویستی و بژیوی ڕۆژانەوە و هەم لە ڕووی نیازی مینوویی و دەروونییانەوە و هەروەهاش دوایی و کۆتایی ئەو بەرچاوتەنگانە لە ئاکامدا. من ئەمەوێ کۆمەڵان هان بدەم، کە دەست لە بەرژەوەندیی تەسک و چاوچنۆکی و دەست قونجاویی هەڵگرن و دەستی هەژاران و نەداران بگرن و هەر کەسێک نیاز و پێویستییەکی هەبوو، لە لایەنی کەسانی دارا و زەنگین و ساماندار، یارمەتی بدرێت".

ئەی ئەهۆرا..!

ئەمە لە تۆ دەپرسم،

بە دروستی بە من بێژە،

ئەو کاتەی داماوێکی ڕاستگۆ،

دەچێتە لای کەسێکی زەنگین و

ئەو زەنگینە یارمەتی پێویستی پێ نادات،
سزای ئێستای ئەو مرۆڤە چییە؟
من باش ئاگاداری ئەو سزایەم،
کە پێی دەگات.
گاتا، هاتی 44، سروودی 19

پێش هاتنی دینی بەهدینی*، چەندەها دین و ئایینی جۆراجۆر هاتوون و لەناو چووبوون و هەر هەموویان بۆ خاپاندن و چەوساندنەوەی مرۆڤی هەژار بووە. نەیارانی سەرسەختی زەردەشت لەو سەردەمە کەرپانەکان و کاویەکان بوون. زەردەشت زۆر بە داخەوە بووە بۆ خەم و ئازار و دەرد و ڕەنجی پەیڕەوکەرانی ئەو ئایینانە. دەیفەرموو: " ئاخ! ئەم دێوپەرستانە چەند گێرەشێوێنن، چەند دەرد و ڕەنج و ئازاریان لە دەست دەکێشم. چۆن دەسەلاّتداری و ستەمگەریان وەک نەشتەر دەچەقێت بە دڵمدا..! ئەوانەی کە بە گەمژەکردنی بیر و رامانەکان و بە یارمەتی کەرپانەکان، جیهانیان پڕ لە دەرد و ئازار و ناخۆشی و تاڵی کردووە. ئاخ..! کە ئەم دڵپیسانە چەندێک ستەمیان بە سەر خەڵک سەپاندووە. ئەمانە کە سەرتاسەری ژیان و کار و ئەندێشەیان تەنها درۆ بووە و تەنها لە بیری پڕکردنی هەنبانەکەیان بوون و ساتێک لە بیری خەڵکی ڕەش و ڕووت و بەلەنگاز نەبوون و هەمیشەش وەکوو زالوو کاریان بەس خوێنمژین و هەوڵ بۆ وێرانی و کاڤلیی جیهان بووە. ئەمانە دەتوانن لە سەر بنیاتی ڕاستی و دروستی بۆ پێشکەوتن و ئاوەدانی و ئاشتیی گشتی تێ بکۆشن؟"

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
چلۆن ستایشتکارانی دێوان (دێڤیەسنایان)،

دەتوانن دەستەڵاتدارانێکی باش بن؟
ئەمانە کە
بە یارمەتی کەرپانەکان و کاوییەکان،
جیهانیان بەرەو ناخۆشی و نەفرەت کێشاوە و
گەلانیان بە ئاهوناڵە دەرهێناوە،
گەلۆ ئەمانە دەتوانن
لە سەر پایەی ڕاستی و دروستی،
بۆ پێشکەوتن و ئاوەدانی و
ئاشتی و ئاسایشتی گشتی تێ بکۆشن؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 20

لەو رۆژگارانەدا کە مرۆڤ نەیتوانیوە بە ئاسانی و ئاسوودەیی و بێ خەمی نانی ڕۆژانەی خۆی پەیا بکات، لەو ژیانە پڕ لە ئاشووب و ئاژاوە و جەنجاڵەدا، ڕێگەیەکی ڕۆشن بۆ خۆی بدۆزێتەوە و بیر و ئەندێشەی بە ژیرانە بە کار بهێنێت. لەبری جەنگ و کێشە و نەیارەتی ڕوو کاتە ئاوەدانی و کۆمەک و ئالیکاری بە هاوڕەگەزی خۆی بکات. زەردەشت باوەڕی ئاوا بوو کە هەر کەس بۆ ڕزگاربوون و گەیشتن بە خودای خۆی، یەک ڕێگا هەیە، ئەو ڕێگا، ڕێگای ئاوەدانی و بەهێزییە. ئاوەدانکردنەوەی خانوو و گوند و باژێر و وڵات بوو. بە نەرینی زەردەشت لە ڕێگەی باشکردنی بنەما و بنیاتی خێزانەوە گوند و شارەکان ئاوەدان دەبێت و لە دوایدا جڤاک و نیشتمانیش ئاوەدان و بەتوانا دەبێت. بۆیە زەردەشت پێی لە سەر زانابوون و پەروەردەکردنی جڤاک دادەگرت، بانگەوازی گەلانی بۆ ئەو ڕێگایە دەکرد کە لە ڕێگای ئاوەدانی و زانایی و باش بیرکردنەوە و بەهێزکردنی خۆیان و وڵاتەکەیان بکۆشن تا بەم شێوە بە مەزدا ئەهۆرا پەیوەست ببن. زەردەشت ئەمەی بە باشترین ڕێگای ڕزگاری و پەیوەندبوون بە خودا دەزانی.

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
ئایا کەسێک،
بە زانایی و بیرکردنەوەی ژیرانە،
بۆ پتربوون و پێشکەوتنی خانوو و گوند و شار یا وڵاتەکەی و
بۆ پەرەپێدانی ئایینی ڕاستی تێ بکوشێت،
بە خەڵاتی دیداری تۆ دەگات؟
کەی و چۆن ئەم ئارەزووەی دێتە دی؟
گاتا، هاتی 31، سروودی 16

لەو کاتەوە کە مرۆڤ لەدایک دەبێت تا دەگاتە تەمەنی بیرکردنەوە و هەست بە بوون و نەبوون دەکات، وەک پەپوولەیەکە کە هەمیشە باڵەفڕەیەتی، لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵەوە، دەیەوێت ئازاد بفڕێ و بژی، دوور بێت لە هەموو دەردەسەریەکانی زیندەگانی. کاتێکیش دەکەوێتە بیرکردنەوە و دابینکرنی نیاز و پێویستیەکانی ژیان، گەر فرە ژیر و وریا نەبێت دەکەوێتە جیهانی بێسەر و شوێنی خراپەوە و زیان بە خۆی و خەڵکی دی دەگەیەنێت و دەبێتە هۆی ماڵوێرانی و جەنگ و ستیز و نەگبەتی و لەدەستدانی ژیان کە گەورەترین بەهرەی خوداوەندی دلۆڤانە. هەروەها دەشتوانێت ژیانێکی ئاسوودە و پڕ لە شادی و کامەرانی بە دەست بهێنێت و لەتەک هاوڕێ و هاووڵاتیانی خۆیدا بە ئاشتی و ئازادی ژیان بەرێتە سەر و لەو بەهرە جوانەی پەروەردەگار کە "ژیان" بێت، سوود وەربگرێت. بۆیە ڕەوشت و کردەوەی هەر کەسێک چ باش و چ خراپ بێت، سەرئەنجام بۆ خۆی دەگەرێتەوە. لەو کاتە کە مرۆڤ لەدایک دەبێت، لاپەڕەی ژیانی دەکرێتەوە و هەر چی چاکە و خراپە بکات لە ناو دەفتەری ژیانیدا دەنووسرێت و کارنامەی بە

چاکە یا خراپە دەست پێ دەکات و دەبێت یەکێک لەم دوو ڕێگایە هەڵبژێرێت. لە هەڵسەنگاندنی ئەم کارنامەیەدایە کە لایەنگیرانی ڕاستی پاداشتی شایان و لایەنگەرانی درۆ و ستەم، سزای پێویست وەردەگرن.

ئەی مەزدا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم:
لە کارنامەی ژیانی مرۆڤ و
لە ئەنجامی
ئەو شتەی بەسەر چووە و
ئەو شتەی بەسەر دەچێت،
پاداشت و سزای لایەنگیرانی
ڕێگای ڕاستی و چەواشەیی چی دەبێت؟
گاتا، هاتی 31، سروودی 14

لە ڕوانگای هزری مرۆڤەوە چاکە و خراپە لایەنگیرانی خۆیانی هەیە و ژیان دەکەنە دوو کەرتەوە. یەکەمیان تەبایی و برایەتی و خۆشگوزەرانی دەکاتە یار و هەڤاڵی و جیهانی چواردەوریشی پێ دەڕازێنێتەوە، دووهەمیشان جەنگ و دوژمنایەتی و برسیەتی و کاڤلی لە جیهانی مرۆڤ بەدی دێنێت و دەیکاتە کەرەسەیەکی بێ بایەخ و گەشە بە بێچارەیی دەدات.
زەردەشت دەیزانی هەر کارە پاداشت و سزای خۆی هەیە، چ دەروونی بێت و یاخود گیانی. هەروەها دەیویست بزانێت سزای چەواشەکارێک کە جیهان بەرەو نابووتی دەکێشێنێت و یا ڕاستکردارێک کە ژیان بەرەو چاکی و خۆشی ڕێنوێنی دەکات چییە و چۆنە. سزای ڕێبەرێکی چاکەئەندێش و تێگەیشتوو و ڕێبەرێکی

گومڕێ و چەواشەکار کە ڕێگای خەڵکی دەتەنێت و دەبێتە کۆسپ و قۆرت لە بەردەم پەیڕەوانی ڕێگای ڕاست، چلۆن سزایەک دەبێت.

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
سزای کەسێک،
کە وزەی چەواشەکار پتر دەکات
چی دەبێت؟
کەسێک کە لە ژیاندا
بێجگە لە ئازاردانی ڕێبەرانی دروستکردار و
پەرەوازەکردنی ڕەنجبەران لە ئەوان،
کارێکی دیکەی لێ ناوەشێتەوە،
چ سزایەک دەبینێت؟
گاتا، هاتی 31، سروودی 15

# شەماڵەکردن* و تیرۆژی* رامان




دە ساڵ تێپەڕی، دە ساڵ لە ناو بیر و رامان ولێکوڵینەوە، تا سەرئەنجام کاتی پیرۆزو مەزنی دیرۆکی گەیشت. نزیکی دەمەوبەیان، پێش خوێندنی کەڵەشێر، زەردەشت خەونێکی سەیری بینی، زەردەشت لە خەونیدا لە لای ڕۆژئاواوەوە سوپایەکی جەنگخواز بەرەو ئەو هێرشیان دەهێنا. سەرداری لەشکرەکە هەمان جادووگەر بوو کە لە سەردەمی زارۆکیدا زۆر جار پیلانی کوشتنی ئەوی کێشابوو. سوپای جادووگەر هەموو پەیکەریان وەک مرۆڤ بوو بەڵام سەر و کەلەیان وەک گورگ بوو، شاڵاویان بەرەو زەردەشت دەهێنا. سوپای جادووگەر غاریاندا تا بگەنە نزیکی زەردەشتەوە، هێشتا نزیک نەبوونەوە کە لە لای ڕۆژهەڵاتەوە سوپایەکی دیکە پەیدا بوو. سوپاسالاری لەشکرەکە بەرگی سپیی پۆشی بوو. لە دەوری ڕوومەتی تیرۆژ و خەرمانەی ڕووناهی بوو. کاتێک سوپای تیشک و بڵێسە گەیشتنە نزیکی لەشکری جادووگەر، تیشکیان تاودا و بەرەو لەشکری جادووگەریان هاویشت و ماوەیەکی نەخایاند کە لەشکری جادووگەر تێکشکان

بڵاوەیان پێ هات و جادووگەریش پشکۆیەک نیشتە چاوی پیسی و لە سەر ئەسپەکەی گل بووەوە و تلیدا و گیانی ناپاکی دەرچوو.

زەردەشت بەم جۆرە لە ناو ڤاڵایی خەو و بێداریدا بوو کە سێبەرێک بە بەرگی سپی هاتە بەرچاوی، سەرتاپای وریشەی دەدا. بەڕێزەوە هەستایە سەر پێ و ڕووی کردە سێبەرەکە فەرمووی: "ئەی جوانی تریفەدار، لە تۆ قەشەنگتر و پاکتر و دڵڕفێنترم نەدیووە، بڵێ کێیت و لە کوێ هاتووی و چۆن بەرەو ئەم مێهرابە* کە بەس من ڕێگای دەزانم، ڕێگەت پەیدا کردووە؟" پەیکەرە تیشکدارەکە زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: "من وەهمەن ئەمێشەسپێنت*، (بەهمەن) ئەمێشەسپێنتی رامانی پاک. لە پەیکەر و جەوهەری تۆم و هاتم کە نهێنیی خەونێک کە دیوتە بۆتی بڵێم و هەروەهاش بتبەم بۆ دیداری داداری تاک و تەنیا. هەستە و بەرگی پاک و خاوێن لەبەر کە و ئامادە بە، ئەمەش مانای خەونەکەتە: "ئەی زەردەشت بزانە تۆ لە بارگای داداری پاک کە هەمان هێزی بەدیهێنەر و هۆش و خێرەتی بوونە، بە سەر دەکرێیتەوە و لە دادار و خێرەتی خۆت کە تیشکە و ترۆپکی خێرەتی گشتییە، هەموو نهێنییەکانی ئایین و دینی بەهدینی دەبیسیت و بە دڵ لە کارەکانت ئاگەدار ئەبیت. تۆ بە دەریایەک زانایی و ئەندێشە دەگەڕێتەوە بۆ ناو کۆمەڵان و دینی پاکی بەهدینی ئاشکرا دەکەیت و گوڵی ڕاستی لە ناو دڵی دڕکدا دەپشکوێنی. بە بڵاوبوون و پەرەگرتنی ئایینی تۆ، جادووگەران و خراپەکاران ناسرەون و بۆ جەنگ لەگەڵ تۆ پەشتوێنیان توندتر دەکەن. لە سەرەتادا کوڕی خاڵی خۆت میدیامانگ* ئایینی بەهدینی لە تۆ پەسەند و دەپژرێنێت و پاڵپشتی تۆ لە دژی جادووگەران دەکات. بەڵام زۆرداران و جادووگەرانی ناپاک لە بەرامبەری دلێری و پاڵەوانیی میدیا توانای ڕاوەستانیان نییە و هەڵدێن و خەڵکیش کە لە دینی ڕاستی و باشی بە ئاگا بوونەتەوە، دەسە دەسە دێنە ناو ئایینەکەت و دینی نوێت دەپژرێن."



ئینجا وەهمەن ئەمێشەسپێنت، ئەمێشەسپێنتی بیری چاکە لە زەردەشتی پرسی: "بە من بێژە کە کام و ئاواتی تۆ لەم جیهانە چییە؟" زەردەشت گوتی: "ئاوات و حەزی دڵی من، دۆزینەوەی ڕاستییە." وەهمەن ئەمێشەسپێنت گوتی: "کەوایە هەستە با بچینە لای داداری جیهان، خێرەتی سەرەکیی بوون و ئەو شتە کە کامی تۆیە لێی ببیستی." زەردەشت هەستا و وەهمەن ئەمێشەسپێنت گوتی: "دیدەکانت ببەستە." زەردەشت چاوی بەست و کتووپڕ هەستی کرد کە دڵی وەک باڵندەیەک لە ناو سینگی بەرەو ئاسمان هەڵدەفڕێ و کاتێک چاوی کردەوە خۆی لە ناو جیهانی مینەوی بینی، جیهانی ڕامان و خێرەت و هزری بێکەران.

زەردەشت چاوێکی بە دەوروبەری خۆی خشاند، هەر چییەکی دی، دەریای تیشک و شەوق بوو کە سەرتاسەری ئاسمانی گرتبوو. زەردەشت چووە پێشتر، تریفەی ڕووناهی و ڕۆشنایی و تیشک، مەزدا ئەهۆرا، خێرەتی سەرەکی بوون و هێزی ڕامانی ئافراندن لە بەرامبەری خۆی بینی. ئینجا زەردەشت دەستی کرد بە ئاخافتن: "ئەی مەزدا ئەهۆرای پاک و دلۆڤان..! بە من بێژە و تێمگەیەنە کە لە لای تۆ باشترین خەڵکان لە سەر زەوی کێن؟" سرووشی* مەزدا ئەهۆرا لە دڵی زەردەشت بەرسڤیدا: "باشترین کەس لە سەر زەویدا ئەو مرۆڤەیە کە ڕاستی نەشارێتەوە، چون بە هۆی ڕاستیەوەیە کە کۆمەڵان بەخشێنەر و ئازاددڵ و شاد

دەبن، پاشان دەبێت دڵیان مێهرەبان بێت، مێهرەبان بە ئاو و ئاگر و زەوی و هەوا و گیا و مرۆڤ و گیانلەبەران."

زەردەشت پرسی: ئەی مەزدا ئەهۆرا..! "خراپترین کەس لە سەر گۆی زەویدا کێیە؟" سرووشی مەزدا دووبارە وەڵامی دایەوە: "ئەو کەسە بە سەر چڤاکدا ستەم بکات و بیانخاتە ناو دەرد و ڕەنج و ئازار، جێگای ئەم کەسە لە ناو دۆژەیە* و ژینی ناخۆش و پڕ خراپە."

زەردەشت جارێکی دیکە لە داداری مەزنی پرسی: "چاکی و خراپی چییە و ڕێگای گەیشتن بەم دووانە چۆنە؟" سرووشی ئەهۆرا مەزدا وەڵامیدایەوە و فەرمووی:" هەرچی چاکی لە جیهاندایە لە بیر و رامانی پاک و هەرچی خراپەیە لە بیر و رامانی خراپە. شین و خەم و خەفەت و دەرد و ڕەنج و زیان لە رامانی خراپ و درۆ هەڵدەقوڵێت و هەموو چاکی و ڕێکی و جوانی و باشی و خۆشیەکان لە بیر و رامانی چاک و ڕاستی دەگرسێت. سزای خراپەکاران ژیانی ناخۆش و پاداشتی چاکەکردارانیش ژیانی خۆش."

زەردەشت دووبارە پرسیاری کرد:"ئەنجامی ستایشتی بەهدینان و چاکەکاران چییە؟" سرووشی دڵی بەرسڤیدا: "هەرچی ڕەخشان* و ڕۆشنییە لە فەڕ و ڕەخشانەوە دەبێتەوە، لە جیهاندا هیچ باشتر لە ڕۆشنی و ڕووناکی نییە. چاکە لە تیشک و خراپە لە تاریکی دەوەشێتەوە، لە هەر شوێنێک ڕۆشنایی هەبێت تاریکی ون دەبێت. ڕووناهی، زانایی و هزر و رامانی پاک پەروەردە دەکات و تاریکی، نەزانی و هەژاری و رامان و مێشکی بەستراو و دڵی ناپاک بەدی دێنێت."

پاشان دوو جیهان لە بەردەم زەردەشت ئاشکرا بوو، جیهانی رامانی پاک و جیهانی رامانی خراپ. لە جیهانی رامانی پاکدا، شەوق و جوانی و ڕێکوپێکی و ڕازاوی و هێمنی و شادمانی و پاکی و ئاوەدانی بوو و لە جیهانی رامانی خراپدا، تاریکی و تەنگی و ئاژاوە و سەرلێشێوایی و شیوەن و دەرد و ڕەنج و کاڤڵی بوو.

زەردەشت لە ناو بیرکردن و شیرۆڤەی ڕامانی خۆی بوو، کە ڕووناکییەک لە سووچێکەوە دەرکەوت و شەش پەیکەری درەخشان و تیشکدار بە نیشانەی شەش ئەمێشەسپێنت لە بەرامبەریدا ئاشکرا بوون. تاوێکی پێ نەچوو کە یەکێک ئەمێشەسپێنتەکان، ئەمێشەسپێنت وەهمەن، ئەمێشەسپێنتی ڕامانی پاک هاتە بەرەو ڕووی و لەتەک زەردەشت بەم جۆرێ دەستی کرد بە ئاخافتن: "داد و ئایینی من، ئاشتی و بیر و ڕامانی پاکە. بە کۆمەڵان بێژە: کین لە دڵ دەربکەن و جەنگخواز مەبن، خوو و ڕەوشتی ڕند و چاکەخواز بن، خراپ مەبن و لە گرد خراپەکاران مەگەڕێن، زانست فێر بن و پیشەی زانایان بگرنە بەر، پەرە بە چاند و فەرهەنگ و ئاوەز و فەرزانیی بدەن و ڕەوشتی خراو بنبڕ بکەن، لەگەڵ دوژمنان بە داد و ڕەوا هەڵسوکەوت بکەن، لەتەک دۆست و هەڤاڵ چاکە بکەن، بە باشی ئاگاداری چواپێیانی سوودمەند و بەهرەدار بن."



دوای ئەو ئەمێشەسپێنتی دووهەم، ئەمێشەسپێنت ئاشاوەهێشتا* (ئۆردیبەهشت) بەم چەشنە دەستی کرد بە ئاخاوتن: "داد و ئایینی من ئاشاوەهێشتا ئەمێشەسپێنت، ڕاستی و پاکییە. بە کۆمەڵان بێژە: دەروون و ڕووی (ناوەوە و دەرەوە) خۆیان هەمیشە پاک ڕاگرن، لە بوختان و ناپاکی خۆیان دوور بخەنەوە و

ستایشتی ڕاستی و پاکی بکەن، ڕێگای ڕاستی بپێون کە تاکە ڕێگە لە جیهاندا ڕێگای ڕاستییە، بە پاکی بیر بکەنەوە، وتە و شتی چاک بە زمانتانا بێژن و بە پاکی هەڵسوکەوت بکەن، لەتەک یەکتردا یەکدڵ و یەکزمان بن، لە درۆ و سوێند و فریو و جادوو دوور بن، ئاگر* لە گێتیدا نوێنەر و ڕەمزی ڕاستی و پاکی و خۆشەویستی و خاوێنییە، بیپارێزن بە لاشەی مردارۆبوو و شتی پیس ناپاکی مەکەن."

دوای ئەمێشەسپێنت ئاشاوەهێشتا، ئەمێشەسپێنت خشترەئێریە (شەهریوەر) دەستی کرد بە ئاخاوتن: "داد و ئایینی من خشترەئێریە ئەمێشەسپێنت، ئازایی و بەهێزی و ئەرکی ئەنجامهێنانی و بەرپرسیاری کار و سپاردە و خەباتە. بە گەلانیش ڕابگەیەنە کە بۆ گەورەیی و سەروەریی و زەنگینی و دەوڵەتمەندی و دەسترۆیشتوویی کۆشا بن، فەرمانبەری بەڕێوبەران و کارزانان و هەڵسوڕێنەرانی دادگەر بن و ڕێزیان بگرن، لە سەودا و فرۆشتندا دروستکاری پاشەکەوت بخەن، بۆ کارکردنیش کاری سوودگەیەنەر بۆ کۆمەڵ و خۆتان هەڵبژێرن و هەستی بەرپرسیاریتان بەرامبەر بە کارتان هەبێت، لە بێکاری و تەوەزەلی* و لەشگرانی و پارسکی کردن* دووری بکەن، حەز و هیوا و ئاواتی خەڵک پێشێل مەکەن و بەرچاوتەنگ و چاونژێر* مەبن، زێڕ و زێو و مس و مەفرەغ و پارە و دراوتان پاک ڕاگرن تا ژەنگ نەهێنێت و بە کار بێت."

ئینجا ئەمێشەسپێنت سپەنت ئارمەئیتی* (ئەسفەند) دەستی کرد بە قسەکردن: "داد و ئایینی من سپەنت ئارمەئیتی ئەمێشەسپێنت، لەخۆبووردن و مێهرەبانییە، لە لووتبەرزی و بایی بوون و فیز و لەخۆدەرچوون و هیوای فیرۆ و خۆپەسەندی و خۆویستی دووری بکەن، گەشبین و چاوپاک و بێ خەوش بن، کەس و کاری هەژار و نەدارتان بەلاوە شەرم و نەنگ نەبێت و لە داهاتی خۆتان یارمەتییان بدەن و داڵدەدەر و هاودەنگیان بن، لە بنیادنانی شوێنی سوودگەیەنەری گشتی پێشڕەو بن، وەک زەوی هێدی و لەسەرخۆ و ئارام بن، زەوی پاک و خاوێن و

ئاوەدان ڕاگرن، خۆتان لە پیسی و چەپەڵی و خوێن و مردوو دوور ڕابگرن و لە تێکڵاوبوونی ئەمانە بپارێزن، لاشەی مردارۆبوو لە جێگایەک بنێژن کە لە کێڵگە و زەوی و زار و ئاو و چۆم و ڕووبار و دەڕە و شیو دوور بێت، زەوی بکێڵن و باخ و ڕەز و دارستان ئاوەدان بکەن، چونکە زەوی سوودی فرە و لە ڕادەبەدری هەیە."

هەئورتات ئەمێشەسپێنت* (خۆرداد) وتاری خۆی ئاوا دەست پێ کرد: "داد و ئایینی من ئەمێشەسپێنت هەئورتات، شادی و ئاوەدانییە، جاڕ بدە بە گەلان دڵیان شاد و خوڕەم و لەشیان پاک ڕاگرن، پاکیی لەش، خاوێنی ڕەوان و گیانە، ناسوپاسی مەکەن و هەرگیز خەمبار و دڵتەنگ مەبن، بە چاوی چاکە ژیان و جیهان ببینن و بە دادی هەئورتات کەیفخۆش بن، دڵخۆش و بەدەماخ بن و هەوڵ بۆ جێکردن و ئاوەدانکردنەوە بدەن، ئاو کە هۆی پاقژی و ئاوەدانییە هەمیشە پاک ڕاگرن و هەرگیز بە لاشە و پیسی و مردارۆبوو ئالوودەی مەکەن، جل و بەرگتان لە ئاوی ڕەوان مەشۆرن، کارێز بکەنن و زەوی وشک ئاوەدان و بەهرەمەند بکەن، مەردم چاک بزانن کە ژیان و هێز و توانا و بەرگەگرتنیان لە ئاوە، ئاوە کە لەشی ئاژەڵ و گیا و گیانلەبەران زیندوو ڕادەگرێت و وڵاتیش تازە و سەرسەوز دەکاتەوە، پیسی مەکەن و خۆراک و خواردەمەنیی پاک و خاوێن بخۆن، چونکە خواردنی ناپاک لەش و گیان ناپاک دەکات."



لە کۆیاییشدا ئەمێشەسپێنت ئامەرتات* (ئامۆرداد) ئاوا دەستی کرد بە ئاخافتن: "داد و ئایینی من ئەمێشەسپێنت ئامەرتات، تەندروستی و تەمەندرێژییە، بە کۆمەڵان بڵێە لەشی خۆیان بەهێز و توانامەند ڕاگرن، لە درۆ و خراپە دووری بکەن، خانوو و جل و بەرگیان پاک ڕاگرن، زۆنگاو و ئاوی وێستاو وشک بکەن و لە جێگایدا کشتوکاڵ بکەن، دار و درەخت بچێنن و پەرەی پێ بدەن، بۆ لەدایکبوونی مناڵەکانتان، نەمام و داری بەردار و جوان بچێنن، بەر و میوەی کاڵ و نەگەیشتوو مەڕنن، تیمار و دەرمانی هەژاران بکەن و پەرەستار* و خەمخۆریان بن، ئاسایشی مرۆڤ و بوونی زیندەبەران لە ڕووان و سەوزبوونە. بەهدینان پشتوین* و کەمەربەند ببەستن. لە چوار گەوهەری ئاو و ئاگر و هەوا و خاک ڕێز بگرن و پیسی مەکەن، چونکە لەم چوار گەوهەرەیە کە لەشی هەموو گیانلەبەران بەدی هاتووە، شاگردان بۆ پەرەپێدانی ئایینی بەهدینی ئۆلی ڕاستی بکۆشن و کۆمەڵان ڕابهێنن کە تەنیا ڕێگای ڕاستی هەڵبژێرن."

زەردەشت هەروەها لە جیهانی مینوو گەشتی لێدەدا و لە شوێنی ئەمێشەسپێنتەکان دوور دەبوو، لە ناکاو هەستی بە شنەی بایەی فێنکی زۆزان و چیاکانی سەرزەمینی میدیای کرد کە ڕوومەتی ناز دەکێشا، دەنگی کەڵەشێری بیست کە مژدەی هەڵستنی رۆژێکی نوێی دەدا، دەنگی ئاشنای بارەباری مەڕ و فیکەی شوان و دەنگی زرنگەی زەنگۆڵەکانی ملی بزن و چێری گوند کە لە داوێنی چیا بوون. یەکەم پرووسکە و تیرۆژی خۆرشید لە سەر لووتکەی کێوی بینی، هەستی کرد لە سەر زەوییە و لە ناو مێحرابەکەی خۆیەتی و ئەو جیهانە مینووە کە بینیی، هەمان رامان و ئەندێشە و مێشکی خودی خۆی بوو.



گوڵی کێویی و خۆڕسک و ڕەنگاوڕەنگ و بۆنی خۆشی بەرزنگڵ*، چیاکانی زۆزانی مـیدیای داپوشیبوو، لە داوێنی چیا سنەوبەر و سپیئار* سەری ئاڵاندبووە یەک، شۆڕەبی و داری سنجوو کەناری قۆپی و مێرگەکان و درەختی میوەی جۆراجۆر کە بە ڕیز لە کەناری جۆگەی ئاو چاندرابوون، سروەی با سەرپەلەکانی دەلەراندەوە. لە لایەکەوە وەرزێرەکان خەریکی کێڵاندنی زەوی بوون و مەڕ و مانگا بە ئەسپایی خەریکی لەوەڕینی خۆیان بوون، پەڕەندەکان لە سەر چڵی دارەکان دەیانچریکاند و لەم چڵ بۆ ئەو چڵ دەفڕین. زەردەشت کە ئەم دیمەنە جوان و سرنجڕاکێشانەی دەدی، یادی ڕووداوەکانی شەوی ڕابردووی دەکرد کە لە ناو رامانی خۆیدا دیبوو و بیستبووی. لە پڕا جۆش و خرۆشێک کەوتە دڵی و ڕۆشنایيەک کەوتە مێشک و رامانی، ئارام دەستی دایە خامە* و دیتن و بیستن و گۆڕانکارییەکانی ئەندێشە و ڕەوان و مێشک و جۆششی دڵ و گیانیی بەمجۆرە نووسی:

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!

ئەو کاتە تۆم بە پاکی ناسی
کە ڕامانی پاک ڕووی کردە من و پرسیی:
تۆ کێیت و
لە چ خانەدانێکی؟
لە هەمبەر پرسیار و دوو دڵییەکانی ڕۆژانە،
لەمەڕ جیهان و خۆت،
چ ڕێگایەک هەڵدەبژێریت و
چ ڕێگایەک دەناسیت؟
گاتا، هاتی 43، سروودی 7

منیش بەم چەشنە بەرسیڤم دایەوە:
من زەردەشتم،
تا ئەو جێگایەی کە لە توانامدایە،
دوژمنی سەرسەختی درۆزنان و
پەنای بە هێزی ڕاستگۆیانم،
ئەی مەزدا..!
داواکارم، تا ئەو کاتە ستایشتگەر و درووودبێژی تۆم،
هەمیشە لە وزەی بێکەرانی تۆ،
بەهرەمەند بم.
گاتا، هاتی 43، سروودی 8

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کاتەی تۆم بە پاکی و پیرۆزی ناسی کە،
ڕامانی پاک ڕووی کردە من و پرسیی:

نوێژ بۆ کێ دەکەیت؟
وەرامم دایەوە:
بۆ تیشکی پیرۆز و ڕەخشەندەی مینووی مەزدا نوێژ دەکەم و
هەتا بڕست و توانام هەبێت
پشت بە ئایینی ڕاستی دەبستم.
گاتا، هاتی 43، سروودی 9

ئەی مەزدا..!
کەوایە بەرەو ڕاستیی دڵخوازم
ڕێنوێنیم بکە،
تا بە پەیڕەوکردنی،
پاکی ببینمەوە.
پرسیار و ئازموونی خۆتم ئاراستە بکە،
کە پرسیار و تاقی کردنەوەی تۆیە،
هێز و دلێری
بە ڕابەران دەبەخشێت.
گاتا، هاتی 43، سروودی 10

ئەی مەزدا..!
ئەو دەمە تۆم بە پاکی ناسی کە،
ڕامانی پاک ڕووی تێ کردم و
منیش لە گوتاری تۆوە فێر بووم و زانیم کە،
هەرچەندە پەرەپێدانی ئایینی تۆ،
لە ناو مەردۆم دژوارە،

بەڵام من ئەو شتە بە ئەنجام دەگەیەنم،
کە بە لای تۆوە باشترینە.
گاتا، هاتی 43، سرروودی 11

دوای ئەوە کە بە منت فەرموو،
بەرەو ڕاستی بڕۆم
تا زانا بم،
هەروەها تێ بکۆشم
سرووش لە دڵم دەنگ بداتەوە،
تا لە بەر تیشکی ڕۆشنایی ئەودا تێ بگەم
کە هەر دوو دەستەی چاکەکار و خراپەکار،
پاداش و سزای پێویست دەدرێن.
گاتا، هاتی 43، سرروودی 12

ئەی مەزدا..!
ئەو کاتە تۆم بە جوانی ناسی
کە رامانی پاک بەرەو ڕووی من هات و
منیش پێم گوت:
بۆ گەیشتن بە ئامانجم،
ئارەزووی ژیانێکی پڕتەمەن دەخوازم،
ئەو ژیانە دڵخوازە کە،
تەنها تۆ دەیبەخشی و
لە توانا و دەستەڵاتی تۆدایە.
گاتا، هاتی 43، سروددی 13

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کاتە تۆم بە ڕندی ناسی،
کە تۆم لە سەرەتای ژیاندا بینی،
زانیم کە بۆ گوفتار و کردار
پاداشتت دیاری کردووە.
چاکە بۆ چاکەکاران و
سزاش بۆ خراپەکاران.
ئەم دەستوورە
لە بەر پرشنگی زانست و هونەری تۆ،
تا ئەنجامی ئافراندن و کۆتایی ژیان
دەمێنێتەوە.
گاتا، هاتی 43، سروودی 5

ئەی مەزدا..!
ئەو کاتە تۆم بە پاکی و بە توانامەندی ناسی،
کە زانیم تۆ بە هێزی خۆت
خواستی ئێمە بە جێ دەهێنی،
سزا و پاداشتی
چەواشەکار و ڕندکاران دەدەیتەوە.
ئاواتەخوازم بەوتیشکە کە لە ڕاستی وزە دەگرێت
گەرما ببەخشیتە دڵەکانمان و
لە هەبوونی رامانی پاک
بێ بەهرەمان نەکەیت.

گاتا، هاتی 43، سروودی 4

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کاتە تۆم بە زەریفی ناسی،
کە رامانی پاک بەرەو ڕووی من هات و
منی فێر کرد کە،
باشترین ڕێگای گەشەکردنی مینوویی،
بیرکردنەوە لە ناو هێمنیدایە و
ڕابەر هەرگیز نابێت هەوڵی کەیفخۆشیی چەواشەکاران بدات،
چونکە هەمیشە ئەوان لە دژی ڕاستگۆیانن.
گاتا، هاتی 43، سروودی 15

کە وایە من،
وەک سروودبێژێک کە متمانەی بە ڕاستییە،
بە باشترین هزرەکان و
بە ئەوینی تۆ،
بەو جۆرە لە تۆ دەخوازیت،
داواکاری ڕابەریی جڤاکم.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
خواستم ئەویە:
بتبینم و ببم بە هەڤاڵی تۆ.
گاتا، هاتی 33، سروودی 6

کە وابێت،

بۆ ئەوەی بە نجامی کۆتایی بگەم،
بۆ ئەوەی تەمەنم درێژ بێت و
لە کۆشک و سەرای ڕامانی پاکدا بگرسێمەوە..
ئاوازی سرووشم پێ ببەخشە،
کە سەرتۆپی هەموو ئاوازەکانە،
هاریکارم بە و
ڕاستی و پاکی بکە بە پاڵپشتم..
تا بتوانم ڕێگای بەهدینی،
بەرەو بارەگای شکۆداری مەزدا ئەهۆرا بدوزمەوە.
گاتا، هاتی 33، سرووودی 5

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئاگادارم بکە،
تا لە ڕێگای ڕاستی و ڕامانی پاکەوە،
ئەو ئایینە هەڵبژێرم،
کە بۆ من باشترینە و
بتوانم لە پاداشتی شادیبەخشت
تێ بگەم و
ئەو شتەی کە ڕوو دەدات و
ڕوو نادات، ببینم.
گاتا، هاتی 31، سرووودی 5

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەی ڕاستی..!

به هۆنەری سروود و
بەستەی رامانبزوێنەری خۆتان،
به مێهرەبانییەوە ڕووی تێ بکەن و
یار و پشتیوانی بن،
تا ڕێنوێنی کۆمەڵان بکات
بۆ ڕێگای ڕووناکی.
گاتا، هاتی 50، سروودی 5

زەردەشت ئامادەیە
لەش و گیانی و
هەڵبژاردەی سرووده پیرۆزەکانی،
که هەڵقوڵیو له رامانی پاکیەتی
پێشکەشی مەزدا بکات.
هەروەها کردار و وتار و وریایی و
هەموو توانای مینوویی خۆی،
پێشکەشی راستی بکات.
گاتا، هاتی 33، سروودی 14

کاتێک که زەردەشت له جیهانی مینوو هاته دەرەوە، هزر و رامانی ڕوونتر و دڵی بەتینتر و بەشەوقتر له جاران بوو. هەست و سۆز و رامانێکی نوێ له دڵ و دەروونی زەردەشتدا بەدی هاتبوو. دەبوایه پەیامی ڕاست و پاکی خودای به کۆمەڵان جاڕ دایه. پەیامێک که گرساو له پرووسکەی رامانی پاک و وانەی ئەهۆرا مەزدا و ڕاهێنانەکانی ئەمێشەسپێنتەکان بوو. دەبێت ڕێگای ڕاستی و ڕێگای خێرەت و زانست به کۆمەڵان نیشان بدات و به دژی ستەمگەران و جادووگەران و

خراپەکاران ڕاپەڕێت و دەست و باوشی پڕتواناى بۆ یارمەتی کۆمەڵ ئاواڵە بکات. دەبێت مێهراو و چیا بە جێ بهێڵێت و بچێتە ناو خەڵکەوە و دەنگی دەرد و ڕەنج و ئاهیان ببیستێت. ئەو تێ گەیشتبوو کە ڕێگایەکی نوێ لە بەردەمی کراوەتەوێ و دەبێت هەنگاوی بۆ بنێت.

# گلە و گازندەی ڕەوانی جیهان

# و

# سەرەتای پەیامهێنەری



زەردەشت بڕیاری چارەساز و گرینگی خۆی دا و لە چیا هاتە خوارەوە و ڕووی کردە ناو خەڵک، هێشتا چەند هەنگاوی نەنابوو، کە لە دوورەوە دەنگێک بەر گوێی کەوت، دەنگێکی دڵتەزێن و خەمناک. سەیر بوو! هەر چی زیاتر دەچووە پێشەوە، ئاهوناڵە بەسۆزتر و ئاشکراتر دەبیسترا. زەردەشت ئاوا هەستی کرد کە هەمووی زەوی و گیا و گیانلەبەران و خەڵکێک کە لە سەر زەوی خەریکی کشت و کاڵ بوون، دەستیان بڵیند کردوەتەوە و دەپاڕێنەوە. لە پاڕانەوەی هەموویاندا دەردێکی نادیار هەبوو کە دڵی زەردەشتی ئازار دەدا. زەردەشت لە سەر تەلەسەنگێک، لە کەناری جۆگە ئاوێک لە ژێر درەختێک دانیشت و گوێی بە لاڵانەوەکە دا، گازندە و شیوەن و ناڵەی پڕخرۆشی ڕەوانی جیهان (گۆی زەوی) بوو:

ڕەوانیی جیهان لە لای ئێوە (ئەهۆرا مەزدا) گازندەی هەیە:
هاوار.... بۆچی منت ئافراند؟
کێ منی خستە ناو قاڵبی بوونەوە؟
ڕک و تووڕەیی و ستەم و دەستدرێژی و ڕووشی،
منی داگرتووە.
بێجگە لە تۆ پشت و پەنایەکم نییە،
فریادڕەسێکی دڵسۆزم،
پێ بناسێنە،
کە ڕزگارم بکات.
گاتا، هاتی 29، سروودی 1

"ئەرێ ئەمە ڕەوانی گۆی زەویە کە ئاوا دەناڵێنێ و دەنگی گازندەی بەرز بووەتەوە و لە ستەم و زۆرداری و دەستدرێژی و خوێنمژی و کین و رووشێک کە گەمارۆی دابوو بە بارەگای ئەهۆرا مەزدا گلەیی دەکات، ڕەوانی بوونەوەران و لە هەمووی بەرزتر گلەیی دڵتەزێنی ڕەوانی مرۆڤ بوو. زەردەشت هەر چی گوێ و بیری چڕتر دەکرد، فرەتر هاوار و داخ و خرۆش و شینی ڕەوانی جیهانی دەبیست:

"ئاخ لەم گشتە ستەمە..!
ئاخ لەم گشتە گەمژەیی و نەزانییە..!
ئاخ لەم گشتە خراپەکاری و ئازار و کینە..!
دەڵەی ژیان لەم جیهانە نفرین کراوە و بە ستەمەوە هەڵواسراوە،
گوێ لە هەر کوێ دەگری ناڵە و شین دەبیستی،
بە هەر لایەک دەڕوانی لاشەیەک دەبینی.

جاری وایە ئەم لاشە، لاشەی گیاندارێکە کە بۆ ڕەزامەندی خوداکان پێشکەش کراوە،

و زۆر جار تەرمی مرۆڤێک دەبینی کە خوا زەمینییەکان ژیانیان لێ ساندووە.

ئێواران لە کاتی ئاوابوونی ڕۆژدا،

بەد ڕەوشتەکانی گێل و نەزان،

لە خانووەکانیان دێنە دەرەوە،

لە گردی ئاگرێک کە دایانگرساندووە، لە ناو ئەشکەوتێکی تاریک کۆ دەبنەوە، ئینجا بە بۆنی گیایەکی تایبەت کە لە کاتی سووتاندا دووکەڵ دەکات، پێدەکەنن و سەرمەست شاد دەبن، باوەڕیان وایە کە نیاز و پەیامیان بەرەو ئاسمان وبەرەو خواکان دەچێت و ئاواز دەخوێنن.

ئینجا، شیرەی گیایەکی مەستیهێنەر دەنۆشن، سەرخۆش و بێخود،

بە دڵڕەقی و توندی،

ئاژەڵێک دەکوژن و خوێنی دەنۆشن،

و تا درەنگانێکی شەو لە گردی ئاگرەکە دەچەرخن و هەڵدەپەڕن،

و لە دوایدا بۆ خانووەکانیان دەگەڕێنەوە،

لە گەڕانەوەیاندا، هەژارانی برچی و بێ خانەومان و خەوتوو لە ناو کووچی و کۆڵانان و بە خەبەر دێنن و بۆ شادیی دڵی خۆیان ئەوان ئازار دەدەن و بە بیستنی دەنگی ناڵە و گریان و دیتنی فرمێسکیان پێدەکەنن و قاقای شادی لێدەدەن.

هەموو جێگایەک فەرتەنەی ڕک و گرژی و تووڕەییە،

لە لایەکەوە ڕکی دەوڵەمەندان لە هەژاران و لە لایەکی دی ڕکی نەداران و لانەوازان لە ستەمگەران و ساماندااران،

یەکێک بە ئەشکەنجە و ئازار و ستەم کەسێک دەکوژێت و کەسێکی دی ستەم و زۆر و ئەشکەنجە دەکێشێت.

هیچ توانای بەربەرەکانێشی نییە،
لە ناو لەش و گیانیدا،
ڕک لە سەر ڕک کۆ دەبێت،
ڕکێک کە دەڕوات ڕۆژێک وەک گڕکان بتەقێتەوە و بپژێت و هەموو تشتێک بکاتە ئاگر و دووکەڵ.
هەموو شوێنێک بۆنی بۆگەن و داڕزیاگی لێ دێت،
وتەکان هەمووی پڕوپووچ و هەڵیتوپڵیت و بێ گیانە،
کردارەکانیش هەمووی سەرسەری و ناهۆشمەندانە و دینانەیە*.
سۆمای ئەندێشە و ژیری کوژاوەتەوە،
ئاسۆیەک بۆ زانست و ژیری نابیندرێت کە ڕێگا بۆ کۆمەڵان بکاتەوە،
هیچ هزر و بیرێک، تیشکێکی لێ نادروشێتەوە تا بەر پێی کەسێک ڕوون بکاتەوە.
لە هەموو شوێنێک بێجگە لە تاریکی و وێرانی شتێکی دی بەدی ناکرێت.
لە دوورەوە هاوارێک بە گوێ گەیشت،
ئەم هاوارە هی کێیە؟
هی ڕێگرێکە کە سەر ڕێگای ڕێبوارێکی گرتووە و سامانی تاڵان دەکات و گیانی دەستێنێت؟
هی ستەمگەرێک کە گەرووی گیرکەوتووێک دەتاسێنێت؟
هی مشتی زۆردارێک لە سەر سینگی داماوێک دێتە خوارێ؟
هی زیندانییەکە کە لە بەندیخانە لە ژێر ئێش و ئازاری ئەشکەنجە دەناڵێنێت؟
هی خوێنی گەشی مانوویێکە کە لە سەر سینگی دەڕژێت، لەتەک دوایین ترپەی دڵ و دوایین هەناسەی و بینێک کە دێتە دەر؟
یان هی خانوویەکی دوورە، کە شەپڵاخەی گرانی پیاوێکی دڵپیس و ناپاک، کە دەیدات لە ڕوومەتی ژنێکی پاک و هەژار و سیابەخت، ئەی داخەکەم ئەم هاوارە هی کێیە؟

نە جارێک هاوار،

هاورا و هاوار.

بۆچی هەمیشە لە ڕووی ئەم، ئەو هاوارانە هەڵدەسێت؟



بۆچی ئەوەندە مرۆڤی دڕەندەخوو و ناپاک و بیرچەوت لە سەر گۆی زەوی زۆرن؟

بۆچی دەستی ئەم ستەمکارانە ئاوا بەربڵاو و ئاواڵایە لە سەر ژیانی هەژاراندا؟

بە ڕاستی چ نێوێک بۆ ئەم چەشنە ژیانە گونجاوە؟

چ شتێک ئەم گشتە توورەیی و خراپی و ستەم و ئازار و ڕک و تۆڵە و دەستدرێژی و بیری کوشتن و دزین، لە دڵ و گیان و مێشک و ئەندێشە و گوفتار و کرداری مرۆڤ جێگیر کردووە؟

ئەم دەستدرێژی و تالآن و چەپاوە بۆ چییە؟

بۆچی کۆمەڵان ناخوازن و ناتوانن بە دەستکەوتی خۆیان خۆشنوت بن و لە سایەیدا بە خۆشی بژین؟

بۆچی چاوی هەر کەسێک نیگەرانی خواست و دەسکەوتی ئەوی دیکەیە؟

بۆچی هزر و کرداری هەمووان لەم ڕێگادایە، کە چۆن و بە چ جۆرێک دەتوانرێت بە سەر خواست و بەهرەی مرۆڤێکی دی دەستدرێژی بکات و ویستی بدەزێت؟

بۆچی ساماندارن و دەسەڵاتداران هەرگیز تێربوونیان نییە و هەرچی تالآن و ڕاو ڕووت دەکەن، هەر بۆ دزین و دۆشینی گەل هەوڵیان فرەتر و چاوبرسیتر و زگبرسیتر دەبن؟

ئەم ترس و هەراسە چییە کە لەش و گیان و دڵی هەمووانی داگیر کردووە؟

نیگەرانی و ترسێک کە هەموو شادی و خۆشی و هیوا و ئاواتەکانی لە دڵاندا کوشتووە و هەموو پەیوەندییەکانی ناو کۆمەڵی بە ژەهری ڕەشبینی ئاڵۆز و تەڤلی یەک کردووە؟

نیگەرانی و ترسێک کە هەموو پیت و بەهرە و سوودمەندی و جوانیەکانی زەوی لە بەر چاوی کۆمەڵان شاردوەتەوە و لە جێگایدا خار و ژەهر و نەشتەر و شمشێر و بڕین و خوێن و ماندوویی و شەکەتی و مەرگیان جێگیر کردووە؟

بۆچی گەلان پابەندی سۆز و پەیمان و گفتی خۆیان نین؟

خەڵک لە کاتی بەستنی پەیمان لەتەک یەکتردا،

بە ڕووی سادە و ساکار و کراوە و خۆشگوفتار و دڵڕفێن دەوستن،

بەڵام لە کاتی کرداردا هەموویان وەک گورگ دڕ دەبن،

بێجگە لە دڕین و خواردن و بردن و دزین، هیچ بیرێکی دی لە مێشکیاندا بەدی ناکرێت.

لەم گێرە و کێشەی پەیمانشکێنی و بەدبینی و چەتە و تالآنی و نەزانیەدا، بێ پەنا و هەژار و دڵساف و ڕەش و ڕووت و بێدەسەڵاتان نابووت دەبن، بێ شەرمان و ملهوڕان و ستەمگەران و ساماندااران و ماستاوچیان و درۆزنان و فریوکاران و ناپاکان زاڵ و فەرمانڕەوا دەبن.

بە ڕاستی ئارمانجی زیندەگی چییە؟

بۆچی مرۆڤ ئافرێندراوە؟

گەلۆ ئارمانجی ئافراندن و ژیان ئەمە بووە کە مرۆڤ هەمیشە لە گۆمی ڕەنج و دەرد و ستەم و ئازار و ئەشکەنجە و خەم و شیندا بخنکێت؟

ئایا ژیانی گەلان هەتا کۆتایی دێت بەم چەشنە دەبێ؟

ئایا گشت ئەم ڕک و گرژی و ئازار و کین و ماڵوێرانی و خراپی ڕەنج و ستەمانە پایانێکی نییە؟

گەلۆ ڕێپیشاندەر و ڕزگارکەرێک نایەت کە یارمەتی خەڵک بدات و لەم ژیان و چارەنووسە ڕەش و تەماوییە و لەم دەرد و پەژارییە، ڕزگاریان بکات؟"



زەردەشت هەروەها کە گوێی بۆ هاوار و گازندەی ڕەوانی جیهان شل کردبوو، ڕووی کردە ناو باژێری شیز. لە شیز بوو کە ئاشکراتر و ڕوونتر هۆی هاوار و بانگهەڵدانی ڕەوانی جیهانی لە ڕەواڵەت و کرداری خەڵکی ناو شار بەدی کرد. باژێر خەمناک و خامۆش بوو. چێهرەی خەڵک گرژ و خەمبار و تورە و تاڵ بوون. لە ناو شاردا هەموو شتێک ڕەنگی تێکشێواوی و ئاڵۆزی دەدایە بەرچاو. ڕامان و گوفتار و کرداری خەڵک وەک مەستانی بێ ئاوەز بوو. وتەکانی خەڵک هەمووی بێ نرخ و بێ ڕێز بوو. وتارەکان لە ڕاستی دوور بوون و هەمووی پڕوپووچ و بێناوەرۆک و دڵشکێن و ئازاردەر و سست و بێپایە بوون.

خەڵکانی زانا و تێگەیشتوو هەموو دەستەوئەژنۆ و گۆشەگیر بوون لە چارەنووس و بەختی خۆیان و شارەکەیان و لە شێوەی ژیان و گوزەرانی خۆیان و ئەوانی دیکە ناڵان و غەمبار بوون. دز و خوێڕی و نەفام و گێل و گەوج و سەرشۆر و بێ ئاوەز و فریوکار و ستەمگەر و خراپەکار و درۆزن هەموویان خەریکی ڕابواردن و حەز و ئاواتیان بوون و توند و تۆڵ و چالاک ئەسپی کام و ئارەزوویان دەئاوژۆت.

لە ڕەواڵەتدا دەستەڵاتدار وەک مرۆڤ بوو، بەڵام دڵیان ڕەش، بە جلوبەرگی مەڕ و لەشیان وەک گورگ بوو. گورگان پەلاماری هەموو شوێنێکیان دەدا و خوێنیان دەڕشت. خراپی لە هەموو جێگایەک بڵاوەی کردبوو و ڕووت لە هەر کوێ کردبایە خراپەکارت ئەدی، هاوڕێیەتی کەسێکت بکردایە تووشی چەوتی و هەڵە و گومڕێیی دەکردی، کاتێک لەگەڵیدا بێەڤایەتی قسەی درۆی بۆ دەکردی و کاتێک لێی دوور بکەوتایەتی خەریکی دارِژتنی پیلانێک بوو بۆت.

جڤاک وەها لە خشتە دەر چووبوو کە لە ڕووبەڕوو هاوڕێ و تەبا و دڵسۆز بوون و لە پاشەملیش خۆسپیان* دەکردی. ئایین و ڕەوشت و داد، سست و لاواز بوو و نادروستی و درۆ و پیلان و گومڕێی، هەموو ئارمانج و ئایینیان ببوو. هەر کەس بۆ ڕێگای ڕاستی و دروستی و پاکی بڕۆیشتایە، دەکەوتە ناو شەرمەزاریەوە و هەر کەس ڕێگای نادروستی و درۆ و ناپاکی و دزیی بپێوایە بە سەرفەرازی دەگەیشت. لاوان و گەنجان بێ پەروا و ڕووش و بەدخوو بوون و ژنانیش نالەبار و ئاڵۆزی و لار، پیاوانیش سووک و چرووک و بەدڕەوشت. دەستی لاوان بۆ جوانمەردی و زمانی پیران بۆ ئامۆژگاری بەسترابوو. کەسێک دەستی کەسێکی دیکەی نەدەگرت و هەرکەسیش پەناهی بۆ کەسێکی دیکە ببردایە نائومێد و سەرشکست و ڕسوا دەگەڕایەوە.

خراپترین و ستەمگەرترین خەڵکان بۆ بەرپرسیاری و بەڕێوبەری کارەکان دابین کرابوون و خەڵکانی باشیش بێدەستەڵات و بەرکەنار دانرابوون. ڕەنج و خەمۆکی هەموو شوێنێکی داگرتبوو و هیچ لێوێک بە خەندە نەدەکرایەوە. جوانان و گەنجان بە هۆی هەژارییەوە توانای زەماوەنیان نەبوو و بە بێهاوسەر دەمانەوە و ئەمە دەبووە هۆی تەنهایی و بە هەڵەداچوون و بەرەو ڕێگەی چەوت و کرداری خراپەچوونیان. کاری سۆزمانی* زۆر بوو، برێک بەم پیشەیە ژیانێکی بەرز و پڕسوودیان دەست کەوتبوو. ڕواڵەتەکان ڕێکوپێک و ئاراستە، دەروون و ناوەرۆکەکان ئاڵۆز و چڵکن. فەرزانەکان خراپترین بەشی خەڵکان بوون و

خەڵکیش لە دەستیان ڕایان دەکرد. بە گشتی خەڵک خەریکی ستایشتی بت بوون و هەموو شتێک بۆ خەڵک بت بوو و گەورەترین و بەرزترین بتەکان بتی زێڕ بوو کە بە سەر هەموو چت و هەموو جێگایەکدا سێوەری خستبوو. ئاژی* زێڕ کۆکردنەوە و ڕاو و ڕووتکردن و ڕفاندنی بەرهەم و سوودەکان جێگری هەموو شتێک ببوو و دڵی خەڵکان لەم ڕێگەوە وەک شەوەزەنگ تاریک و ڕەوانیان چەوت و گومڕێ. هەموو چتێک کەم و ناوێزە بوو و هەمووش بە پلە و بە پەرۆشی پەیداکردنی شتی دەگمەن و نایافت. هەژاران و نەداران و ڕەشوڕووتان گرفتاری دەرد و ڕەنج ببوون و دڵی سوودپەرست و خوێنمژ و سەرمایەدار و ڕاوچیانی پیت و بەهرەی کۆمەڵ تێر نەدەبوو. ڕاستی و دروستی لە ناو داد و ستەددا* کۆکریابوو و کالاش* کەموکووڕ.



ژنان ئەرکی کەیبانوویی و دایکی و ماڵدارییان بە جێ هێشتبوو و سەریان کردبووە کاری ناحەز و نازەریف و ناپەسەند و سووک. خۆشەویستی و ئەڤین لە

دڵەکان ڕۆیشتبوو و لە جێگایدا تووڕەیی و توند و تیژی نیشتبوو. گێلی، دانایی دەرپەڕاندبوو و تاریکیش ڕۆشنایی و هەروەها بێ ئاوەزیش فەرزانەیی. جڤاک ئاڵۆز و نائارام بوون هەر شتێک بە ئاسانی دەیتوانی هەراسانیان بکات. داد و بەخشش و پەیمان و ڕادی سست ببوو و ڕاستیش کەم و کەمتر ببوو. جەشن و شادی و خۆشی فەرامۆش کرابوو، بە پێچەوانەش خەم و خەفەت و شین و زاری وەک شەوە خۆی بە سەر دڵەکان دابوو. داد و دادڕەسی سست و لەرزۆک، بێداد و ستەمیش پتەو و پایەدار بوو. لە کارەکاندا نادروست و ناڕەوایانە فەرمان دەدریا، بەرتیلیش شتێکی باوی لێ هاتبوو. خۆبەزلزانی و خۆپەرستی و من من گوتن لەش و دەروونی ژەهراوی کردبوو و دڵەکانیشی پڕ لە قین و قار کردبوو. کرداری ناشایست و گوناهی مەزن ئاسایی ببوو، شەرم و شکۆفەکردن لە کاری خراپە نەمابوو. درۆ و دەلەسە و خۆڵتەکاری* و زمانلووسی و ستایشی ناڕەوا بۆ وەرگرتنی پایەبەرزی و مەزناهی و دەبدەبەیی، هەڵوێست و زمانی خەڵکانی چەپەڵ کردبوو. هەراس و نیگەرانی بە سەر لەش و گیانی هەمووواندا زاڵ ببوو. مرۆڤی پاک کەساس و کەنەفت و کلۆڵ بوو، ناپاکیش بەڕێز و خۆشەویست بەشکۆ و پلەمەند ببوو. میران ستەمکار و دەوڵەمەندان خوێنمژ و چاوچنۆک، فەرزانەکان بەرچاوتەنگ، هەژارانی تەنگەستیش درۆزن، پیران نابەکار و بێکەڵک، کچان سووک و بێ ئاوەز، کوڕانیش بێشەرم و شکۆف بوون. خەڵک ڕووی لە دانش نەدەکرد و زانایان کەم و دانشیش پێشل کرابوو. کشتوکاڵ و کار ڕوو لە کزی بوو و جوتیارانیش کێڵگەکانیان بەجێ هێشتبوو و زەوی و زاریش وێرانە.

زەردەشت هەروەها بە ناو شاردا دەسووڕایەوە و گلە و گازنجی ڕەوانی جیهانی دەبیبیست و کرداری ناحەز و ناشیرینی خەڵکانی دەبینی. جادووگەران و خراپەکارانی ناپاک و تاوانبار کە فەڕ و شکۆی زەردەشتیان دیبوو و دەیانزانی کە بە پەرەگرتنی بیر و رامانی زەردەشت، ژیانی پیس و ناپاکیان کۆتایی پێدێت،

بۆیە هاتنە سەر ئەو بیرە کە دەرفەتێک پەیدا بکەن و لە ناوی ببەن. سەرۆکی جادووگەران هەڕەشەی لە زەردەشت کرد و گوتی: "هۆرەکانت شاراوە ڕاگرە و بۆ کەسی مەخوێنەوە ئەگینا ئاگری تێ بەردەدەین و بشزانە هۆرەکانت کاریگەریەکی نییە لە سەر جادووەکانی ئێمە."

کاتێک زەردەشتی پاک ئەم هەڕەشانەی لەو ناژیری بێئاوەزانە دەیبیست بە بزەی لێوەوە پێی دەگوتن: "بێنە پێش با جوان گوێتان لێ بێت." زەردەشت بە بانگێکی بەرز و ئاوازێکی پڕخرۆش و بە تەمورە سروودی بۆ دەخوێندنەوە جادووگەرانیش کاتێک گوفتاری زەردەشتیان دەبیست لەرز دەکەوتە لەش و گیانیان و لە ترسان هەڵدەهاتن و دوور دەکەوتنەوە. زەردەشت لە ناو بیری گوتە و هەڕەشەی جادووگەران و دواپین گوتەی ڕەوانی جیهان بوو 'ئایا ڕزگارکەرێک نایەت کە گەلان یارمەتی بدات و..' کە ئاوازێکی خۆشی لە جیهانی مینوو و لە کانگای دڵیەوە هەستا":

ئینجا،
کردگاری جیهان (ئەهۆرا مەزدا) لە ڕاستی پرسیی:
ڕابەری تۆ لە جیهاندا کێیە،
تا ئێمە ببینە یاوەر و پشتیوانی و
توانای ئاوەدانکردنەوەی جیهانی پێ ببەخشین؟
دەخوازی چ کەسێک سەرداری جیهان بێت،
تا ڕک و ئازاری چەواشەکاران تێک بشکێنێت؟
گاتا، هاتی 29، سروودی 2

زەردەشت ئاوازەکەی بیست و ئاخفتنەکەی بۆ ئاشنا بوو. وتووێژی ئەهۆرا مەزدا، گەوهەری هەستی* لەتەک ئەمێشەسپێنت ئاشاوهێشتا نیگابانی ڕاستی و

هەنجاری بوون بوو. مەزدا ئەهۆرا لە ئەمێشەسپێنت ئاشاوهێشتا دەیویست کە تا ڕابەر و سەردارێک بناسێنێت کە بەرسڤی گلەیی و خرۆشی ڕەوانی جیهانی بدات و بۆ یارمەتی ئەو بچێت و زۆر و ستەم و کین و ئازاری نەزانەکان، تێک بشکێنێت. زەردەشت لە بارەی ئەم گفتوگۆ قووڵە بیری دەکردەوە کە لە بەرزایی تەپۆڵکێک، پەیکەرێک کە سەرتاپای تیشک دایگرتبوو مەشخەڵ بەدەست هات بۆ دیداری، پەیکەرەکە بە ئارامی بەرەوەڕووی زەردەشت هاتە بەرەو، زەردەشتیش پەیکەرە تیشکدارەکەی ناسی. ئەمێشەسپێنت ئاشاوهێشتا، پەیکەری هەنجاری هەستی و هەنجاری ڕەوان بوو کە لە جیهانی مینوو دیبووی و لەتەکیدا گفتوگۆی کردبوو. ئەمێشەسپێنت ئاشاوهێشتا بە زەردەشتی فەرموو: "هاواری خرۆش و گازندەیی ڕەوانی جیهانی بیست و لە پەیڤینی مەزدا ئەهۆراش لەگەڵ منیش تێگەیشتی؟

من گلەیی و پرسیارەکانی ڕەوانی جیهان کە لە بارەی دەرد و ڕەنجەکانی خۆی و کۆمەڵان بوو، بیستم و لە پرسیاری تۆش لە بارەی چۆنیەتی و چارەی دەرمانی ئەم دەردانە تێگەیشتم و ئێستا لە بەرسڤدا دەڵێم، دەرمان هەمانە کە لە جیهانی مینوو بیستت. هەمووی ئەم شپرزی و شێواوی و دەرد و ئاڵۆزاوی و ستەم و ناڕاستییانە کە لە ژیانی جڤاک دەبینرێت، چاوکانیەکەی لەوێوەیە کە جڤاک پایە و هەنجاری بوون، واتە ڕاستی پێشێل دەکات و بە خاپاندن و ناڕاستی کە مایە و سەرچاوەی هەموو خراپییەکانە، ڕوو دەکات و ئەمە هۆی هەموو ئەم خرۆش و گازندەی ڕەوانی جیهانەیە. هەروەها کە بیستت ئەهۆرا مەزدا لە من، کە نیگابانی ڕاستیم، دەیەوێت کە ڕابەر و سەردارێک بۆ جیهان دەستنیشان بکەم، تا توندی و ئازاری بێ ئاوەزەکان تێک بشکێنێت و ڕەنج و ستەم لە زیندەگانی و ژیانی گەلان هەڵماڵێت. ئێستا لە دوای ئەم قسانە کە لە جیهانی مینوودا لە زمانی من بیستت، دەخوازم زۆرتر لە ڕاز و و نهێنیی ڕاستی و تەکووزی هەستی ئاگادارت بکەم، تا بزانی بۆچی ئەهۆرا مەزدا بۆ بەدیهێنانی خۆشی و شادمانی و پاک

کرنەوەی دەرد و ستەم لە ژیانیان و پەیداکردنی ڕێبەر و سەردارێک کە توانای ئەم کارەی ببێت لە منی دەوێت. ئێستا بە وردی گوێم بۆ بگرە:

هەستی بە واتەی گشتی، لە گەشەکردن و باڵاکێشان و نەوێستان و گەڕیاندایە. گەوهەری هەستی لە ناو ئەم واتانە، جاویدانییە و هەمیشەش لە چەشنێک بە چەشنێکی دیکە دەگۆڕێت. بە سەر ئەم گەشەکردن و باڵاکردن و گەیین و تێپەڕیین و کەم و زۆربوون و زایین و مردنی دیاردەکانی ئافەرینش، زاگۆنێکی تەکووز و جاویدان و نەپساو فەرمان دەدات. ئەوەش زاگۆنی ڕاستی، کە هەنجاری هەستییە. ڕاستییە کە دروست دەکات و دەیزایەنێت و دەشیمرێنێت، دەیکاتەوە و دەیبەستێت، پەروەردەی دەکات و دەیژاکێنێت، دروستی دەکات و دەیشکێنێت، دەیهێنێت و دەشیبات، دەیئاخنێت* و بڵاویشی دەکات، ڕاستی فەرمانڕەوای بوونە و ئەوە کە بوون بە هەموو پێواژۆکان و چەشنەکانی ئاڵوگۆڕی چۆنیەتیەکان و وەرچەرخان و گۆڕانکاریەکانی لە ژێر فەرماندایە. ژیانی گەلان لە ژێر بەربستی ڕاستیدایە و ئەمە ڕاستییە کە شێوە و چەشنەکانی جۆراجۆر بە ژیان دەبەخشێت. بەڵام ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە، گەلۆ لە ژیانی خەڵکانی ئەم باژێرە کە تۆ بینیت، ستەم و بێداد، تاڵان و چەپاو، توندی و دەستدێژی، گرژی و قاروقین، کوشتن و ڕفاندن، قاچاندن و بە بەندکێشان، لەتەک ڕێکی و سازیی و پوختی و پاکی، ڕاستی دەگونجێت، یاکوو ناڕێکی و ناسازی و شاشی لەتەکیدایە؟

بەرسڤی ئەم پرسە ڕوونە. ئەگەر ڕاستی سازکەرە، ئەگەر ڕاستی بوونە، ئەگەر ڕاستی هەنجارە، ئەگەر لە هەستیدا هیچ شتێک ناهەنجار و ناتەکووز و بێکەمایەسی و ناساز نییە و هەرچی هەیە هەنجار و ڕێکوپێکی و پوختییە، ئەگەر ڕاستی نابووتکەر و تێکدەری هەموو ناڕێکی و ناپوختیەکانە، کە وابوو هەر چەشنێک ناسازگاری لە ژیانی گەلان، وەک ستەم و کوشتن و گرژی و قین و قار و ئازار و دەستدێژی و تاڵان و خراپەکاری، ناسازگار و ناڕێکە لەتەک هەنجاری

ڕاستی و دەبێت لەناو بچێت. باشە ئەم کارە چۆن دەکرێت؟ لە گەڕیان و گەشەکردن کە فەرمانڕەوایە بە سەر ژیانی کۆمەڵاندا، ئەو گەڕیان و گەشەکردنەی کە هزر و رامانی مرۆڤ پەروەردە دەکات بۆ لەناوبردنی ڕێڕەوە* کۆنەکانی کۆمەڵگا، کە بوونیان بە سەر چووە، هەڵیاندەتەکێنێت و ڕێڕەوی نوێی دروستکەر، جێگیریان دەکات." ئەمێشەسپێنت ئاشاوهێشتا پاشان ڕووی کردە زەردەشت و گوتی: "ئیسە زانیت کە بۆچی ئەهۆرا مەزدا، کە ترۆپکی خێرەتی بەرز و گشتی بوونە و پەیکەری تیشک و ڕەوانی ڕاستییە، لە کاتی ناڵە و گازندەی ڕەوانی جیهان لە ستەم و بێدادی، ڕووی کردە من ویستی ڕابەرێک بناسێنم کە بتوانێت ستەم و بێدادی بێدادگەران تێک بشکێنێت و جیهان ئاوەدان بکات و ڕاستی پەرە پێ بدات؟"

ئیسە بە تۆ دەڵێم: "ئەو ڕابەرە کە بتوانێت بۆ ئەم کارە مەزنە هەستێت، کەسێکە کە گەڕیین و گۆڕانی زەمان هەست پێ بکات و تێ بگات و بە رامانی پەروەردەکراو و خێرەتی زۆڵاڵ، پەیامی سەردەم و چارەساز وەربگرێت و بە کۆمەڵانی ڕابگەیەنێت. سەبارەت بە پرسیاری ئەهۆرا مەزدا و ناساندنی ڕابەر و سەرۆکێک بۆ کۆتایی پێهێنانی ئازار و ڕەنجی گەلان، دەڵێم ئەو کەسە من نیم، ئەو کەسە وەهمەنە، رامانی پاکە کە توانای وەڵامی ئەم پرسیارەی هەیە. لەم ڕووەوەیە کە لە بەرسڤی ئەهۆرا مەزدا کە دەیەوێت سەردار و ڕابەرێک بۆ ئامۆژگاری و ڕێنوێنی کۆمەڵان بناسێنم، دەبێژم:

ڕاستی بەرسڤی دایەوە و گوتی:
کەسێکی ئاوا ناناسم،
کە ئازار بە ڕووی جهانەوە نەهێڵت و
یارمەتیدەری ڕندکاران بێت لە هەمبەری خراپەکاران.
بێگومان ئەو کەسە دەبێت،

لە ناو کۆمەڵگادا مێهرەبان و
لە هەموو کەسێک بە تواناتر بێت،
تا ئالیکاریی بکەین.
گاتا، هاتی 29، سروودی 3

ئەمێشەسپێنتی ڕاستی، ئەمەی گوت و بەم جۆرە درێژەی بە قسەکانی دا:

بێگومان مەزدا ئەهۆرا،
لە هەموو کەسێک باشتر ئاگادارە،
کە پەیڕەوانی خودایانی درۆ (دێڤ پەرستان و بت پەرستان)،
لە ڕابردوو چییان کردووە و
لە ئایەندەشدا چی دەکەن،
تەنها مەزدا ئەهۆرا داوەرە،
کەوایە، هەر چی ئەو بیەوێت هەر بەدی دێت.
گاتا، هاتی 29، سروودی 4

من و ڕەوانی ئافەرینشت،
بە ڕێز و دەستی بەرزکراوەوە،
ستایشتی ئەهۆرا دەکەین،
لە ئەو داواکارین
کە لە ئالی چەواشەکاران و نەیارانەوە
گەزەند بە پاکان و ڕابەرەکەیان نەگات.
گاتا، هاتی 29، سروودی 5

ئەمێشەسپێنتی ڕاستی ئەم سروودانەی خوێند و بێدەنگ بوو. هەمدیسان سەر گردەکە ڕۆشن بوەوە و لە ناو ڕۆشنایەکەدا پەیکەرێ پەیدا بوو و ڕووی کردە زەردەشت. زەردەشت کە لە پەیکەرەکەی ڕوانی، زۆر بۆی ئاشنا بوو. پەیکەرەکە نزیکتر بووەوە و زەردەشت لە یەک ساتدا شەوەکەی بە یاد هاتەوە کە ئەمێشەسپێنت وەهمەن، ڕامانی پاک هات و ئەوی برد بۆ جیهانی مینوو.

پاشان،
مەزدا ئەهۆرا،
کە هۆنینەوە و هۆرەی ژیان،
لە دانایی ئەوە، گوتی:
ئایا تۆ سەردار و ڕابەرێکی پاک و شایستە ناناسی؟
مەگەر تۆ بۆ ئاگاداری و پاراستنی جیهان
هەڵبژاردەی پەروەردەگار نیت؟
گاتا، هاتی 29، سروودی 6

مەزدا ئەهۆرا ترۆپکی زانایی هەستی، ئەم پرسیارەی کرد و ئەمێشەسپێنت وەهمەن، ڕامانی پاک لە وەڵامیدا فەرمووی: "ڕابەرێک کە لەم پێڤاژۆی زەمەندا دەبێ ڕاپەڕێت و فەرمانی ڕاستی بە کار ببەستێت، دەبێت پەیکەر و جەوهەری خواست و ویستی سازکەری سەردەمی خۆی بێت. لەتەک خراپی و ستەم بجەنگێت و بۆ نەوژەنی و سازکەری خەبات بکات. دڵێکی پاک و دوور لە درۆی بێت. پڕ لە مێهرەبانی و ڕاستی بۆ جیهانی هەبێت. بە هێز و توانای ڕامان و هۆشی خۆی وەرچەرخان دروست بکات و چەواشەکاری و بێداد لە ناو ببات و هەوڵ بۆ هاتنە سەر کاری چاکەکاران و دادگەران بدات. ڕامانی پڕتوانا و پڕبڕیار و خوو و ڕەوشتیشی پایەدار و ڕاوەستاو بێت.

لەتەک خەڵکی چاک و دروستکردار پەیوەندیی نزیک و گەرمی هەبێت و پەیمانداریش بێت و لەو پەیوەندییانە، وەها هێز و توانایەکی بەدەست هێنابێت، کە بەرزتری لە هەمووانی کردبێت. ئەگەر ڕابەرێکی ئاوا بە ڕامانی ڕۆشن و سازکەر و دڵی پاک و مێهرەبان و هاویار و هاودڵ لەگەڵ کۆمەڵ بەدی بێت، بێگومان هێزەکانی ئافراندن و ڕاستی و گەیین و گەڕیان و سازکەری، بۆ یارمەتی دێن و بە سەر نەیار و دوژمناندا زاڵی دەکەن. لەم هەل و مەرجەی زەماندا، ڕابەرێکی ئاوا، دەبێت بەدی بێت و بە دڵنیایی بەدیش دێت. ئەمە فەرمانی ڕاستی و هەنجار و یاسای گەیین و گەشەکردن و باڵاکردنە."

وەهمەن ئەمێشەسپێنت بەم چەشنەی گوت و ئینجا بە ڕوویەکی شادومانەوە ڕووی کردە ئاسمان:

تەنیا کەسێک کە من بیناسم و
گوێ لە ڕاهێنانی ئێمە بگرێت
زەردەشت ئەسپێتمانە،
تەنیا ئەوە کە دەیەوێت،
ڕاهێنانەکانی ئایینی ڕاستی و
سروودی ستایشتی مەزدا
بە کۆمەڵان ڕابگەیەنێت.
کە وابێت،
ئێمەش پەیڤی شیرین و دڵپەسەنی گوفتار،
هەر بۆ ئەو ڕەوا دەبینین.
گاتا، هاتی 29، سروودی 8

ئەم گوفتارە پیرۆزەی،

ڕامان دەخرۆشێنێت و شادی دەهێنێت،
لە پەروەردەگارێکەوەیە،
کە خواستی لەتەک ڕاستیدا یەکسانە.
مەزدا ئەهۆرا،
پاکانی فێر کردووە،
بۆ ئاوەدانی و پێشکەوتنی جیهان.
ئەی ڕامانی پاک..!
کێیە ئە فریادڕەسەی کە لایەنگری تۆ بێت و
بە ڕاستی هاریکاری خەڵک بێت؟
گاتا، هاتی 29، سروودی 7

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
لە ڕێگای ڕاستی و ڕامانی پاکدا،
هێز و توانایان پێ ببەخشە (زەردەشت و یارانی)
تا جیهانێکی پڕ لە ئاوەدانی و ئاسایش،
بەدی بێنن.
ئەی مەزدا..!
من (ڕەوانی ئافرینشت) ئەو
بە بەرزترین ئافەریدەی تۆ دادەنێم.
گاتا، هاتی 29، سروودی 10

بەم چەشنە بویەری گەورەی مرۆڤایەتی و دیرۆکی ڕوویدا.
ئەمێشەسپێنت وەهمەن پەیامی ئەهۆرا مەزدای گەیاند و زەردەشت بەم چەشنە بۆ ڕزگاری ڕەوانی جیهان لە دەرد و ڕەنج و زۆرداری و دڵڕەقی و ئازار و ستەم،

بۆ پەیامبەری هەڵبژێردرا. بەڵام ڕەوانی جیهان دوودڵ بوو. ئایا بە ڕاستی زەردەشت لە خەباتی خۆی سەرکەوتوو دەبێت و ئایا کەسێک کە هێزی شان و ملی و هێزی چەکدار و لەشکری نییە، دەتوانێت لەگەڵ سوپای زۆر و گەورەی نەیاران، کە هەموو شوێن و جێگایەکیان لە ژێر چاوەدێری و دەستەڵاتدایە، بجەنگێت؟

ڕەوانی جیهان لە ئەندێشەی ڕووناک و پڕبار و خێرەتی گەورەی زەردەشت ئاگادار بوو. ڕەوانی جیهان زەردەشتی لە بەرزترین سنووری زانست و هۆش و داناییدا دەدی، بەڵام دەشیزانی کە ژیانی گەلان بە بێ هێز و توانای ئەنبووژەنی* ناگۆڕدرێت. ڕەوانی جیهان، ڤالآیی سەرسووڕهێنەر بوو کە تاکە کەسێک توانای ئەوەی هەبێت جەنگ لەتەک سوپای گەورەی ستەمەگەران و جادووگەران و بکات.

پاشان،
ڕەوانی جیهان دوبارە بانگی هەڵدا و گوتی:
ئایا دەبێت من پشتیوانی پیاوێکی بێتوانا
بپەژرێنم و گوێی بۆ ڕاگرم؟
بە ڕاستی ئارەزوومەندی سەردارێکی بەتوانا بووم.
کەی کەسێکی ئاوا،
بە دەستانی پڕتوانای خۆی،
یارمەتیی من دەدات؟
گاتا، هاتی 29، سروودی 9

ئەهۆرا مەزدا ترۆپکی خێرەتی هەستی، کاتێک دوودڵیی جیهانی بینی ئەوی لە توانامەندیەکانی زەردەشت دڵنیا و ئاگادار کرد. لە زمانی پاراو و شیوا و دڵپەسەن و گەرم و ڕاوەستاو، لە بەڵێن و گفتی، لە گوتاری هزربزوێنەر و پیرۆزی

کە لە دەمی دەردێت وەک تیشکی ڕۆژ بۆ جڤاک گەرمی و ڕووناکی دەبەخشێت و ئەوان بەرەو جیهانی پاکی و سەرفەرازی هاندەدات. لە ناو وتاری زەردەشتدا دەریایەک هەست و سۆز و پاڵپێوەنان و هۆش و ژیری و ئاوەز و زانست هەبوو. کاتێک کە کۆمەڵ سرووده نەمر و جاویدانییەکانی زەردەشتیان دەبیست، دەکەوتنە ناو بیرکردنەوە و دڵ و گیانیان دەکەوتە فڕین و پەرکێشان و رامان ئاوەزیان ڕێگای گەشەکردن و ڕۆشنایی دەگرتە بەر و بۆ ناسین و زانین و دەستخستن بەتواناتر دەبوون، و ئەمەش ئارمانج و هیوای زەردەشت بوو.



زەردەشت هەرگیز بڕوای خۆی بە زەبروزەنگ و توندی و زۆرەملی بە سەر مێشکی خەڵک نەدەسەپاند. کاری مەزنی زەردەشت تەنیا ورووژاندن و هاندان و گاڵدانی رامانەکان بوو و لەم ڕێگاوە بوو کە مەروم قسەی ئەویان دەبیست و خۆیان

بیریان دەکردەوە و لێی دەکۆڵینەوە و هەوڵیاندەدا و خۆیان هەنگاویان بۆ ڕێگای ڕاستی و زانست و دانایی و وریابوونەوە دەنا. هەر ئەو وتارە پیرۆز و ئەندێشەبزوێنەرانەی زەردەشت بوو کە لە مەودایەکی کەمدا بزاڤ و گەشەکردنێکی دەریاوێنەی لە ناو کۆمەڵگادا بەدیهێنا و زەمینەسازی شۆرشی مەزنی مێژووی مرۆڤایەتیی لە مەزرۆ بۆتان (میتسوپاتامیا) چێ کرد، بزاڤێک بۆ لەناوبردنی بێدادی و ستەم و نادانی و تاریکی و بەدیهێنانی ئازادی و داد و یەکسانی و دانایی و ڕووناکی.

# سەرەتای دەست پێکردنی جەنگ



زەردەشت پێی نایە ناو ئاوەردگای* جەنگ، جەنگ لەتەک تاریکی، ناحەزی، درۆ، ستەم، وێرانی و بێدادی و هەروەها دامەزراندنی ڕاستی، داد، تیشک، جوانی و سازکەری. بەڵام لە هەمان گاڤی یەکەمی کارزاری* نەبەرددا، لە هەمبەر خۆی دەریایەک دژواری و ئاستەنگی بینی. بەڵام ئەم دەریا تۆفانی و پڕ لە شەپۆلی سامناکە، نەیتوانی ترس و هەراس بخاتە ناو دڵی زەردەشتەوە و هەروەها بیخاتە ناو دوودڵی بۆ بەئەنجام نەگەیاندنی خەبات و ئەرکی پیرۆز و مەزنی. بە هەمان چەشن کە زەردەشت ڕۆژێک ڕووی کردە چیا و مێهراوی گۆشەگیری بۆ تێگەیشتن

و ناسین و چۆنیەتی و کردنەوەی گرێ کوێرەکانی ژیان و هەستی بە گشتی، ئیمرۆش باش دەیزانی کە خەباتی گەورە خۆی لەتەک تاریکی، نەزانی و ستەم، لە ئاگایی و زانیین دەست پێدەکات، لە ئاگادارکردن، وریاکردن و بەخەبەرهێنانی مێشک و خێرەتی خەفتوو و پاککردنەوەی ژەنگاوی دێرینەی نەزانی لە هزر و رامانی کۆمەڵان. چاکیش دەیزانی کە پێش لە هەر چتێک و هەر کارێک، دەبێت کۆمەڵان هۆشیار بکاتەوە. وریا و ئاگادار لەو بڕوایانەی کە هەیانە و لەو باوەڕانەی کە دەبێت بیانبێت. دەشێت سستی و بێپایەیی و بێبناغەیی بڕواکانیان پێ نیشان بدات و باوەڕێک کە لە سەر کۆڵەکە و ستوونی زانست و رامان و ژیری دامەزرابێت پێیان بناسێنێت. دەبێت ژیانی ڕاستی و ئەهۆرایی و ژیانێک کە خێرەت و رامانی پاک و ڕاستی، پایە و بنچینەیەتی، بە کۆمەڵان فێر بکات و پێیان بێژێت و هۆشیار و وریایان بکاتەوە کە ژیانی ئێستایان چییە و چۆن و تا چ ئەندازە و ڕادەیەک لە ژیانی ڕاستی و دروستی دوورن.

دەبێت کۆمەڵان ڕابهێنرێن و بزانن کە لە چ دۆژەیەکدا دەژین و سازکەران ئەم دۆژەیە کێن و لە چێکردنی ئەم دۆژەیەدا چ سوودێک دەبینن. هەروەهاش دەبێت لە بەرامبەر ئاشکراکردنی ئەم دۆژەیە، ئەو ژیانەشیان بۆ ئاشکرا بێت کە ژیانێک هەیە تەنیا لە مێهرەبانی و خۆشەویستی و ئازادی و داد و ڕاستیەوە هەڵدەقوڵێت. دەبێت هەوڵ بدرێت کە زەریفی و ناسکیی دیمەنەکانی ئەو ژیانە بێتە بەر چاویان و فێر بکرێن کە ژیان جوان و بێهاوتا و خۆشە، بەو مەرجە کە ئازادی و ڕۆشنایی و پاکی و ڕاستی هەبێت، کشتوکاڵ و سەرسەوزی و شادی و خوڕەمی هەبێت، داد و دادوەری هەبێت. دەبێ کۆمەڵان تێ بگەن کە کۆیلەتی، ستەم و دزین، تاڵان، درۆ، داگیرکاری، دەستدرێژی، کوشتن و بڕین، هەمیشەیی نییە و ڕۆژێک دەبێت لە ناو بچن و ئاسایش و ئاشتی سەقامگیر بێت. مەردوم پێویستە ڕوو بکاتە بیر و بۆچوون و رامانی ڕوون و دروست و سازکار و و بە بڕوایەکی پتەو و ڕاوەستاو لەتەک خراپییەکان دژایەتی و خەبات بکات و خۆیان

بە شتی پاک و چاک نزیک بکەنەوە. مرۆڤ دەتوانێت بەو ئاستەی هۆشیارییە بگات، تەنیا پێویستە بە هێزی گەڕیین و گەیین و توانامەندی خۆی بڕوای تەواو پەیدا بکاتەوە. ئەگەر زانا بێت و بەم زانینەی خۆی پابەند و پایەدار بێت و بڕوای هەبێت کە تای ترازووی دادی فەرمانڕەوا بە سەر بوون و ژیاندا، بێ هیچ کەموکووڕی هەموو شتێک دەڕژێنێتە ناو تای ترازووی زەمەن، هەڵیدەسەنگێنێت و لەیەکی دەدات و لە کۆتایی بڕیاری چارەسازی خۆی دەدات و بە کاریشی دێنێت. ئەگەر خەڵک ئەم زاگۆن و دەستوورە پۆڵایانەی زاڵ بە سەر هەستی و ژیاندا بزانێت و بۆ گەیشتن بە ئارمانجی خۆیان بە دڵ و گیان تێ بکۆشن، بێگومان لە کار و خەباتی مەزنی خۆیدا سەرکەوتوو دەبێت و ئەو مەشخەڵ و چرایە کە ڕابەر و ڕابەریی بۆیانی داگرساندووە، دەبێتە هەتاوی هەتاهەتایی و هەمیشە ڕووناکیان. گەلان دەبێت هۆشیار ببنەوە، هۆشیار و زانا لە ڕابردوو، هۆشیار و زانا لە ئێستا و هۆشیار و زانا لە داهاتوو. زانا لە داوەری و پێواندن و هەڵسەنگاندنی ترۆپکی هۆشیاری هەستی و هێزی ئافەرینش. زانا و هۆشیار لە داوەری و بڕیاری ڕاستەقینە و دروستیی هەڵسەنگاندنی ترۆپکی هۆشیاری هەستی و هێزی ئافراندن.

ستەمگەران و چەواشەکاران و جادووگەران و میران کەوتبوونە جموجۆڵ، ترس لە دڵەکانیان نیشتبوو. ئەوانەی کە تا دوێنێ وەک پۆڵا ڕاوەستاو و پتەو دەبینران و وەک زەمان فەرمانڕەوایی و شکۆمەندی خۆیان بە هەمیشەیی دەزانی، ئێستا بە چاوێکی نیگەران و دڵێکی لەرزۆک و هەراسان، وەرچەرخان گۆڕانکاریەکانی دەوروبەری خۆیان دەدی. دەبینن و تێدەگەن کە ئەو نەمامانە کە لە بەر تیشکی ڕووناکی گوفتار و هزر و ژیری زەردەشت، قەتماخە و قوری سەخت و توندی بڕواکانی کۆنیان دەشکێنن و سەر دەردێنن و بە لەزوبەز چەکەرە دەکەن و باڵا دەکێشن و دەپشکۆێن و بە پێچەوانەش داری بڕواکانی کۆنیان پووچەڵ و هەڵۆڵ دەبن و لە ناودا دەپەرتووکن و دادەڕزن و دەشکێن و دەکەون. ئەوان دەبینن و

تێدەگەن کە لە هەر شوێنێک بێت بیروبۆچوونەکانی زەردەشت، پاکان و ڕاستان بۆ لایەنی خۆی ڕادەکێشێت و دەیانخاتە رامان و جوولان و گەشەکردن و خەبات و بەرخۆدان. ئەوان دەبینن و تێدەگەن کە هەرچی زەمان تێپەڕ دەبێت، توانا و هێزیان کەمتر دەبێت و توانای پاکان و چاکان و بەهدینان خورتتر و فرەتر دەبێت. بۆیە کەوتنە ئەندێشەی لەناوبردنی زەردەشت و یارانی. سەیرە! سەیرە تا دوێنێ زەردەشت و هەموو هاوڕێیانیان بە هیچ و کەم دەزانی و گاڵتە و سووکییان پێ دەکردن، بەڵام ئیسە شەو و ڕۆژ ئارمیان لێبڕاوە و بەردەوام لە بیری لەناوبردنی زەردەشت و یارانین. زەردەشت وەک خۆر دەدرەوشایەوە و وەک هەتاو بە هەر شوێنێک پێی دەنا، هزر و دڵ و گیان و مێشکی خەڵکی گەرم و ڕوون دەکردەوە و بیر و مێشک و گوفتار و کرداریانی بۆ ڕێگەی ڕاست هاندەدا و هەروەها ئەوانی لە ستەمگەران و جادووگەرانی فریوکار دوور دەخستەوە و شالوودەی ژیانی ستەمگەرانی سست و بێپایە دەکرد. زەردەشت لە بەرامبەری بەرەی نەیار و کۆیلەدار و درۆزن و جادووگەر ڕادەوەستێت و بە دلێری و ڕاشکاوی هۆرەی گڕئاویی دەخوێند:

ئەی بەدئاوەزان..!
هەمووتان و ئەوانەش کە بە خیرەسەری
ستایشتان دەکەن،
هەموو ئەو کردارە دوو ڕووانەتان،
لە درۆ و خۆویستییەوە سەرچاوە هەڵدەگرن،
بۆیە ناوتان لە هەفت شارردا*
بە بەدناوی و خراپەیی
زڕاوە.
گاتا، هاتی 32، سروودی 3

ئەی چەواشەهزران..!
رامانی کۆمەڵتان
ئاوەها پەریشان کردووە و شڵەژاندووە،
کە خراپترین هەڵسوکەوت دەکەن،
لە رامانی پاک دووری دەکەن و
ڕوو لە دۆستایەتی خراپەکاران دەکەن و
لە هزری ئەهۆرایی و
ڕاستی و پاکی ڕادەکەن.
گاتا، هاتی 32، سروودی 4

ئەی بەدئاوەزان..!
ئێوە بەم چەشنە،
جڤاکتان خاپاند
بە کرداری گومڕێیانە،
بە رامان و گوفتار و کرداری نالەبارانە و
مژدەی سەروەری و مەزنی،
ئەوانتان لە ژیانێکی خۆش و
بەختەوەرانە بێبەهرە کرد.
گاتا، هاتی 32، سروودی 5

لەوانەیە تاوانبارێک،
بە کرداری ناشیرینی خۆی،
بە سەرکەوتنێک بگات و ناودار ببێت،

بەڵام ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
تۆ کە هەموو شتێک لە یاد دەمێنێت،
لە باشترین ڕامان ئاگاداری و
دەشزانی کە لە ئەنجامدا،
لە بەر تیشکی شکۆداری تۆدا،
ئایینی ڕاستی فەرمانڕەوا دەبێت.
گاتا، هاتی 32، سروودی 6

هیچ یەک لەم تاوانبارانە،
لە مانای پڕنرخی کار و گەشەسەندنەکەی،
ناگەن،
مەگەر ژیان بە ئەزموونی تاوێنەری خۆی
فێریان بکات.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
تۆ باشتر لە هەموو کەس
لە ئاکامی ئەم کەسانە ئاگاداریت.
گاتا، هاتی 32، سروودی 7

بێجگە لە جادووگەران دوو دەستەی دیکەش هەبوون کە دوژمنایەتی زەردەشتیان دەکرد، ئەمانەش کەرپانەکان و کاویەکان بوون. زەردەشت لە هەمان کاتدا کە لەتەک جادووگەران لە بەربەرەکانێدا بوو، لەگەڵ ئەم دوو دەستەی تریشدا خەریکی جەنگ بوو. کەرپانەکان فەرمانڕەوای باوەڕ و مێشکی کۆمەڵان بوون، کاویەکانیش فەرمانڕەوای ژیان و ڕامیاری و ئابووریان. دوو هێزی چەوسێنەر و تەواوکەری یەکدی کە دەستڕەنجی گەلانیان هەڵدەلووشی. کەرپانەکان

بەڕێوبەرانی ئایینی ڕۆژپەرستی بوون. لەم ئایینە هەتاو و تیشک کە بە مێهر دەناسرا، لەتەک دیاردەکانی دیکەی جیهانیان بە خودا دەزانی. کەرپانەکان بە هێندێک وڕینە کە بەردەوام بۆ ڕۆژ و یەزدانەکان دەیانخوێند و بە چەشنی جۆراوجۆر ستایشتیان بەرپا دەکرد و ترسی خواکانیان دەچاندە ناخی دڵی کۆمەڵانەوە، تا لەم ڕێگەیەوە ئاسانتر بتوانن بە مەبەستە سوودپەرستانەکانیان بگەن و دەستەڵاتداریی خۆیان هەمیشەیی و پابەرجێ ڕاگرن. ئەو خودا ڕەنگاوڕەنگانە کە کەرپانەکان لە ناو مێشک و باوەڕی گەلیان دەسەپاند و بەردەوام بۆ جێگیربوون و ڕیشەدارکردنی کۆششیان دەکرد ئەمانە بوون:



میترا* یا مێهر خوای مەزن، هەزار چاو و هەزار گوێی هەبوو. میترا هەموو بەیانییەک سواری گەردوونەکەی دەبوو، چوار ئەسپی شەوقدار گەردوونەکەیان ڕادەکێشا و لە قەد چیا هەرە بەرزەکانەوە دەردەکەوت و بە گورزی سەد گرێ و سەد دەمی تیژ کە لە زێڕی سەخت ساز کرابوو، دەچوو بۆ جەنگی دێوان. میترا

زرەێیکی زێڕی لە بەردا بوو و سپەرێک بە دەستەوە، بە قامچی گەردوونەکەی لێدەخوڕی. لە نێو گەردوونەکەیدا هەزار تیر و کەمانی چاک ئامادە بوو کە تیرەکانی بە توندی و خێرایی خەیاڵ بەرەو دوژمن و دێوان دەهاویژت، هەروەها هەزار تەورزین دوودەمی پۆلا و هەزار خەنجێری دوو سەر و هەزار ... دیکەی لە ناو گەردوونەکەی هەبوو.

کەرپانەکانی ئایینی ڕۆژپەرستی هەمیشە دەستی نیایشتیان* بەرز دەکردەوە و ستایشتی میترایان بەم چەشنە دەکرد: ئەگەر مەڕ و ماڵاتێک ڕفێندرا، خوای دلێری ئێمە کە خاوەنی چیا و دەشتەکانی پان و بەرینە، تاو دەداتە سەر دزەکان و مەڕ و ماڵاتەکەمان ڕزگار دەکات. کەرپانەکان خوایان بەمجۆر بۆ خەڵک پێناسە دەکرد: مێهر خوای مەزن، خاوەنی چیا و دەشتەکان، سامان و دارایی و گوند و شار و وڵات و پاتشایە. ئەو کەسێکە کە جەنگاوەران لە پشتی ئەسپەکەی نوێژ دەکەن و بۆ هێزی ئەسپەکانیان و تەندروستی خۆیان نیایشتی ئەکەن تا بە سەر نەیارانیاندا سەرکەوتوو بن. میترا کەسێکە دێوەکان سەرکوت دەکات و وڵاتی دوژمن لە ڕێگای ڕاست دوور دەخاتەوە و فەڕ و شکۆیان لێ دەستێنێتەوە و ترس و سەرلێشواوی دەخاتە ناو دڵیان. کەسێکە هەزار دیدەوانی* هەیە و بە هێز و توانامەندە و ئاگادری هەموو شتێکە و هیچ کاتێکیش فریو نادرێت. کەسێکە کۆڵەکەی ماڵەبەرزەکانی ڕاگرتووە و دارەڕای خانووبەرەکان پتەو ڕادەگرێت و بە کەسانی خۆشەویستی خۆی، مەڕ و ئاژەڵ و دارایی دەبەخشێت و ئەگەریش برەنجێت ماڵەکان تێدەپێنێت و زمانی مرۆڤی درۆزن لە زاریان جودا دەکاتەوە.. و دیان شتی دیکە. ئەمانە پێناسە و تایبەتمەندییەکانی خواکانی ئایینی ڕۆژپەرستی بوون و کەرپانەکانیش ستایشتی ئەمانەیان لە ناو دڵی خەڵکدا جێگا دەکردەوە.

ئەم هەلومەرجە بەم چەشنە بەردەوام بوو تاکوو زەردەشت وەک ئەستێرەی گەش لەناو ژیانی ئەو سەردەمە پەیدا بوو و بە گوفتاری دڵنشین و دڵگیرەکانی، جەنگی لەتەک درۆزنان دەست پێ کرد. زەردەشت بە جێگای پەژراندنی کوێرانەی

باوەڕە کۆنەکان لەمەڕ یەزدانەکان، ساڵانی ساڵ بیری کردبووەوە، ژیری و مێشکی خستبووە کار و لە ئەنجامدا خودای ڕاستی لە ناو هۆشیاریی تەواودا ناسی. خودای زەردەشت ئیدی خەنجێر و کەمان و شمشێر و نێزە و گورز ئاگری بەدەستەوە نەبوو، سواری گەردوونە نەدەبوو و سەری دوژمنانی جودا نەدەکردەوە و ئەوانی بە ئاگری تووڕەیی و ڕکی خۆی نەدەسووتاند و سزایانی نەدەدا. خودای زەردەشت هێزی خێرەت و هەنجاری ئافراندنە. تریفەیە، ترۆپکی هەموو تریفەکانی سەر زەوی و ئاسمانەکانە، تریفەی هەرمانە*، ئاوەزی هەستی و هەنجاری بوونە. زەردەشت خودای بەو جۆرە کە لە ئاسماندا بە سەر گەردوون بڕوانێت و دانیشتبێت نەدەدی. خودای زەردەشت هێزی ئافەرینشت و هەموو دیاردەکانی ئافراندنە، خودی هەستی و هەموو دیاردەکانی هەستییە. زەردەشت بە پێچەوانەی خۆرپەرستان و مێهرپەرستان کە خودایان لە زاری بەڕێوبەران دەناسی، بە خەڵکی ئامۆژگاریی دەکرد کە ببینن و ببیستن و بیر بکەنەوە و بە تیشکی هزر و رامان و بە ویناوی* خۆیان، خودا لە دەروونی خودیان بدۆزنەوە و بیناسن. ئەو خودایە کە هێزی ئافراندنە و پرشکی ئافراندنی لە هەموو دیاردەکانی هەستی بەدی دەکرێت. زەردەشت دەیفەرموو:

ئەوە کە لە سەرەتادا،
بە هزری خۆی،
ڕۆشنایی بە گەردوون بەخشی و
بە خێرەتی خۆی
هەنجاری بوونی ئافراند،
تا چاوەدێر و پشتیوانی،
رامانە هەرە باشەکان بێت.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!

ئەی ئەوەی کە مینای یەکسانیت..!
بە هێزی پیرۆزی مینووی خۆت،
ڕووناک و سەرفرازمان بکە.
گاتا، هاتی 31، سروودی 7

ئەی مەزدا..!
کاتێک کە لە رامانی خۆم ورد بوومەوە،
تێگەیشتم کە
تۆ سەرەتا و سەرئەنجامی بوونی،
تۆ سەرچاوەی رامانی پاکیت.
ئەو کاتەی کە بە ویناوم تۆم بینی،
لەوە گەیشتم کە تۆی
بەدیهێنەری ڕاستیی،
هەر خۆت داوەری دادگەری هەموو کردارێکی ئەم جیهانەی.
گاتا، هاتی 31، سروودی 8

کێیە، ئەو جوانمێرە بە شکۆیە
کە پێشتر من فێر بکات،
کە زیاتر لە هەمووان
تۆ شایستەی ستایشتی و
تۆ سەروەری ڕاستی و داوەری پاکی کردارەکانی؟
هەمیشە ئارەزوومەندین کە بە رامانی پاک،
لە ئایینی ڕاستی و
لە هەموو ئەو شتانە کە تۆ لە بارەیەوە گوتووتە،

ئاگادار بین.
گاتا، هاتی 46، سروودی 9

دەستەی دیکەش کاویەکان بوون، کە بریتی بوون لە شا و میر و سەرۆکی هۆزەکان. ئەمانە ستەمگەری و زۆرداری و کۆیلەدارییان پەرە پێدەدا. زەردەشت کە لەگەڵ ئەم ئەربابانی ستەمیشدا خەریکی بەرخۆدان و جەنگ بوو و بەم جۆرەوە لە بارەیان دەیفەرموو:

ئەمانە بە ڕاهێنانەکانیان
دەبنە لەمپەر لە نێوان گەل و کرداری شایستەدا...
ژیانی گەل بە گوفتاری فریوکارانە لەناو دەبن،
لە جیاتی پاکان،
فرەتر ڕێزی گەراهما و کەرپانەکان دەگرن و
بۆ پەیرەوانی درۆ
هێڤیی سەروەری دەخوازن.
بەڵام مەزدا،
بۆ ئەم کەسانە و کارە خراپەکانیان،
سزایەکی سەختی دیاری کردووە.
گاتا، هاتی 32، سروودی 12

لە مێژەوەیە،
«گەراهما» بە یارمەتیی کاوییەکان،
هۆش و توانای خۆی،
بۆ شەکەت کردنی پەیامهێنەر

دەخاتە کار و
جیهان بەرەو نابووتی ڕاکێش دەکات و
لە گێلیی گومڕێیان یارمەتی وەردەگرێت و دەبێژێت:
بە کوشتنی گیانلەبەران و (قوربانی کردن)
خواردنەوەی هەئومەی جاویدانی،
نەخۆشی و مردنمان لێ دوور دەبێتەوە.
گاتا، هاتی 32، سروودی 14

زەردەشت لە ناو نموونەکانی شای تاوانبار کە لەو سەردەمە بۆ خەڵک تەواو ناسیاو بوون وەک پاتشا گەورە، جەمشێت بەم جۆرە دەیفەرموو:

یەکێک لەم سووچدارانە،
جەمشید ڤیەونگەهانە.
ئەو کەسەیە کە بە هەوا و هەوەسی خۆی،
پەروەردەگاری جیهانی بە پەست دانا.
ئەی مەزدا..!
من بە داوەریی کۆتایی تۆ
لەمەڕ گوناهکاران بێگومانم.
گاتا، هاتی 32، سروودی 8

ئەی مەزدا..!
ئەو کەسانە
ژیان لە ناو دەبەن،
کە چەواشەکاران بە مەزن دەژمێرن،

ناهێڵن ژنان و پیاوانی مەزن
بە کامی دڵ بگەن و
خەڵاتی یەزدانیان پێ ببڕێت،
پاکان و ڕاستانیش
لە پاکترین ڕامان
دوور دەخەنەوە ئازاریان دەدەن.
گاتا، هاتی 32، سروودی 11

هەر هێزێک کە «گەراهما»
لە پەنای هزرە خراپەکان
ئارەزووی بەدەستهێنانی دەکات،
سەرئەنجام ژیانی خودی خۆی
بەرەو لەناوچوون دەبات.
ئەی مەزدا..!
بەڵام ئەو کاتە دێت
کە بە ناڵە و گریانەوە،
داخوازیی بیستنی پەیامی پەیامهێنەری تۆ دەبێت.
ئەو پەیامهێنەرەی،
کە لە هەمبەر هێرشی دوژمناندا،
ڕاستی دەپارێزێت.
گاتا، هاتی 32، سروودی 13

لە ڕاستیدا،
کەرپانەکان و کاوییەکان،

هەر بە دەستی ئەو کەسانەی کە هیچ کاتێک
ژیانێکی ئازاد و دڵخوازیان
پێ ڕەوا نەبینیوون،
شکست دەخۆن و لەناو دەچن.
کەسانێک کە لە بەر پرشنگی گەشەکردن و جاویدانیدا،
بەرەو کۆشکی هزری چاکی ڕێگا دەبیننەوە.
گاتا، هاتی 32، سروودی 15

# جەنگ لەتەک زەردەشتدا



کاریگەری گوفتارە پیرۆزەکانی زەردەشت، دەرئەنجامی باشی لەتەک خۆی هێنا. دەڵێی هەژاندن و ڕاشەکانێکی توند و سەرانسەری ڕووی دابوو، بۆمەلەرزە بوو، زەوی بە یەکجارەکی لەرابوو. هەموو چتێک شڵەژاو و تێکهەڵچبوو. سەیرە! هەموو ئەو شتانە کە تا دوێنێ وەک چیا پتەو و ڕاوەستاو دەبینریا، ئەوە ئێستا کەتبوونە جووڵە و لەرە و بەرەو تێتەپان دەچوو. ئەگەر تا دوێنێ میرێک بە شوێنێکدا دەڕۆیشت، مەردوم لە ترساندا هەڵدەهاتن و یا ئەگەر بواری هەڵاتن نەبوایەت، ئەوە تا تێپەڕبوون یا ڕۆیشتنی میرەکە، چاویان دەبڕییە سەر زەوی و سەریان هەڵنەدەبڕی، بەڵام خەڵک سەوازەیان کرابووە. کەرپانەکانی خاوەن هێز و توانای نادیار کە تا دوێنێ دارای دەستەڵات بوون بە سەر مێشک و ڕەوانی خەڵکدا و تەنانەت خەڵک لێ سێبەری کەرپانەکانیش سڵیان دەکردەوە نەکا بکەونە بەر نفرینی خواکان، ئیمڕۆ ببوون بە گاڵتەجاڕی خەڵک.

سەردەمێک جەمشیت شایان بە خوای گەورە و بەدیهێنەری زەوی و جیهان و ئاسمان و گەردوون دەزانی. بە لایەنەوە هیچ هێزێک لە جیهان نەبوو کە توانای بەرانبەری لەگەڵ هێزی جەمشید بکات. هەموو شتەکانی لە ناو کۆمەڵگا، چ گوتە و باوەڕ و چ ئایین و نامە و نووسراوەیەک هەروەک پۆڵا سەخت و چەسپاو دەبینریا. چەرخی ژیان بێ هیچ تەنگ و چەڵەمە و لە ڕێگەدەرچوونێک بە هەمان ڕێگا کە پێشتر هاوێشترابوو، دەڕۆیشت، بێ هیچ لاری و گیرییەک، چەرخ بە هەمان ئاهەنگ و لە هەمان ڕێگا و بەرەو هەمان ئارمانجێک کە لە سەدەکانی پێشتر بۆی دیاری کرابوو دەڕۆیشت. هیچکەس گومانی ئەوەی نەدەکرد کە ڕۆژێک تەنها تۆزێک خولی چەرخەکە سستی و خاوی یا وەستاندی لێ بەدی بێت. کۆڵەکەی فەرمانڕەوایی کاویەکان و کەرپانەکان کە لە سەر بەردی پتەوی خارا* هەڵچندرابوو و بەردەکەش بە ڕووکەشێکی پتەو و پانی ئاسنین داپۆشرابوو. پاسەوانانی تەختی فەرمانڕەوایی، شەو و ڕۆژ بێ وچان چاوەدێرییان دەکرد، هەر کاتێک کەسێک نزیکی تەختەکە ببوایەت پەلاماریان دەدا و زگیان هەڵدەدڕی.



بەڵام سەیرە! ئیمڕۆ شتەکان لە دەرووندا پووکاو و داڕزابوون. گوفتاری زەردەشت هێشتا نەنووسرابوو و لە هەمان سەرەتای دەم بەدەم گەڕیاندا بوو کە هەروەک تەورێک بدەی لە بنی دارێکی پووکاو و بکەوێت، پەیکەری کۆشکی فەرمانڕەواکانی خستبووە لەرزین. کاویەکان ئیتر شەوانە خەوی ئارامیان لێ هەڵگیرابوو، دەیانزانی کە تەنبوور و هۆرەکانی زەردەشت خەڵکی هۆشیار و وریا کردبووەوە. کەرپانەکان ترسیان لێ نیشتبوو و خۆیانیان نەدەخستە بەر چاو. ئەمە جاری یەکەمە کە بویەری ئاوا بقەومێت. پێشتر هەرگیز تۆفانێکی ئاوا هەڵی نەدابوو ئاوا کاخی فەرمانڕەوای میرانی زەمانە بخاتە لەرزین. زەردەشت هەموو شتێکی خستبووە جماندن*، ئەو شتانە کە لەگەڵ هۆش، دانش، ئەندێشە، ئازادی، ڕاستی، دروستی، پاکی و زانستدا ناسازگار بوو، هەر چتێک کە مایە و هەوێنی لە درۆ و ستەم بگرتایەت، زەردەشت بە ئاهەنگی خۆشی تەمووره و دەنگی زۆلاڵی خۆی و سرووده جاویدانیەکانی جڤاکی خستبووە هەژاندن و لەرزین. زەردەشت سەهۆڵبەندانی ساڵەکانی کۆنی مێشک و ئەندێشەکانی، بە تیشکی هەتاوی هۆرەکانی دەتواندەوە و لە بندا هەڵیدەتەکاند.

پرسیار لە دوای پرسیاریان لە یەکتر دەکرد: "دەبێت چی بکرێت؟ دەبێت چی بکرێت؟ ئایا دەبێت دەست بخرێتە سەر دەست و زەردەشت سروودی خۆی بخوێنێت و هەر بەم چەشنە لۆمەمان بکات و تەخت و تاجی ئێمە بەرەو ڕمان و لەناوچوون ببات و جڤاک بۆ بەرهەڵستی و کارشکێنی و بەرخۆدان و دوژمنی ئێمە هان بدات؟"

خاپێندراوانی دەبستانی میریی،
هیچ کاتێک بە درێژایی ژیانیان،
«زەردەشت ئەسپێنتمان»یان

دڵخۆش نەکردووە،
چونکە ئەمانە،
بەختیاریی لە کردەوەی ئەنبووژەنی دەبینن،
نەک لە جۆش و خرۆشەکانی مینوویی.
گاتا، هاتای 51، سرووودی 12

بەم جۆرە،
چەواشەکار،
کە بە سەرپێچی کردن لە ڕێگای ڕاستی
ویژدانی خۆی بەرەو نابووتی کێشاوە،
لە تێپەڕگای داوەری و
لە هەمبەر ئاشکرابوونی کرداریدا،
گرفتاری سەرزەنشتی ویژدانی دەبێت.
چونکە بە کردار و گوفتاری خۆی،
لە ڕێگای ڕاست لایداوە.
گاتا، هاتی 51، سرووودی 13

ئەو کەسانەی کە
بە بیری چەپەڵ و زمانی پیسیان،
ڕک و تووڕەیی و بەرچاوتەنگی پەرە پێ دەدەن و
دەبنە کۆسپی بەر ڕێگای مەردمی سازکەر و پەروەردەکار،
هەروەها بەو کردارە ناشیرینانەیان
بیر لە داهێنان و کاری خاس ناکەن،
ئەمانە دێڤانێکن

کە دەروون و ویژدانی گەل،
بەرەو درۆ و شاشی دەبەن.
گاتا، هاتی 49، سروودی 4

گومڕێیانی بەدکار،
کە کۆیلەی هەوەسن و لە ڕاستی بێزارن،
لە پاکان زویرن و پایەبەرزان بە سووک دەژمێرن،
هەمیشە لەتەک خۆشیاندا
لە گەرمە و کێشە و ململانێدان.
کێیە ئەو پێشەوا جەوانمەردە
لەو پەڕی ئازادیدا،
بە دڵ و گیان و بەو چەشنە کە خواستیەتی،
لە دژ ئەو جۆرە بەدکارانە بجەنگێت؟
ئەی مەزدا..!
تەنها شکۆمەندیی مینوویی تۆیە،
کە دەتوانێت یار و یاوەری دەروێشانی دروستکردار بێت و
لە باشترین پاداشتەکان بەهرەمەندیان بکات.
گاتا، هاتی 53، سروودی 9

کەرپانەکان،
هیچ کاتێک لە داد و ئایین و ئاوەدانکردنەوە
پێڕەوی ناکەن،
ئەمانە بە ڕاهێنان و کردارەکانیان،
زیان بە ئاوەدانکارانی جیهان دەگەیەنن.

بەڵام، هەر ئەم ڕاهێنان و کردارانەیە،
کە لە ئاکامدا
بەرەو سەرای درۆ دەیانگەیێنێت.
گاتا، هاتی 51، سروودی 14

ڕەوانی میرانی ستەمکار و
بەدڕەوشتان و دڵڕەشان و
لایەنگرانی درۆ و چەواشەکاران،
نیشتەجێیانی سەرای درۆن،
چونکە ناخیان لە ڕووناکیەوە
بەرەو تاریکی چووە و
لە ڕاستی دوور کەوتوونەتەوە.
گاتا، هاتی 49، سروودی 11

ئەی مەزدا..!
لە مێژە کە «بێندو»،
لە کرداری نادروستی خۆی شادمان و سەرمەستە و
لە هەمبەری من نەیاریەتی دەکات.
ئەی بەخشێنەری دلۆڤان..!
بە پاداشتی چاکە بەرەو ڕووی من وەرە،
تا بە رامانی پاک،
ئەو لە چەواشەیی ڕزگار بکەم.
گاتا، هاتی 49، سروودی 1

ئەی مەزدا..!
ئارمانجی سەرەکیی «بێندو»
درۆ و فریو و سەرلێشێوانی مرۆڤ و
دوورکەوتن لە ڕاستییە،
پابەندی سۆز و بەڵێنی خۆی نییە و
رامانی لەتەک پرسیار و بەرسیڤ بێگانەیە.
گاتا، هاتی 49، سروودی 2

جادووگەران کەوتنە خۆیان، بڕوایان وابوو کە چیتر کاتی دانیشتن نییە، ڕابن و دەست بە کار بن پێش لەوەی تووشی کارەساتێک بن، خۆیان لە نابووتی و لەناوچوون ڕزگار بکەن. هەموو گەیشتبوونە ئەو بیرە کە پێویستە ئامادە بن و کارێک بکەن، کارێک کە دەبوا پێشتر بیانکردبا، ئەوەش کوژتنی زەردەشت بوو. تەنها ئەو ڕێگایەیان بۆ مابوو. بۆیە خێرا ئامادەباشی گشتییان دا و هەموو ئەو نەخشە و ئەمرازانەی کە دەبووا بۆ کوشتنی زەردەشت و یارانی ساز و تەیار بکرابان، ئامادە کریا.

# کۆچی ناچاری



زەردەشت دەبوا لە بیری چارەیەک بوایە و پێش لەوە کاتی لە دەست چێت، دووربینیشی بکردایەت و خۆی و هەڤاڵانی لەو پیلان و نەخشە شوومە کە بۆیان کێشرابوو دەرباز بکردایەت. چی دیکە هەوشار* و شیز جێگای مانەوە بۆ ئەو یارانی نەبوو. هەموو خراپەکاران و کاویەکان و جادووگەران و بە تایبەت لە هەموویان توند و تیژتر، گرەهمای* ستەمگەر و بێندوەی* بەدخواز کە لەگەڵ یەکدی هاوپەیمان ببوون، بە هەموو وزە و تواناییانەوە بۆ لەناوبردنی زەردەشت و یارانی. زەردەشت دەبوایە بۆ جێگایەک بڕوات کە زیانی ئەمانەی پێ نەگات و بتوانێت بە ئازادی و سەربەستی بۆ پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی رامان و زانیاری و وریاکردنی کۆمەڵ، ستەم و زیان و خراپەکاری ئازاری دەسەڵاتدارانی چەوسێنەر

کۆتایی پێ بێنێت. زەردەشت بەرپرسیاریی خۆی لە هەمبەر خەڵک باش دەزانی و دەبوا هەنگاو و بڕیارەکانی دووربینانە و هۆشیارانە بایە. بۆیە زەردەشت لە ناو بیر و خەفەتێکی گەورە بوو، کاتێک کە چووە ناو یارانی و فەرمووی:

ڕوو بکەمە کام ئاخ؟
بۆ کوێ بڕۆم؟
لە کەس و خێش و هەڤاڵانم دوورم دەخەنەوە،
هیچ دڵخۆشییەکم لە هاوکارانیش نییە،
میرانی وڵاتیش لایەنگیری درۆ دەکەن.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
چلۆن دەتوانم خۆشنوتت بکەم؟
گاتا، هاتی 46، سروودی 1

ئەی ئەهۆرا..!
دەزانم بۆچی لاوازم،
دەنگی من کز و کەسانیشم کەم.
هانا بۆ تۆ دێنم،
بە چاکی لێم بڕوانە،
داخوازی ئەو ئەڤینە دەکەم،
کە دڵدار بە خۆشەویستەکەی دەبەخشێت.
ئەی مەزدا..!
لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
من لە وزەی پڕتوانای رامانی پاک
زانا بکە.

گاتا، هاتی 46، سروودی 2



بەڵام چونکە زەردەشت خۆی سەرچاوەی ئۆمێد و پەیکەری هیوا بوو، خێرا بە وریایی بە سەر غەم و پەژارەیدا زاڵ بوو و ئینجا بە ڕوویەکی کراوە و شادمانەوە سەری بەرەو ئاسمان بڵند کرد و فەرمووی:

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
لە بەر تیشکی ڕاستی و ڕامانی پاکدا،
زەردەشت کە ستایشتگەری تۆیە،
چ پارمەتییەکی دەدەی؟
من بە دروستی و بە هۆرە و ئاوازی شایستە،
ستایشتت دەکەم،
ئارەزوومەندم ئەو شتەی کە لای تۆ پەسەندە و

بە باشی دەزانی،
بە منی ببەخشی.
گاتا، هاتی 49، سروودی 12

ئەی مەزدا..!
چۆن بزانم
کە ئێوە لە سەر بنەمای ڕاستی،
بە سەر هەمووی ئێمە و
ئەوانیش کە بە دوای ئازاری مندا دەگەڕێن،
فەرمان دەدەی؟
چۆنیەتی ڕەوشتی ڕامانی پاکم
بۆ ئاشکرا بکە.
ڕزگارکاریش
لە پاداشتی کار و خەباتی ئاگادار بکە.
گاتا، هاتی 48، سروودی 9

زەردەشت لایەنگرانی خۆی هۆشیار دەکردەوە بۆ بەربەرەکانێی خراپەکاران. زەردەشت دەیفەرموو: "چەواشەکاران، هەرچەندە بەهێز و تێکدەر و ناپاک بن و هەرچەندە دەستیان بەستەمکاری ڕاهاتبێت و بۆ ویرانیی جڤاک تێ بکۆشن و ڕاستکاران تەنگاو بکەن، بەڵام لە کاتی بەربەرەکانێ و جەنگدا، ئەگەر چاکان بە گیان و دڵ لەتەکیاندا بجەنگن سەرئەنجام تێکدەشکێن و ڕاستی و ڕووناکی و پاکی سەرکەوتوو دەبن".

ئەو چەواشەکارەی کە،

به کرداری دوژمنانه و زیانباری خۆی
به خراپەکاری ناوی زڕاوە،
لایەنگیرانی ڕاستی
له پێشکەوتنی ژیانی گەل،
له شار و وڵاتدا پاش دەخات.
ئەی مەزدا..!
ئەو کەسەی که به دڵ و گیان
بەرامبەر به چەواشەکار بجەنگێت،
مرۆڤ و جیهانی ئافەرینشت،
بۆ ڕێگای زانست و ویژدانی پاک
پێش دەخات.
گاتا، هاتی 46، سروودی 4

ئەی مەزدا..!
بەڕاستی، چەواشەکاران به کرداریان
ئێمەیان هەراسان کردووە،
ئەمانه بۆ جڤاک،
بێجگه له تێکدان و وێرانکردن
شتێکی دیکەیان نییه.
سامانداڕانیان به سەر هەژاراندا ستەم دەکەن و
لەتەک ئایینی تۆدا نەیاری دەکەن،
هیچ کاتێک بیر له ڕاستی ناکەنەوە،
له رامانی پاک
ڕادەکەن و ڕوویان هەڵدەماڵن.

گاتا، هاتی 34، سروودی 8

ئەی مەزدا..!
ئەو کەسانەی کە
بە کرداری ناپەسەند و بە نائاگایی لە رامانی پاک،
ئەڤین و پاکی جوانمەردی،
کە لای زانایانی تۆ بێ ئەندازە پلەمەندە،
لە دەست دەدەن.
هەر بەو جۆرەی کە وێرانکاران
پشت لە ئێمە دەکەن،
لە ڕاستیش دوور دەکەونەوە.
گاتا، هاتی 34، سروودی 9

زەردەشت لە ژێر گوشاری هەڕەشەی سەختی نەیارانی بوو. دڵپیسی و بەددڵی و بەدنیهادی و بەدفەڕی و ئازار و پیلانی کوژتنی خۆی و پەیڕەوانی هەموو چوار دەوری داگرتبوو، بەڵام نائومێدی و دوودڵی هەرگیز ڕووی تێ نەئەکرد. زەردەشت زۆر گەشبینانە لە ناو تاریکیدا چاوەڕوانی ڕووناکی بوو و لە ناو بەفر و بۆراندا بۆنی بەهار و گوڵ و سەوزەڵانیی دەکرد. زەردەشت ڕووی دەکرد یارانی و بە ئاهەنگی دڵنشین خۆی ستران و سرووده جوانەکانی بۆ ئەخوێندنەوە:

ئەی مەزدا..!
لە کوێن ئەو دڵدارانەی تۆ،
کە لە بەر تریفەی رامانی پاک
ئاگادار لە ڕاهێنانە پڕبەهاکانی تۆ

ڕوویان لێت هەڵنەگەڕێنەوە و
لە چاخی خۆشی و سەختی
بە هۆشمەندی بە کار بێنن و
بۆ پەرەپێدانی پەیکی پیرۆزی تۆ بکۆشن؟
بێجگە لە تۆ کەسێکی تر ناناسم،
کە وایە، لە بەر تریفەی ڕاستیدا
پشت و پەناهم بە.
گاتا، هاتی 34، سروودی 7

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئێمە لە بەر تیشکی ڕاستیدا،
پرووسکەی پرشنگدار و پڕتوانای تۆ دەخوازین.
ئەو تریفە جاویدان و بەتوانایە،
کە ئاشکرا پاڵپشتی پەیڕەوانی ڕاستییە و
مەبەستی پیس و ئازار و دوژمنی نەیاران
ئاشکرا دەکات.
گاتا، هاتی 34، سروودی 4

ئەی مەزدا..!
چەندە بە شکۆیە فەرمانڕەوایی و توانامەندیی تۆ.
چەندە ئاواتەخوازم
کە لە ڕێگای تۆدا خەبات بکەم و
بە تۆ پەیوەند ببم،
بە هێزی ڕاستی و ڕامانی پاک،

یار و هاریکاری ئەویندارانی تۆ بم.
تۆ لە گشت کەس مەزنتر و بانتر دەناسم،
هەروەها بێزاریی خۆم لە خودایانی درۆیی و
مەردمی گومڕێ دەردەبڕم.
گاتا، هاتی 34، سروودی 5

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
خۆتم بۆ ئاشکرا بکە.
بە هێزی پاکی
ڕەوانم توانامەند بکە،
بە مینووی پاک و پترکەری خۆت
وەڵامی نیایشتەکانم بدەرەوە.
بە یارمەتیی ڕاستی،
لە هێز و توانای فراوان
بەهرەمەندم بکە.
بە رامانی پاک
گەورەییم پێ ببەخشە.
گاتا، هاتی 33، سروودی 12

ئەی مەزدا..!
ئەو کاتەی کە چەواشەکارئامادەی ئازاری منە،
بێجگە لە تریفەی تۆ و ئەندێشە بە تۆ،
چ کەسێک هانای من دەدات؟
ئەی ئەهۆرا..!

لەو دوو پرشنگی زانایی و ڕووناکییە،
کە ئایینی ڕاستی دەکەوێتە کار،
کە وایە سرشت و ویژدانی من
لەو ئایینە ئاگادار بکە.
گاتا، هاتی 46، سروودی 7

زەردەشت باش دەیزانی کە ڕاز و نهێنیی گەورەی بوون کە هەمان کار و کاردانەوە لە ژیانی کۆمەڵانە، لە زاگۆنی پاداشت و سزادانە. هەروەها لە ئەنجامی جەنگی خراپەکاران و ستەمگەران و چەوسێنەران لەتەک لایەنی خاسان و دادگەران و ئازادیخوازان، شکست و سەرشۆڕی بۆ خراپەکاران دەبێت و هەموو زیان و ئازار و ناتۆرەیان بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە و بێگومان دەستەڵاتداریی ستەمگەرانەیان کۆتایی پێ دێت.

هەر کەسێک ڕوو لە ڕاستی بکات،
تیشک و ڕووناکی دەبێتە سەرا و هەواری.
بەڵام مرۆڤی گومڕێ،
تا زەمانێکی دوور و درێژ،
ژیانی لە ناو تاریکی و دڵڕەشی و
داخ و خەفەت دەباتە سەر،
سەرئەنجامێک کە
لە کردار و ویژدانی خۆی بەدی دێت.
گاتا، هاتی 31، سروودی 20

هەر کەسێک بە رامان و گوفتار و کردار،

دژی چەواشەکاران بجەنگێت و
نەخشەکانیان تێک بشکێنێت،
یا خۆیان و لەیەنگرانیان،
بۆ ڕێگای ڕاست ئامۆژگاری بکات و
بۆیانی ڕوون بکاتەوە،
بە ڕاستی ئەو مرۆڤە،
بە باوەڕ و بە دڵ و گیان،
خواستی خواوەندی بەجێ هێناوە.
گاتا، هاتی 33، سروودی 2

ئەی مەزدا..!
کاتێک کەسێک،
بە ئاشکرا یا نهێنی،
پرسیارێکت لێدەکات
یا کەسێک بۆ گوناهێکی پچووک
سزایەکی مەزن دەبینێت،
تۆ بە چاوی وردبینی خۆت و
لە ڕێگای ڕاستیەوە،
هەموو شتێک دەبینێت و لە گشتی ئاگاداریت.
گاتا، هاتی 31، سروودی 13

ئەی مەزدا..!
ئەو کەسەی کە
لە ئەندێشەی ڕماندنی جیهاندایە،

بێگومان بەو کردارە ناپەسەندانەی
زیانێک بە من ناگەیەنێت،
بەڵام ئەو کردارە دوژمنانەیەی،
بۆ خودی خۆی دەگەڕێتەوە و
لە ژیانێکی خۆش پاش دەخات و
ژیانی بەرەو خراپی دەچێت.
گاتا، هاتی 46، سروودی 8

زەردەشت ئەنجامی ژیانی کاویەکان و کەرپانەکان و جادووگەرانی ستەمکاری بە ڕوونی دەزانی و دەیفەرموو: "هەرچەندە ئەم وێرانکارانە بە کردارە یەکگرێدراوەکانیان زیندەگانیی خەڵکیان لە ناو بردووە و هەرچەندە ستەم و بێدادی لە سەر کۆمەڵ پترتر دەکەن، بەڵام سەرئەنجام ڕۆژێک کاردانەوەی کرداریان بۆ خۆیان خرۆش هەڵدێنێت و لە سەر تەختی دەستەڵاتدارییان دەیانهێنێتە خوارێ و بەرەو دۆژە شۆڕ دەبنەوە و بۆ هەمیشە لە سەر گۆی زەوی ون دەبن".

کاوییەکان و کەرپانەکان،
بە هێزی یەکگرتوویان و
بە کرداری ناشیرینیان،
ژیانی مەردم لە ناو دەبن.
بەڵام ڕەوان و ویژدانی ئەمانە،
لە کاتی گەیشتن بە تێپەڕگای داوەری،
لێیان دێتە خرۆش و
بۆ هەمیشە نوقمی سەرای درۆ دەبن.

گاتا، هاتی 46، سروودی 11

زەردەشت بە هەڤاڵانی دەگوت: "هەرگیز بێ هیوا مەبن و هەروەها بەردەوام بن لە پەیکاری* خۆتان دژی خراپەکاران و ستەمگەران". زەردەشت چاوەڕوانی پەیکێک* بوو کە پێشتر ناردبووی بۆ چەند شوێنێک کە بگەڕێت و خەڵکانی باشی بدۆزێتەوە.

# مزگێنییەکانی پەیک



کاتی گەڕانەوەی پەیک هەموو یارانی زەردەشت دەورەیان دا و کەوتنە پرسوجۆ بۆ بیستنی هەواڵی تازە و خۆش. لە مێژ بوو چاوەڕوانیان دەکرد، دەیانویست بزانن کە لەو ماوەدا بۆ چ جێگایەک چووە، چ کەسانێکی دیوە و لەتەک کێ پەیوەندی کردووە و چیان باس کردە و بشزانن ئایا زەمینەی پەرەپێدانی دینی بەهدینی لە ناو خەڵکانی دی هەیە یا نا؟

بۆیە پەیک کەوتە وەڵام و بەم جۆرە بەرسیڤیانی دایەوە:

-"دەنگوباسی خۆشم بۆتان هەیە. لەو ڕۆژەوە کە من ڕۆیشتووم، شوێن و خەڵکی فرەم دیوە و لەتەک مەردمێکی زۆر گفتوگۆم کردووە و چتگەلی زۆر سەیرم دیوە. لە زۆر شوێنیش وەک ئێرە ستەم و بێدادی و دەستدرێژی و دەستەنگی و بەدبەختیم بینی و خوێنمژانی خەڵکی نەزان بۆ چەوسانەوەیان وەک ئێرە دەستیان ئاواڵەیە. کەسانێکی زۆر و خەڵک و ئاوایی و هەرێم و ناوچەی فرەم دی

که وەک لای خۆمان نیری* نەزانییان له ئەستۆدایه، بەڵام بەختەوەرانه تەنیا له باشووردا بەم چەشنەم نەبینی، ئەویش چیا سەرکەشەکانی هەرێمی دەستەڵاتداری کەیگوشتاسپ* له بەڵخه* بوو. کەی گوشتاسپ دوو شالیار* و ڕاوێژکاری دانا و به ناوبانگی به ناوی جەمئەسپ* و فرەشەوشتر* هەیه. گوشتائەسپشا کوڕی لۆهراسپه*. هەر چەنده ڕەوشت و هەڵسوکەوتی توند و تیژه، بەڵام پەیجۆری* زانست و لێکۆڵینەوەیه. له کۆشکه بەرزەکەی که له سەر چیا چێی کردووه، مرۆڤی زانا و تێگەیشتوو و لێهاتوو و هونەرمەند و هۆشمەند له هەموو لایەک کۆ بوونەوەتەوه. شاگوشتاسپ پاڵەوان و یەلێکی* ڕاستکردار و وردبین و هۆشمەنده، ویست و ئاواتیشی زانینی هزر و زانستەکانی نوێی سەردەمه. بەڵام ئەو شتەی که لەمەڕ کەیگوشتاسپ دەتوانێت باڵکێش بێت، هەبوونی ئەو دوو دانا و فەرزانەیه که برای یەکدین و شالیاری ئەون. به تایبەت جامئەسپیان، که شاگوشتائەسپ بێ ڕاوێژی ئەو هەرگیز هیچ کارێک ناکات. یەکێک له تایبەتمەندیەکانی جام ئەسپ ئەوەیه که دەتوانێت پێشبینی هاتنی باران و تەرزه بکات و دەشڵێن له هێندێک زانیاری نادیاریش ئاگاداره و ڕووداوەکانی داهاتوو پێشبینی دەکات. فرەشەوشتری براشی هوشیار و پڕ زانایه."

-"لەو شته سەیر و باڵکێشانەی که له کۆشکی کەی گوشتاسپ دیوته، چی بووه؟"

-"له کۆشکی کەیگوشتاسپ مرۆڤی سۆزرەتی* زۆرم بینی، بەڵام له هەمووی سەیرتر به لای منەوه خەونەکانی کەی گوشتاسپ بوو. خەڵکی دەوروبەری قەڵا دەیانگوت: ماوەیەکه گوشتاسپ خەونی ناوێزه* دەبینێ. خەونی دیوه که ئایینێکی نوێ هەڵدەبژێرێت و ڕێگای ڕوونی ڕزگاری دەپێوێت. له خەونیدا ئەمێشەسپێنتەکان و ئەهۆرا مەزدای دیوه و هانیان داوه بۆ پەژراندنی دینی بەهی."



زەردەشت و هاوڕێیانی گوێیان بۆ کابرای پەیک شل کرد و بە بیستنی هەڤاڵەکان زۆر شادومان بوون. پاشان زەردەشت چووە ناو بیرکردنەوە و دوای ماوەیەک سەری بەرز کردەوە و فەرمووی: "هەڤاڵان، دەبێت بەرەو باشوور کۆچ و بار بکەین، بەرەو مەڵبەندی شاگوشتاسپ. بەمجۆرە کە دیارە پاتشا و دوو پێشکارەکەی،فرەشەوشتر و جام ئەسپ، بۆ پەژراندنی ئایینی بەهی ئامادەن. هەستن و خۆتان کۆ بکەنەوە و ئامادە بن، دەرفەتێکی باشە بۆ پەرەپێدانی دینی ڕاستی و گاڤی یەکەم بۆ ئەم کارە پیرۆزە، پێویستە کە گوشتاسپ شا و دوو شالیارەکەی، جام ئەسپ و فرەشەوشتر و هەڤاڵانی بڕوا بهێنن و ببن بە پەیڕەوانی دینی ڕاستی و پاکی." زەردەشت ڕووی کردە یارانی ئەم سروودەی فەرموو:

هەر کەس لە ئەنجامدانی خەباتی
زەردەشت ئەسپنتمان
یارمەتی و خۆشنوتی بکات،
ئەوە بە مرۆڤێکی دروستکار ناوبانگ دەر دەکات و
مەزدا ئەهۆراش ژیانی جاویدانی دەبەخشێتە ئەو مرۆڤە و
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
گێتی ئەو پتر دەکات و
هەمووانیش بە دۆست و هەڤاڵی
ڕاستی دەیانناسن.
گاتا، هاتی 46، سروودی 13

پاشان زەردەشت ڕووی کردە خێش و کەس و کار و یاران و فەرمووی: "مەزنترین کار لە ژیانی هەر کەس هەنگاونان بۆ ڕێگای زانایی و جوداکردنەوەی دانا لە نادانە، چاوکانی زانستیش ڕاستییە."

ئەی ڕۆڵەکانی «هێچدئەسپ ئەسپێنتمان»..!
بۆ ئێوە دەئاخفم،
گوێ بدەنە ئەو شتانەی
کە بۆ ئێوە باشترینە،
تا بە پێی ئەوە، زانا لە نادان جوێ بکەنەوە و
بە کرداری خۆتان
ببن بە خاوەنی ئەو ڕاستییە
کە بنەمای ئایینی ئەهۆرایە.

گاتا، هاتی 46، سرووودی 15

زەردەشت لە نەیاریەتی خۆی لەتەک کاوییەکان و کەرپانەکان و چەواشەکاران یادی کرد و فەرمووی: "من کەسێک نیم کە لەتەک وێرانگەران و بەدکاران سازشت بکەم و بگونجم. هەرگیز نا، من هاوڕێ و دۆستی باشان و خاسان و دۆستی ڕێڕەوانی ڕێگای ڕاستی و بیری چاکەم و دوژمنی خراپەکاران و دژی نەیارانی ئازادی خەبات دەکەم. هەرگیز لە ڕێگای ڕاستی، کە ڕێگای مەزدا و پایە و بنیاتی دینی باشییە، لانادەم و بە ئاگاداری لە هەموو مەترسیەکانی ئەم ڕێگایە، بەردەوام دەبم."

ئەو کەسەی کە ببێت بە هاوڕێم،
من بۆ ئەو باشترینم و
لە بەر تریفەی ڕامانی پاک،
مزگێنیی باشترینەکانی پێ دەدەم.
ئەو کەسەی کە لەتەک مندا ڕاستترە
منیش لەتەک ئەودا ڕاستترم.
ئەی مەزدا..!
من بە ڕاستیی،
خواستی تۆ بە جێ دێنم،
ڕێگایەک کە خێرەت و هزری من
هەڵیدەبژێرێت.
گاتا، هاتی 46، سرووودی 18



زەردەشت کە دارای ڕووناکترین هزر و خێرەتەکان بووە، هەموو تشتێکی مرۆڤی لە ئەنجامی ڕامانی خۆی دەزانی و ڕامانیشی بە ڕابەر و بڕیاردەری مرۆڤ لە هەموو گۆڕانکارییەکانی ژیانی دەژمارد، بۆیە لە هەمبەر ئەم ڕووداوە سەخت و گرینگ و مێژووییەدا کە بۆ پەیڕەوانی و خۆی ڕوویدابوو، بەمجۆرە دڵنەوایی ئەوانی دەدایەوە:

مرۆڤی ژیر دەبێژێت:
لە سەر بنەمای هزری پاک
خەبات بکەن،
جوانمەردی کە بنیاتی ڕاستییە
بپارێزن،
دڵنیاش بن کە هەمووی ئەمانە،
لە بەر تریفەی پڕتیشک و شکۆداری

مەزدا ئەهۆرا پەیدا دەبێت.
گاتا، هاتی 34، سروودی 10

(لە سەر کۆچبەربوونی زەردەشت لێکۆڵینەوەیەکی ورد و زانستی و بێ لایەنانە تا بە ئێستا نەکراوە، بێگومان هۆی تایبەت و دیاریکراوی خۆی هەیە. بەڵام بە گشتی 2 بیروڕا هەیە، یەکەمیان زۆربەی نووسەرانی بێگانە بە تایبەت فارس پێ لە سەر ئەوە دادەگرن کە زەردەشت خەڵکی دەوروبەری "ورمێ" لە ڕۆژهەڵاتی کورستان بووە و کاتێک کە کۆچبەر بووە بەرەو شاری "بەلخ" لە ئەفغانستان چووە، هەڵبەت برێک نووسەر بە بێ بەڵگە و بێ سەرچاوە پێ لەوە زیاتر دادەنێن و دەنووسن زەردەشت لە ڕۆژئاوای ئێران "خۆراسان" لەدایک بووە و لەوێشەوە بۆ شاری بەلخ کۆچی کردووە و گۆڕەکەی لە شاری "مەزارشەریف" دایە. بەڵام بیری دووهەم کە لە ئەدەبیات و ئاڤێستای نوێ سەرچاوە دەگرێت و گومانشکێنە، شوێن و جێگای کۆچبەری زەردەشت دیاری دەکات. ڕەوانشاد "عمادالدین دەوڵەتشاهی" نووسەری هێژای کرمانشانی لە پەرتووکەکانی "چیاکانی نەناسراوی ئاڤێستا" و "ڕۆستەم و زۆراو بە زمانی ئاڤێستا" بە سەرچاوەگرتنی ئەدەبیاتی زەردەشتی "یەشتەکان"، شوێن و جێگای کۆچبەری زەردەشت بەم چەشنە دەستنیشان دەکات. یەکەمجار زەردەشت پەنا دەباتە بەر زۆزانی "ئەوشێدرینە" کە بە درێژایی مێژوو ئەم وشەیە بە چەشنی "ئاویدەر، ئاویەر" لە هەریمی شاری "سنە" لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ماوەتەوە. پاشان زەردەشت لەوێشەوە دەڕوات بۆ چیای "هۆگر" کە لە دوایدا دەبێتە چیای "هەژیر، هەجر، هەجیر" ئێستا ئەم ناوچەیە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بە "دینەوەر" بەناوبانگە. لەم شوێنەدا بەشی دووهەمی سروودەکانی گاتا بۆ زەردەشت داهۆنرا. کەی گوشتاسپ کە کۆشکەکەی بە ناوی "کەنگ شا" ناو دەبریا و لە سەر چیایەک دروستی کردبوو، ئایینی ئەوی پەژراند، بوو بە گەورەترین پاڵپشتی زەردەشت و

یارانی. ئەم شوێنە ئێستا لە بازێری "سەحنە"یە کە لەو سەردەمە بە شاهیندژ، شاییندژ، ساییندژ" بە ناوبانگ بوو. زەردەشت هەروەها ئاگرگایەکی لە "باکتەریا" دایمزراند. ئەم شوێنە لە دوای هەزاران ساڵ بە ناوی "پارسینە" لە هەریمی "دینەوەر"ی کرمانشا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ماوەتەوە. پاشان باکتەریا گۆڕیا بە "باختەر" و ئەم گوندەش ئێستا ماوە. "ڕۆستەم و زۆراو بە زمانی ئاڤێستا، ل. 35 و 36". نووسەر و زمانەوان «محمدامین هەورامانی» لە هەفتەنامەی "ئاویەر" لە ژمارەی 52 ساڵی 3 لاپەڕەی 12 باسێکی لەسەر ئاویەر نووسیوە کە جێگای سەرنجە: "بە ڕەواڵەتدا ئەم وشە ناساکارەیە "ئاویەر" وەها خۆی دەردەخات، کە فرە کۆن بێت! ئەگەریش وەها بێ، دەبێ بەم جۆرەی خوارەوە لێک بدرێتەوە واتە، وشەی "ئاویدەر" لە هەر دوو دۆخی لێکدانەوەدا لە دوو بەشی سەرەکی پێک هاتووە و ئەوانیش ئەوەی کە دەبێ لەم ڕووەوە بوترێ ئەوەیە کە فەرهەنگە پارسیەکان و جوگرافیاناسانیان هەوڵیان داوە کە سەرپاکی ناوە کوردیەکان بۆ زمانی پارسی وەربگێڕن و ئەمەش جۆرە کارێکە کە دەستی بۆ سنگەوە ناگیرێ و جۆرە تاوانێکی مێژوویی و جوگرافیایی و ئینسانیشە کە هەرگیز لە بیر ناچێتەوە! پاش ئەم لێکدانەوەیە دەبێ ئەوە لە یاد نەکەین کە ئاویەدەر یەکێک لەو جێگایە پیرۆزانە بووە کە زەردەشت لە کاتی هاتووچۆکردنی لە "شیز"ەوە بەرەو "لوڕستان" بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لە ئاویدەردا ماوەتەوە و ئەوجا بەشی دووەمی ڕێگابڕینەکەی گرتووەتە بەر کە لە هاتن و چوونەوە و گەڕانەوەدا ڕێگاکەی بە قەراغی "سیروان"دا تێپەڕیوە".

بە بڕوای من گوندی بەڵخە ئێستا لە هەورامان لە سەر سنووری دەستکردی "ئێران و ئێراق" هەڵکەوتووە و ماوە. ئەم شوێنە سەردەمی خۆی بازێرێکی مەزن بووە و کۆشکی بە ناوبانگی کەی گوشتاسپی لێ بووە، هەرچەندە ئێستا لە شێوەی گوندێکی چەند ماڵی لێ ماوە، بەو مەرجە کە لە دوای داگیرکاری عەرەبە موسوڵمانەکان و هێرشی بێ بەزیی مەغۆلەکان و پاشان سەردەمی ڕژێمی بەعس

ئەم شارە دێرینە شتێکی وای لێ بە جێ نەماوە. ئەم شوێنە لە نێوانی گوندەکانی "دەڕەی مەڕ، دەرکێ، هانەگەرمەڵە، ڕەشین و دزڵی و شارەکانی هەڵەبجە و مەریوان" هەڵکەوتووە.)



# کاروانێک بە دەم ڕێگایەوە



لە ناو خامۆشیی شەودا کە هەموو باژێری شیزی داگرتبوو، کاروانێک بە هێمنی و ئەسپایی بەرێ کەوت. کاروان ئامانج و مەبەستێکی دووری هەبوو، بەرەو باشوور، هەرێمی ژێر دەستەڵاتی شاگوشتاسپ و سەرکاروانیش زەردەشت بوو. کاروانەکە دەبوایەت بە ئارامی لە شار بچوایەتە دەرەوە،هۆکەشی ئەوە بوو کە ئەگەر دوژمنان و ناحەزان ئاگاداری بڕیاری کۆچبەریی زەردەشت و هەڤاڵانی ببوونایە، هێرشیان دەبردە سەریان و هەموویان بە بێ بەزەیانە دەکوشتن. بەڵام بەختەوەرانە کاروانەکە بێ هیچ گرفت و تەگەرەیەک توانیی لە باژێر بچێتە دەرەوە. هەموو شوێنێک خامۆش و تاریک و بێدەنگ بوو.

لە تاریکیی ئەو شەوەدا کە شنەی با، گەڵای درەختەکانی دەلەراندەوە و ئاوازی جریوەی مەلی شەو و خوڕەخوڕی ئاوی ڕووبار و قەڵبەزەی جۆگە و چەمەکانی سرووشتی دەشتی هەوشار هەموو لایەکی داگیر کردبوو، زەردەشت لە بیردا بوو و رامانە پاکەکانی بە چەشنی ستران و سروود دەوتەوە.

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
بە رامانی پاک و دڵی ڕووناکەوە،
لە بەر تیشکی ڕاستیدا،
ڕوو لە تۆ دەکەم،
ئێمە لە پاداشتی ژیانی ئەنبووژەنی و مینوویی،
کە لایەنگرانت بە بەختیاری دەگەینێت،
بەهرەمەند بکە.
گاتا، هاتی 28، سروودی 2

زەردەشت هۆنراوەی دەهۆنییەوە،هۆنراوەکانی کورت و پڕواتە و دڵنشین بوون. ئەم سروودانەی لە ناوەڕۆک و چوارچێوەدا نوێ بوون، هەر کەس بۆ یەکەم جار دیبیست لە ناخی دڵییەوە حەز و خۆشەویستیەکی لە لا جێگیر دەبوو و ژێکانی دڵی دەلەرایەوە و خۆشییەک لە دڵ و گیانی دەنیشت و لەتەکیدا دەبوون بە یەک. ناوەرۆکی سروودەکانی زەردەشت بۆنی خەم و شیوەن و پرسە و دڵتەنگیی لێ نەدەهات. زەردەشت لە ڕزگاری و بەختیاری و لە ئازادی و شادمانی و ڕێگای خۆشبەختی دەدوا. ڕێگادۆزینەوە بۆ تریفە و تیشکەکانی ئەهۆرایی و توانامەندیی مینەویی و پاکی:

ئەی ڕاستی و ئەی رامانی پاک..!

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
سروود بۆ ئێوە دەهۆنمەوە،
سروودێک کە تا ئێستا کەس نەیهۆنیبێتەوە،
تا توانامەندیی مینوویی و پاکی،
لە ئێمەدا پتر بێت.
تکای ئێمە بپەژرێنە و
شادومانی و بەختیاریمان پێ ببەخشە.
گاتا، هاتی 28، سروودی 3

مرۆڤ پێویستە لەم جیهانی تەسک و ناهەموارەدا لە هەرچی پەستی، نزمی، کەنەفتی، پەرێشانی، سووکی،بندەستی و بەلەنگازییە ڕزگار بێت و هەنگاڤ بۆ جیهانی بەرین* بنێت. لە سەر لووتکەی چیا و زۆزان بفڕێت و لە ناو دڵی ئاسمان تێپەڕێت و هەوای پاک و خاوێن هەڵبمژێت و لە ئاسمانەوە دیمەن و جوانیەکانی ژیان ببینێت. مرۆڤ پێویستە ژیانی بوونەوەرانی ناو زۆنگاوەکان* و گۆلاوەکان ڕەها بکات و پا بنێتە سەرپەلی درەختەکان. دەشێت سەری بەرز ڕاگرێت و پا بنێتە ناو ڕێگایەک کە بەرەو داوێنی زۆزانەکانی دڵڕفێن دەگات. لە هەوراز و نشێو و کەژ و کۆ تێپەڕێت و خانوو لە سەر ترۆپکی چیاکانی دروست بکات. دەشێ بە دڵ، خۆی بداتە دەست شەپۆلی دەریا، تا بە سەرزەمینی سەوز و خۆش و خوڕەم بگەیەت. پێویستە پەرتووک و پەراو* و خامە بە دەستەوە بگرێت و بیخوێنیتەوە و بینووسێت و لە ژەرفاگی تاریکی و نەزانی، کە بێجگە لە خراپی و ناشیرینی و خۆویستی و بای هەوا و ستەم و بێداد و دڵڕەشی و بەدگومانی شتێکی دیکە بەدی ناکرێت، بێتە دەرەوە. کاتێک هزر و ژیریی مرۆڤ ڕێگەی زانستی دۆزیەوە، ئینجا تریفەی گەرمی زانست پەردەکانی تاریکی دادەدڕێنێت و هەموو بەشە ژەنگ لێنیشتووەکانی دڵی خاوێن دەبێتەوە و دەروون

و گیانی دەبات بەرەو جیهانی جوان و پاکی مینوو. ئەرێ دەشێ کەژ و چیا و ڕێگای گران و سەخت و تەنگەبەرییەکانی دەروون تێ بپەڕێنێت، تا هەنگاو بنێتە ناو ڕێگای ڕاستی. هەنگاو بۆ ڕێگایەک کە سەرئەنجامی مرۆڤ بە ئاوات و دڵخواز و ویستی دەگەیەنێت. ئەو ڕێگایە، ڕێگەی ڕاستییە.

وا من ڕەوانی خۆم لەتەک رامانی پاکدا،
بەرەو سەرای بەرین ڕێنوێنی دەکەم و
بە لەبەر چاوگرتنی ئەو پاداشتەی کە مەزدا ئەهۆرا
بۆ کرداری پاکی دیاریی کردووە،
تا هێز و توانام هەیە،
کۆمەڵان فێر دەکەم کە
لە ڕێگای ڕاستیدا تێبکۆشن.
گاتا، هاتی 28، سروودی 4

"ئەی درۆزنان! زاری خۆتان داخەن، ئەی ناپاکان! ڕووتان وەشارن، ئەی خراپەکاران! بچنە کون و قوژبنەکانتان، ئەی ستەمکاران! بچنە ناو ڕەفی گورگانی هاوپیشەتان و ببن بە هاودەمی چەقەڵ و کەمتیارەکان، لە خۆتان و جیهانتان بێزارم. هەرگیز توانای دیتنی نیگاکانی پڕ خۆویستی و خۆپەسەندیی کرداره دڵ ئێشەنەرەکانتانم نییە. جیهانی من جیهانی ڕاستی و جیهانی وەهمەنە، جیهانی رامانی پاکە. وزەی دڵم ئەهۆراییە. ئاوازی دەروونم کە لە دڵم سەرچاوە دەگرێت، من بەرەو شتی جوان و باش ڕادەکێشێت. هەرگیز لە خۆم بیر ناکەمەوە و ئێستا کە لە تیشکی مەزدا و جیهانی ڕاستی و پاکی تێگەیشتم، تێدەکۆشم کە لە دەروونی تاریکییەوە ڕێگا بەرەو ڕووناکی و ئازادی بدۆزمەوە و گومڕایانی

چارەڕەش و گرفتاری ستەم و بێدادی ستەمگەرانی خوێنمژ و نادان بەرەو جیهانی ڕووناهی ڕێنموونی بکەم."

ئەی ڕاستی..!
کەی دەتوانم بتبینم؟
ئەی رامانی پاک..!
کەی دەتوانم لە داناییدا بە تۆ بگەم؟
ئەی ئەهۆرای بەتوانا..!
کەی دەتوانم ڕێگات بدۆزمەوە؟
کەی دەتوانم سرووشی یەزدانی ببیستم؟
هیوادارم لە بەر پرشنگی پەیامی بیرخرۆشێنەرت و
هێزی گوفتاردا،
ڕێپیشاندەری گومڕایان بم.
گاتا، هاتی 28، سروودی 5

دوژمنان هەموو شوێن قوژبنێکیان گرتبوو. زەردەشت و هەڤاڵانی لە ناو گەمارۆی سەخت و گرانی دڵڕەشان و نەیارانی پاک و دڵچەپەڵەکاندا بوون. لە هەموو جێگایەکەوە دەنگی لوورەی گورگ دەهات و دڵی شوان و گاوانیان خستبووە ترس و لەرزەوە. کەرپانەکان و کاویەکان پێیان لە سەر ئەوە دادەگرت کە پێویستە هەموو جێگایەک لە ژێر ڕکێفی دەستەڵات و فەرمانڕەوایان بێت و هەموو چتێک بە پەردەی ڕەشی تاریکی و نەزانی داپۆشرێت. هەمیشە پرسە و شین دانرابێت و نابێت هیچ بەستە و ئاوازێکی خۆش و شادیهێنەرێک لە شوێنێک ببیسرێت، هیچ ئاهەنگ و نەوایێک لە ساز و ئامێرێک هەستێت. گەرەکە هەموو جێگایەک ڕەش و تاریک بێت و دەبێت وەک گۆرستان، خامۆشی و ماتەمی بە

سەر هەموو شوێنێکدا زاڵ بێت. دەبێت هەموو ڕۆژێک قریشکەی داڵەکەرخۆرەکان لە ئاسمانەوە هەستێت. کەو و کۆترەکان دەبێت بمرن و پەڕەسێلکەکان بڕۆن و تەنها داڵەکەرخۆرەکان دەبێت بە ئاسمانەوە بفڕن و تەنها دەنگی ناخۆشی داڵ و قالاوەکان لە سەر چڵی درەختەکان هەستێت و هەر ئەوان دەبێت ڕووی نیگای ترسناکیان لە ڕووی زەوی بێت.



بەڵام زەردەشت، ئەم چەشنە ژیانەی نەدەویست. ئەو دەیخواست لەتەک نەیارانی خۆی و لەتەک هەمووی ئەوانەی کە چاوەدێر و پارێزەری ستەم و نادانی و تاریکین بجەنگێت. ئەو دەیویست داڵەکان بە سەر بەرزایی خانووەکان و دەشت و زەوی و کێڵگەکان وەدەرخات و پەڕەسیلکەکان و بە تایبەت کۆترەکان بۆ کلک و باڵخشاندن بە دوای یەکدا و بۆ دەربڕینی خۆشەویستی و گمەگمەکردنیان هان

بدات. ئەو شەیدای دەنگ و چریکە و خوێندنی باڵندەکانی بەهار و هەموو ئەو پەڕەندانە کە خۆش ئەیانچریکاند. ئەو دینی* هەڵاتنی هەتاو و هەروەها پشکوتنی گوڵی گوڵەبەڕۆژە بوو و ئارەزوومەند بوو هەموو کەس وەک گوڵەبەڕۆژە ڕووی لە ڕۆژ و ڕووناکی بێت. لە تیشک و گەرما و جوانی و ڕووی لە گەشانەوە و پشکووتن و بەهرەمەندی و سوودمەندی و ڕوو لە زایاندن و بەدیهێنان و ئافراندن و چێکردن بێت. ئەو ستایشتی ڕۆژ و مێهری دەکرد و بۆ مێهر و ڕۆژ سروودی چێ دەکرد و دەیخواست جیهان هەمیشە بە تیشکی خۆر و مانگ ڕووناک ببێتەوە. زەردەشت دەیویست ژیان و تەمەنی درێژ بێت تا بتوانێت سروود و هۆنراوەکان بخوێنێت و هزر و ئەندێشە و هەستەکانی بنوسێت. هەروەهاش داواکاری تەمەندرێژی و بەختەوەری و شادمانی و کامەرانی و سەرفرازی بۆ هاوڕێیانی لەتەک هەموو خەڵک بوو.

ئەی ڕاستی و ئەی رامانی پاک..!
بەرەو ڕووی من بێن،
خەڵاتی تەمەندرێژیم پێ ببەخشن.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
بە گوتاری ڕاستی خۆت،
بە زەردەشت و هاوڕێیانی،
وزەی مینوویی و شادومانیمان خەڵات بکە،
تا بە سەر ئازار و ڕکی نەیارانماندا زاڵ ببین.
گاتا، هاتی 28، سروودی 6

ئەی مەزدا..!
ئەو چەواشەکارانەی

کە پشت لە رامانی پاک دەکەن،
با ڕەنج بکێشن و ئازار بچێژن.
ڕاستکاران کە وا ناکەن، ئەوە نەبینن.
ڕاستڕەو هەرچەندەش هەژاریش بێت،
لە لای ڕاستڕەوان هەر خۆشەویستە،
چەواشەکاریش،
هەرچەندە زەنگین و توانامەندیش بێت،
بێ ئەرجە.
گاتا، هاتی 47، سروودی 4

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
تۆ لە بەر تریفەی رامانی پاک،
مژدەی باشترین خەڵاتت
داوەتە ڕاستکرداران.
بەڵام چەواشەکار
لە مێهری تۆ بەهرەمەند نابێت.
چونکە چەواشەکار،
رامان و کرداری
ناشرین و نادرووستە.
گاتا، هاتی 47، سروودی 5



زەردەشت بیستی گوشتاسپ پیاوێکی زانایە و بۆ پەرەپێدانی ڕاستی تێدەکۆشێت، بۆیە داخوازی ئەو لە ڕاستی و پاکی ئەوە بوو کە پاداشتی ڕامانی پاک ئەوە بێت کە بە کۆمەڵان هێزی تێڕوانینی دروست و توانای هەڵسەنگاندن و پێوەریی ڕاست و مێهرەبانی و هێمنی و مودارایی* و ئاوەدانگەری بدات و هەروەها ئارەزووی گوشتاسپ بێتە دی. زەردەشت هیوادار بوو کە توانای ئەوەی هەبێت کە ئەو شتەی لە مێشک و دڵیدایە بە گەلان ڕابگەیێنێت تا کۆمەڵان ڕێگای کامەرانی و خۆشبەختی و ڕزگاری و سەرفەرازی ببیننەوە و زیندەگی بە سەربەرزی و شادمانی ڕاستەقینە ببەنە سەر.

ئەی ڕاستی..!
ئەو خەڵاتە بە ئێمە ببەخشە،
کە بەهرەی رامانی پاکە.
ئەی پاکی..!
ئارەزووەکانی «گوشتائەسپ» و پەیڕەوانی بە جێ بهێنە.
ئەی مەزدا..!
وزەمان پێ ببەخشە،
تا پەیامی تۆ بە هەمووان ڕابگەیەنین.
گاتا، هاتی 28، سروودی 7

هەروەهاش بۆ فرەشەوشتریش کە بیستبووی ڕێگای دانایی دەپێوێت و دڵی بۆ ڕاستی لێدەدات، ئارەزووی رامانی پاکی بۆ هەبوو. چونکە زەردەشت دەیزانی تەنیا بە رامانی پاکەوەیە کەسانێکی وەک فرەشەوشتر دەتوانن ڕێبەرایەتی و سەرۆکایەتی خۆیان و خەڵکیان بەرەو ڕووناهی ببەن. بۆیە زەردەشت لە ئەهۆرای پاک، هێڤی و ئارەزووی رامانی پاکی بۆ خۆی و هەڤاڵانی دلێری دەخواست.

ئەی ئەهۆرا..!
ئەی باشترین و لە هەمووان چاکتر..!
ئەی هاودەمی باشترین ڕاستییەکان..!
لە کانگای دڵەوە تکا دەکەم،
کە جاویدانی و رامانی پاک
بە «فرەشەوشتر»ی دلێر و یارانی ببەخشیت.
گاتا، هاتی 28، سروودی 8

کردار و ویستی زەردەشت بە چەشنێک بوو کە هەرگیز نەیدەخواست ئەهۆرا مەزدا و ڕاستی و رامانی پاک لە خۆی بەڕەنجێنێت و بۆ جڤاکیش ئەم شێوە کردار و ویستەی ئاوات دەخواست.

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەی ڕاستی..!
ئەی رامانی پاک..!
بەو بەخششەی کە بۆ من هەتانە،
هەرگیز ئازارتان نادەم،
تێدەکۆشم کە ستایشتی خۆم
بە ئێوە نیاز بکەم،
کە ئێوە و توانای مینوویی ئێوە،
شایانی ستایشتن.
گاتا، هاتی 28، سروودی 9

زەردەشت لە مەزدا ئەهۆرا دەپاڕایەوە بۆ ئەو کەسانە کە دارای رامانی ڕاست و دادگەر و دروستکردار بوون، بەڵام لە هەمان کاتدا ئاوارە و ڕاکردووی دەستی ستەم و درۆ و ناپاکی بوون. زەردەشت و هەڤاڵانی هیوادار بوون کە جێگایەک ببیننەوە کە بیر و بۆچوون و ئارەزووەکانیان بە ئازادی و سەربەستی بە کار بهێنن و بیخەنە ناو گەڕ و ئازموونی ژیاندا. زەردەشت بە دڵ نیایشتی لە مەزدا ئەهۆرا دەکرد بۆ سەرکەوتنی ئەم کەسانە و هاتنە دیی ئاواتەکانیان. زەردەشت باوەڕی ئاوا بوو کە پاڕانەوەیەک کە لە دڵەوە هەستێت و ئەنجامی چاکەی بێت، وەڵامی دەدرێتەوە.

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئاواتی ئەو کەسانە بەجێ بهێنە،
کە دەیانناسیت و دەزانیت
ڕاستبێژ و بیرچاک و دروستکارن.
من چاک دەزانم
کە تۆ وەڵامی هەر نیایشتێک
دەدەیتەوە،
کە لە کانگای دڵەوە هەڵبقوڵێت و
بۆ ئارمانجێکی چاک بێت.
گاتا، هاتی 28، سروودی 10

زەردەشت لەتەک بیرکردنەوەدا هۆنراوە و سروودیشی چێ دەکرد و لە هەمان کاتیشدا ڕێبەرایەتیی کاروانیشی لە سەر شان بوو. سەرئەنجام دوای تێپەڕینی ڕۆژانی سەخت و ناهەموار و دژواری فراوان و دیتنی کۆمەڵانی خەڵک و تێپەڕکردنی دەشت و دەرە و چیا بەرزەکان، گەیشتنە باژێری «بەڵخە» لە هەورامان. زەردەشت و یارانی دوای دەرکردنی ماندوویی و شەکەتی ڕێگا لە لەشیان، بڕیاری دا بۆ دیتنی کەی گوشتاسپ سەردانی کۆشک و قەڵاکەی بکات.

لەو سەردەمەدا کۆشکی کەی گوشتاسپ و باژێری بەڵخە، ناوەندی مشتومڕ و کێبەرکێ و لەیەکدانی رامان و بیر و بۆچوونەکان بوو. لە چواردەوری هەورامان و ناوچەکانی دیی سەرزەمینی میدیا، زانایان و پەیجۆران و فەرزانەکان ڕوویان دەکردە ئەو باژێرە و لە کۆشکی شاگوشتاسپ خەریکی گفتوگۆ و پشکنین و هەڵسەنگاندن و بەراوەردکردن و لەیەکدانی ئەندێشەکان و بابەتی جۆراوجۆر و نوێ دەبوون. زانایان و فەرزانەکانی ناو قەڵا زۆر تامەزرۆی دیداری زەردەشت بوون، چونکە پێشتر پەسنی رامان و زانست و پاکی و ڕاستی زەردەشتیان

بیستبوو. سەرئەنجام چاوەڕوانیان کۆتایی پێ هات و زەردەشت چوو بۆ سەردانی پاتشا و فەرزانەکانی.



# زەردەشت و زاناکان



کۆڕ و نشستێکی مەزن بوو. کەی گوشتاسپ لای ژوورەوەی تالار دانیشتبوو و جام ئەسپ و فرەشەوشتریش لە تەنیشتی و چەندەها فەرزانەی دی بە دەوری تالاردا. زەردەشت هاتبوو تا گوشتاسپ و زانایان لە هزر و رامانی خۆی ئاگادار بکات. دوای ڕێز و بەهات هاتن و دروود و بڕێک بابەتی سەرەتایی پرسیارەکانی دانیشتوانی کۆڕەکە بەم چەشنە دەستی پێ کرد:

"ئەم بوونی بێکەرانە چییە، سەرەتا و شوێنی پەیدابوونی چییە؟ بوون بۆ کوێ دەڕوات و ئێمە بۆ کوێ دەچین؟ بوون لە کوێ بەدی هاتووە و کەی و چۆن بەدیهاتووە؟ کۆتایی بوون کەی و لە کوێ و چلۆنە؟ گەلۆ بوون سەرەتا و پایانێکی هەیە یان بێکۆتایی و بێکەرانە؟ بەدیهێنەری هەستی کێیە؟ ئافراندن چلۆن ئەنجامی گرتووە؟ جیهانی ئێمە چۆن بەدیهاتووە؟ ئایا جیهان لە جووڵەدایە یا ڕاوەستاوە؟ ئەگەر دەجووڵێت، بزوانی هەمیشەیی جیهان لە چییەوەیە؟ گەڕیان و ڕۆیین و دەرهاتن و باڵاکردن و گەشەکردن و گەورەبوون و پیربوون و داوەشیان و مردنی دیاردەکانی هەستی لە چییەوەیە و بۆ چییە؟ سەرەتای ئەم گەڕیان و گۆڕانکاریانە لە چی بووە و بۆ چییە؟ گەڕیان و گۆڕانکاری لە کوێ دەستی پێ کردووە و بزوێنەر و هەڵسووڕی یەکەمین کێ بووە؟ گەلۆ ئەو گەڕیان و گۆڕانەی سەرەتا بووە، یاکوو زنجیرە گەڕیانی دی بەدی هێناوە؟ ئەگەر وایە ئەو گەڕیان و و گۆڕانی یەکەمینە هۆ و دەندەر* و ویستی چ بووە؟ ئایا ئەو گەڕیان و ویستە، هۆشیارانە و لە ڕووی ئاگایی بووە یا نائاگاهانە و ناهۆشیارانە بووە؟ هۆ و چەمەکی* سەرەتای ئەم

شوور و خرۆش و دەنگ و هەرای بوونە چ بووە؟ هاندەری یەکەمین کێ بووە و نێوانی هۆی یەکەم و هۆکانی دوایی چ پەیوەندییەک بووە و هەیە؟ مرۆڤ کێیە؟ ئەم دیاردەی هەرە سەرەکییەی سەر زەوی، مرۆڤ، ئەم بوونەوەری مێشکدار و باهۆشە، بە چ چەشنێک بەدی هاتووە و چۆنیەتیی ئافراندنی چییە؟ نێوانی ئەم بوونەوەرە و بوونەوەرانی دیکە چ پەیوەندێک هەیە؟ ئایا مرۆڤ بەرزتر لە هەموو بوونەوەرانە یا لە زنجیرەی ئافراندندا بازنەیەکە لە بازنەکانی بە یەک بەستراوی ئافراندن؟ خێرەت و هۆش و رامان و هەست و نەست و هێزەکانی دیکەی ڕەوانی مرۆڤ لە چییە؟ ڕەوشت و دیاردەکانی مرۆڤ، وەک باڵاکردن و گەشەکردن و گەییینی ژیان، لە ڕووی زەوی وەریگرتووە یا مرۆڤ لە سەرەتادا بەم چەشنە بەدی هاتووە؟ بۆچی لە تەن و پەیکەر و برێک لە هێزەکانی ڕەوانی مرۆڤ و گیا و ئاژەڵەکان، زنجیرەیەکی بەستراو هەیە و مرۆڤیش بازنەیەکە لەم زنجیرەیەدا؟ ئەگەر وایە چلۆن و بۆچی مرۆڤ لە بوونەوەرانی دیکە ڕێکوپێکترە و چلۆن بە توانای بیرکردنەوە و چێ کردن و بەدیهێنان گەیشتووە؟ هێزی دروستکردن و ئافراندن لەناو مرۆڤدا لە چییە؟ ئایا ئەم وزەیە بەهرەیەکی سرووشتییە یا لە وەرزش و گەشەکردنی مێشک و ئەندێشە سەرچاوە دەگرێت؟ لە ناو ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ، چاکە و خراپە چەس، داد و ستەم و زەریفی و ناشرینی چەس؟ سەرچاوەی باشی و بەدی، داد و ستەم، قەشەنگی و ناحەزی چەس؟ ئایا کردگاری چاکە و خراپە، داد و بێداد، جوانی و ناشیرینی یەکێکە یا هەر یەک بەدیهێنەرە و دروستکەری دیاریکراوی هەیە؟ هەژاری و دەوڵەمەندی، پلەمەندی و نزمی و نابەرابەریی کۆمەڵان لە چەدایە؟ بۆچە یەکێک لەو پەڕی توانا و ناز و دارایی و بووندایە، بەڵام یەکێکی تر لە ناو ڕەنجبەری و داماویدایە؟ توانامەندیی و بەلەنگازی، کەسێک پاتشا و یەکێک گەدا، کەسێک سەروەر و یەکێک بندەست و ئاتاج، ئەمە چەس؟ ئایا بەخت و چارەنووس هەرمانییە*، یا مرۆڤ ناچارە، یا گرێدراوی دەستی خۆی یا کۆمەڵگایە؟ مەرگ و ژیان چییە و گەلۆ پاش مردن زیندەگییەکی نوێ دەست پێدەکات، یا ژیان لەتەک مردندا بۆ هەمیشە کۆتایی پێ دێت؟ سزا و پاداشت چییە و ئایا کەسێک کە ستەمکارە لەم جیهانە یا لە جیهانێکی دیکە دەبینێت، کەسێک کە ڕەنج و ئازار دەکێشێت، پاداشتێک لە جیهانێکی دیکە وەر دەگرێت؟ یا سزا و پاداشت نییە و هەر کەس هەر کارێکی کرد، چەند و چوون و پرسینەوەیەکی بۆ نییە؟ پێش لەوە مرۆڤ بۆ ئەم جیهانە بێت لە کوێ بووە و چۆن ژیانێکی هەبوو؟ ئافەریدەگاریش پێش لە ئافراندن لە کوێ بووە و خەریک بە چی بووە و ئایا پێش لەوە زەوی و گیا و مرۆڤ و گیانلەبەران دروست بکات، بوونەوەرانی تری بەدی هێنابوو؟ چارەنووس چییە؟ ئایا مرۆڤ لە ژیاندا سەربەستە* یا ناچارە*، ئەگەر سەربەست یا ناچارە هۆ و چەمکی لە چیدایە؟ ئەگەر مرۆڤ ناچارە کەوایە سزا و پاداشت بۆ چییە و ئەم هەموو ئایین و داپ* و دەستوور و بەربەست و پەند و ئامۆژگارییانە بۆ چییە؟ ئافەریدەگار چییە و چ هێزێکی بە بووندا هەیە و شێوەی چۆنە و ئایا ئەو جۆرە کە مێهرپەرستان و ڕۆژپەرستان دەبێژن مێهر و هەتاو و دیاردەکانی دیکەی گەردوون یەزدانن و یا ئەمانە یەزدان نین و بە سەر هەمووی ئەمانە یەزدانێکی مەزنتر فەرمان دەدات؟"

لەمێژ بوو کە ئەم پرسیارانە لە کۆڕ و نشستەکانی شاگوشتاسپ و یارانی دەمەتەقێ و وتووێژی لێدەکرا. پەیجۆران هەر لە بەیانی تا بەری ئێوارە لەتەک یەکتردا گفتوگۆ و دەمەتەقێیان دەکرد و بۆچوون و ڕوانگا و بڕوای جیاوازی خۆیان دەهاوردە سەر زمان و ڕۆژیان بەم چەشنە دەبردە سەر، بێ ئەوەی ئەنجام و یا سوودێکی لێ بکەوێتەوە، ماندوو و شەکەت هەڵدەستان و دەڕۆیشتن.

ئەمرۆش دووبارە کۆ ببوونەوە، بەڵام بە جیاوازییەکی زۆر تایبەت. ئەوەش بوونی زەردەشتی هێژا لە ناو ئەو کۆڕەدا و بە تایبەت فەرزانەی هێندی «چەنگەرگاچا»*، کە لە هێندوستانەوە بە دوای دۆزینەوەی ڕاستی وێڵ و سەرگەردان،

کۆشکی شاگوشتاسپی بینیبووە. دوای ئەوە کە پرسیاری زانایان کۆتایی پێ هات، هەموویان چاویان بڕییە زاری زەردەشت کە چۆن وەڵامی گشت ئەو پرسیارانە دەداتەوە. زەردەشت هەستایە سەر پێ و سەرەتا چەند سرووددێک لە سروودەکانی خۆی بە ئاوازێکی خۆش و بەرز و ڕەسا خوێندەوە:

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
بە سرووشی خۆت،
من بە نیایشتەکانم،
کە پاسەوانی هەمیشەیی ڕاستی و رامانی پاکم،
فێرم بکە و پێم بێژە:
سەرەتا چۆن بوو و
ئەم بوون و ئافراندنە چلۆن بەدی هاتن؟
گاتا، هاتی 28، سروودی 11

ئەی مەزدا..!
من، زەردەشت
لایەنگری ڕاستی،
بە ئاوازێکی بڵند و ڕێزەوە
ستایشتی تۆ دەکەم،
ئارەزوومەندم هەمیشە
زمانم بۆ ڕێگای ژیریی بوێژ بکەیت و
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
ئایینی خۆتم بۆ ئاشکرا و فێرم بکەیت.
گاتا، هاتی 50، سروودی 6

ئەی مەزدا..!
ئەو بەختیارییەی کە لە بەر ڕووناکیی تیشکی مینوویی،
لە ڕێگای ڕاستییەوە،
بە هەر دوو گروو مزگێنیت داوە و
ئەو ئایینەی کە بۆ فەرزانەکانە،
بە گوفتاری خۆت،
بۆ ئاگابوونەوەی ئێمە، ئاشکرا بکە
تا من، هەموو کۆمەڵان

بۆ لایەنگیری لە ئایینی ڕاستی بانگەواز بکەم.
گاتا، هاتی 31، سروودی 3

ئەی پەیجۆرانی دانش..!
ئێستا ئەم ڕاهێنان و گوتارانەی،
کە تا بە ئێستا نەبیستراون،
بۆتانی ئاشکرا دەکەم.
بێگومان، ئەم گوتانە،
بۆ ئەو کەسانە ناگەوارە کە،
بە ئامۆژگاریی درۆ،
جیهانی ڕاستی بەرەو وێرانی دەکێشن و
بۆ سەوداسەرانی مەزدا، شادیبەخش و باشترینە.
گاتا، هاتی 31، سروودی 1

پاشان زەردەشت ڕووی کردە گوشتاسپ و فەرزانەکان و فەرمووی: "گرانبەهاترین و پایەبەرزترین و باشترین و کەم وێنەترین دیاردەکان لە جیهان و هەستیدا کە ئەهۆرا مەزدای پاک بە ئێمەی بەخشیوە، رامان و خێرەتە. ئەی کەی گوشتاسپی دلێر! ئەی زانایان! پرسیارەکانتان فرە پڕواتە و دژوارن. دەبێت بۆ هەر یەکیان وەڵامی تایبەت بە خۆی و پڕ بە پێستی بدرێتەوە، منیش بۆ ئەوە کارەکەم ئاسان کردبێتەوە، لە مێشک و بیر و رامانی خۆتان یارمەتی وەردەگرم و بەرسڤی هەموو پرسیارەکان بە یەکجار دەدەمەوە."
زەردەشت ئەمەی فەرموو و لە ناو سەرسووڕمان و چاوەڕوانیی شاگوشتاسپ و زانایانی دی، دەنکە گەنمێکی دەر هێنا کە لە تۆی خامێکی سەوزدا پێچرا بوو، نایە بەردەمیان و فەرمووی: "هەموو پرسیارەکانتان ئەم دەنکە گەنمە وەڵامی دەداتەوە. لەمەڕ ئەم دەنکە گەنمە بە وردی و شێنەیی بیر بکەنەوە و وەڵامی خۆتان وەرگرن." شاگوشتاسپ و یارانی کە چاوەڕوانی گوتاری دوور و درێژ و وردبینانە و گرینگ لە زەردەشت بوون، لەم کارەی زەردەشت سەریان سووڕ ما و زۆر بە لایەنەوە سەیر بوو.



خێرا بێ ئەوە بیرێکی لێ بکەنەوە، برێکیان کەوتنە پێکەنین و تیتاڵیکردن*، هێندێکیشیان گرژ و توڕە بوون. شاگوشتائەسپیش زۆر بە گرژی و تووڕەیی ڕووی کردە زەردەشت و گوتی: "بیستبووم کە تۆ زۆر دانا و هۆشیار و ژیری..." بێ ئەوە کۆتایی بە قسەکانی بهێنێت، بە پەلە هەستایە سەر پێ و لە تالاری کۆشکەکەی چووە دەرێ. فەرزانەکانیش بە دوای ئەودا هەستان و زەردەشتیان بە جێ هێشت.

تەنیا "چەنگەرگاچا"ی هێندی مایەوە. چەنگەرگاچا دەنکە گەنمەکەی لە سەر زەوی هەڵگرت و ڕووی کردە زەردەشت و گوتی: "ئەی زانا! ئەی فرە زانا! ئەی کە بانتر و سەرتر لە هەموو زانایینی جیهانی! ئەی زانستڤانی ڕووناهی! ئەی کەسێک کە دەریای مێشک و ئەندێشە و هزر و زانستی بێ سنوور و پڕفراوانە! من ساڵانی زۆری تەمەنم لە وڵاتی هێند و کشوەرەکانی دیکە بە دوای ڕازی ئافراندن، هەستی و ژیان بردۆتە سەر. سەدان زانا و لێهاتوو و بەلیمەتم دیوە، بۆ گوتاری زۆربەیان گوێم گرتووە هەزاران گوتەم بیستووە، سەدان نووسراوەم خوێندوەتەوە زۆر ڕۆژ و شەوگارم بە تەنیایی و بیرکردنەوە بردۆتە سەر، بەڵام تا پێش ئێستا ڕێگای ڕاستیم نەدۆزیبووەوە. بیستم لە نیشتمانی مانگ، لە وڵاتی چیا بەرزەکان، لە میدیا، فەرزانەیەک هەیە کە توانیویەتی هەموو ڕازەکانی بوون و ژیان و ئافراندن بدۆزێتەوە. بەم هیوا و ئاواتە کە وەڵامی پرسیارەکانم لە لای تۆ بدۆزمەوە، بووم بە ڕێبواری ئەم ڕێگا سەخت و پڕ دژوارەی ئێرە. چەرمەسەری و ڕەنجی فرەم کێشا تا بە ئێرە گەیشتم، ئیمڕۆش کە تۆم دی، بۆم دەرکەوت ئەوەی کە بۆ تۆ لە بارەی زانست و دانایی تۆ گوتوویانە، یەک لە هەزاریش نییە. من بێگومانم کە تۆ بانتر و بەرزتر لە هەموو زانایانی جیهان. ئەی زەردەشت! دەرسێکی* مەزنت بە من فێر کرد. دەریایەک گوتە و قسە نووسین و دەفتەر، هەموویت لە دەنکێک گەنم گونجاند و بۆ منت ئاشکرا کرد، سوپاسی بێ پایانات دەکەم. من ئەو شتەی کە پێویست بوو بۆ زانیین و تێگەیشتن، فێر بووم. تۆ کلیلی مەزنی گەنجینەی زانستت دایە دەستم. دەبێت من بۆ وڵاتی خۆم بگەڕێمەوە، ئیدی پێویست ناکات لەمە زیاتر لێرە بمێنمەوە.

چەنگەرگاچا، هەستا و ناوچاوانی پاک و ڕووناکی زەردەشتی ماچ کرد و ڕۆیشت. زەردەشتیش بە دڵێکی پەژار و غەمگین لە هەڵسووکەوتی بە پەلە و ناوردبینانەی شاگوشتاسپ و هەڤاڵانی لە کۆشک و قەڵای گوشتاسپ چووە دەرەوە و ڕووی کردە کەپر و باخچەی خۆی. (سەبارەت بە چەشنی هەڵسووکەوتی توند و گرژی کەی گوشتائەسپ لەتەک زەردەشت لە کۆڕی یەکەمدا، چیرۆک و ئەفسانەی جۆراجۆر گوتراوە، کە هەموویان نیشانەی ئەوەیە کە لە دیداری یەکەمی نێوان زەردەشت و شاگوشتاسپ شتێک بەدی نەکراوە، و زەردەشت زیز بووە و دەر کراوە)

دوای کۆتایی پێهاتنی وتەی زانای هێندی و پاشان ڕۆیشتنیشی، گوشتاسپ و زانایانی دەوروبەری سەریان سووڕ ما و کەوتنە بیرکردنەوە و پرسیار لە خۆیان، ئەو دەنکە گەنمەی زەردەشت چیی تێدا بوو کە ئەو زانا سەرگەردانەی هیندی ئاوا شاد و دڵخۆش و بێ وستان و کەیفخۆش گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی؟ (دەبێژن چەنگەرگاچا هەمان زانای هیندییە کێ لە دوای گەڕانەوەی بۆ هێند نووسراوە بەناوبانگەکەی "ڕیگڤیدا"ی بە چەشنی سروود نووسی. ڕیگڤیدا لە نووسراوەکانی هەرە پیرۆز و گەورەی ڕۆژهەڵاتە).
جامئەسپ و فرەوشەوشتر زۆرتر لە هەمووان ئەم پرسیارەیان لە مێشکی خۆیان دووپات دەکردەوە. تا سەرئەنجام جامئەسپ کەوتە قسە و گوتی: "ئەی کەی گوشتاسپ! ئێمە کارێکی فرە ناشیرین و نەگونجاومان کرد کە کۆڕەکەمان بە جێ هێشت. کاری دروست و ڕەوا ئەوە بوو کە فەرزانەی هێندی کردی. زەردەشت بە نیشاندنی ئەو گەنمە پەیامێکی بۆ ئێمە هێنابوو، کە پێویست بوو تێ بگەیشتینایە و بیرمان بخستایە کار. بڕوا بکەن لەو کاتەوە کە زەردەشت ئەو دەنکە گەنمەی نیشاندین، هەست بە نائارامییەکی سەیر لە ناو دەروونم دەکەم. هەروەها هەست دەکەم دەنکە گەنمەکە لەتەک مندا وتووێژ دەکات و نهێنییەکانی دڵی خۆیم بۆ باس دەکات. من لە کردەی خۆم زۆر پەژیوانم و واش بە باش دەزانم هەموومان داوای لێبوردن لە زەردەشت بکەین و جارێکی تر بانگهێشتنی بکەینەوە."
گوشتاسپ قسەکانی جامئەسپی پەژراند و ئەویش لە کردەوەی خۆی پەشیمان بوو، زانایانی دەوروبەریش هەر بەم چەشنە دانیان بە هەڵەی خۆیاندا نا. بۆیە پاتشا پەیکێکی شاند* بۆ لای زەردەشت بۆ لێبوردن و بۆ ئەوەی جارێکی دیکە بانگهێشتی بکەنەوە بۆ کۆڕ و گفتوگۆکردن. زەردەشت گوێی لە پەیکەکە شل کرد و بە ڕووەیەکی خۆشەوە پێی فەرموو: "من ئەو شتەی کە پێویست بوو فێریان بکەم، کردم، ئیتر کارم لە کۆشکی شا نییە، بەڵام ئەگەر شا و هاوڕێیانی دەیانەوێ چتێک فێر بن، من هەموو بەیانییەک لەم حەوشە و باخچەدا خەریکی ڕاهێنان و فێرکردنم، خەڵک لە هەموو پلە و پایەیەک دێن و فێر دەبن، جا ئەگەر کەیگوشتاسپ و یارانیشی دەیانەوێت شتێک فێر بن دەتوانن بێنە ڕیزی شاگردەکان و دانیشن و بە گوتەکانی من گوێ بدەن."
پەیکەکە گەڕایەوە و پەیامی زەردەشتی گەیاند. کەیگوشتاسپ لە چەشنی وەڵامی زەردەشت زۆر تووڕە بوو. پێی وابوو چۆن زەردەشت پاتشایەک وەک گوشتاسپ بۆ فێرگەکەی خۆی بانگ دەکات؟ گوشتاسپ وەرامی زەردەشتی بۆ جامئەسپی گێڕایەوە. جامئەسپ دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی: "ئەی پاتشا باش بزانە و وریا بە، زەردەشت ئەمجارەش وانەیەکی گەورەی بە تۆ و ئێمە دا. زەردەشت بە تۆی گوت: بۆ فێربوون دەبێت خاکی* بیت و لە قاڵبی دەستسازت بێیتە دەرەوە و وەک منداڵێکی ساوا پاک و بێگەرد و سادە، ڕێگای دەبستان* بگریتە بەر. تۆ تا زەمانێک گوشتاسپشاهی و ناز و هێز و هەستی دەسەڵاتداری لە سەرتدایە، دڵت جێگای فێربوون و بیستنی قسەی نوێی نییە. تۆ بەند بووی بە بیر و بۆچوون و زانیارییە کۆنەکانت، کەوایە هەروا کە زەردەشت فەرموویەتی بەرگی سادەی سپی لە بەر بکە و بتی دەروونت بشکێنە تا مێشکت توانای وەرگرتنی قسەی تازە و نوێی هەبێت."
گوشتاسپ لە تووڕەبوونی خۆی پەشیمان بووەوە و زوو هەستا بەرگی گرانبەهای شاهانەی لە بەر داکەند و پڵاسی سپی و سادەی کردە بەر و لەتەک فەرزانەکان بەرەو فێرگەی زەردەشت بەرێ کەوتن.
کاتێک کە پاتشا و هاوڕێیانی گەیشتنە کن زەردەشت، ئەو و یارانی بە ئامرازی کشتوکاڵ خەریکی کەندن و ئاوەنیای زەوی بوون. زەردەشت کە چاوی بە گوشتاسپ کەوت فەرمووی: "ئەی کەیگوشتاسپ و ئەی جامئەسپ و فرەشەوشتر و

ئەی زانایان! چەندە بە جێ و لە کاتی باشدا هاتن. من و یاران و شاگردانم ماندووین، تکایە ئێمە پشوویەک دەدەین و ئێوە خەریکی کێڵاندن بن."

گوشتاسپشا تۆزێک تێک چوو بەڵام چۆن پێی سەلمێندرا کە زەردەشت قسەی نابەجێ و نەگونجاو ناکات و هەرچەندەش حەزی بەم کارە نەدەکرد بەڵام بە نابەدڵییەوە ملی لێ نا و ئەوانیتریش بە دوایدا دەستیان پێ کرد و تاوێکی پێ نەچوو کە کەیفخۆشییەکی سەیر هەموویانی داگرت. کەسانێک کە تا ئەو کاتەی تەمنیان دەستیان لە پاچ و پێمەڕە و گاسن نەکەوتبوو، ئێستاکە بە دڵخۆشییەکی سەیر، خەریکی کێڵانی زەوی بوون، ئەویش بە خۆشی و حەزێکی زۆر. پێدەکەنیان و تەنانەت چەند کەسێکی دەنگخۆشیان دەستیان کرد بە ستران گوتن. ماوەیەکی پێ نەچوو ئینجا زەردەشت فەرمووی کە پشوویەک بدەن. گوشتاسپ و هەڤاڵانی بە سەرڕوومەتی ئارەقاوی هاتن بۆ ژێر سێبەری دارێک کە زەردەشت و یارانی لە ژێری دانیشتبوون. هەموویان کەیفخۆش و بەدەماخ بوون و هەروەهاش ماندوو، بەڵام هەستیان بە سووکی و تازەیی دەکرد، هەروەک بارێک لە سەر شانیان لاچووبێت.



زەردەشت رووی کردە گوشتاسپشا و فەرمووی: "یەکێک لە خراپەکارییەکانی جەمشیدشا ئەوە بوو کە کاری مێشکی لە کاری لەشی جودا کردبوو. هەر کەسێکی بۆ کارێکی دیاری کردبوو. جەمشید کاری مێشکی و هۆشی لە پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەش و جەستە جیا کردبوو. بەشی هەرە گەورەی ماندوویی و داوەشیان و سستی و توندی و تیژی و نائارامی و نائاسوودەیی و نەخۆشیی فەرمانڕەوایان و بە گشتی دەست و پێسپیان، دووربوون و نەکردنی کار و وەرزشی لەشە. ئێوە لە بەیانی تا شەو دادەنیشن و قسە دەکەن و دەستوور و فەرمان دەدەن، ئەشێت باش بزانن کە لەشی ئێوە نیازمەندی جووڵان و گەڕیانی هەیە. ئەگەر ئێوە بەم نیازە سرووشتیەی لەشتان وەڵام نەدەنەوە، لەشتان دادەوەشێت و بە داوەشینی لەشتان، ڕەوانتانیش دادەوەشێت. ئەم ماندوویی و سیسییەی لەشتان کە هەمیشە کە لە ناوتاندایە، هەرچی دەرمانی بۆ بە کار بێنن، بێهوودە و بێسوودە. هەوڵ بدەن ئەم ئامۆژگارییەتان لە یاد نەچێت، لە هەر کارێکدا کە هەن، هەرگیز کاری لەشی و جووڵان و گەڕیان لە بیر مەکەن و لەشی خۆتان بخەنە کار و بەم چەشنە ماندوویی و داوەشان لە گیانتان دوور و پاک دەکەنەوە".

پاشان کەیگوشتاسپ فەرمووی: "ئەی زەردەشت ئێمە لە ڕازی ئەو دەنکە گەنمە تێ نەگەیشتین و لە کردەوەی خۆمان فرە پەشیوانین و بۆیە داوای لێبوردن و بەخشینت لێ دەکەین و ئێستاش ئامادەین گوێت لێ بگرین".

زەردەشت ڕووی کردە جەواڵی گەنمێک کە لە تەنیشتیدا بوو و فەرمووی: "ئێستا کاتی وەشاندنی گەنمەکەیە، هەستن و گەنمەکە هەڵگرن و لەم زەویە کە ئاوەنیا کراوە بیپژێنن". گوشتاسپ و هاوڕێیانی هەستان و گەنمەکەیان چاند و پاشان دڵخۆش گەڕانەوە بۆ لای زەردەشت.

زەردەشت ڕووی کردە کەیگوشتاسپ و فەرمووی: "گەنمەکەتان کردە ژێر خاک و داتانپۆشی و دەمی بۆ قسەکردن بەسترا. ئێستا کە گەنمێک نییە منیش شتێکم نییە بۆ گوتن". گوشتاسپ و زانایانی لە وەڵامی زەردەشت سەریان سووڕ ما و گوتیان: "ئەی زەردەشت! ئێمە لە گوتەکانی تۆ سەر دەر ناکەین. ئەگەر دەنکی گەنم نییە، خۆت دەتوانی ڕاز و نهێنییەکەیمان بۆ باس بکەی".

زەردەشت پێکەنی و گوتی: "ئەز ئامۆژگارم* و ئامۆژگاری ڕاستەقینە فێر ناکات، بەڵکوو بە ئاگا دێنێت" (هۆشیار دەکات). پاشان زەردەشت سروودێکی کە سەبارەت بە فێربوونی خۆی گوتبووی بەم چەشنە خوێندەوە:

چونکە بەم ڕاهێنانە ناڕاستە،
بواری هەڵبژاردنی ڕێگا،
ڕوون و ئاشکرا نییە،
من، هەر وەک ئامۆژگارێک،
کە هەڵبژاردەی مەزدایە،
بەرەو ڕووی ئێوە دێم،
تا هەر دوو گروو ڕابهێنم،
بەرابەری ڕاستی بژین.
گاتا، هاتی 31، سروودی 2

پاشان زەردەشت دەستی کێشا بۆ ڕانێک*کە خەریکی لەوەڕین بوون. نیشانی شاگوشتاسپ و فەرزانەکانی دا و فەرمووی: " ئایا ئەگەر من و هەر کەسێکی تر، ساڵانی ساڵ خەریکی فێرکردنی زمان و قسەکردن بەم مەڕانە بێت، دەتوانێت شتێک فێری ئەم مەڕانە بکات؟ هەرگیز نەخێر، بەڵام زارۆلەیەک هێشتا تەمەنی بە دوو ساڵ نەگەیشتووە، بەو وشەگەلە کە دایک و کەسووکاری دەیخەنە سەر زاری، فێری ئاخافتن دەبێت. کەوایە جیاوازیی نێوانی مەڕ و زارۆکی مرۆڤ لە چیدایە؟ لەو هێزە نووستووەی ئاخافتن کە لە ناو منداڵی مرۆڤدا هەیە و دایک بە هەوڵ و کۆششی خۆی بە خەبەری دێنێت، بەڵام ئەم وزەیە لە مەڕدا نییە.



جا مرۆڤ لە هەموو زەمینەکاندا بەم چەشنەیە. مرۆڤ دارای وزە و توانامەندییەکی فرە مەزنە کە نووستووە. بۆ تێگەیشتن پێویستی بە هیمبوون* هەیە و دەبێت فێرکەر ئەم هێزە بێدار بێنێت و مێشکەکان ئامادەی وەرگرتن بکات بە هەمان چەشن کە من پێشتر لە سرووودێکدا گووتوومە":

ئەم ئایینە،
بۆ مرۆڤی هۆشیار
کە بە ژیری لێی تێ بگات و
بە هێزی مینوویی،
بە گوفتار و کرداری خۆی
پشتیوان و چاودێری ڕاستی بکات،
ڕوون و ئاشکرایە.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
کەسێکی ئاوا، لە لایەنی تۆوە
شایستەترین یاوەر و ڕێپیشاندەری مرۆڤە.
گاتا، هاتی 31، سروودی 22

"ئەی کەیگوشتاسپ! مامۆستای ڕاستەقینە نابێژێت و فێر ناکات، بەڵام کارێک دەکات کە قوتابییەکان بە مێشک و رامانی خۆیان تێ بگەن و تۆش پێویستە ئاوا بکەی. تۆ دەبێت خۆت بیر بکەیتەوە و ئەو شتەی کە گەرەکە من ببێژم تۆ خۆت بیدۆزیتەوە. من تەنیا پەنجێرەی رامان و ئەندێشەی تۆ دەکەمەوە و لەمەولا ئیتر خۆتی کە دەشێت بە چاوەکانت دەروەی پەنجەرەکە بڕوانی. شاگوشتاسپ، هەستە و چاوێک بخشێنە بە کێڵگەکە و بۆ منی بڵێ کە ئەم گەنمەی چاندتان چۆنی دەبینی"؟

کەیگوشتاسپ ڕوانییە زەوییەکە و گوتی: "ئەو شتەی کە دەزانم ئەوەیە گەنمێک کە ئیمڕۆ چاندمان ماوەیەکی پێ ناچێت بە هۆی تیشکی هەتاو و ئاو و هەوا چەکەرە دەکات و سەر لە زەوی دەردێنێت. کە وابوو گەنم بە دەرهاوردنی لە ناو ئەنبار و گۆنیەدا و بە چاندن لە خاکدا و گەیشتنی ئاو بەخەبەر دێت. هەروەک نموونەی منداڵەکە و کردنەوەی زمان و دەست کردنی بە ئاخافتن. هێزەکانی نووستووی دەروونی گەنمیش بەخەبەر دێت و گەنم ڕوو لە سەوزبوون و باڵاکردن دەکات. لەم دیاردە بچووکەدا دەتوانین بڵێین کە لە ڕەوان و مێشک و هۆش و بیر و دڵی مرۆڤدا جیهانێکی نووستوو هەیە کە ئەگەر زەمینەکانی بۆ خۆش و ئامادە بکرێت، ئەوە زیندوو و بێدار و بەخەبەر دێت".

کاتێک گوتەکانی شاگوشتاسپ گەیشتە ئەم شوێنە، لە ناکاو جامئەسپ هاوارێکی پڕ لە خۆشیی تێکەڵ بە گەشکەی کێشا و خۆی پێ ڕا نەگیرا و خۆی نزیک زەردەشت خستەوە و گوتی: "ئەی زانای ڕۆژگار! بەو کورتە قسەیە کە لە بارەی بەخەبەرهاتنی رامان گوتت، هەموو شتەکانم بۆ ڕوون بووەوە و هەزاران وانەت فێر کردم. تۆ بەو پەلەپیتکە کە لە مێشکی منت دا، منت لە خەونێکی گران بەخەبەر هێنا. ئێستا من دەتوانم بیر بکەمەوە و ئەگەر ڕێگەم بدەی دەتوانم لەمەڕ گەنمەکە تێڕوانینی خۆم بڵێم".

زەردەشت فەرمووی: **"**ئەی جامئەسپ! لە بارەی دانایی بەڕێزتان شتی فرەم بیستووە. ئەو چتەی کە تێگەیشتویت بیڵێ. دەڵێن ئاست و توانای رامان و ئەندێشەی تۆ زۆر بانە و ئاسۆی هزرت فراوان".

جامئەسپ دەستی کرد بە ئاخافتن و گوتی: "ئەی زەردەشت! ئەو شتەی کە من بۆی چووم و تێگەیشتم ئەوەیە، تۆ بە کێشانی سەرنجی ئێمە بۆ دەنکی گەنم، بە ئێمە ئەم مەبەستەت گەیاند کە لە بری ئەوەی وەک هەمیشە دانیشین و ڕۆژانێکی زۆر و درێژ سەبارەت بەمجۆرە پرسیارانە دەمەتەقێ بکەین، لە بارەی یەک نموونەی ئاوا پچووک و ساکار و سەرنجڕاکێشی بوون وەک دەنکە گەنمێک، بیر بکەینەوە و بە جێگای خەیاڵ و گومانچنین*، گەنم بچێنین و لە نزیکەوە بیخەینە ژێر سەرنج و وردبینی رامان، پاشان بزانین چۆن پێڤاژۆکانی ڕواندن و گەیین تێپەڕ دەکات. تۆ بە ئێمەت فێر کرد کە ئەو شتەی سوودی لێ وەرناگیرێت، ڕووی تێ نەکەین و بە پێچەوانە ڕوو بکەینە تشتێک کە توانای دیتنی ئەو شتەمان هەبێت تا ئێمە شتێک وەک دەنکی گەنم بە درووستی نەناسین و لە ڕاز و نەهێنیەکانی دەروونی ئەو تێ نەگەین و نەیدۆزینەوە، هەرگیز بە ناسینی ئەو نادیارانەی کە ئێمە بە دوایدا وێڵین سەرکەوتوو نابین. تۆ رامان و ئەندێشەی ئێمەت لە بێسنووری بە سنووداری کێشاند. ئێستا بە بوونی ئەم مۆمە کە تۆ بۆ منت داگرساند دەتوانم بەرپێم ببینم، نە زۆر دوور، بەڵام ئەگەر توانای بینینی بەرپای خۆمم هەبێت بێگومان دەتوانم زۆر دووریش ببینم. چونکە لە دڵۆپ دڵۆپی ئاو، ڕووبار و چۆم و زەریا درووست دەبێت و لە هەنگاوە پچووکەکان فەرسەخ بەدی دێت و لە دیتنییەکانە کە نادیارەکان دەبینرێت".

"تۆ ئێمەت فێر کرد کە گەنم دانەیەکی بێ گیانە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا گیانی هەیە و بە ئەندازەی جیهانێک ڕاز و نەهێنی لە ناویدا نووستووە. گەنم دانەیەکی بێگیان و جوودایە، بەڵام هەر کە چاندرا و زەمینەکانی ئاو و خاک و هەتاو و هەوای بۆ ساز و ڕێک کرا،گیانی زیندووی بە ئاگا دێت و لە ناو پێواژۆی چەکەرەکردن و باڵاکێشان دەکەوێت. کەوایە هیچ شتێک لە جیهاندا مردوو و بێگیان نییە. هەموو تشتێک بە چتەکانی دیکەوە پەیوەند و بەندە و بەوانە ڕاوەستاو و دیارە. ئەی زەردەشتی بەشکۆ! چ دەرسێکی مەزنت بە ئێمە دا، لە گومانەوە بەرەو رامان و لە رامانەوە بۆ بینین، ئەو دیتنەی کە جیهان بە چەشنی زیندوو و دروست دەبینرێت و هەموو شتێک بە یەک بەندکراو و بەستراو و پێکەوەبوون، بزانین".

زەردەشت بە بیستنی وتەکانی شاگوشتاسپ و جامئەسپ پڕ کەیفخۆش بوو. خەندەیەکی خۆشی لە دڵەوە کرد پاشان ڕووی کردە شاگوشتاسپ فەرمووی: "شاگوشتاسپ، وەک لە ڕازی گەنمەکە تێ گەیشتی ئێستاکەش کۆشش بکە بە هەمان شێوەی جووتیار، کە گەنم دەچێنێت و وزەی ڕوواندن و گەیین و زایینی بەخەبەر دەهێنێت، تۆش دانەی گەنمەکە بەرە بۆ ناو کێڵگەی ڕەوان و مێشکت و هێزی ڕوواندن و باڵاکێشان و زایینی، لە ناو رامان و ئەندێشەی خۆت بە ئاگا بێنە".

بە فەرموودەکانی زەردەشت، گوشتاسپ و جامئەسپ و زانایانی دیکەش چوونە ناو بیرکردنەوەیەکی قووڵ، بەڵام پەیوەندییەک کە لە نێوانی گەنم و ڕەوان و هزری خۆیانیان بێت، نەدۆزییەوە. سەرئەنجام جامئەسپ ڕووی کردە زەردەشت و گوتی: "ئەی مامۆستای مەزن! ئێمە لەم وتەی ئێوە هیچ تێ ناگەیشتین، خۆت یارمەتیمان بدە و ڕاز و نهێنیی گوتنەکەی خۆت بدرکێنە".

زەردەشت ماوەیەک بێدەنگ ما و پاشان دەستی کرد بە ئاخافتن: "دەتوانم بڵێم کە مرۆڤ لە جیهاندا بە سێ جۆرە: یەکەم خەڵکێک چاویان هەیە بەلام نابینن، گوێیان هەیە بەڵام نابیستن، ئەمانە کەڕ و کوێر دێنە ڕووی ئەم جیهانە و کەڕ کوێریش لەم جیهانە دەڕۆن. بۆ ئەمانە هەڵهاتنی خۆر و ئاوابوونی وەک یەکە، ئەمانە تیشکی گەرم و ڕووناکی هەتاو و شەماڵەکردن و ئاوابوونی نابینن و هەستی پێ ناکەن. گرووی دووهەم، جیهانی دەوروبەری خۆیان دەبینن و دەبیستن، بەڵام دیتنی ئەمانە وەک تیشکدانەوەی شەوق لە ناو ئاوێنەدایە و بیستنیشان وەک پەژواک* لە کێودایە. ئەمانە ئەو شتەی کە بەم چەشنە دەیبینن و دەیبیستن، دەیبەنە ناو مێشک و هزریان و ڕێک بە هەمان شێوە دەیتاڤێنن*. ئەندێشە و مێشکی ئەمانە هەرگیز توانامەندیی گۆڕانی دیتنییەکان و بیستنییەکانیان نییە و لە هەمان پێواژۆ و سنوورێکدا کە هەن دەمێننەوە، نە شتێک بە ئازموون و پاشکەوتی رامان و ڕەوانیان زیدەتر دەکەن و نە بۆ گەشەکردنی کۆمەڵگا گاڤێک دەنێن. بەڵام دەستەی سێهەم: دەنگ و کاردانەوەیان لەتەک دوو دەستەی پێشوو جیاوازە. ئەمانە دەیبەنە ناو کێڵگەی رامان و هزر و ڕەوانی خۆیان و دەیخەنە ژێر کاریگەری وزەکانی پڕتوانای دەروونی ناو مێشکیان و لەو چەشنەی کە بووە دەیگۆڕن و دەیزێنن. دەیهاڕن و دەیدەن لە بێژنگ و پوخت دەیشێلن و گەشەی پێ دەدەن و پاشان بەرهەمێکی نوێی لێ بە دەست دێنن. سازکەران و داهێنەران و بەدیهێنەرانی چاند* و مێژوو و ژیاری* ئەم جیهانە لەم گرووپەن. هونەرمەندان، هەڵبەستوانانی ئەڤین و ڕاستی، ڕۆشنبیران، زانایان، لێهاتووان، بەدیهێنەران، فەرزانەکان، وێژەران و هۆشیاران هەموو لە ناو ئەم دەستەیە سەر هەڵدەدەن و هەر ئەمانەن کە جیهان بەرەو پێشکەوتن و ئاوەدانی دەبەن. پرسیار ئەوەیە، ئایا کەسێک توانای ئەمەی هەیە، بەم ئاست و پلەی گەشەدانی رامان و ڕەوانییە، بگات؟ ئەرێ هەیە، بەڵام بە مەرجێکی زۆر گەورە: ئەویش وەگڕخستن و وەرزیدەکردن* و چڕبوونەوەی رامان. هەرگیز رامانێکی پووک و بەتاڵ و ڕەوانێکی سست و پووچەڵ و مێشکێکی سووک و لاواز، توانای گۆڕاندنی دیتنیەکان و بیستنیەکان جیهانی نییە. ئەگەر مێشک و ڕەوانێکی گوتەیەک ببێژێت و بنووسێت قسە و نووسیاوەکانی پڕوپووچ و بێ واتە یا فرت و فێڵ و درۆیە. لەمەڕ دێوپەرستان بێژم، گوتەی من بۆ ئەمانە ئەمەیە کە ئێوە تەنها هەتاو و مێهر دەبینن. تیشکدانەوەی هزری ئێوە لەم دوو دیاردە، تیشکدانەوەیەکی ئاوێنەییە، ڕۆژ و مێهر هیچ کاریگەریەکی لە ئەندێشە و ڕەوانی ئێوە نییە و ئەگەریش هەبێت لە سنوور و ئەندازەی هەمان تیشکدانەوەی ئاوێنەکەیە. من دەبێژم ئێوە خۆر و مێهر بهێننە ناو ئەندێشە و ڕەوانی خۆتان و پەروەردەی بکەن و گۆڕان و گەشەی پێ بدەن. کە ئەگەر واتان کرد پاشان دەبینن کە خۆر و مێهر لە ڕەوان و رامان و دڵی ئێوە سەر هەڵدێنێت و بۆ خۆتان دەبنە هەتاو و ڕووناکی، پاشان

دەبینن کە یەکەم دڵ و گیانی خۆتان و لە دوایی جیهانێک ڕۆشن دەکەنەوە. ئەو ڕوون بوونەوە (ئاگایی دڵ) کە من دەبێژم، هەر ئەو گۆڕانی بیستنییەکان و دیتنییەکانی جیهان و گەردوون لەناو دڵەکان و هەڵاتنی ڕۆژ و تیشکدانەوەی لە دڵەکانە، هەر ئەم هۆشیاری و ڕۆشن بوونەوەیە کە ڕێگا بۆ ڕێبوار تا بێکەران، دیار و ڕووناک دەکاتەوە و دەیباتە ژوانی خۆشبەختی و ئازادی و ڕزگاریی ڕاستی".

ئەو ڕۆژە کۆتایی پێ هات و شاگوشتاسپ و هاوڕێیانی گەڕانەوە بۆ کۆشکیان، بەڵام جامئەسپ لە هەموویان فرەتر چوبوە ژێر کاریگەری هزر و رامانی زەردەشت. جامئەسپ ئارامی لێ براببوو و بەردەوام گوتەکانی زەردەشت لای خۆی دووپات دەکردەوە و لە بارەی ڕاز و نهێنیی گەنمەکە بیری دەکردەوە. جامئەسپ چووە ماڵەوە و دوای خواردنی شێو، چوو بنوێ، بەڵام خەو بە چاوی نەدەهات. سیمای پیرۆزی زەردەشتی دەهاتە بەرچاو و فەرموودەکانی دەهاتە بیر. سەرئەنجام خەوی لێکەوت و پاشان خەونێکی سەیری دی.

جامئەسپ لە خەونەکەیدا دیی کە لە ناو گەنمزارێکدایە. گوڵی گەنمەکە کە سەری دەرهێنابوو پرسی: "ئەی گەنمی جوان! تۆ کێی، چما شێوەی ئێمەی مرۆڤت هەیە"؟ گەنم کەوتە وەڵام و گوتی: "سەرگوزەشتەی من دوور و درێژە، من هەمان دانەی گەنمم کە باپیرە مەزنی* ئێوە منی خوارد و لە بەهەشت دەریان کرد. جامئەسپ بە بیستن ئەم قسەیە تێک چوو و گوتی: "ئەی هاوار! کەوایە تۆ بووی ئێمەت بەم هەموو دەرد و ڕەنج و پەرێشانیانە گرفتار کرد؟ تۆ بووی بە هۆی ئەوە کە ئێمەیان لەو جیهانە جوان و ئاسوودەیە دەربهێنن و بۆ ئەم جیهانی پڕ لە ستەم و بێدادی، خەم و سەختی، دژواری و مەرگ و پرسە دووچار کرد؟ تۆ بوویت کە ئەم گۆی زەوییەت ئالوودە و ئاڵۆزاند، تۆ بوویت کە مرۆڤی ستەمکارانت بەدی هێنا تا هەزاران خراپەکاری و بێدادی لە سەر تۆپی زەوی بکەن".

کاتێک گوتەکانی جامئەسپ گەیشتە ئێرە، دەنکە گەنمەکە دایە قاقای خەندە و گوتی: "دەبێت تۆ قسەی ئاوا بکەی، چونکە لە چەند و چوون و هیچ شتێکی من ئاگادار نییت. تۆ بۆ ئەوەی لە ڕاستی و دروستیی کاری من تێ بگەیت پێویست بوو لە سەردەمی باپیری خۆت بژیایەتی، ئینجا مانای ڕەنج و سەختی و ڕاز و نهێنیی کاری منت بۆ دەر دەکەوت و تێ دەگەیشتی. لە زەمانێکدا کە باپیری تۆ لە بەهەشتدا بوو، لەوێ هیچ کارێک نەبوو، لەتەک هاوسەری خۆیدا هەر لە بەیانی تا شەو بەتاڵ و وێڵ دەگەڕیا. هیچ ویست و حەز و خۆشی و هیوا و بزاڤ و بەرزی و نزمی و کام و کار و داهێنەرییەکیان نەبوو. کاری ئەوان تەنها خواردن و خواردنەوە بوو. ژیانێکی سادەی گیایی و ئاژەڵی. بەڵام چون مرۆڤ دارای مێشک و هۆشە، سەرئەنجام لەو ژیانە یەکجۆرییە وەڕەس و ماندوو و بە تەنگ هات و هەوڵی ڕزگاربوون و دۆزینەوەی ڕێگایەک بۆ خۆی لەو ژیانە یەکسانەی دا. هەر لێرەوە بوو کە یەکەمین بزاڤ و هەڵخڕاندنی مێشکی تیادا دروست بوو. مرۆڤ پای نایە پێواژۆیەکی نوێ، ئەوەش جیهانی بیرکردنەوە و رامان و گەڕیان، جیهانی دۆزینەوە و ئازموون و تاقیکردنەوە. باپیرەگەورە گوتی من دەبێت خۆم تاقی بکەمەوە و خۆم بیر بکەمەوە و بۆ یەکەمین ئازموون دەبێت کارێک بکەم. ئەوەش ڕێک هەمان فەرمانێک بوو کە پێشتر بە ئەو درابوو، ئایا فەرمانی نەخواردنی گەنم درووستە یان نا؟ لە سەرەتادا باپیرەگەورە ترسا، بەڵام سەرئەنجام رامان و گوشاری دۆزینەوە و لێکۆڵینەوە، وورووژاندی کە نزیکی گەنم ببێتەوە دوای دوودڵێکی زۆر بڕیاری شکاندنی فەرمانی دا و گەنمی خوارد و لە هەمان کاتیشدا لە بەهەشت وەدەر نرا. سەیر ئەوە بوو دوای دەرکردنی مرۆڤ لە بەهەشت، تێکۆشا و گەڕیا بۆ دۆزینەوەی خۆراک و دۆزیشیەوە. بەم چەشنە ژیانی نوێی دەست پێ کرد. ژیانی خۆش و شیرینی کار و ئافراندن. لەمەودوا مرۆڤ پێی نایە ناو هەوراز و نشێوی ژیان. هاوکات لەتەک کار و ئافراندندا، رامانی گەشەی کرد و هۆش و خێرەتی وەرزیدەتر دەبوو و شادیی

ڕاستەقینە کەوتە دڵیەوە. باوەڕم وایە کە تۆ لە مانای ئەمە تێدەگەی، چونکە خۆت بە دوای دۆزینەوە و بیرکردنەوە و ئافراندنی. تۆ باش دەزانی کە کاتێک شتێکی نوێ فێر دەبی و تێدەگەی و چتێکی تازە بەرهەم دەهێنی، چەندە خۆشی و شادی دەکەوێتە ناو دڵتەوە. تۆ ئێستا بە دوای دۆزینەوەی ڕازی چارەڕەشی و بەختیاریی گەلانیت. ویست و ئارەزووی تۆ گەڕانەوەی دووبارەی کۆمەڵان بۆ هەمان ژیانی پڕ لە ئاسایشت و ئاسوودەیی ڕۆژگاری بەهەشتە و منیش بۆت دەڵێم، ئەی جامئەسپ دانا! من دەنکە گەنمێکم کە ڕازی بەختیاری گەلان دەناسم، بە هەمان شێوە کە باپیرەگەورەتم لە بەهەشت وەدەرنا، توانای بردنەوەشم بۆ بەهەشتی ڕاستەقینە هەیە. کەوایە بمناسە و لێم تێ بگە و هەمیشە لە بیری مندا بە و بیر لە ڕازی گوتەی من بکەرەوە کە من توانای بردنەوەی مەردمم بۆ بەهەشتی ڕاستین هەیە..." کاتێک کە دەنکە گەنم ئەم قسەی کرد جامئەسپ بە قوقەی کەڵەشێر لە خەو ڕابوو.

جامئەسپ ئەو ڕۆژە زووتر لە هەموو کەسێ چوو بۆ فێرگەکەی زەردەشت، پاشان بە پەلە خەونەکەی بۆ زەردەشت گێڕایەوە و داوای وەرگێڕانی خەونەکەی کرد. زەردەشت بۆ خەونەکانی خەڵک زۆر ڕێزی دادەنا. لە خەونەکانیان بۆ ناسینی دەروون و ڕەوانیان، کەڵکی وەردەگرت. زەردەشت بە جامئەسپی فەرموو: "ئەو گەنمە کە هاتە خەونی تۆ، ویژدان و هۆشیاری خۆت بوو کە بە چەشنی خەون لە ڕووت ئاشکرا بووە و تۆ زیندانی کۆشک قەڵای شاگوشتاسپ و ئەزموون و بیر و بڕوا دێرینەکانتی، ئەو گەنمەش چەکەرەی رامان و خێرەتی تۆیە کە لە زەمینی هزرت چێندرا و لە ڕەوتی ڕوواندن و گەیین و گەشەکردندا دانراوە. ئێستا ئەمە پێواژۆیەکی تازەیە کە خودی ئاگای تۆ گۆڕانی بە سەرتا هێناوە و بە چەشنی تۆم* چووەتە خەونی تۆ و دیوتە. دەنکە گەنمەکە هەمان خودی ئاگا و چەکەرەی رامان و خێرەتی و ئەندێشەی تۆیە. دەیەوێت تۆ لە بەند و کۆیلەتیی ئەندێشە و بڕوا کۆنەکانت، کە تەنانەت لەتەکیشیدا سازگار نیت، ئازاد و ڕزگارت بکات و ڕزگاریشت دەکات. تۆ لە تار و پۆی دواکەوتوویی و گۆجی ئەو رامانە ڕزگار دەبیت کە بە چاوی تۆ وەک بەهەشت دەبینرا، گۆڕانکارییەکی پڕ لە فەراز و نشێو و بزاڤێکی هزریی و رامانی بە سەرتا دێت. ئەمە دیتن و هەڵسەنگاندنی منە سەبارەت بە خەونەکەت. ئێستا لەمەڕ خۆت بیر بکەرەوە و ئەو شتەی کە لە یەکەمین گوتەی من لە بارەی گەنم تێدەگەی بۆ منی بێژە".

جامئەسپ بە بۆنەی وەرگێڕانی خەونەکەی لە زەردەشت سپاسی کرد دوای تاوێک بیرکردنەوە گوتی: "گومانم بۆی دەچێت کە مرۆڤیش وەک تۆمی گەنم وابێت. تا زەمانێک لە ناو هەنبانە و ئەنباردا شاراوە بێت، جووڵە و گەشەکردنێکی نییە و لە خۆیدا شتێک ناڕوێنێت و نازێنێت، بەڵام هەر کە لە زیندان و بەندی خامۆشی و بەستراویی هاتە دەرەوە و پێی نایە ناو ڕووپەلی ژیان و گەردوونەوە و هەروەها کەوتە شوێنی شیاوی خۆی و کەوتە کۆشش و گەڕیان، ئینجا گیانی خامۆشی بەخەبەر دێت و گەشە دەکات و دانەی لێ بەدی دێت".

زەردەشت فەرمووی: "ئەمەی کە گوتت ڕاستە، کەوایە تۆ قاڵبی رامان و باوەڕە دێرینەکانت بشکێنە و پا بنێ جیهانی زایاندن و باڵاکردن و گەشەکردن، تا هەموو هێزەکانی دەروون و دەرەڤەت، زایەند و بەتوان و بەگڕ بێت، هەمان شێوە کە من پێشتر لە سروودەکانم ئاماژەم بۆ کردووە".

ئەی ئەهۆرا..!

ئەمە لە تۆ دەپرسم،

بە دروستی بە من بێژە،

چلۆن لە بەر تیشکی تریفەی ڕاستیدا،
دە هێزی دەر و ناوەوەی من،
بەدیهێنەر و توانامەند و داگرساو دەبن؟
ئەی مەزدا..!
چلۆن بکەم تا بەمانە (دە هێز)
بە گەشەکردن و جاویدان بوون بگەم و
منیش ئەم دووانە پێشکەشی کۆمەڵان بکەم؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 18
(مەبەست لە دە هێزی دەر و ناوەوەی مرۆڤ ئەمانەن: بیستن، بینین، چێژتن، بۆنکردن، هەستکردن، توانامەندبوون، داهێنان، خێرابوون، تێگەیشتن، دووربین بوون یان پێشبینی کردن)

زەردەشت لە جامئەسپی پرسی: "چی دیکە لە دەنکی گەنم دەزانی؟"
جامئەسپ وەرامی دایەوە: "لەم سرووده مەزن و پڕواتەدا کە خوێندت وا دەردەکەوێت کە زایەندی بەهێز و داگرساویی وزەکانی دە دانەی مرۆڤ، لە ڕاستییەوەیە. هەروەها لە یەکێک لە ڕاهێنانەکانی دیکە فەرمووت کە ڕاستی لە فەلسەفەی مندا تەنها گوتەی ڕاست نییە، بەڵکوو هەنجار فەرمانڕەوایە بە سەر بوون و لە سەر ڕەوانی مرۆڤدا. هەروەهاش گوتت کە جیهان لە سەر هەنجار و ڕێکوپێکی دامزراوە و ئەو هەنجارەی کە بە سەر جیهانی بووندا فەرمان دەدات، سرووشت و نیهادی مرۆڤیشی لە ژێر دەستەڵاتدایە. پوختەی ئەم گوتارە ئەمەیە کە دانەی گەنم دیاردەیەکی بچووکە لە بوون، کە لە ناویدا هەنجارێکی ڕاوەستاو هەیە و سەوزبوون و گوڵدانی گەنمیش لەوەدایە. بۆیە دەڵێن: لە گەنم، گەنم و لە جۆ، جۆ دەڕوێت".
زەردەشت فەرمووی: "ئەی جامئەسپ! وتەیەکی بەنرخ و پڕبەهات وت. بە ڕاستی شایانی ئەوەیت کە مرۆڤ بە تۆ ببێژێت زانا و هەروەها شاگوشتاسپ گەلێک سەرفەراز و بەختەوەرە کە شالیارێکی وەک بەڕێزتی هەیە. ئێستا کە هەنجاری دەروونی گەنمت ناسی، باشتر وایە کە هەنجار لە شێوەی گشتی و ڕەها، دەربهێنین و جوان و ورد شی بکەینەوە. ئەمە ڕێباز و ڕەوشی منە. من لە ئاخافتن و دواندنی بابەتی ڕەها پارێز دەکەم،مرۆڤ بەرەو سەرلێشێوایی دەبات. لە کاتی ڕوو بەڕوو بوونەوە لەتەک پرسیارێکی نوێدا، تێدەکۆشم بەش بەش شی بکەمەوە و هەر بەشێکیش بە وردی بیناسم لێی بکۆڵمەوە. پاشان ئەنجامی بەشەکان کۆ دەکەمەوە و وەرامی ئەو پرسیارە دەبینمەوە. ئێمە دەنکە گەنمەکەمان شی کردەوە و دیمان لە دەنکێکی گەنمدا، یاسا و بنچینەیەکی هەستی فەرمان دەدات. ئێستا گەنمەکە کە تێدەپەڕێنین و دەچین بەرەو دیاردەکانی دیکە، کاتێک ئەوانیشمان بە هەنجارەوە بینی و ناسی، ئینجا تێدەگەین کە بە سەر بوونی گشتی و ڕەهادا، هەنجاری گشتی و ڕەها فەرمان دەدات و هەنجاری فەرمانڕەوا بە سەر بوونی گشتیدا، هەمان هەنجاریش فەرمانڕەوایە بە سەر پارچەکانی دیکەی بوونە. مرۆڤیش بەشێکە لە بەشەکانی بوون و لە ژێر فەرمانی هەنجاری بووندایە و هەنجارێک کە بە سەر گەردوون فەرمان دەدات، هەموو بەشەکانی بوون و هەروەهاش بوونی مرۆڤیش دەگەڕێتەوە. کار و کاردانەوەی چاک هی کەسێکە کە لە هەنجاری هەستی پەیڕەوی بکات و توانامەندی ڕاستەقینە هی

کەسێکە کە بە سەر ئارەزوو و خواستەکانی* ناهەنجاری زاڵ بێت. ڕاستی هەنجاری بوونە. ڕاستی سەرمایەی بەختیاریی و ڕزگارییە".

لەم کاتەدا سێبەری ڕۆژ گەیشتبووە داوێنی چیاکانی هەورامان و ڕۆژ کۆتایی پێ هات، زەردەشتیش هەستا و ئامادەی نوێژی* ئێوارە بوو و جامئەسپیش هەستا و ڕۆیشتەوە بۆ سەرای خۆی.

# گەنم لە جێگای دڕک



جارێکی دیکە شاگردەکان وەگردی یەک کۆ بوونەوە و هەمدیسان پرسیار و بەرسڤ دەستی پێ کرد و زەردەشت فەرمووی: "ئیتر کارێکمان لەم فێرگەیە نەماوە. کاتی ئەوە هاتووە هەستین و ئەو شتەی کە لە سەری باس دەکەین، لە دەبستانێکی گەورەتر، دەبستانی گێتی و جڤاک و لە ناو فێرگەی کۆمەڵگا بیدۆزنەوە. چونکە، تا مرۆڤ ئەم پێواژۆیە مەزنە تێپەڕ نەکات، هەرگیز توانای تێگەیشتن و وەرگرتن و شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی پرسیاری سەخت و سەخڵەتی نابێت".

شاگردان لەتەک زەردەشتدا هەستانە سەر پێ و کەوتنە رێ بەرەو فێرگەی مەزنتر، فێرگەی زەنگینی ژیان. کاتێک کە زەردەشت و شاگردەکانی لە قەراخی کێڵگەیەکدا دەڕۆیشتن، جووتیارێکیان بینی کە خەریکی کار بوو. زەردەشت و هاوڕێیانی درووود* و ماندوو نەبوونیان لە وەرزێر کرد و ئەویش وەڵامیانی دایەوە. پاشان زەردەشت داوای کرد لە کابرای وەرزێر کە بهێڵێت تاوێک لە لای زەوی و زارەکەی خۆی و هاورێیانی پشوویەک بدەن. کابرای جووتیار بە ڕوویەکی خۆشەوە خۆشهاتنی لێکردن و دانیشتن.

زەردەشت ڕووی دەمی کردە وەرزێر: "درووود و ڕۆژباش ئەی وەرزێری سەرکەوتوو! کە باخ و کێڵگەیەکی ئاوا خۆش و ئاوەدان و سەرسەوز و نوێت هەیە".

وەرزێر لە وەڵامدا: "ئەم کاتەتان باش و سوپاس بۆ ئێوە کە توانای بینینی سەوزبوونی درەختەکان و زەوی و زاری منتان هەیە و بەرد و پلارتان نەهاویشت بۆ سەگ و دارەکانم".

زەردەشت: "ئەی برای هێژا! لە دڵی ئێمە ئێش و ئازار و کین نییە تا هەڵسووکەوتی وامان لێ بوەشێتەوە. ئێمە تامەزرۆ و تاسەی دیتنی دیمەنەکانی ڕند و تازەی ژیانین و لە هەر شوێنێکدا ئەم نموونە جوانانە ببینین پێی خەنی و کەیفخۆش دەبین و دەگەشێینەوە و ڕێزی لێ دەگرین".

وەرزێر: "دەبینم ئاخافتنتان خۆش و دڵنشینە، ئەگەر کارێکی تایبەتیتان نییە دەتوانن تا هەر چەندە حەز بکەن بێنە ناو باخەکە و لە ژێر سێبەری درەختەکان ماندوویی دەربکەن".

زەردەشت: "فرە سپاست دەکەین، ئێمەش پڕ بە دڵ پێمان خۆشە، بەڵام دەمانەوێت پرسیارێک ئاڕاستەی بەڕێزتان بکەین، ئەوەش ئەوەیە چلۆن ئەم باخ و سەوزەلانیەت ساز و ئاوەدان کردووە و پێشتر ئێرە بە چ چەشنێک بووە؟"

وەرزێر: "جێگای ئەم زەوی و زارە، پێشتر وشکەڵانی و خارستانێکی بێ کەڵک بوو کە بەس مار و دووپشکی ژەهراویی تێدا بوو. بەڵام ئیتر من بیر ناکەمەوە لە ڕابردوو و لەو کاتانەی کە لە خەبات و بەربەرەکانێی مار و دڕکدا بووم، چونکە ئەگەر بێتو ئەو ڕەنج و سەختی و ماندووییانە بهێنمە یادم، ئیتر ناتوانم ئیمڕۆ لە جوانی و خۆشیەکانی ئەم باخ و ڕەز و کێڵگەکەم چێژ و سوود بگرم. من بیرەوەریی جانەوەرانی زیانەخرو و دڕووم، بە مەل و گوڵی ڕەنگاوڕەنگ لە یاد و هۆشم پاک کردووە و لە شوێنیدا سەوزە و درەختی بەهرەدارم چاندووە. من تەنها بە ئیسە و بەو شتەی کە لە داهاتوو لە پێشمدایە بیر دەکەمەوە. من بۆ لەناوبردنی دڕک و گیای هەرز و جانەوەرانی زیانەخروو، ڕەنج و شەکەتی فرەم کێشا. بەڵام بە لەناوبردن و پاککردنەوەیان، بۆ هەمیشە ئەو بیرەوەریە تاڵ و پڕ لە ماندووییەم خستووەتە گۆڕ. ئێستا سێبەری تاریکی و شەکەتی لە ڕووی دڵ و گیانی من نەماوە. ئیسە جەنگ و بەربەرەکانێی درێژخاین کۆتایی پێهاتووە و تشتێکی ناخۆش و تاڵ لە دڵ و گیانمدا نەماوە کە سێبەر بخاتە سەر ئاگایی و ڕامان و توانای هەڵسەنگاندنم. ئێستا دڵێ من ڕوون و گەشە، هەر چەندەش ئەو کاتە خەریکی لەناوبردنی خار و زیانەخرووەکان بووم، ئاوا نەبووم. خۆی پەرێشانی و خەفەتباری و سەرلێشێواویم تا ئەو ساتە بوو کە بەربەرەکانێی لەتەک دڕوو و گیای هەرزە دەستی پێ نەکردبوو. بەڵام ڕۆژێک کە بڕیاری چێکردنم دا و دەستم دایە پاچ و پێمەڕە بۆ هەڵکەندنی یەکەمین دڕک و وەدەرنانی یەکمین زیانەخروو، ژیانێکی نوێ و پڕ پیت و سازکەر و شادیهێنەر دەستی پێ کرد و تا ئیمڕۆش نیگا و چاوەڕوانیی من بەس بۆ پشکوتنی گوڵێک و خونچەیەکە کە دەبێتە میوە، یا گەنمەکەم دروێنە دەکەم و یا مەڕ و ماڵاتەکەم دەزێن".



زەردەشت: "ئەی کاکی جووتیار! لە قسەکانت دیارە کە دڵ و مێشکێکی دانا و هۆشیارت هەیە، ئایا دەتوانی بە ئێمە بێژیت کە کاری تۆ لەم باخە کۆتایی پێ هاتووە و ئایا لە ئاوەدانکردنەوە و چێکردنی شوێنی نوێ دەستت ڕاگرتووە؟"

وەرزێر: "هەرگیزاو هەرگیز، ئەگەر وا بێت کە دیسان ڕۆژگاری تاڵ و تاریکی پێشوو دەگەڕێتەوە. تەماشای ئەو بەرەوە بکەن، ئەو دەشتە پڕ لە دڕکوداڵەش هی منە. هەوڵ و کۆششی ئایەندەی من چێکردن و بووژانەوەی ئەو بەریشە، هەر وەک ئەمبەرە".

زەردەشت: "ئەوە گریمان ئەو دەشتە پڕ لە دڕکوداڵەشت ئاوەدان کردەوە، ئایا ئەوە بەو واتەیە کە کاری تۆ کۆتایی پێ هاتووە و ئاوات و ئارەزووی تۆ بە جێ هاتووە؟"

وەرزێر: "هەرگیزاو هەرگیز، ئەگەر ئەوێش ئاوەدان بووەوە، لە دوایدا من کارێکی نوێ دەست پێ دەکەم، من تاقەتی بێکاری و ڕاوەستانم نییە، ئەو سووچە ببینن کە داری فەرشم هەڵداوە. دوای لێ بوونەوە لە کار و پشوودان، هەڵدەستم و خەریکی چنینی فەرش دەبم، لەویش ماندوو بووم ئەوە خەریکی کارێکی دیکە دەبم".

زەردەشت: "دەبینم کە شمشاڵت هەیە".

وەرزێر: "بەڵێ، ستران و نەیژەنین جودا لە ژیانی من نییە، هەر کاتێک کە ماندوو دەبم و یا دڵم بێتە جۆش و هەستم ببزوێت، شمشاڵەکەم هەڵدەگرم و تا بخوازم و بتوانم دەچڕم و دەیژەنم".

زەردەشت: "ڕاستی ئەو تاکە درەختە بە سەر لووتکەی ئەو کێوە کە ئاوا دەوری بەردچن کراوە چییە، ئایا هیچ دەچێتە پای ئەو دارە؟"



وەرزێر: "ئەو دارە من چاندوومە و سەنگچنەکەش کاری منە. زۆر جار کە دەچمە پای ئەو دارە، هەمووی ئارەزووی من ئەوەیە کە ڕۆژێک بێت و هەمووی ئەم کەژ و کێوانە، بە دار داپۆشم و بیانڕازێنمەوە، تا باڵندەکان ڕووی تێ بکەن و لە سەر چڵەکانی هێلانە ساز بکەن".

زەردەشت: "کەوایە تۆ بەختیاریی لەوەوە دەبینیت کە ئەو چیایە بە درەخت داپۆشرێت؟"

وەرزێر: "نا، هەرگیز، خۆشبەختی لە کۆتایی ڕێگەدا نییە. لە ناو خودی ڕێگادایە، جا ئەگەر بتوانی ڕێگا و ئارمانجێک ببینیتەوە و گاڤێکی بۆ هەڵبگریت".

زەردەشت: "باشە ئەگەر چیاکەش بە دار و درەخت ئاوەدان کرایەوە، پاشان ئامانج و ئاواتی تۆ چییە؟"

وەرزێر: "ئینجا بە خارستان و کەژ و کێوێکی دیکە بیر دەکەمەوە و چاندن و چاندن تا کۆتایی ژیان و تا دوایین هەناسە لە بەردەوامیی ئەم کارە. ئارەزووی من ئەوەیە کە گۆڕەکەی من لە بن دوایین درەختێکدا بێت کە دەیچێنم و لەو کاتەی کە دارەکە دەچێنم، دەستەکانم لە کاتی چاندن لە کار بکەوێت و دڵم لە لێدان بوێستێت. هیواداریشم کە دووایین درەخت، داری سنەوبەر بێت و هەر لە بن ئەو دارەش بمنێژن. داری سنەوبەر بۆ من نیشانەی سەرسەوزی و زیندەگانی و حەسانەوە و ئاسایشتە".

زەردەشت: "ئایا بۆ ئەنجامدانی هەمووی ئەم کارانە وزە و توانات هەیە؟"

وەرزێر: "هێز و توانا پەیوەندیی بە ویستی خودی مرۆڤەوە هەیە. تۆ هەر شتێک بوێت و بە دڵ و گیان ویستت، ئینجا وزەی ئەنجامدانیشی وەدەست دێنیت. لە سووچێکی لەش و گیانت کە ناشزانی لە کوێ دایە، هێزێکی نوێ دەجۆشێت و هانت دەدا بۆ ئەنجامدانی".

زەردەشت: "ئەو درەختانەی کە دەتەوێت بیچێنیت، حەز دەکەی چۆن درەختێک بێت؟"

وەرزێر: "دەمەوێت جوانترین و باشترین و پڕبارترین و سوودمەندترین و ڕاست و ڕاوەستاوترین درەختەکان بێت".

زەردەشت: "ئەی برای هێژای بەختەوەر! کە بە ڕاستیش بەختیاریت، ببێژە بۆمان کە ئەم ڕێگای کەیفخۆشی و گەشبینی و جوانیەی خۆشبەختیەت چۆن هەڵبژاردووە و یا کێ بە تۆی فێر کردووە؟"

وەرزێر: "کەمێک دوور و درێژە، بەڵام بۆتانی دەڵێم. من پیاوێکی داماگ و سەرلێشێواو بووم. دڵم خەفەتبار و ژاکاو، ڕەوانم پەژمۆردە و پەرێشان، لەشم ماندوو و گیانم داگیرا بوو. ژیانم بە ناخۆشی و دڵتەنگی و تاریکی تێپەڕ دەبوو. هەمیشە هەستم بەوە دەکرد کە لە ناو دەروونمدا، مۆرانە خەریکی خواردنمن و لەشم لە ژەهری دووپشک پڕە. بە بەردەوامی هەستم بە ئازارێکی زۆر دەکرد. توانی بیرکردنەوە و دارڕژتنی بەرنامەیەکم بۆ داهاتوو نەبوو. هەموو شتێکم بە لێڵی دەدی. دەنگی داکروژانی دادانی مۆرانەکانم لە ناو لەش و گیانمدا دەبیست. من بەم چەشنە بووم تا ڕۆژێک ڕێبوارێک هاتە سەر ڕێگام. ڕێبوارەکە کە منی ئاوا پەرێشان و دەستەوئەژنۆ بینی، دڵی بۆم سووتا و لە دۆخ و بارمی پرسی. کاتێک لە دەردی من تێگەیشت گوتی من شاگردێک لە شاگردەکانی زەردەشتم و دەرمانی دەردتم لە لایە. لێم پرسی ئەو دەرمانە چییە و چۆن دەتوانم وەری بگرم؟ کابرای ڕێبوار گوتی: لە زەردەشتم وەرگرتووە و دەیفرۆشم بە سەد دانەی گەنم، بەو مەرجەش هەر دەنکە گەنمێک لە گوڵە گەنمێک ببێت. دەبێت بچیتە خارستان و سەد بنجە دڕک هەڵ بکەنیت و لە جێگای هەر بنجە دڕکێک دەنکە گەنمێک بچێنیت. کاتێک کە گوڵە گەنمەکان ڕووا و کاتی دوورینی هات، لە هەر گوڵە گەنمێک دەنکە گەنمێک جودا بکەیتەوە و بیهێنی بۆ لای من، ئینجا دەرمانەکەت وەردەگری. هەروەهاش چەند هۆرەیەکی زەردەشتی فێر کردم و گوتی لە کاتی چاندنی گەنمەکاندا بیخوێنمەوە. منیش بەو چەشنەم کرد کە ڕێبوارەکە گوتبووی. سەد بنی دڕکم هەڵکەند و سەد دەنکی گەنمم چاند و پاشان کەوتە دڵمەوە و سەد دەنکە گەنمی دیکە بچێنم، بۆیە سەد دڕکی دیکەشم هەڵکەند و سەد دەنک گەنمم چاند و ئەم کارە دووبارە و چەند بارەم کرد. ئاوەها نیشتمە ناو ئەو کارە کە ئیدی هەموو دەرد و ڕەنجەکانم لە بیر کرد و تا ئێستاش هەروەها خەریکم و هێشتاش کاتی ئەوەم پەیدا نەکردووە کە بتوانم بچمە لای ئەو کابرای دەرمانفرۆشە و سەد دەنکە گەنمەکەی بدەمێ و دەرمانەکەی لێ وەربگرم".

جامئەسپ و شاگردەکان ڕوویان کردە زەردەشت و دوای تاوێک جامئەسپ گوتی: "ئەی مامۆستای فەرزانا! ئەو دەرمانە کە شاگردەکەی تۆ دەیویست بەم پیاوە بیدات چی بوو؟" زەردەشت فەرمووی: "ئەم سرروودە بوو:"

بە رامانی پاک

مەزدا ئەهۆرا دڵخۆش دەکەین.

ئەو بە خواستی خۆی،

شادی و کاری بۆ ئێمە ئافراندووە.

هێڤیدارین مەزدا ئەهۆرا،

به توانامەندیی خۆی،
هێزی کارکردن بە ئێمە ببەخشێت،
تا لە بەر تیشکی رامانی پاک و
ڕاستی و زانستی دروست،
لە ڕێگای ڕاست و پێشکەوتنی مرۆڤدا تێ بکۆشین.
گاتا، هاتی 45، سروودی 9

کابرای وەرزێر کە ناوی زەردەشتی بیست و زانیی کە ئەمە خودی زەردەشتە کە ئەو لەتەکی ئاخافتن دەکات، لە خۆشیدا گەشکەی کرد و نەیدەزانی چۆن خۆشی خۆی دەربڕێت، خێرا هەستایە سەر پێ و زەردەشتی ماچ کرد و زەردەشتیش بە هەمان شێوە، وەرزێر گوتی: "ئەی مامۆستا! ئەی ئەو کەسەی کە ژیانی منت ژێروژوور کرد و منت لە ژیانی دۆزەخی* ڕزگار کرد و گەیاندتە بەرزترین پلە و پایەکان! هەزاران ڕێز و درووود بۆ تۆی بەڕێز، هەر بژیت".

زەردەشت لە وەڵامی وەرزێر فەرمووی: "ڕێز و درووود بۆ تۆ کە دڕکەجاڕت کردە باخ و گوڵشەن، دڕکی دڵت هەڵکەند و لە جێگایدا گەنم و گوڵت چاند، ئێستا بۆمان بێژە کاتێک کە لە کەناری زەوی و زارەکەت ڕوودەنیشی و کەروێشکەکردنی* گەنمەکانت تەماشا دەکەی، زیندەگی چۆن دەبینی؟" کشتکارەکە وەڵامی دایەوە: "تا گاسنەکەم و گاجووتەکانم ساز و بەهێز بن و زەویەکەم بۆ بکێڵن و بۆ چاندنی گەنم ئامادەی بکەن و منیش بچێنم و ڕواندن و باڵاکردن و گەییینیان ببینم، ژیان بۆ من خۆش و هەموارە و هیچ شتێکی ناخۆش لە زیندەگانی نابینم. ئەی زەردەشت! ئەی فەرزانەی دانایی! بە من ببێژە، چی جوانتر و دڵڕفێنتر لە خەندە و پشکوتنی زەوی هەیە؟ بە من بڵێ چ کاتێک جوانتر و دڵگوشاوتر لەو کاتەیە، کە تۆوی گەنم دەچێنیت و دوای ماوەیەک چەکەرەکەی لە زەوی دەبینی؟ ئەو چەکەرە جوانانە، ئەو چووزە ناسک و سەوزانە کە لەش و گیانی وەرزێر تازەتر دەکات؟ ئەی زەردەشت! ببیسە ئەو سترانە جوانە کە لە دوورەوە دێت. بە بڕوای من خۆشترین و دڵڕفێنترین هۆرەکانی جیهان، ئاوازی چەرخی ئاسیاوە. ئەی زەردەشت! ئەوە دەنگی ئاشی منە و گەنمێکیش کە دەبێتە ئارد، بە دەست و پەنجەکانی من بەرهەم هاتووە. ئەی زەردەشتی هێژا! ئەو ئاوازە بۆ من،ئاهەنگ و هەوێنی ژیانە. دەنگ و باڕەی ئاژەڵەکان، دەنگی خوڕەخوڕی ئاوی کانی و کارێز، دەنگی پاساری بە سەر چڵی دارەکان و هەزاران دەنگ و ئاواز و خوێندنی دیکە کە لە دڵی باخ و سەرا و کێڵگەکەی منەوە هەڵدەستێت. ئەم ئاهەنگانە هەموویان بۆ من خۆش و دڵڕفێن و گیانبەخشن. ئەی زەردەشتی ئەرژمەند*! پێویستە ئەمەش ڕابگەیەنم کە من پێشتر هەستی ئاوام نەبوو و جیهانم بەم شێوە نەدەدی. لەو ڕۆژەوە کە گوتەکانی ئەو کابرایەم بەر گوێ کەوت و بە دوایدا ئاشنا بە ناو و سرووده بووژێنەرەکانی تۆ بووم و سەرم لێدەر کردن، دیتن و بیر و بۆچوون و رامانی من بە گشتی گۆڕانکاریی فرەی بە سەردا هات، ئەمەی پێ هات کە ئیمڕۆ دەیبینن. ئەی زەردەشتی ڕێزدار! بهێڵە تا چەند لەو سرووده پیرۆزانەی تۆ کە ئەو کابرا ڕێبوارە فێری منی کرد بۆتانی بخوێنم. من هەموو بەیانییەک بە خوێندنی ئەم هۆرانە دەست بە کار دەکەم. با شاگردەکانی تۆش گوێیان لێ بێت تا دڵ و گیانیان وەک من ڕوون ببێتەوە":

مەزدا ئەهۆرا،

به شکۆمەندی و مەزنی خۆی،
بەو کەسەی کە خواستی ئەو بە جێ بهێنێت و
بۆ ئاوەدانی و پێشکەوتنی جیهان تێ بکۆشێت،
پاداشتی باشتر لە باشی پێ دەبەخشێت،
بەڵام ئەو کەسەی کە بەدکردار و ناڕاستە و
خواستی ئەو ئەنجام نەدات،
لە ئەنجامی ژیانیدا
بە کەیفەری کرداری خۆی گرفتاری دەکات.
گاتا، هاتی 51، سروودی 6

ئەی مەزدا..!
لە باشترین زانست و کردارەکان
ئاگادارم بکە،
تا بە بیری چاک و بە پاکی و ڕاستی،
ستایشتت بکەم.
ئەی ئەهۆرا..!
بە خواست و شکۆداریی خۆت،
لە ژیانێکی نێو و سەرپڕ لە ڕاستی،
کامەرانم بکە.
گاتا، هاتی 34، سروودی 15

ئەی ئەهۆرا..!
بێگومان لەش و گیانی کەسێک
لەو پاداشتی مزگێنیدراوە بەهرەمەند دەبێت،
کە بە رامانی پاک خەبات دەکات و
بۆ ئاوەدانی و پێشکەوتنی جیهان تێ بکۆشێت،
لە بەڕ تیشکی ڕاستیدا
ئایینی هزری پیرۆزی تۆ پێش بخات و
خواستی تۆش بە جێ بهێنێت.
گاتا، هاتی 34، سروودی 14

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!

ئەم ڕێگایە کە بۆ منت دیاری کردووە،
ڕێگای رامانی پاک و دەستوور و راهێنانی سوشیانسەکانە،
ڕێگاکەش بەم چەشنەیە:
تەنها کرداری پاکە
لە بەر تریفەی ڕاستیدا
ئەنجامی شادمانی و گەیشتن بە تۆ دەگەیەنێت،
ئەو پاداشتەی کە بە زانایان دەیبەخشیت.
گاتا، هاتی 34، سروودی 13

ئەی بەدیهێنەری زەوی و ئاو و گیا..!
ئەی مەزدا..!
لە بەر پرشنگی پیرۆزی خێرەتی خۆتدا،
پێگەیشتن و جاویدانیبوونم پێ ببەخشە و
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
تاو و توانامەندیی لەش و ڕەوان و
پایەداریی ژیانی نوێم پێ ببەخشە،
هەروەهاش لە ڕاهێنانەکانی خۆت
کامەرانم بکە.
گاتا، هاتی 51، سروودی 7

ئەی مەزدا..!
ئێستا پەیامی تۆ
بۆ مرۆڤی زانا ڕوون دەکەمەوە:
سەرئەنجامی خراپ بەشی چەواشەکارانە،
بەختیاریش بۆ کەسێکە
کە پابەندی ڕاستییە.
بێگومان شادومانیش هەر بەشی ئەوە،
چونکە ئەم پەیامە ڕامانخرۆشێنەرە
بۆ دانایان ئاشکرا دەکات.
گاتا، هاتی 51، سروودی 8

"ئەی زەردەشت! من ئەم سروودانە و سروودەکانی دیکەت هەموو ڕۆژێک لە بەر دەخوێنم، چونکە ڕێگای ڕوونی ژیانت لە هۆنراوەکانتا دیاری کردووە". زەردەشت ناو چاوانی کابرای جووتیاری ماچ کرد و هەستا لەتەک شاگردەکانی بەڕێ کەوت. پاشان زەردەشت بە دوای گوتەکانی جووتیارەکە فەرمووی: "پایە و کۆڵەکەی دین و ڕاهێنانی من، ئاوەدانی و پێشکەوتنی جیهانە. هۆنراوەی هەرە مەزنی من دەر بارەی ئاوەدانی و پێشکەوتنی جیهان و ئاوات و ئارەزووی من بۆ ژیانێکی ئاسوودە و پڕ لە ئاشتی و جیهانێکی باشتر بۆ کۆمەڵان، بەم چەشنەیە":

ئەی مەزدا..!
کەی ڕاستی و پاکی و
خۆبەختکاری و وڵاتی پڕ لە کێڵگەی پان و بەرین و
خانومانی جوان و ئاوەدان،
بە دی دێت؟
کێن ئەو کەسانە،
لە هەمبەر چەواشەکارانی دڵڕەش
پشتیوانمان دەبن؟
کێن ئەو کەسانە،
کە لە زانست و تێڕوانینی رامانی پاک،
بەهرەمەند دەبێت؟
گاتا، هاتی 48، سروودی 11

بە ڕاستی زەوی
پەنایەکی باشە بۆ ئێمە.
زەوی دوو دیاری،
توانامەندیی لەش و هێزی ڕەوان بە ئێمە دەبەخشێت.
مەزدا ئەهۆرا،
لە سەرەتای ئافراندن و لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
لە سەر زەوی گیا و ڕووەکی ڕواندووە.
گاتا، هاتی 48، سروودی 6



زەردەشت فەرمووی: "هەموو شتێک لەم جیهانە، لە زەوی و کار و کۆشش و بزاڤ و لێکۆڵینەوە و لە ئاوەدانیدایە. گەرەکە جیهان ئاوەدان بکرێتەوە و لە خۆشی و ئاسایشتدا بژی. پێویستە لە ناو هەموو باوەڕ و رامانەکاندا، ئەو بڕوایە هەڵبژێردرێت کە مرۆڤ هان دەدات بۆ خۆشەویستی و ئاوەدانکردنەوەی ئەم جیهانە و هەروەها بۆ تەندروستی و گەشەکردن و شادومانی. هەر رامان و باوەڕێک کە بەم چەشنە نەبێت و مرۆڤ ببات بۆ جیهانی خەیاڵ و گومانچنین و تاریکی، دەبێت وێڵ بکرێت و پشت گوێ بخرێت".

ئینجا زەردەشت ڕووی کردە شاگردەکانی و پرسی: "بە ڕاستی ئەم هەموو حەز و دڵخۆشی و هیوا و سەوداسەرییە کە لە دڵی جووتیارەدا بوو، چ بوو؟" قوتابیەکان هەر کامەیان قسەیەکیان کرد و پاشان زەردەشت بە جامئەسپی فەرموو: "ئەی جامئەسپی زانا! ڕەوشتی من بەم چەشنەیە کە هەرگیز رامانی خۆم بە کەسێک بار ناکەم و نایسەپێنم و هەموو خەبات و تێکۆشانی من لە ڕێگای ورووژاندن و زایاندن و گەشەکردنی ئەندێشەکانە. دەخوازم لەمەڕ پرسیارێک کە کردم بە وردی بیر بکەیتەوە و بیروبۆچوونی خۆتم پێ بێژی".

جامئەسپ تاوێک بیری کردەوە و ئینجا گوتی: "لە سەر بنەمای ئەو شتانەی کە فێرمانت کرد، گومان دەکەم بۆ ناسین و زانینی ڕاز و نهێنیی ئەو هەموو حەز و خۆشەویستی و ئاوات و کەیفخۆشیەی ئەم وەرزێرە، دەبێت دووبارە ئەو دەنکە گەنمە بێنینەوە یادمان و بیخەینە بەر تیشک و لێکۆڵینەوە. دەنکی گەنمێک کە ئەم جووتیارە دەیچێنێت، هەمان وزەیەکی هەیە کە لالۆی جووتیار هەیەتی، ئەوەش هێزی زایاندنە. ئەگەر بێتو لالۆی جووتیار لە جێگای گەنم، وردە بەردی بپرژاندایەت، ئەوە وردە بەردەکە گیانی نەدەگرت، ڕیشە و چەکەری نەدەبوو، نەدەڕووا، باڵای نەدەکێشا و نەدەپشکوت. هۆی ڕوواندن و باڵاکردن و گەیینی گەنم ئەوەیە، کە هێزی زایاندنی هەیە و هەر ئەم هێزەیە کە ئەو بۆ بزاڤ و دۆزینەوە هان دەدات و لە مردوویی و خامۆشی دەری دێنێت و کۆتایی بە بێگیانی ئەو دێنێت. ئەم وەرزێرە

ئەگەر لە جێگای کێڵاندن و چاندن، بخزایەتە سووچێک و بۆ رامانی لێڵ و تێکەڵ و پێکەڵ و پڕ لە زیان هانای ببردایەت، ئێستا هەرگیز ئەو هەموو خۆشی و حەز و شادمانییەی، لە سەرو ڕووی نەدەباری. یا ئەگەر ئەم جووتیارەش وەک ڕێگران، ئارمانجی ژیانی تەنها لە دزی و تاڵان و کوژتن و دەستدرێژی بە بەرهەمی کۆمەڵانی دیکە بدیایەت، هەرگیز بەم چەشنە جیهان و ژیانی ئاوا ڕووناک و ناسک نەدەبینی. ئەویش دەبووە درەندەیەکی تاڵانکەر و خوێنمژ و بەکوژ، کە ژیانی بەس لە دزین و بڕین و کوشتن دەزانی. خواوەندەکەشی لە جێگای ئەوە یەزدان و بەدیهێنەری چاکییەکان و زەمین و ئاو و گیا و گیانلەبەران و ئاوەدانی و شادمانی و کامەرانی بێت، خودایەک دەبوو، خوێنرێژ و ناشیرین و کینەیی و بەددڵ کە ئەوی بۆ کوشتن و دزین و بڕین و چەواشەکاری یارمەتی دەدا و نیایشت و لاڵانەوەکانی بۆ تاڵانکردن و دزی و دەستدرێژی بۆ سەر خەڵک دەپژراند و وەڵامی دەدایەوە. هەموو دیاردەکانی کرداری و ڕەوشتی ئەو جووتیارە لە هەمان هێزی زایاندن بەهرە دەگرێت و هەڵدەستێت. بە هەمان چەشن کە وزەی زایاندن، سەری چەکەرەی ناسکی گەنم لە ژێر ئاستەڕی خاک کە داپۆشیوە سەر هەڵدەدات. هێزی زایاندنی جووتیارەکە، وزەکانی سازکەری ڕەوان و لەشی ئەو بەئاگا دێنێ و وەکاری دەخات و دژواریەکانی ژیانی لە سەر ڕێگا بۆ لا دەبات".

لەم کاتەدا جامئەسپ ڕووی کردە زەردەشت و گوتی: "ئەی ئامۆژگاری مەزن و ئەی فێرکەری زانا! ئەی کە خێرەتی تۆ پایانی نییە! ئێستا کە ئەم گوتانەم لەمەڕ زایاندن گوت، سروودێکت هات بە بیرم کە لە سەرەتای پەیامنێریت، ئەو کاتەی کە وەهمەن و ڕەوانی جیهان هەر دووکیان ئەهۆرا مەزدایان ستایشت دەکرد و داوایان لێ دەکرد کە گەزەندێک بە بەهدینان و ڕابەرەکەی لە ئالی چەواشەکارانەوە پێ نەگات، دەخوێنم":

من و ڕەوانی ئافەرینشت،
بە ڕێز و دەستی بەرزکراوەوە،
ستایشتی ئەهۆرا دەکەین،
لە ئەو داواکارین
کە لە ئالی چەواشەکاران و نەیارانەوە
گەزەند بە پاکان و ڕابەرەکەیان نەگات.
گاتا، هاتی 29، سروودی 5

زەردەشت فەرمووی: "ئەی جامئەسپی دانا! قسەیەکی فرە بە جێت گوت. ڕەوتی ژیانی کۆمەڵ، ڕێک چەشنی ڕەوتی دەنکە گەنمەکە و جووتیارەکەیە. هەر کاتێک ڕەوتی گەڕیان و دۆزینەوە لە کۆمەڵگایەک ڕاوەستێت، ( کە ڕاوەستێت، چونکە سرووشت و هەنجاری مرۆڤایەتی هەمیشە لە دۆزینەوە و گەشەکردندایە،) وزە و تیشکی ژین بەرەو خامۆشی دەڕوات و مێشک و هزرەکان هەر وەک گەنمی لە ئەنبارکراو، کە لە یەک جێگادا ڕاگیرابێت، لە خۆی هیچ نیشانە و برژەنگێکی زیندووبوون نیشان نادات و ناپشکوێت، باڵا و گەشە ناکات و لە ناو خۆیدا دەنکی تر بەدی ناهێنێت. لە کۆمەڵگایەکی قەتیسکراوی ئاوا، لەشی مرۆڤ بێتین و بێگیان دەبێت و کاری بەس خواردن و نۆشین دەبێت. گوتن و کرداریشی ڕەنگدانەوەی ئەو شتەیە کە بیستوویەتی و یا خود لاساییکردنەوەی پێشینیانیەتی. لە کۆمەڵگای ئاوا ڕۆژەکان و هەپتەکان* و هەیڤەکان* و ساڵەکان تێ پەڕ دەبێت، ساڵەکانیش بە سەدە* و سەدەکان دەبن بە ڕۆژگار و

زەمانیش تێدەپەڕێت، بەڵام ئەم مەردومە وەک کوچک* لە سووچێک کەوتن و هەرگیز لە خۆیاندا نیشانەیەک بۆ جووڵە و گۆڕانی ژیان بەدی ناکەن. ئەمەی کە لە سەرەتای پەیامهێنەریی من، خێرەتی بوون و ڕەوانی پڕ پیت و فەڕی جیهان کەوتنەتە جووڵە و گەڕیان، بۆ ئەوە بوو کە مەردوم لە جووڵین و دۆزینەوە و گەڕیان و بەرخۆدانەوە، دەیانویست لە ناو دڵی تاریکیەوە، ڕێگایەک بەرەو ڕووناکی بدۆزنەوە. دەیانویست ئەو شتەی کە دێرین و وەستاو و قەتیسماو و داڕزیاگ بوو و مێشکیان نەیدەپەژراند، فڕێ بدەن و بەرەو باوەڕ و ئایینێک ڕوو بکەن، کە لەتەک رامان و ئەندێشەیان سازگار و گونجاو بێت. مەردوم لە ستەم و بێداد و خوێنمژی کەرپانەکان و میران و جادووگەران بە وەڕەس هاتبوون و داواکاری ژیانێکی تازە و نوێ بوون. ئەم کار و کاردانەوانە و گەڕیان و بیرکردنەوانە، ببوو بە هۆی ئەوە کە هزری کۆمەڵ بڵێسەدار و بەرەو دۆزینەوە و چارەسەری بچێت. لە هەمووی ئەم هەڵچوون و داچوونانە و گشت ئەو گۆڕانانە، من هەمیشە لە ناو جڤاک بووم و لە سەرنج و بزاڤ و وشیاری خەڵکی پێشرەو و پێشاهەنگ تێ دەگەیشتم. هەروەها لە بەر بەرسڤ و داخوازی و ویستی زەمان بوو کە ڕاپەڕیم و دینی خۆمم ئاشکرا کرد. ئێستاش من رامان و باوەڕەکانی خۆم شی دەکەمەوە و ئێوە دەیبیستن و تێدەگەن و بە کاری دێنن. کۆششی و خەباتی من بۆ ئەوەیە کە جیهانێکی نوێ و باشتر بەدی بێنم، کە جەوهەرەکەی، ژیان و بوون و تازەگەری و وەرچەرخانە، بە هەمان چەشن کە لە سروودەکانم گوتوومە":

ئەی مەزدا..!
تا ئەو کاتە کە لە بەر تیشکی ڕاستیدا
تاو و توانام هەیە،
ستایشتی تۆم کردووە و هەر ستایشتت دەکەم.
هیوادارم ئەی ئافەرینەندەی جیهان..!
لە بەر تیشکی ڕامانی پاکدا،
یەکەمین و باشترین خواستی دروستکرداران،
کە تازەسازیی جیهانە،
بە جێ بهێنیت.
گاتا، هاتی 50، سروودی 11

زەردەشت کەوتە پرسیار و فەرمووی: "چ کەسانێک لەتەک ئەم وەرچەرخان و پێویستییەی سەردەم و راهێنانەکانی من بەربەرەکانێیان دەکرد و ئێستاکەش دژن؟ بێگومان کەرپانەکان و کاوییەکان و جادووگەران. ئەوانەن کە لەتەک ئاوەدانکردنەوە و گۆڕانکاری و نوێکردنەوەی جیهان دژایەتی دەکەن و دەیانەوێ کۆمەڵگا بە هەمان چەشن ببێت و بمێنێتەوە کە مێشک و باوەڕە تاریکەکانیان فەرمانیان پێ دەدات. ئەمانە لەتەک هەر کەسێک کە هەنگاڤێک بۆ تازەگەری، بووژانەوە، وەرچەرخان، ئاوەدانکاری و ورووژاندنی هزر و رامان و ژیان بنێت، دەجەنگن. هۆی سەرەکیشی ئەمەیە کە بوون و مان و ژیانی تێر و تەسەل و ساماندارییان، لە دواکەوتوویی و نائاگایی جڤاکدایە. بەڵام کەرپانەکان و کاوییەکان نازانن کە یاسای گەردوون و فەرمانی ژیان، جووڵە و گەڕیان و دۆزینەوە و گەشەکردنە. ئەوان نازانن کە هەر

ئەندازە وزە و توانای خۆشیان بخەنە کار، سەرئەنجام دانە دەکەوێتە ژێر خاک و ئاو و تیشکی ڕۆژی پێ دەگات و سەر لە زەوی دەر دێنێت و چەکەرە دەکات و جووتیاریش بە ئاوات و ئارەزووی گەنمەکەی دەگات. جا ئارمانج و کام و خواست و کۆشش و بەرخۆدانی من، وەرچەرخان و نوێکرنەوەی جیهانێکی باشترە. من دەمەوێت پاشڤەڕۆیی و کۆنەپەرەستی لەناو ببەم. من دەمەوێت هزری داڕزان و نەخۆش فڕێ بدەم و جیهانێکی تازە دروست بکەم و هەمیشە کارێک بکەم کە بە رامان و بیری بەهرەدار و داهێنەر، جیهان تازە ڕابگیرێت، چون هەموو خۆشییەکان لە نوێبوون و تازەبووندایە. دووبارە گوێ بەم سرووده بگرن":

کەسێک بەڕاستیی،
خواستی زەردەشت بە جێ بهێنێت،
کە داواکاری درووستکردنی
جیهانێکی تازەیە،
لە پاداشتی ژیانی جاویدانە بەهرەمەند دەبێت و
لەم جیهانە پڕبەهرە و بەپیتەدا،
هەموو ئارەزووەکانی دڵی دێتە دی.
ئەی مەزدا..!
هەمووی ئەم شتانە
تۆ بۆ من ئاشکرا و فێرت کردووم.
گاتا، هاتی 46، سروودی 19

جامئەسپ پرسیاری کرد: "ئەی زەردەشتی زانا! دەمەوێ لەمەڕ ئەو سروودەت کە ئاماژە بۆ ڕەنج و شادی و کارە، فرەتر شی و ڕوونیان بکەیتەوە".

زەردەشت فەرمووی: "لەم سرووده چەند خاڵی سەرەکی و بنەڕەتیی ژیان هەیە، بەڵام با لە سەرەتادا لە بارەی ڕەنج و شادی بڵێم. سروشت و ڕازی ژیان بە چەشنێکە کە لە ناویدا هەم ڕەنج هەیە و هەم شادی. شادی و خۆشیی ڕاستەقینە و بێکۆتایی تەنیا لە ناو زێ* و مناڵدانی دایک دایە. یان لەو کاتەوە کە بە گوتەی ئەو دەنکە گەنمە، کە هاتە خەونی جامئەسپەوە، کە مرۆڤ لەو بەهەشتەدا بوو. لە ناو زێ یان بەهەشتبوون خۆشە، مرۆڤ بە بێ ئەوە بخوازێت و کۆشش و هەوڵێک بدات و لە شوێنێک بۆ شوێنێک بچێت، تێر و پڕ دەژی و جێگا و شوێنی گەرم و نەرمە و هیچ شتێک ئازاری نادات. لەوانەشە هۆ و هاندەری نادیار و ناپەیدای مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی ئاسایشت و خۆشی، بازگەشت و گەڕانەوە بێت بۆ ڕۆژگار و ژیانی ناو پسدانی دایک یا بەهەشتی خەونەکەی جامئەسپ. بەڵام سروشتی مرۆڤ وایە کە ناتوانێت هەمیشە لە ناو مناڵدان و یا ئەو بەهەشتەدا بژێت. ئێمە بیستمان لەو بەهەشتەدا رامان و هێزی لێکۆڵینەوە و پشکنینی مرۆڤ، سەرئەنجام ئەوی بۆ گەڕان و بیرکردنەوە هان دا و لەو جیهانە قەشەنگ و ئارام و ئاسوودەیە کە پێوە گرێدارو بوو، جودا کردەوە و هەوراز و نشێو و خەم و خەفەتی زەوی نایە سەر کۆڵی.

باوەڕم وایە ئەگەر مرۆڤ ماوەیەکی فرەتر لەو بەهەشتەدا بمایەتەوایە، بە هۆی نەبوون و نەکردنی هەوڵ و کۆشش و چالاکی و کار، هێدی هێدی سست دەبوو و دادەوەشیا و دەپووکا و لەناو دەچوو. بەڵام دەرچوونی لە بەهەشتدا، خۆی بوو بە سەرەتای دەستپێکردنی ژیانێکی نوێ، کە هەر چی نەبێت ئەوی بە هێزی رامان و کار بۆ هەمیشە لە زەوی نیشتەجێ کرد. منداڵیش ئەگەر زۆرتر لە ماوەی دیاریکراوی خۆی لە پسدان و سکی دایکیدا بمێنێتەوە، دەمرێت و تەنانەت مەترسیش بۆ دایکەکەی دروست دەکات. کەواتە ژیانی منداڵدان و بەهەشت سزاوار* و شایستەی مرۆڤ نییە. چونکە جووڵین و گەڕیان و گەشەکردن و پێشکەوتن لە ناو نیهاد و دەروونی مرۆڤدایە و مرۆڤ دەبێت و گەرەکە لە ژیانی منداڵدان و بەهەشتی بەر بدات و خۆی بهاوێژێتە ناو زەریای پڕ شەپۆلی ژیان. جا ئەم زەریایە بە پێچەوانەی منداڵدان و بەهەشت، تەنیا خۆشی نییە،بەڵکوو ڕەنجیشی هەیە. بۆیە دەرئەنجامی ئەم بگرە و بەردە و کۆشش و خەباتە لەتەک ڕەنجدا، چاوکانی خۆشییە. بەڵام پرسیارێکی دیکە دێتە ئاراوە ئەویش ئەوەیە کە چۆن لەتەک ڕەنجدا خەبات بکرێت و بە خۆشی بگەی؟ هەمان شێوە کە لە ژیانی لالۆی جووتیاردا دیمان و لە سروودی منیشدا بیستتان، لە ڕێگەی کارکردن. کارێک کە هاوکات لەتەک رامان و هزری چاک و ڕاستی و زانیاری و پێشکەوتندا بێت. بەم جۆرانەیە کە مرۆڤ دەتوانێت کۆتایی بە ڕەنج بدات و بە خۆشی بگات. لە بارەی کارکردنیش بێژم، کە کارکردن بەشێکە لە سرووشت و نیهادی مرۆڤ. مرۆڤ بە بێ کارکردن هەروەک ئاسنێکە، کە لە جێگای تەڕ و شێداردا دابنرێت، بێگومان لە بێکاریدا ژەنگ دێنێت و دادەڕزێت و لەناو دەچێت. سرووشتی مرۆڤ سازکەرە و تا دوایی هەناسەی ژیان دەبێت کار بکات. کارکردن مایەی ئاسایشتی ژیان و هەم مایەی تەندروستیی لەشە و هەم سەرچاوەی ئاسایشت و خۆشگوزەرانی کۆمەڵگایە. ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا هەموو کار بکەن، هەمووی جڤاک لە خۆشی و ئاسایشت ژیان دەبنە سەر. بەتاڵی بەدترین ئاپۆرەیە* بۆ جڤاک. بێکاری، بکوژی پاکی و خۆراگرییە و هەروەها دەبێتە مایەی سەرلێشێواوی و هەراسانیی مێشک، تێکچوونی شیرازەی ڕەوان، ناهەنجاریی ئاکار و ڕەوشت، هەژاری و بندەستی، گوێلەمشتی و کۆلەتی. بێکاری مرۆڤ لە کرداری چاک دوور دەکاتەوە.

بەڵام سەرکەوتن و خۆشبەختی، شادومانی و ژیاویی، سەرودڵخۆشی و ئاسوودەیی، کامەرانی و سەرفەرازی، بێنیازی و پێشکەوتن، دەستەڵات و پوختەیی، دەوڵەمەندی و تەرپۆشی، توانامەندی و مەزنی، باڵاکردن و دەسترۆیشتن، ڕەواندروستی و ڕەوانئارامی، خۆگری و ئامادەیی، خۆناسی و کۆمەڵناسی، تەوژمداریی و گەشەکردن، کەیفخۆشی و ڕەوشتجوانی، ڕێز و تۆکمەیی، خۆشنوتی و دڵخۆشی، بەدەماخی و ڕاوەستاوی، پایەداری و بەهێزی، راماندروستی و کرداردروستی، وریایی و بەهرۆزی، پشکووتن و دەستئاوەڵایی، ئازایی و نەبەزی، تینداریی و داهێنەری، داهێنەری و پاکی، سازکەری و تازەیی، دڵگوشایی و دڵزیندوویی، هیواداری و یارمەتی، وەرزیدەیی و خێرەتمەندی، بەشکۆیی و ناوداری، کاربینی* و تەیاری، خۆشەویست بوون و ئاگابوون، دانای و ئاوەدانی، هۆشیاریی و سەرگەرمی و دەیان پەسنی باشی تر هەمووی لە کـــــــار دەوەشێتەوە. کار مانای ژیانە و ژیان بە واتەی کارە. بەڵام سەبارەت بە چۆنیەتی و چەشن و شێوەی کار بێژم، هەروا کە پێشتر لە کاری لالۆی جووتیار دیتان، کارتان خۆش بوێت و بە دڵ و دایەن و وردی و پوختی ئەنجامی بدەن. کار فێر بن و بە زانابوون دەستی بۆ بەرن. هەرگیز کار بە سەرسەری* مەگرنە ئەستۆ و سەرسەریش ئەنجامی مەدەن. کارەکانتان هەرچی کە هەیە بە جوانی و زەریفی و دروستی ئەنجامی بدەن و لە بیری چەندوچۆنی مەبن، ئەوەی ئەرزشمەند و بایەخدارە خودی کارە، نە چەندوچۆنی. هەرگیز کاری ئیمڕۆ مەخەنە بەیانی. کار بکەن و کاری شایان بکەن و لە هەر چەشنێ کاری ناشایست دوور بکەوەوە. لە کارێکدا کە سووچ و

سەرشۆڕی و بێ ئاوڕوویی و بەدناوی بە دوایەتی، نزیک مەبنەوە. کارێک بکەن کە بۆ پێشکەوتن و ڕاژەی* کۆمەڵگا بێت. هەرچی ڕاژەی کار بۆ کۆمەڵگا پترتر بێت، بەشکۆتر و پڕبەهاتر و بەئەرزشترە. ئەگەر گەرەکتانە سەربەخۆ و ئازاد بژین هەمیشە کار بکەن. هەر کارێک دەستان بۆ برد لە کاتی دیاریکراو و لە جێگای خۆی بیکەن. لە کاردا سستی و کەمتەرخەمی مەکەن، ئەگینا بەهرە و سوودی کارەکە لە دەست دەچێت. کارێکی کەم کە بە دڵ و گیان ئەنجام بدرێت، لە کارێکی فراوان کە بە بێ ویست و حەز بکرێت باشترە. کار بەدیهێنەری هەموو بایەخ و ئەرزش و پلە و پایەکە. بە کارکردن، نرخی خۆتان فرەتر بکەن و لە ڕەنجی شان و باڵی خۆتان نان بخۆن و بەهرەی کاری کەسێکی تر مەڕفێنن. باشترین سەرمایەکان، سەرمایەیەکە لە کار و دەسترەنجی خودی مرۆڤ بووەشێتەوە. بیچێنە تا بیدووریتەوە. هەمیشە کار بکە و بە هیوای گەنج و خەزێنەش دامەنیشە".

# دەنگی پیکی ئاسنگەر



زەردەشت درێژەی بە فەرمایشەکانی دا: "مژار، مژاری شادی و ڕەنج و کار و ژیانە. کاری ئەو جووتیارە کە بە دەستە پڕتواناکەی خۆی خارستانی کردە گوڵستان و کێڵگەیەکی سەوز و ئاوەدان، بەم جۆرە ئەو توانی دڵ و گیان و ڕەوانی خۆی بگاتە جێگای چاندن و پەروەردەکردنی چاکییەکان. ئێستاش دووبارە گوێ بگرن و دیاردەیەکی دیکە لە کار ببینن. ئەوەی کە دەیبیستن دەنگی پوتکی* ئاسنگەرە. ئەم ئاسنگەرە دراوسێی منە و هەموو بەیانیەک کە لە سەرام دێمە دەرەوە، بۆ تاوێک لە بەر دەرگای ئاسنگەرخانەکەی ڕادەوستم و کاری قەشەنگ و وردی، تواشا دەکەم و گوێ بۆ دەنگی پیکەکەی دەگرم. شان و مەچەکی ئاسنگەر بەهێزە، بە دەستێکی پارچە ئاسنێک دەگرێت و بە دەستەکەی تری پوتکەکە. لە ناو کوورەکەی، ئاسنەکە جوان سوور دەکاتەوە و پاشان دەیخاتە سەر سندانەکە* و بە پوتکەکەی دەکەوێتە گیانی و بە هەر چەشنێک کە بیەوێت وەک بێڵ* و پابێڵ و پاچ و گاواسن و بزمار و ناڵ و گوڵمێخ و لەغاو وئاوزەنگ و نیل و ئاموور و تەشو و تەور و شەن و ئەمرازی دیکەی ئاسنیی دەری دەهێنێت. ڕەنگی سووری ئاسن و دەنگی سەنگینی پیکەکەی، گوێ و چاوی من نەوازشت دەکات. زۆر جار ڕادەوستم و چاو دەبڕمە ئاسنە سوورەوەکراوەکەی و هەروەها گوێ دەدەمە دەنگی پیکەکەی و جارجاریش لەتەک ئاسنگەرەکە قسان دەکەین. پێشنیاز دەکەم کە ئێستا بچین بۆ لای ئاسنگەرەکە و برێک گفتوگۆ بکەین، چونکە من فرە سوود و بەهرەم لە ئاخافتنی ئەو بردووە و قسەکانی بەڕاستی سەرنجڕاکێشە".

زەردەشت: "ڕۆژباش پاڵەوان، ئەی مەردی لێهاتووی کارگای ئاسنگەری! ئەی کە ئاسن لە بەر دەست و مەچەکی تۆ هەر وەک مۆمی لێ دێت و بە هەر چەشنێک کە بتەوێت دەینەخشێنی، لەتەکماندا قسان بکە، کە گوتەکانی تۆ زۆر بۆ من خۆش و سوودمەندە. سەرەتا بۆمان بێژە قارەمان*، ئایا ڕەوانت هیچ تووشی دەرد و ئازار دەبێت"؟

ئاسنگەر: "ڕەنگە ئاسنێکی ژەنگاوی کە لە سووچێکی شێدار فڕێ درابێت دڵێکی پڕ لە ئازار و ڕەوانێکی دەردەداری بێت، بەڵام دەرد و ئازار و ڕەنج لە مندا نییە. کوورە داخەکەم زۆر ئاسان و زوو ژەنگی ئاسنەکە پاک دەکاتەوە و لەو ئاسنێکی ژەنگاوی فڕێدراو، ئەسپابێکی سوودمەند دروست دەکەم".

زەردەشت: "ئایا تۆ مەزنتری یان شاگوشتائەسپی دلێر، یان ئایا کەسێک لە خۆت بە بەرزتر دەزانی و یا خۆت لە کەسێک بە کەمتر دادەنی"؟

ئاسنگەر: "شمشێرێک کە بە بەر کەمەری شاگوشتاسپەوەیە و زرێیەک* کە لە کاتی جەنگدا لە بەری دەکات و کڵاوخوودێک* کە دەیکاتە سەری و لەغاو و ئاوزەنگی* ئەسپەکەی و دشنە* و خنجێرەکەی هەموویان لە بەر دەستی من هاتوونەتە دەر. بڕوام وایە ئەگەر من نەبم، شاگوشتاسپیش نییە. ئەمە من نیم کە دەبێت لە بەرانبەری شاگوشتاسپ سەر دابنەوێنم و هەست بە پچووکی بکەم. ئەمە شاگوشتاسپە کە دەبێت لە بەر دەم درگای کارگاکەم ڕابوێستێت و گوێ لە فەرمان و ئامۆژگاریی من بگرێت و هەرچی کە دەبێژم بە کاری ببەستێت و هەر چی کە چێی دەکەم بە کاری بێنێت".

زەردەشت: "ئایا هیچ بۆ ڕابردوو درێغ* و ئەفسۆس* دەخۆی و هیوات بە داهاتوو هەیە"؟

ئاسنگەر: "مرۆڤ کاتێک درێغ و ئەفسۆس دەخوات کە کارێکی بە فەرمانی هزری نەکردووبێت. من کە هەمووی ژیانم لە بەردەمی ئەم کوورە و پوتک و سەندانە بووم، مێشک و دەستەکانم خستووەتە کار و هەزاران ئاسنواڵەم دروست کردووە، ئیتر جێگای داخ و خەفەت خواردن بۆ گوزەشتە نییە و بیر لە داهاتووش ناکەمەوە، چونکە ئایەندە وەکوو کوورە و ئاسنە سوورکراوەکە کە بە سەر سەندانەکەمەوەیە، ئاوا بۆم ڕوون و ئاشکرایە".

زەردەشت: "ئایا تا ئێستا هیچ هەستت بە تێکشکان و کڵۆڵی و پەرێشانی و کەنەفتی کردووە و یا دەکەی"؟

ئاسنگەر: "ئەگەر ئاسن توانای ڕاوەستانی لە بەرم ببوایەت و سوور و نەرم نەبوایەتەوە و نەتوایەتەوە، ڕەنگە، بەڵام هیچ ئاسنێک تا ئێستا لە بەرانبەری مندا توانای ڕاوێستانی نەبووە کە هەست بە سەرشکستی و لاوازی و داماوی بکەم".

زەردەشت: "ئایا تا ئێستا هیچ دەرد و خەفەت و هەژاری و ئاتاجی دایگرتوویی"؟

ئاسنگەر: "تا کوورەکەم گەرم و تاوێنەر و بەگڕە و ئاسنم بۆ سوور دەکاتەوە، نا، لە ئایەندەش ئاگادار نیم، بەڵام تا گیان لە لەشم دایە و تا دوا هەناسەی ژینم، ئاسنی سوورۆکراو دەکوتم، لە ڕووداو و پێشهاتەکانی چاوەڕوان نەکراویش بێئاگام".

زەردەشت: "ئایا هیچ چوکڵەی خاری بێهانایی و بێهیوایی یان سەرلێشواویی تۆی داگرتووە"؟

ئاسنگەر: "لە سەربانی ئاسنگەرخانەکەم خاری وای لێ شین نابێت و ڕێگاشم ناکەوێتە دەشت و بیابان".

زەردەشت: "ئایا تا ئێستا هیچ گرژی، ڕژدی*، بەدبینی، بەدخوازی، بەدنیهادی، بەدڕەوشتی و ئەندێشەی خراو، تۆی داگرتووە و یان ڕووی تێکردوویی"؟

ئاسنگەر: "دەنگی خۆش و دڵکێشی پۆتکی من وەها دڵ و ڕەوانی منی داگرتووە کە هەرگیز جێگایەک ناهێڵێت بۆ گرژی و خوار و خێچی و ترشی و تاڵیی".

زەردەشت: "ئایا ڕژدی بە کەسێک دەبەیت"؟

ئاسنگەر: "ڕەنگە کەسانێک بە من ڕژد ببەن، بەڵام من بە هیچ کەس ڕەشک* نابەم".

زەردەشت: "کارگاکەت پڕ دەبینم و هەموو شتێک لە سەر ڕێگا و جیگای خۆی دانراوە و بە گشتی بە ڕێکوپێکی دێتە بەر چاو تەنانەت جل و پڵاسی تۆش جوانی و ڕازاوەیی تایبەتیی خۆی هەیە".

ئاسنگەر: "ڕێکوپێکی و ڕازاوەیی لە ڕەوان و دەروونی من و لە دەستەکانمدایە و هەروەها لە کار و ڕەوشتم. جا ئەگەر بێتو من تۆزێک کەم و کورت و ناتەواو و ناڕێک و ئاڵۆز بم، ئەوە پرشە و پەرەنگی ئاگر و ئاسنی سوورۆکراو، هەموو لەشم دەسووتێنێت. کوتانی ئاسنی سوورۆکراو لەتەک ناڕێکی ناگونجێت".

زەردەشت: "ئایا هیچ ترسی کەسێک یا شتێک لە دڵت دایە و یا لە کەسێک دەسڵەمێتەوە"؟

ئاسنگەر: "ڕەنگە کەسێک هەبێت کە ترسی کوورەی ئاسنگەری و ئاسنی سوورۆکراو و پوتک و شان و قۆڵی منی لە دڵدا هەبێت، بەڵام لە دڵی مندا ترسی چتێک یا کەسێک نییە".

زەردەشت: "ئایا لە خواوەندیش ناترسی"؟

ئاسنگەر: "خودای من خودای زەردەشتە. خودای زەردەشت، گوزارەی* ترۆپکی خێرەتی هەستییە، مانای هێزی هۆشیاری ئافراندنە، ئەو هێزەیە کە خونچە و گوڵی دارەکانی حەوشەی خانووی من دەپشکوێنێت و بە بەرهەمی دەگەیەنێت، مانگاکانی من دەزێنێت و دەستەکانی من بە سەر ئاسنی سوورۆکراو دەکوتێنێت. خودای زەردەشت هەموو شتێکی بەخشش و خرۆشە، کەوابوو مرۆڤ نابێت لە کەسێک کە دەبەخشێنێت، بترسێت. تەنیا چتێک کە گەرەکە مرۆڤ لێی بترسێت هەمان ترسە، نە داداری مەزنی ئافەریدەگار".

زەردەشت: "ئایا لە تاریکیش ناترسی"؟

ئاسنگەر: "تاریکی بە کوورەی گڕاوی و ئاسنی سوورۆکراو ڕووناک دەکەمەوە".

زەردەشت: "فرە هێدی و دڵنیا و متمانەمەند دیتە بەر چاو، هۆی ئەم ئارامی و لەسەرخۆیی و ڕاوەستاویەت لە چیدایە و ئایا هیچ گرفتاری شێواوی و نائارامی دەبیت"؟

ئاسنگەر: "لە دەروونەوە هیچ تەوژمێک هەست پێ ناکەم تا پێی شڵەژاو ببم. ئەگەر بێتو بەم چەشنە ببوایە و دەروونم ئاڵۆز ببوایە، ئەوە ئەو کەرەستانەی کە لە ژێر دەستم چێ دەبن، ئەسپابێکی ڕێکوپێک و جوان و بەهرەمەند و بەئەندازە دەرنەدەهات. چاکی و لێهاتوویی ئەسپابەکانی دەستکاری من، لە ئاسوودەیی و ئارامیی ڕەوان و بنیاتی منەوە سەرچاوە دەگرێت".

زەرەشت: "ئایا زمانت هەرگیز بە درۆ کراوەتەوە"؟

ئاسنگەر: "لە دڵی کەسێک کە ترس و زەبوونی و شەرمەزاریی و پەرێشانی نەبێت، لە سەر زمانیشی درۆ نییە".

زەردەشت: "ئایا لە گوتە و کردەی خۆت هیچ پەشیمان دەبیتەوە"؟

ئاسنگەر: "کارێک کە بە ڕامان و ڕاوێژ و بە خێرەت ئەنجام بدرێت پەشیمانی نابێت و هزری من لە هەموو کارێکدا ڕێپێشاندەرمە".

زەردەشت: "ئایا ڕک و کینەی کەسێکت لە دڵدایە"؟

ئاسنگەر: "من هیچ شتێک لە دڵمدا ڕاناگرم. هەر تشتێک گرژ و توڕەم بکات، لە هەمان کاتدا زمانم هانم دەدات کە قسان بکەم، گوتەم بێ هیچ بیم و ترسێک دەبێژم و هەموو کین و تووڕەییم دەڕژێنمە دەرەوە، کاتێک کە گرژی و ڕکم ڕژیا، ئیدی شتێک نامێنێت تا لە دڵمدا ڕای بگرم. بە گشتی من هەمیشە لە بەرانبەر تشتێک کە ببێتە هۆی گرژیم، کۆشش دەکەم ڕوو بکەمە ڕامان و ئەندێشە، هەمیشە کین و گرژی و توڕەیی، بە مێشک و ڕامان لە ناویان دەبەم".

زەردەشت: "ئایا بووە کوتوپڕ بە کەسێک دڵت بسووتێ و لە ناکاودا پشتی لێ بکەی"؟

ئاسنگەر: "ئاسنی سوورۆکراوە بە هێمنی و شێنەیی نەرم دەبێت و بە لەسەرخۆیی بە چەشنی کەرەستەیەکی لێ دەردێت و پاشانیش بە ئەسپایی نەرم و سارد دەبێتەوە، سەروکاری منیش لەتەک ئاسنە نەک لەتە پووش و پلاش و پووار".

زەردەشت: "ئایا قەت لە ژیان بێزار و وەڕەس بووی و یا دەمێک هاتبێت کە ژیان بۆ تۆ کەوتبێتە تەنگەبەری و بە تەواوی دەستت لێ شۆردبێت"؟

ئاسنگەر: "ئەگەر ئاسن سەرسەختی بکات و سوور و نەرم نەبێتەوە، ڕەنگە، بەڵام تا ئیمڕۆ هیچ ئاسنێکی سفت و پتەو نەبووە کە لە ژێر دەستی من نەرم نەبووبێت و بە ئارەزووی خۆم بە شتێکی دڵخواز دەرم نەهێنابێت".

زەردەشت: "ئایا پێوەندیی تۆ لەتەک کۆمەڵگادا پتەوە یان دوورەپەرز و گۆشەگیریی"؟

ئاسنگەر: "ژیان و کاری من گرێدارو بەو خەڵکانەیە کە کاری ئاسن دەخوازن و منیش بۆ ئەوان چێی دەکەم. نێوانی من و گەل پەیوەندیەکی پۆلایینە کە بێ ئەو پەیوەندیە نە من توانای ژیانم هەیە و نە کۆمەڵیش بۆی هەڵدەسووڕێت".

زەردەشت: "ئایا مەردومت بە دڵ خۆش دەوێت یاکوو خۆشەویستییەکی بەرژەوەندیخوازانە و لە سەر بنەمای ئابوورییە"؟

ئاسنگەر: "هەمان چەشن کە کوورەی ئاسنگەرییەکەم بە من گەرما دەدات، پەیوەندی لەتەک مەردوم دڵ و گیانم گەرم و بەتین ڕادەگرێت".

زەردەشت: "شادومانی یا خەمباری"؟

ئاسنگەر: "خەم و دڵتەنگی ساردییە و لە کارگای ئاسنگەریدا ئەویش لە سەر سندان و ژێر پوتکەکەیدا، جێگایەک بۆ ساردی و خەفەتباری نامێنێتەوە".

زەردەشت: "هەست بە سەرکەوتوویی دەکەیت یان شکست"؟

ئاسنگەر: "تا بە هێزی رامان و شان و قۆڵم و ئاگری کوورە و پوتکەکەم ئاسنی سەخت تێکدەشکێنم، هەمیشە سەرکەوتووم".

زەردەشت: "ئایا لە رامان و ئەندێشەتدا، کارگایەک مەزنتر لە کارگای خۆت دەبینی"؟

ئاسنگەر: "مەگەر لە کارگە و کاری من لەم جیهانەدا، کارێکی دیکەش گەورەتریش پەیدا دەبێت"؟

زەردەشت: "هیچ بیر و خەیاڵی دوور و درێژ داتیگرتووە"؟

ئاسنگەر: "من پەسپەسەکۆڵە* نیم کە خۆم بە تاری گومانەوە هەڵواسم. ئاسنگەرم و ئاسنگەریش بێجگە لە پوتک و سەندان و کوورە و دەست و مەچەک و بازوو، شتێکی دیکە ناناسێت".

زەردەشت: "ئایا هیچ پێ لە بەڕەی خۆت درێژتر ڕادەکێشیت"؟

ئاسنگەر: "بەڕەی من ئەم ئاسنگەرخانەیە و بۆ من سەرو زیادە".

زەردەشت: "هیچ قسە و گوتەیەک کە بۆنی لووتبەرزی و یا خۆهەڵکێشانی لێ بێت، کردووتە یا دەیکەی"؟

ئاسنگەر: "من ڕاهاتم کە ئاسن بە ئەندازەی خۆی سوور کەمەوە و بە ڕادەی خۆی بیکوتم و لە کێشێک بێت کە نە سووک بێت نە سەنگین".

زەردەشت: "ئایا خۆت بە کەمتر یان مەزنتر لە ئاسنگەرانی تر دەزانی"؟

ئاسنگەر: "هەموو ئاسنەکان لە کارگاکانی دیکەی ئاسنگەری یەکجۆرن، پوتک و سندان و ئاگری کوورەکانیش یەکێکە".

زەردەشت: "هیوا و ئارەزووی تۆ چییە و دەتەوێت خول و ڕێڕەویی ژیانت چلۆن بێت"؟

ئاسنگەر: "دەخوازم بەیانییان هەمیشە دەرگای ئاسنگەریەکەم بکەمەوە و ئێوارانیش دایبخەمەوە، باسکەکانم بۆ کوتانی ئاسن بە هێز و ڕاوەستاو بێت، ئاسن و ئاگریشم بە ئەندازەی پێویست هەبێت و کڕیاری بەرهەمەکانیشم بە ئەندازە. سینگم هەمیشە ئاواڵە و سەرم بەرز، دڵم خۆش و لێوم بە خەندە، پەیوەندیم لەتەک خەڵک گەرم و بە تین و پڕ بێت لە مێهرەبانی، چرای ماڵم ڕووناک و سکڵی ئاگردانم گەشاو، زارۆڵەی وەکارم بێت، خراپی لە دڵم ڕێگە نەدەم و ڕەشبین نەبم و هەنگاو بۆ خراپە هەڵنەگرم".

زەردەشت زۆر درووود و سپاسگوزاریی ئاسنگەری کرد و ڕووی کردە جام ئەسپ و فرەشەوشتر و فەرمووی: "ئەی هەڤاڵانی من، روخساری دوو مرۆڤی سەرکەوتوو و ڕەواندروست و بەدیهێنەر و شادمانتان بینی، ئێستا دەمەوێت لە ئازموون و تاقی کردنەوەکانی خۆتان بەهرە و سوود بگرن و کەسانێک کە ڕەوان و گیانیان بە پێچەوانەی ئەم کەسانەیە بە ئێمەی بناسێنن، تا من ڕازی دروستی ئەم جووتیار و ئاسنگەرە و ڕازی نادروست و سەرنەکەوتن و تێکشکاوی و دۆڕاویی ڕەوانی ئەو کەسانەتان بۆ باس بکەم".

# خوو و ئاکارەکانی ناپەسەند



فرەشەوشتر گوتی: "بە گومانی من ڕەوانێک کە بە پێچەوانەی ڕەوانی کابرای جووتیار و ئاسنگەر ببێت، ڕەوان و کەسێتیەکی لاواز و دوودڵ،سووک و بێ ئاوەز، کز و داماو، بێهێز و ترسنۆک، شڵەژاو و شەرمن، شەرمەزار و هەژار، تەنیا و سەرشۆڕ، بێپەنا و ناسازگار، بێکارە و شپرزە، گوماناوی و سڕ، پەشێو و ناساز، ناکۆک و دڵتەنگ، سیس و سەرلێشێواو، هەراسان و سست، نیگەران و چاوەروان، دەستەنگ و بەرەڵا، بێبڕوا و بڕوا پێنەکراو، بەدخواز و سەلەبەر، ڕووش و کەمتەرخەم، گرژ و ناوچاوتاڵ، نەناس و نەخۆش، هاڤی* و شەکەت، بێکەڵک و نەدار، نیازمەند و گەدا، چارەڕەش و ناو زڕاو، خراپەویست و کلۆڵ، کۆیلە و گوێلەمشت، دڵچەپەڵ و مەینەتبار، گۆشتاڵ و بەدخوو، بەدبین و ئاتاج، زمانتاڵ و دەستپیس، نەیار و بێئابڕوو، ڕسوا و دووڕوو، دەستپاچە و ملشۆڕ، تەوەزەل و خەفەتبار، ناتوان و دەمبەگلەیی، ناڕاست و ئاوارە، زەبوون و بێزار، پەشیمان و ناپاک، ڕەنجبەر و دەردەدار و زۆر شتی دیش، کە لە ژیانمدا کەسانی لەم چەشنەم فرە بینیوە کە ڕەوانیان بە پێچەوانەی ڕەوانی ئاسنگەر و وەرزێرکە بووە. داواش لە چامئەسپ دەکەم با بفەرمێت و ئازموون و تاقیکردنەوەکانی خۆی بڕێک بۆ ئێمە بڵێت".

جامئەسپ دەستی کرد بە ئاخافتن و گوتی: "سەردەمێک لەتەک شوانێک سەروکارم بوو. یەکەم جار کە چاوم پێی کەوت، ویستی خۆمم پێی ڕاگەیاند. کاتێک کە خەریک بووم کە مەبەستی خۆمم بۆی دەگوت و هێشتا وتەکانی من کۆتایی پێ نەهاتبوو، شوانە وتەی منی بڕی و دەستی کرد بە قسەکردن. سەرەتا وا تێگەیشتم کە ڕەنگە شوانە زوو لە ئامانج و ویستی من تێگەیشتبێت، بۆیە بێدەنگ بووم و گوێم بۆی ڕاگرت، بەڵام کە کاتێک قسەی دەست پێ کرد، دەستی کرد بە خۆهەڵکێشان و گوایە کە چیی کردووە، لە ئازایەتی و نەترسی خۆی باسی دەکرد، لەتەک گەورەپیاوان وتووێژی کردووە و بۆ سەر خوانیان بانگیان کردووە و لە لێهاتووی خۆی لە پیشەی شوانییدا، ئیدی نەیدەبڕیەوە. شوانە

گوتی و گوتی تا باسی هاورده سەر ڕان و مێگەل و ئەسپ و گاگانی، پاشان دەستی کرد بە پیاهەڵدان و ستایشتکردنی مەڕ و ماڵات و مانگاکانی، دروست بەو هەست و سۆزە کە دەبێژی خودی خۆی پەسن دەدات. منیش بە سەرسووڕمانەوە گوێم بۆ شل کردبوو، کاتێک کە داوای وەرامێکی کورت و پوختم لێ کرد و هەستی کرد کە من مەبەستم بیستنی ئەو بابەتانە نەبووە، سەخت گرژ و تووڕە بوو و وتەکانی درشت و تیژ و وەڵامی نەدایەوە. جارێکی دیکە و چەندان جاری تریش چوومە کنی، بەڵام هەموو وتەکانی بەس ستایشت و پەسنی خۆی و گاگەلەکەی بوو. لە زۆر شوێنی تریش بەڵام نابەجێ بە مەبەستی خۆهەڵکێشان قسەی دەکرد بەڵام تەوەری قسەی هەر خۆی و گاگەلی بوو. جاری وا بوو زۆر بە تووڕەیی خامۆشیان دەکرد و دایاندەنیشتانەوە، بەڵام لە شوێنێکی تر هەمدیسان گەوجانە دەستی پێ دەکردەوە و باسی گەورەیی منەکەی "من" دەکرد. من فرە جار بۆ هەمان مەبەست و کارێک کە دەمویست چوومە لای، بەڵام هەمیشە گێلانە لە جێگای ئەوە بە کاری من بگات، دەستی دەکرد بە ستایشتی خۆی و لاف و گەزافەکردن، پاشان کە بە تەواوی نەزانی و گێلی ئەم کابرایەم بۆ ئاشکرا بووەوە، گەیشتمە ئەو ئەنجامە کە ئەو ماوە کاتم بە فیرۆ چبوو".

یەکێکی دی لە شاگردەکان بەم چەشنە دەستی کردە گێڕانەوەی ئەزموونی خۆی و گوتی: "جارێک بە هۆی کارێک لەتەک کابرایەکی جووتیار بووین بە ئاشنا. کابرای جووتیار وای دەزانی منیش وەک خۆی جووتیارم و دەمەوێت لە زەوی و زارەکەی دەری بکەم و داگیری بکەم بۆ خۆم. جووتیارەکە پیاوێکی بە ساڵاچوو و بەناوبانگ و جێگای بڕوا. سەرەتای دانیشتنمان وێ دەچوو کە سەبارەت بە کشت و کاڵ بەئاخفین. ئەو زۆر ڕێکوپێک و ژیرانە قسەی دەکرد و منیش بە چاکی گوێم بۆی شل دەکرد، ئەمە بەم جۆرە بەردەوام بوو تا ڕۆژێک هەستێکی سەیری پەیدا کرد کە گوایە من نیازی داگیرکردنی زەوییەکەیم هەیە. کوتوپڕ بینیم کە ئەم زەلامە، شێوەی مناڵێکی لێ نیشت، هەروەک چۆن خواردەمەنییەکی لێ دەستێنیت، ئاوەها کەوتە هاوار و فریاد و شیوەن و ڕۆ، دەستی کرد بە جنێودان و قسەی ناشیرین و ناونیتکەگوتن. ئیتر لەم پیاوە بەتەمەنە هۆش نەما و وەک مرۆڤێکی گەوج و بێ ئاوەز تەنیا کاری ببوو بەوە، کە بە هەر کەس دەگەیشت خوسنی* بە من دەدا و لە هەر کوێ کە دادەنیشت ناوی منی بە خراپە دەهێنا. وای لێهاتبوو ئیدی ئەو کاری نەدەکرد و کێڵگەکەی بە جێ هێشتبوو و لە شوێنێک بۆ شوێنێک لە کەسێک بۆ لای کەسێک دەچوو و دەیناڵاند، تەنانەت جاری واش بوو دەشگریا. زۆر جار هەوڵمدا تێی بگەیەنم کە من نیازی خراپم نییە و کارم بە سەر کێڵگەی ئەوەوە نییە، من بە ڕێگای خۆم و ئەویش بە ڕێگای خۆی، بەڵام بێسوود بوو، هەروا دەیوت و دەیناڵاند و جنێوی دەدا. زۆر لام سەیر بوو و ببوو بە پرسیار کە بە ڕاستی ئەم جووتیارە کێ بوو؟ بۆچی پێاوێکی ئاوا سەر و ڕدێن سپی و بە ساڵاچوو، ئاوا لە بەر بیرێکی چەواشە و ناڕاست، بەم شێوە هەڵسووکەوت دەکات؟ پاشان گەیشتمە ئەو بڕوایە کە ئەم کابرایە مێشکی کاڵ و کرچە، با تەمەنێکێشی لێ چووبێت. بەڵام نەمزانی کە هۆی چییە کە رامان و مێشکی کابرا، لە سەردەمی هەرزەکاری لە گەشەکردن ڕاوەستاوە و بە تێپەڕبوونی تەمەنیشی هەر وەک خۆی ماوەتەوە"؟ بە درێژایی ژیانم لەم جۆرە کەسانەم زۆر دیوە، کەسانێک کە چەرخی ڕۆژگار هیچ کاریگەریەکی لە سەر رامان و کەسایەتیانی نەکردبوو. کەسانێک کە لە ڕوانگای رامان و کردار و ئاگایی، هەر وەک زارۆکێک ماونەتەوە و ئاکاریشان هەمان هەڵسووکەوتی زارۆکانە. خەڵکانێکی زۆرم بینیوە کە کاتێک دەڕوانییە هەڵسووکەوت و ویستیان، مرۆڤ دەخەنە بیر کەسانی ڕۆژگارانی کۆن و دواکەوتووی پێشین. جا کۆمەڵگایەکی ئاوا دواکەوتوو و قەتیسماو کە وەک گەنکاوی* بۆگەن بواری پاکبوونەوە و ڕوونبوونەوە و بزاڤ و گەشەکردن و پێشکەوتنی تێدا نەبێت، لە ناو هەمان چەرخ و ڕۆژگارەدا کە هەبووە، هەر وەستاوە و هەنگاوێک بەرەو پێش هەڵناگرێت".

فرەشەوشتر گوتی: "لە شتەکانی سەیری ژیانم کە بینیومە و بە بیرم بێت، جارێکیان سەربازێک و سەردارێکی سوپاهیان بۆ لای من هاورد، سەربازەکە تیری کەوانێکی هاوێژتبووە چاوی ڕاستی فەرماندەکەی. دەبوایەت من وەک داوەرێک سزای سەربازەکەم دیاری بکردایە. لە تاوانبارەکەم پرسیار کرد هۆی هاویشتنی ئەو تیرە بۆ چاوی فەرماندەکەی چی بووە و بۆ کوێرت کردووە؟ پێم گوت ئەگەر ڕاستییەکەی بێژی سزاکەت کەم دەکەمەوە. تیرئەندازی تاوانبار گوتی: چەند ساڵ لەمەوبەر، کاتێک خەریکی مەشقی سەربازی بووین و خۆمان ئامادەی جەنگ دەکرد، بە هەڵەیەک لە کاتی کێشانی کەمانەکەمدا، ئەم فەرماندەمان بە سەربازێکی دیکە فەرمانی دا شەپڵاخەیەکم لێ بدات. سەربازەکە کە هۆمال* و ڕەقیبی من بوو، بە خۆشییەکی زۆرەوە هاتە نزیکەوە و شەپڵاخەیەکی توندی لێدام. من دووبارە کەوانم کێشا و هەمدیسان تووشی هەڵە بووم و دیسان سەربازی هۆماڵم زللەیەکی تری لێدام و ئەو کارە تا پەنج جار دووبارە کراوە. کات تێپەڕ بوو و ڕۆژانی بە سەردا هات، بەڵام داخی ئەو شەقەزلانە هەر لە دڵم مابوو. تا دوای چەند ساڵ ئەوە ئیمڕۆ ئەم دەرفەتەم بۆ هەڵکەوت و نازانم چ هەستێک هانمی دا و بێ بیرکردنەوە لە ئەنجامی ئەم کارە، خۆمم لە سووچێک داگرت تا فەرماندەکەم بینی، بە هەموو هێز و توانامەوە تیرێکم هاویشت و بەمجۆرە نابینام کرد. لەو کاتە کە هاواری کرد و دەنگی لێ بەرز بووەوە و خوێن لە چاوی دەڕژا، دەتگوت گەورەترین خەڵاتی ژیانم وەردەگرتووە، هەرچەندەش دەزانم ئیمڕۆ سزای کاری خۆم دەبینم، بەڵام پەشیمان نیم و کەیفخۆشم".

یەکێکی دی لە قوتابیەکان بیرەوەری خۆی بەم چەشنە گێڕاوە: "من بە درێژیی تەمەنم، کۆمەڵانی جۆراوجۆرم بە خوو و ڕەوشت و داب و نەریتی جیاواز بینیوە. کەسانێکم بینیوە کە بە جۆرێک دەروون و ڕەوانیان نەخۆش و دەردەدار ببوو و بە شێوەیەک دڵیان بریندار ببو کە توانای مێهرەبانی و دەربڕینی خۆشەویستییان نەمابوو. کاتێک بیابان‌نیشینەکان بۆ چەپاو و تاڵانکردنی گوندی ئێمە هێرشیان هێنا، دەمدی کە بە چ دڵڕەقی و بێبەزییانە پەلامارمان دەدان. هەر شتێک کە بە ماندووبوونێکی زۆر پێک هێندرابوو و دروستمان کردبوو، ئەوان بە ئاسانی لە ناویان دەبرد و دەیانسووتاند. ئەوانە دوژمنی جوانی و ئاوەدانی و پاکی و ئاوەدانی و ژیان و سروشت بوون و هەر شتێک بۆنی شادی و هەست و جۆش و خرۆشی ژینی لێ بهاتایە، بە ڕقەوە لە ناویان دەبرد. من خۆم زۆر جار لەتەک ئەو بیابان‌نیشینانە کە بە دیلمان دەگرتن، دەکەوتمە دەمەتەقێ، لە سەرەتادا وامدەزانی هۆی وێرانگەری و خراپەکارییان لە نەزانی و گێلییانە، بەڵام پاشان لە ناو وتەکانیان بۆم دەر کەوت کە ڕاماندن و کاولکردن بەشێک لە بیر و ڕامانیانە و لە کاتی ڕووخاندن و خاپوورکردنی شوێنەکان، ڕەوان دەروونیان شاد دەبێت و چێژی لێ وەردەگرن و ئەو کارە لە ویست و بڕوایان سەرچاوە دەگرێت".



زەردەشت گوتەکانی جامئەسپ و فرەشەشتر و شاگردەکانی لەمەڕ ناسینی دەروونی نەخۆش و خوار و خێچ بیست و ئینجا فەرمووی: "بەو جۆرە کە بیستتان، ڕەفتاری دروست لە دەروون و ڕەوانی دروست دەوەشێتەوە و ئاکاری خراپ لە ڕەوان و ئەندێشەی خراپ هەڵدەستێت. کاتێک کە من باسی ڕاستی دەکەم، مەبەستم ڕەواندروستی و هەنجاری دەروونە، مەبەستم باشبوون و ڕێکوپێکی هزر و رامانە. کاتێکیش باسی درۆ دەکەم، مەبەستم نادروستی ڕەوان و پەرێشانی و سەرلێشوایی دەروون و تێکچوون و ناسامانی و ناڕێکی رامانە. بەو شێوە کە لە سروودەکانم هاوردمە":

مرۆڤی باوەڕمەند و پاک،
بە زانست و گوفتار و کردار و ویژدانی خۆی،
ڕاستی پتر دەکات.
مەزدا ئەهۆرا بەم کەسە،
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
توانامەندیی مینوویی دەبەخشێت.
منیش بۆ ئەو
پاداشتی چاکە* ئاوات دەخوازم.
گاتا، هاتی 51، سروودی 21

(مەبەست لە پاداشتی چاک، هێمنی رامان و ویژدانێکی ڕووناک و دڵێکی بینا و توانامەندی مینوویی و بێنیازبوون لە هەوا و هەوەس و خۆشنووتی هەمیشەییە)

ئەی مەزدا..!
ئەم باوەڕ و ڕاهێنانەت بە دروستی
بۆ هەمووان دیاری کردووە،
کە ڕاستی ئازادیبەخش و سوودمەندە
درۆش زیانبار.
لەم ڕووەوەیە
کە ئارەزوومەندم هەمووان،
پەیوەندیی خۆیان لەتەک رامانی پاک پتر بکەن و
تێکەڵی خۆیان لەتەک چەواشەکار و لایەنگرانی درۆ بپسێنن.
گاتا، هاتی 49، سروودی 3

ئەی مەزدا..!
ئێوە لە ڕێگای ئاگری بڵێسەدار و
ئازموونی تاواندنی مینوویی،
هەر دوو لایەنی ڕاستکردار و چەواشەکار
تاقی دەکەیتەوە و پاداشت دەدەیتەوە.
لەم ڕێگایەوەیە
کە ئایینی ژیان ئاشکرا دەکەی:
ڕەنج بۆ چەواشەکاران،
سوود و شادی بۆ ڕاستکرداران.
گاتا، هاتی 51، سروودی 9

مەزدا ئەهۆرا،
لە ڕێگای هزری پاک و
بە توانامەندی بە سەر جیهاندا سەروەری دەکات،
لە وەڵامی ستایشتکاراندا فەرمووی:
ڕاستیی پرشنگدار، کە بۆ پاکی
یاوەرێکی باشە،
بۆ ئێوەم هەڵبژاردووە.
کۆشش بکەن تا هەمیشە
بەشی ئێوە ببێت.

گاتا. هاتی 32، سروودی 2

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەی بەتواناتر لە هەمووان..!
ئەی پاکی..!
ئەی ڕاستیی گەردوونگێڕ..!
ئەی ڕامانی پاک..!
ئەی توانای مینوویی..!
گوێم لێ بگرێ،
ئەو دەمەی کە پاداشتی هەر کەسێک دەدەی،
بۆ منیش بەخششت هەبێت.
گاتا، هاتی 33، سروودی 11

# چاکە و خراپە



ئەی زەردەشت! ئێمە ئاگادار بکە لە مەبەست و ناوەرۆکی چەمک و مژاری کوور و فراوانی چاکە و خراپە. چاکە و خراپی چییە و سەرچاوەکەیان لە کوێیە؟ گەلۆ زەروانییەکان* و لایەنگیرانی زەروانی بێکەران ڕاست دەبێژن: لە سەرەتادا، ڕووناکی و تاریکی بووە؟ یەزدان و ئەهریمەن دەستکردی زەروانن؟ کۆشکی یەزدان ڕۆشن و بارگای ئەهریمەن تاریکە، یەزدان چاوکانی باشی و ئەهریمەنیش سەرچاوەی خراپییە؟ لە سەرەتادا تاریکی و ڕووناکی، باشە و خراپە لەیەک جودا بوون؟ ڕاستە دەڵێن ئەو کاتە کە ئەهریمەن ڕێگەی بۆ جیهانی ڕۆشنایی دۆزیەوە، بە کردار و ڕەوشت و نیهادی خراپی کە هەیبوو، دەستی کرد بە جەنگ لەتەک هەموو دیاردەکانی ڕووناکی و باشی و ئافەریدەکانی یەزدان؟ گوایە ئیمڕۆش کە ڕۆژگار، ڕۆژگاری تێکەڵبوون و لەیەکدانی چاکە و خراپە و تاریکی و ڕۆشناییە، هەرچی خراپەی لە جیهاندا هەیە لە ئەهریمەن بەدی هاتووە و هەرچی باشەیە ئافەریدەی یەزدانە. مرۆڤیش لەم چەرخە سەخت و دژوارەدا پێویستە کە لەتەک تاریکی و خراپیدا بجەنگێت و ڕوو بکاتە ڕۆشنایی و باشی".

"هەروەهاش بیستوومانە کە مرۆڤ گیانلەبەرێکی گوناهکارە کە بەو تاوانە مەزنە لە بەهەشتدا کردی، لە بەهەشت وەدەریان نا، بۆیە ئەهریمەن هەمیشە بە دوایەتی کە تووشی گوناهی زیاتری بکات. (چیرۆکی ئادەم و حەوا پێش ئەوە موسا باسی بکات، لە ناو بابلییەکان باو بووە.) هەروەهاش بیستوومانە کە مرۆڤ و ئەهریمەن دەستکردی یەزدانە، ئێستا تێدا ماینەتەوە، یەزدانی مەزن کە سەرچاوەی جوانی و باشییە، بۆچی هاوکات لەتەک ئافراندنی مرۆڤ، ئەهریمەنیشی بەدی هێنا و ئەم هەموو خراپە و وێرانییەی لە جیهان و لە ژیانی گەلان بەدی هێناوە؟ یاکوو بە پێچەوانە بیستوومانە کە مرۆڤ لە سروشت و جەوهەردا، هیچ خراپە و شتی ناحەزی تێدا نییە، هەرچی لە ژیانی مرۆڤدا هەیە، لە دەرەوەی ئەو بە سەریدا دەیسەپێنن و باری دەکەن، بە واتەیە کە لەناو خێزان و کۆمەڵگا پێی فێر دەکرێت".

"برێکیش بڕوایان وایە کە گوایە چاکە و خراپە، مایە و هەوێنی ژین لە ژیاندایە. هەموو بەدییەکان لەویەوە سەرچاوە دەگرێت کە مرۆڤ هەوێنی ژینی بە ئەندازەی پێویست و نیاز نییە و بۆ وەدەستهێنانی، دەست بۆ هەموو کارێک دەبات. کە ئەمەش لەتەک داب و نەرت و ڕەوشت و ناوەرۆکی کۆمەڵگا ناسازگار و نەگونجاوە. هەر ئەم کارانەشە کە لە ڕوانگای کۆمەڵگا ڕەنگێکی خراپی هەیە. لەم بڕوا و بیروبۆچوونانە فرەمان بیستووە و بە ڕاستی لە ناسینی چاکە و خراپە، دەستەوئەژنۆ ماوین و ئێستاکەش لە تۆ دەخوازین کە وەڵامی ئەم بابەتانەمان بۆ بڵێی و ڕێگای دروستی ژیانمان پێ نیشان بەدەی".

زەردەشت کە لە بەرانبەری کۆمەڵێکی زۆر خەڵکدا کە بۆ دیتن و بیستنی ئەم پرسیار و بەرسڤانە هاتبوون، چووە شوێنکی بەرز تا هەموویان ببینن و گوێیان لە فەرموودەکانی ببێت، ئینجا بە دەنگێکی خۆش و سەرنجڕاکێش بەم چەشنە دەستی کرد بە هۆرە گوتن:

ئێستا بۆ ئێوە ئەی پەیجۆرانی ڕاستی و
ئەی خەڵکانی دانا دەئاخفم..!
لەمەڕ دوو مژاری گەورەوە،
هەروەهاش شێوەی ستایشتی ئەهۆرا و
رامانی پاک و
زانستی چاک و ئایینی ڕاستی،
تا تیشک و ڕۆشنایی ڕاستەقینە بناسن و
بە ڕەسایی و شادومانی بگەن.
گاتا، هاتی 30، سروودی 1

(دوو مژاری گەورە مەبەست: دوو هێزی نەیار و دژ بەیەکن، یەکەمیان "سپێنتامینوو" یان بیری پاک، دووهەمیان "ئەنگەرەمینوو" بە واتەی بیری خراپ)

کە وایە،
پەیڤە هەرە باشەکان بە گوێی هۆش ببیسن و
بە رامانی ڕوون بڕوانن،
هەر یەک لە ئێوە،
یەکێک لەم دوو ڕێگایە بۆ خۆی هەڵبژێرێت و
بەر لە بویەری مەزن،
ڕاپەڕن و بە دروستی،
ئەم ئایینە فێر ببن و پەرەی پێ بدەن.
گاتا، هاتی 30، سروودی 2

"یەکەمین گوتەی من بۆ ئێوە ئەمەیە: ئارمانج لە مژاری بابەتی چاکە و خراپە و هەر وتووێژ و ئاخافتنێک، یەکەم باش وایە کە باشترین گوتەکان ببیسن و بە رامان و هزری ڕوون بڕوانن. لەمەڕ ئەو گوتانە کە بیستووتانە بە وردی بیر بکەنەوە و ئەندێشە و رامانتان بخەنە کار، پاشان خۆتان ڕێگای دروست پەسەن بکەن. لە لاساییکردنەوە و شوێنکەوتنی کوێرانە دووری بکەن و بۆ بیرکردنەوەی دروست بە فرەهی ئاگادار بن، کاتێک کە ئەگەر ڕووناک و وریا ببنەوە، لە تیشک و ڕۆشنایی تێدەگەن و دەیناسن و بە ڕەسین و کامەرانی دەگەن. کە ئاگا و ڕوون بوونەوە، ئینجا ئەو شتەی کە زانیتان و فێری بوون، بە ئەوانی تر فێر بکەن و کۆشش بکەن بۆ پەرەپێدانی و بڵاوکردنەوەی. ئێستا لە ڕاز و نهێنیی چاکە و خراپە ئاگادارتان دەکەمەوە، جوان گوێ بگرن و گوتەکانم بە دڵ ببیسن و بە ساکوڵی* بیری لێ بکەنەوە".

ئەو دوو گەوهەرە لفانە،
هەر لە سەرەتاوە،
لە ناو رامان و خەیاڵدا پەیدا بوون،
یەکێکیان چاکە دەنوێنێت و ئەوی دیکە خراپە،
لەو دووانە
مرۆڤی ژیر ڕاستی و دروستی هەڵدەبژێرێت،
نەزانیش خراپە و چەوتی.
گاتا، هاتی 30، سروودی 3

"بۆ تێگەیشتنی گوتەکانی من برێک فراوانتر بڕواننە دەوروبەری خۆتان. بڕواننە ئەو مێگەلە کە لەو لەوەڕگایە خەریکی لەوەڕینن. بڕواننە ئەو باڵندانە کە لە ئاسماندا دەفڕن. بڕواننە ئەو خشۆک و جرجانەوەرانە کە لە ڕووی زەوی دەجوڵن یا خشۆکن*. جیاوازی و ناسانی ئێوەی مرۆڤ لەتەک ئەم گیانلەبەرانە لە چیدایە؟ ئەو گیاندارانەش هەروەک ئێوە ئەندام و لەشیان هەیە و سکوزا دەکەن، دەخۆن، دەنۆشن، دەخەون، ماندوویی دەردەکەن و دەشمرن. کەوایە چ شتێکە کە ئێوە لە ئەوان جوێ و بەرزتر دەکات؟ تەنها چتێک کە مایە و جەوهەری جیاوازی و ناسانیی مرۆڤ لە گیانلەبەرانە، هێزێکە کە لە ئێوەی مرۆڤدا هەیە بەڵام لە گیانلەبەرانی دیکە نییە، ئەوەش توانا و وزەی رامانە. ئەم توانامەندییە، کە مرۆڤی لە بەرزترین ئاستی ئافراندن و ڕسکاوی* لە ڕووی گۆی زەمین داناوە. هەر ئەم هێزەشە کە دنە* و هانتان دەدات بۆ باڵاکردن و گەشەکردن و گەیین و ڕەسین و ئێستاکەش کۆ بوونەتەوە و گوێ دەدەن بە هۆرەکانی من".

"کاتێک کە من دەبێژم دوو گەوهەری لفانە*، مەبەستم جیهانی رامان و ئەندێشەیە و کاتێک کە دەڵێم چاکە و خراپە، چاکە و خراپە لە مێشکمدا دەهێنمە بەر چاو. کەوایە دەڵێم ئەو شتانە کە لەمەڕ چاکە و خراپە و چاوکانیان و هەروەها جیهانی تاریکی و ڕۆشنایی و جیهانی خراپە و چاکە و ئەو باسانەی دیکەی کە پێشتر بیستووتانە، هەمووی فڕێ بدەن و بشزانن کە هیچکامیان ڕاست نییە. سەرچاوەی چاکە و خراپە، لە دەرڤەی ئێمەدا نیین. چاکە و خراپە لە دەروونی خۆمان دروست و دەگرسێت و ڕیشەشی لە ناو مێشک و رامانی خۆماندایە و هیچ فرێکی بە شتێکی دیکە وەک یەزدانی خراپە یا ئەهریمەن نییە. ئەو کەسەی کە رامانی چاکە، ڕێگا بۆ چاکە دەرباز دەکات و ئەوەی کە رامانی چەوتە، ڕێگا بۆ شاشی دەرباز دەکات. ئەمەی کە گوتوویانە کە چاکە و خراپە دوو بەدیهێنەری جیاوازیان هەیە، گوتەیەکی ناڕاستە.

ئەهۆرا مەزدا ئافەریدەگاری هەستی و سەرچاوەی چاکییە و چاکەش هەمان ئافراندنە. چاکە و خراپە لە ژیانی ئێمەی مرۆڤ هیچ پەیوەندیەکی بە ئەهۆرا مەزداوە نییە، تەنها پەیوەست و گرێدراو بە خۆمان و بە رامانی ئێمەوە هەیە. بەم سروودەی من بە وردی گوێ بدەن:

لەوساوە،
کە ئەو دوو گەوهەرە پێک گەیشتن و
ژیان و ناژیانیان بەدی هێنا.
یارانی درۆ ناخۆشترین بوونیان هەڵبژارد،
ڕاستپەرستانیش خۆشترین.
لەوساوە
ئەمە بوو بە یاسا و
هەتا هەتایەش
هەر وا دەبێت.
گاتا، هاتی 30، سروودی 4
(ژیان و ناژیان، بوون و نەبوون، هەستی و نیستی، لێرە مەبەست لە ناژیان و نەبوون و نیستی، مەرگ نییە، ناژیان بە واتەی ژیانێکی بێ سوود و بێکەڵک، یان پڕ لە درۆ و دووڕوویی و کرداری ناپەسەنە کە لەتەک هەنجاری ژیان ناگونجێت)

"کاتێک کە ئەو دوو گەوهەرە بە یەکدی گەیشتن، ئەو دەمە بوو کە رامان لە مێشکی مرۆڤ بەدی هات و رامانی پاک و هزری خراپ لە مێشکی مرۆڤدا ئاشکرا بوو. کاتێکیش رامانی پاک و خراپ گرسیا، پاشان ژیان و ناژیان* ئاشکرا بوو و واتەشی پەیدا کرد. ئینجا کە رامانی پاک و خراپ ئاشکرا بوون، یەکێکیان لە ڕاژەی پەروەردەکردن، پەرەپێدان، ڕواندن، باڵاکردن، گەشەسەندن و ڕەسینی ژیان دیاری کرا، کە ئەمە خۆی رامانی چاکەیە و ئەوەی دیکە لە ڕێگای ناژیانیدا وەکار کەوت، وەک: وێرانی و لەناوچوون و شێواندن و چەواشەیی ژیان کە ئەمەش رامانی خراپەیە. هەموو باشییەکان لە ڕاستیدا خۆی نواند و هەموو خراپییەکان لە درۆدا. رێگای گەیشتن بە ڕاستی، زانایی و هۆشیارییە و ڕێگای درۆش، نەزانی و ناهۆشیارییە. کەوابوو لە دەروون و رامانی خۆتاندا بە دوای چاکە و خراپە بگەڕێن. بەم سروودانەی من گوێ بدەن و لە بارەیەوە بیر بکەنەوە":

لەم دوو گەوهەرە،
لایەنگری درۆ
کردارە خراپترینەکان هەڵدەبژێرێت،
ئەو کەسەی کە پاکترین رامانی هەیە و

به تیشک پایەداری زانست ڕازاوەتەوە،
هەر وەها ئەو کەسەی کە
بە بڕوای پتەو و کرداری دروست
مەزدا ئەهۆرا کەیفخۆش دەکات،
ڕاستی هەڵدەبژێرێت.
گاتا، هاتی 30، سروودی 5

"نەیار و دوژمنی سەرەکی مرۆڤ چییە و چ تشتێک مرۆڤ بۆ خراپەکاری هان دەدا و ژیانی لێ تاڵ و ناخۆش دەکات؟ فریو، ئەویش فریوی دیاردەکانی هزری خراپ، بەڵام چ کاتێک مرۆڤ بەرەو ڕێگای فریو دەڕوات؟ ئەو کاتەی کە رامانێکی سست و لاوازی هەبێت. مرۆڤ لە ڕەوتی دەستپێکی ژیانیدا، گرفتاری سستی و بێپیشەیی و بێتوانایی رامان دەبێت، بۆیە لەم کاتە فریو هێرش دێنێت و بە دواشیدا خراپی، جا بەدترین جۆری خراپەیی، تورەیی بە هەموو دیاردەکانی قار و قینەتی. مرۆڤ کە ڕووی کردە تورەیی، وێرانی و توند و تیژی و لەناوچوون بەدی دێنێت".

لەو دوو گەوهەرە،
دێڤپەرستان ڕاستی هەڵنابژێرن.
چونکە کاتێک کە دوو دڵ و بە گومانن،
فریو دەخۆن،
بۆیە
ڕوو لە خراپترین رامان دەکەن و
هەنگاو بۆ تووڕەیی دەنێن و
ژیانی جڤاک بەرەو کاڤلی دەبەن.
گاتا، هاتی 30، سروودی 6

"بەڵام بەرهەم و کاردانەوەی رامانی پاک چییە و ئەو کەسەی ڕوو دەکاتە هزری پاک و بۆ خۆی دەیکاتە ئارمانج، بە چ ئەنجامێک دەگات؟ یەک ئەنجام و بەهرەی مەزن، ئەوەش وەدەستهێنانی توانای مینوویی و ڕاستی. ئەگەر مرۆڤ بەم ئاستەی پێگەیشتنی ڕەوان بگات، ئینجا هەنگاو دەنێت بۆ پلەی پاکی و بەهدینی. بەهدینیش بە مرۆڤ ڕاوەستاویی، جوانمێریی، پایەداریی و هەستی بڕوابەخۆبوون دەبەخشێنێت. ئەو کەسەی کە خاوەنی توانامەندیی مینووییە، ڕاستی و ڕاوەستاویی و بەرخۆدان بە سەر هزر و ڕەوانی فەرمان دەدات و لە هەوراز و نشێوەکانی ژیان و لە ئەزموونەکانی هەمیشەیی زیندەگی کە دێتە سەر ڕێگای هەر کەسێک،

سەرکەوتوو و سەرفەراز دەرباز دەبێت. زاڵبوون و سەرکەوتن لەم ئازموونانەیە کە ڕزگاری و کامەرانیی بۆی مسۆگەر دەکات".

ئەو کەسەی کە ڕێگای چاکە هەڵدەبژێرێت،
توانای مینوویی،
رامانی پاک و ڕاستی دەست دەکەوێت و
پاکی بە تەن و گیانی ئەو،
پایەداری و توانامەندی دەبەخشێت.
بێگومان چونکە ئەو لە لایەنی تۆ بووە،
لە ئەزموونی گرانی ژیاندا
سەر دەکەوێت.
گاتا، هاتی 30، سروودی 7

"ژیانی مرۆڤ گۆڕەپانی بەربەرەکانێی سزا و پاداشتە. هزری چاک و خراپ وەک تۆوێک لە زەمینێکدا چاندرا بێت، بەر و میوەی خۆی بە وێنە چارەڕەشی و بەختیاری، سیاڕۆژی و کامەرانی، بندەستی و ڕزگاری دەدات. شادی و خۆشی بۆ ئەو کەسەیە کە بە دیتنی سزا و بەری ترش و تاڵ و زیانباری رامانی خراو و بە کۆمەکی زانست و رامانی پاک و ڕووناک و هۆشیاریی، خۆی لە جیهانی تاریکی و درۆ ڕزگار دەکات و بەرەو ڕێگای ڕاستی و هۆشیاریی بکێشێنێت.

ئەو کاتەی کە،
تاوانباران ئەنجامی سووچەکانی خۆیان بینی،
ئەوسا، ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
لە ڕێگای رامانی پاکەوە،
شکۆداری و دەستەڵاتی تۆیان
بۆ ئاشکرا دەبێت و
فێر دەبن،
چلۆن بۆ لەناوبردنی درۆ و
سەرکەوتنی ڕاستی و پاکی کۆشش بکەن.
گاتا، هاتی 30، سروودی 8

"داخوازیمان لە ئەهۆرا مەزدا هەمیشە ئەوە بێت کە رامان و هزرمان تازە ڕاگرێت. کۆشش بکەین بە نویٚ ڕاگرتن و تازەڕاگرتنی رامانمان، جیهان نویٚ بکەینەوە و لە کاتێکدا ژیری و خێرەت تووشی تووش و سستی و لاوازی دەبێت، لە جێگای ئەوە کە بکەوینە داوی فریو و گرفتاری خراپی ببین، ڕوو بکەینە ڕاستی و بە یارمەتیی ڕاستی پیٚ بخەینە ناو جیهانی جوان و خۆشی رامان و هزری پاک".

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئارەزوومەندین خۆمان بدەینە دەستی تۆ و
لەو کەسانە بین کە جیهان بەرەو پێشکەوتن و ئاوەدانی دەبن.
ئەی هەستیبەخش، وا بکە:
ئەو کاتەی کە رامان تووشی بەدگومانی و لاوازی دەبێت،
ڕاستی بە هانامان بگات و
دڵ و رامان،
ئێمە لە یەک نزیک بکەنەوە.
گاتا، هاتی 30، سروودی 9

"ئەگەر کۆمەڵان بتوانن بە ئاریکاریی رامانی چاکە، درۆ ڕیسوا و تێک بشکێنن و ڕاستی دابمەزرێنن، ئینجا ئارەزوو و هیوای باشی چاکان دێتە دی و شاربازێری دڵخوازی چاکە و ئەو بەهەشتە کە هەمووان لێی دەدوێن و چاوەڕوانی دیتنی دەکەین، هەر لە ڕووی ئەم جیهانە بەدی دێت و خۆشی و شادومانی و ئاسایشت و کامەرانی و ژیاویی دڵخواز، هەموو جێگایەک دەگرێتەوە":

ئەو کاتەی کە درۆ و
وێرانی تێکدەشکێت،
ئارەزووی ئەوانەی کە بە خۆشناوی خەباتگێڕ و
چاکەکار ناسروان،
بەدی دێت و
لە سەرای درەخشان و خۆشیی رامانی پاکی یەزدانی و
ڕاستی بەهرەمەند دەبن.
گاتا، هاتی 30، سروودی 10

"گەرەکە مرۆڤ لە زاگۆنی* هەرە مەزنی بوون ئاگادار بێت، ئەویش زاگۆنی پاداشت و سزایە. شادی و سوودی بێکەران بەشی ڕاستانە و ڕەنج و سزاش بەشی تاوانبارانە. بەم زانیاریانەیە کە مرۆڤ ڕێگای ڕامانی پاک جودا دەکاتەوە و خۆشی، ئازادی، سەرفەرازیی، و ڕاستیی هەمیشەیی وەدەست دێنێت".

ئەی خەڵکینە..!
هەر دەمێک لەم ئایینە دیاریکراوەی مەزدا بگەن کە:
سزا و ڕەنجی هەمیشەیی بەشی چەواشەکارانە و
شادی و سوودی بێژمار بەهرەی ڕندکارانە،
ئینجا،
لە بەر تریفەی ئەم ڕێبازەدا
بە بەختیاری و ڕزگاریی ڕاستەقینە دەگەن.
گاتا، هاتی 30، سروودی 11

# بەهەشت و دۆژە
# ئەزدان و ئەهریمەن



"ئەی زەردەشتی ژیر! لە گوتاری گەوهەرباری تۆ چاکە و خراپە بە سەرچاوەکانییەوە، بەو جۆرە کە پێویست بوو ناسیمان و ڕێگای هەڵبژاردنی چاکە و خراپەشمان زانی. ئێستا دەمانەوێت ئەو شتەی کە سەبارەت بە بەهەشت و دۆژە گوتراوە، کە گوایە دەڵێن بەهەشت پاداشی چاکانە و دۆژەش سزای خراپەکارانە، تێمان بگەیەنی".

"پێش لەوە لەمەڕ بەهەشت و دۆزەخ بۆتان بدوێم، بە پێویستی دەزانم بپرسم: ئایا هیچ لە ژیاندا تووشی تاڵی، تەنگانە، دەرد، غەم، ڕەنج، پەشیمانی، سەرزەنشت، ستەم، نائومێدی، شکست، ڕک و کینە، تووڕەیی، نەیارەتی، کەنەفتی، هەژاریی، پەرێشانی، نەخۆشی، دەستەنگی، کۆچبەری، بێپەنایی، تەنانەت جنێو و هەزاران دەرد و ڕەنجی دیکە، بوون؟ ئایا لە بەرامبەر ئەم وێنە ناشیرین و تاڵ و تاریکانە، هیچ چێژی خۆشی سەرکەوتن، سەرفەرازی، هێڤی، شادی دۆستایەتی، تەبایی، خۆشەویستی، پیرۆزی، ئەڤین، لەشساخی و هەزاران وێنە و دیاردەی خۆشی دیکەی بوون. کەوایە دۆژە و بەهەشت، هەر لەم جیهانەدایە و هەر لە لەش و ڕەوان و ژیانی جڤاک و کۆمەڵگادایە، لە خانە و کۆڵان و گوند و باژێر و وڵات و کیشوەر و جیهاندایە. بەهەشت بە واتەی باشترینەکانە، ئەویش باشترین ژیانەکانە. دۆزەخیش بە مانای دۆژئەنگە یان ژیانی خراپە. کە واتە لە جێگای ئەوە کە چاوەڕوانی مردن و مەرگ بکەین و بڕۆین بۆ بەهەشت و لە سەرایەکی دیکەدا بژین، با بێین و بەهەشت لە گیان و ژیان و لادێ و شار و زێد و جیهانی خۆ چێ بکەین و دۆزەخیش هەر لەم جیهانە و لە ناو خۆماندا و لە زیندەگی و دێ و شار و ئاخ و جیهانی خۆماندا، فڕێ بدەین و لە ناوی بەرین".

"ئەی زەردەشتی دانا! سپاسی فرەت لێ دەکەین کە چەمک و مەبەستی چاکە و خراپەت بۆ تاووتێ کردین و ئەم ڕازە مەزنەت شی کردەوە، بەڵام ئێستا پرسیارێکی دیکە دێتە ئاراوە، ئەگەر ئەم گوتەی زەروانەکان بە ناڕاست بزانین کە دەڵێن گۆی زەوی گۆڕەپانی بەربەرەکانێ و جەنگ و تێکهەڵچوونی یەزدان و ئەهریمەنە و رامانی خودی مرۆڤ بە چاوگی چاکە و خراپە بزانین، کەواتە لە بواری چاکە و خراپە، ژیانی مرۆڤ و گۆی زەوی گۆڕەپانی بەربەرەکانێ و بەیەکداهەڵچوونی کام لە هێزەکانی دژ بە یەکن"؟

"بیرو بۆچوون و نەرینی زەروانەکان لە بارەی یەزدان و ئەهریمەنەوە ناڕاست و شاشە. چونکە ئەهۆرا مەزدا سەرچاوەی باشییە و لە باشی بەس چاکە دەوەشێتەوە. ئەگەر بێتو بپەژرێنین کە ئەهۆرا مەزدا، ئافەریدەگاری ئەم گەردوونەیە و ئەهریمەنیش بە ئافەریدەی ئەو بزانین، ئەو کاتە خواوەندی چاک و باش، بەدیهێنەر و سەرچاوەی هەموو خراپییەکان دەبێت، بۆیە ئەمە گوتەیەکی ناڕاست و نابەجێیە و ئەمە لەتەک زاتی یەزدانی دلۆڤان ناگونجێت و دژە. ئەهریمەن بوونی نییە تا دەستکردی ئەهۆرا مەزدا بێت، بۆیە واتەی دروستی ئەهریمەن، رامانی خراپە. خودی واژەی ئەنگەرە* بە واتەی ناشیرین و خراپە و مان*یش بە واتەی رامانە. ئەنگەرەمان یان ئەهریمەن بە مانای رامانی خراپە کە لە هەمبەر سپەنتامان* هەیە. سپەنتامان بە واتەی رامانی پاک و پترکەرە. لە ناو ڕێباز و بڕوای مندا، جیهان مەیدانی بەیەکداهەڵچوون و جەنگی ئەهۆرا مەزدا و ئەهریمەن نییە، بەڵام سپەنتامان رامانی پاک و ئەنگرەمان رامانی خراپ، هەمیشە لە ناکۆکی و جەنگدان. سەرکەوتن و

زاڵبوونی هەر کام لەم دوانەیە کە ژیانی مرۆڤ بەرەو خراپە یا چاکە دەبات. ئێوە لە نموونەکانی پێشوودا کە لەتەک برێک کەس کە دارای دوو ڕەوشت و خووی جیاواز بوون، ئاشنا بوون. لە ئازموونی ژیانی خۆتاندا لەتەک مرۆڤی جۆراجۆردا کە برێکیان بەختیار و شادمان و سازکار، برێکیان لووتبەرز و ڕککو و ڕژد و ئاخاپۆک* و خۆپەسەنن، دیوتانە و بە خوو و ڕەوشتیان ئاشنا بوون. لێرەدا دەبێژم سەرچاوەی هەمووی ئەو خراپە و چاکییانە تەنها یەک شتن، ئەویش رامانە. بڕواننە ئەو مریشکە کە چۆن جووجکەکانی بە دوای خۆیدا دەبات. پەیوەندیی نێوانی گوتار و کردار و هەست و دیاردە و نیشانەکانی دیکەی مرۆڤ لەتەک راماندا، هەر وەک پەیوەندیی جووجکەکانی مامر لەگەڵ دایکەلەیاندایە. جووجکەکان لە هێلکەی مریشکێک هەڵهاتن کە مریشک هەڵیهاوردووە. ئەوە گەرمیی لەشی مامرە کە هێلکەکان بۆ هەڵێنان ئامادە دەکات و ئێستەش هەروەها کە دەبینن ئەمە مریشکە کە جووجکەکانی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشێنێت و دانەخواردنیان پێ فێر دەکات و لە بەرانبەر گەزەند و مەترسیی جۆراجۆردا دەیانپارێزێت. رامانی مرۆڤیش هەر بەم چەشنەیە. هەست و سۆزی ئێوە هەر چی ببێت، ڕەنگدانەوە و سەرچاوەی لە رامانی خۆتان وەردەگرێت و گوفتار و کرداریش بەم شێوەیە. هەر چییەک هەبێت بارسایی و ئەندازە، چۆنیەتی و سازکاری رامانی ئێوە نیشان دەدات. ئەگەر رامانی ئێوە ڕووناک و گەش و سازکەر و داهێنەر و پاک و خاوێن ببێت، هەموو دیاردەکانی سۆز و هەست و کرداری ئێوە چاک دەبێت. ئەگەریش خراپ بێت، ئەوە لە جێگای ئەوە کە رامانتان مریشک و گوفتار و کردار و سۆزی ئێوە جووجکەکانی بێت، ئەوە رامانی ئێوە وەک مار دەبێت و ئینجا ڕەفتار و سۆز و کردارتان تولەمارەکانیەتی، کە لە دوای دایکی خۆی کەوتوون".



"ئەی زەردەشت تێمان گەیەنە کە چلۆن رامان دەبێتە مامر یان مار".

"وەڵامی ئێوە بە یەک واژە دەستنیشان دەکەم وئەوەش **فێـــــربوونە**، سەرەتا بە سرووودەکانی من لەمەڕ فێربوون گوێ بدەن":

ئەی پەیجۆرانی دانش..!
ئێستا ئەم ڕاهێنان و گوتارانەی،
کە تا ئێستا نەبیستراون،
بۆتانی ئاشکرا دەکەم.
بێگومان، ئەم گوتانە،
بۆ ئەو کەسانە ناگەوارە کە،
بە ئامۆژگاریی درۆ،
جیهانی ڕاستی بەرەو وێرانی دەکێشن و
بۆ سەوداسەرانی مەزدا،
شادیبەخش و باشترینە.
گاتا، هاتی 31، سروودی 1
(مەبەست لە سەوداسەرانی مەزدایی، ئەو کەسانەیە کە بە دڵ ئەڤینداریی خودا دەکەن)

چونکە بەم ڕاهێنانە ناڕاستە،
بواری هەڵبژاردنی ڕێگا،
ڕوون و ئاشکرا نییە،
من، هەروەک ئامۆژگارێک،
کە هەڵبژاردەی مەزدایە،
بەرەو ڕووی ئێوە دێم،
تا هەر دوو گروو ڕابهێنم،
بەرابەری ڕاستی بژین.
گاتا، هاتی 31، سروودی 2

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
پاکی و بەهدینی لە تۆوەیە.
گەوهەری پیرۆزی مینووی جیهانساز لە تۆوەیە.
تۆ ئازادی هەڵبژاردنی ڕێگات

بە مرۆڤ بەخشیوە.
تا پێشڕەوی ڕاستەقینەی خۆی هەڵبژێرێت و (رامانی پاک)
پشت لە ڕابەری درۆ بکات. (رامانی خراپ)
گاتا، هاتی 31، سروودی 9

بە ڕاستی،
ڕاهێنانی ڕاستەقینە و هۆشمەندانەی مرۆڤی پاک و زانا،
لە هەموو شتێک چاکترە.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
تۆ توانای تێکدانی پیلانی ئەو کەسانەت هەیە،
کە بە دوای ئازاری منەوەن.
منیش دەکۆشم،
پێڕەوان و دڵبەختکەرانی تۆ،
لە دوژمنی و ڕکیی چەواشەکاران ڕزگار بکەم.
گاتا، هاتی 32، سروودی 16

لە بەهدین و چەواشەکار،
کامەیان ڕێگای دروستی هەڵبژاردووە؟
زانای ڕووناکبیر بەرپرسیارە
کۆمەڵان وریا بکاتەوە،
تا نەزان هەڵیان نەفریوێنێت و بەرەو چەواشەیی نەیانبا.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
بۆ ئێمە،
ئامۆژگار و ڕێپیشاندەری هزری پاک بە.
گاتا، هاتی 31، سروودی 17

کەواتە، با کەس
گوێ لە گوتار و ڕاهێنانەکانی
مرۆڤی چەواشەکار نەگرێت.
چونکە بێگومان چەواشەکار

خانوو و گوند و شار و وڵات
بەرەو وێرانی و لەناوچوون دەبات.
کەوایە، لە دژی چەواشەکاران،
ڕاپەڕن و بجەنگن.
گاتا، هاتی 31، سروودی 18

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
کەوایە با مەردوم
گوێ بدەنە گوتاری دانایەک کە
لە ڕاستی بیر دەکاتەوە و
چارەسەری ژیانی کۆمەڵانە،
ڕاستگۆییەکەی دەرمانبەخشە،
خۆشبێژ و بەتوانایە و
لە بەر تریفەی پرشنگداری تۆ،
شوێنی هەر دوو ئالی دیاری دەکات.
گاتا، هاتی 31، سروودی 19



"ئەو شتەی کە پێویست بوو کە لەمەڕ ڕاهێنان و ئامۆژگاریی چاکە و ئامۆژگاریی خراپە بیێژم لەم سروودانە گوتوومە، ئەمەندە دەڵێم کە هەموو شتێک لە فێرکردن و پەروەردە بەدی دێت. رامان بۆ هەر لایەک ئاراستە و هان بدەیت، هەمانی لێ دەردێت و هەر پەروەردە و ڕاهێنانێکی پێ بدەی و پێی فێر بکەی، هەمان وێنە و شێوە و مایەی لێ دەردەچێت. دایکێکی کۆیلە و نەزانی فێرنەکراو، منداڵەکانی بەندە و گومڕێ و چارەڕەش پەروەردە دەکات و هەروەها دایکێکی تێگەیشتوو و ئازاد و ڕاهێنراو، ڕۆڵەکانی پلەمەند و ئازاد و سەرکەوتوو ڕادێنێت. کۆمەڵگاش بەم چەشنەیە، چارەنووس و ئایەندەی کۆمەڵگایەک لە دەستی مامۆستایانی ئەو کۆمەڵگایەدایە و ئەمە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە مامۆستایانەوە هەیە، بە کورتی مامۆستا چ بێت کۆمەڵگاش هەمان دەبێت".

"ئەی زەردەشت! ئێمە تێ بگەیەنە کە ڕاهێنانی چاکە و خراپە چییە و کیژان* ڕاهێنان و فێرکردنە کە رامان گەش و پەروەردە دەکات و دەیگەیەنێتە پێواژۆی باڵاکردن، پشکووتن و ڕەسین"؟

"ئێمە لە گردی یەک کۆ بووینەتەوە کە وتووێژ لە سەر چاکە و خراپە بکەین و لێی بکۆڵینەوە و هەر کەس بیر و ڕای خۆی دەربڕێت. ئەم وتووێژانەیە کە ئێمە دەگەیەنێتە ئەنجام، کەوابوو پەروەردەکردنی رامان هەر لێرەوە دەست پێدەکات، لە یەکدان و ئاڵۆگۆڕکردن وگفتوگۆکردنی بیر و ڕا و دانوستاندن و بەرسڤ و پرسیار و بیستنی هزر و نەرینی یەکدی و ڕاوێژ و کۆڕ و دانیشتن. پاشان لە ناو دڵ و هەوێنی ئەم گفتوگۆیانەدایە کە ڕامان باڵ و پەڕ دەگرێت و گەشە دەکات و دەکەوێتە فڕین و گەڕیان. ئەمەش باش بزانن کە ئاسۆ و توانای رامان و ئەندێشە، بێئەندازە و بێسنوورە. هەر چی رامان وەرزیدە و پەروەردە و ئاواڵە بکەن، ئاسۆ و توانا و هێزی فرە و بەرفراوانتر دەبێت. بڕواننە ئەو کابرایە کە لەو باخە چلۆن بەو تەورە خەریکی بڕینی ئەو دارە ئەستوورەیە. ببینن چەندێک وەستایانە و بە زانایی تەورەکە بەرز دەکاتەوە و دەیکوتێتە ئەو شوێنەی کە دەیەوێت، بڕواننە شان و مەچەک و ماسولکە دەرپەڕیوەکانی کە چەندە وەرزیدە و تەیارە، ئێستا تاوێکی پێ ناچێت کە دارەکە دەخات بە لادا. بە ڕاستی چ تشتێکە کە ئەم هەموو تۆکمەیی و توانایەی بەخشیوە بەم کابرا تەورزەنە؟ بۆیە تەنها یەک شتە، ئەوەش وەرزش* و وەرزشکردنە. بێگومان ئەو لە یەکەم جاریدا کە دەستی برد بۆ تەور، بڕینەوە و خستنی درەخت و کۆتەداری دەست پێ کرد، ئەم توانا و لێهاتوویەی ئیمڕۆی نەبوو. بۆیە تەنها بە وەرزش و تێکۆشان و بەردەوامبوونەی لەم کارە بوو کە ئەوی بەم پلە و توانایەی گەیاند. ئینجا هزر و رامانیش بەم شێوەیە. ئەگەر رامانیش بخرێتە کار و کۆشش و ڕایبهێنێت و پەروەردەی بکەیت و بپشکوێت، ئینجا رامانیش وەک دەستەکانی ئەم کابرای تەوەرزەنە، بەتوانا دەبێت و دەتوانێت هەر دژواری و سەختییەک، وەک باڵا و تەنەی ئەو درەختە لە پا بخات و لە ناوی ببات. ئەمەش بشزانن کە بۆ پەروەردەبوونی رامان مەرجێکی مەزن پێویستە و ئەگەر ئەمە نەبێت، هەرگیز رامان نابزوێت و باڵا ناکات و گەشە ناستێنێ، ئەوەش ئـازادیـیە، هەمان شتێک کە من لە سروودەکانمدا بەم چەشنە هاوردوومە":

ئەی مەزدا..!

کاتێک لە سەرەتادا،
بە رامانی خۆت،
لەش و خێرەت و ویژدانت
بۆ ئێمە ئافراند،
گیانت بە لەشی ئێمە
بەخشی و
توانای گوفتار و کردار و ڕابەریت پێ بەخشین،
ویستت ئێمە رامانی خۆمان
بە ئازادیی تەواو هەڵبژێرین.
گاتا، هاتی 31، سروودی 11

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
پاکی و بەهدینی لە تۆوەیە،
گەوهەری پیرۆزی مینووی جیهانساز لە تۆوەیە.
تۆ ئازادیی هەڵبژاردنی ڕێگات
بە مرۆڤ بەخشیوە،
تا پێشرەوی ڕاستەقینەی خۆی هەڵبژێرێت و (رامانی پاک)
پشت لە ڕابەری درۆ بکات. (هزری خراپ)
گاتا، هاتی 31، سروودی 9

لەم ڕووەوەیە کە هەر کەس،
چ ڕاستگۆ بێت و چ درۆزن،
چ زانا بێت و چ نەزان،
ئەو شتەی کە لە دڵ و رامانیدایە
بە سەر زاریدا دێت و ئاشکرای دەکات،
هەر کاتیش کە
رامان دوچاری پرسیار و سەرگەردانی و دڵەڕاوکێ بێت،
ئەوە پاکی
بە هانای ڕەوانی دێت و
ڕێنوێنی دەکات.

## گاتا، هاتی 31، سروودی 12

"بەڵێ تەنیا لە کەش و هەوای ئازادیدایە کە دەتوانرێت رامان پەروەردە بکرێت و بە ئەنجام و ئاکامی تابان و پڕبەهای بگەیەنرێت. بڕواننە ئەو باڵندەیە کە چلۆن لە ئاسماندا دەفڕێت و ببینن کە چلۆن ئازادانە لەم بەری باخەوە بۆ ئەو بەری باخ، شەقەی باڵ لێ دەدات و لەم چڵ بۆ ئەو چڵ دەفڕێت. جا بێن و ئەم باڵندەیە لەتەک ئەو کرمە کە لە ناو قوڕ و چڵکاو دەجوێت* بەراوەردی بکەین و لە بەرامبەری یەکتر داینێین. ناسانی و جیاوازیی ئەم کرمە لەتەک ئەو باڵندەیە ئەوەیە کە ئەو باڵندەیە توانای فڕینی لە ئاسماندا هەیە، بەڵام ئەو کرمە لەم توانا بێ بەهرەیە. مرۆڤ دەتوانێت ئەم نموونانە لەتەک رامان بەراوەرد بکات. ئەگەر رامان لە مەیانی ئازادی پەروەردە بکرێت، ئەوەی لێ دێت کە وەک ئەو باڵندەیە، دەبێتە خاوەنی دوو باڵ و دەتوانێت بفڕێت و خۆی بگەیەنێتە بەرزترین سنوورەکانی گەشەکردن و پێگەیشتن، بەڵام رامانی بەندکراو و خەسێنراو و نائازاد، سنووری گۆڕەپانی بەس لە ناو کون و ژێر زەوی و قوڕ و لیتاو تێپەڕ ناکات و بە هەمان چەشنیش کە هەیە دەمێنێتەوە و دەشرزێت و لەناو دەچێت".

"بەڵام با باسی یەکێک لە دوژمنە سەرەکییەکانی رامان بکەین، کە ئەویش کەلەڕەقی و وشکەسەرییە. بڕواننە ئەم کۆڕەی ئێمە، ماوەیەکی دوور و درێژە خەریکی گفتوگۆ و ئاڵوگۆری بیروڕاین، بەو مەرجەش کە هەر یەک لە ئێمە دارای رامان و ئەندێشە و ئایینێکی جیاوازە. لەم ماوە درێژەدا، هێشتا هیچکامان تووشی تووڕەیی و گرژی و توندی نەبووین. زۆر بە ئاسانی گوتەی یەکتر گوێ دەگرین و دەیبیسین و وەڵامی یەکدیش دەدەینەوە و بێگومانیش لە ڕۆژەکانی داهاتووش هەروا بەم چەشنە دەبێژین و دەبیسین و بە ئاکام و ئەنجامی بەنرخ و بەسوود دەگەین. ئەو شتەی کە یارمەتیی ئێمە لەم کۆڕە و نشستانە دەدات، ئەویە کە ئێمە لە باوەڕ و رامان و نەرینماندا، پێ دانەگرین و کەلەڕەقیمان نەدایەتە بەر، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر بێتو هەر لە سەرەتای وتووێژماندا، بە دەنگی بەرز و تووڕەیی دەستمان پێ کردایە، ئەوە تووڕەیی دەبووە هەرا و پاشان هەراش دەبووە دوژمنی و لە کۆتاییش جودایی. جا وریا و هۆشیار بن، دووری بکەن لە لاساری و کەلەڕەقی. ئەمە نەخۆشینێکی سەخت کوشەندەیە و وەک مۆرانە رامانتان لە ڕیشەوە دەخوات و دایدەڕزێنێ و بەرەو تاریکی و لەناوچوونتان دەبات. هەروەهاش دووری بکەن لە پاشڤەڕۆیی، بە تایبەت لە جۆری ئاینیی، کۆنەپەرستە مێشکوشکەکانی ئاییی کاریان بەس ئەویە کە رامانێکی کۆن بگرن و بەرگری لە ڕواندن و هەڵدان و گەشەکردن و پەروەردەبوونی هەر رامانێکی نوێ بکەن و بە ڕک و کین و ستەمکاری و وشکەسەری وفیلسواری و تووڕەیی هەوڵ بۆ لەناوبردنی دەدەن و پارێزگاری و چاوەدێری لە ئاییی پاشڤەڕۆخواز دەکەن. بێگومان ئەوەش بۆ ئەوەیە کە سوود و بەرژەوەندییان بۆ بژیوی ڕۆژانە بپارێزن. ئەمە خاڵێکی پڕ باڵکێشە کە چلۆن ژیانی کەرپانەکان، لە سەر ئەم بنەمایە دامەزراوە و لەتەک هەموو شتێکی تازە دژن، بێجگە لە ڕۆژپەرستی نەبێت. ڕک و گرژی و توندیی ئەوان بۆ من و ئێوە لە بەر ئەوەیە، کە ئێمە لە بەرانبەر گوتە و باوەڕ و ئەندێشەکانی وشک و

پرتووکاوی ئەوان، گوتە و باوەڕ و رامانێکی نوێمان هەیە و ڕێگایەکی تازە بەرەو ڕووی رامانی کۆمەڵان دەکەینەوە و ئەمە بەرژەوەندییان دەخاتە مەترسییەوە".

"کەوایە جارێکی تر پێتان ڕاسپێرم بۆ موداراکردن و ڕێزلێنان لە رامانی جیاواز، باش بیر بکەنەوە و دروست ئەندێشە بەکارهێنان و فێربوون، نرخ و بەهادان بە ئازادی، پەرەپێدان و بڵاوکردن و پەروەردەکردنی رامان مەرجی ئایینی بەهدینییە و دووری بکەن لە کەلەڕەقی و پێداگرتن لە سەر بیرو بۆچوون، ماننەوە و پەنگاوخواردن و دواکەوتوویی رامان و هەر جۆرە کەونەپەرستی بە تایبەت ئایینی. داواکاری و بانگەوازی ئەوەتان لێدەکەم کە بۆ دامەزراندن و بنیاتنان و فێربوون و ڕاهێنانی بنەمای ئۆلی من: رامـانی پاک، گـوتاری پاک و کـردەی پاک، چالاک بن".

# جەژنی شاڵپۆشان و گرێچنی پشتوێن
# (ئائیۆیاونگ‌هەنە)
# «پەیمانی بەهدینی»



جەژن و ئاهەنگێکی فرە گەورە بە ڕێگەوەیە. جەژنێکە تەنیا بۆ لاوانی کچ و کوڕی بەهدینی و ئەو کەسانەی کە بیانەوێت ئایینی "بەهی" بپەژێرێنت یا بیەوێت بێتە ناو ڕەفی ئەم ڕێباز و فەلسەفەیە. گەنجان و تازەپێگەیشتووان و نەودینانی ژن و پیاوی کۆمەڵگای بەهدینی لەم جەژنە شاڵ* دەپۆشن و گرێی پەیمانی پشتوێن* دەبەستن و سروود و ئافەرینەگانی تایبەت بۆ پەژراندنی دین دەخوێندرێت. پاشان داب و دەستووری تایبەت ئەنجام دەدرێت و دەبنە یەکێک لە ئەندامانی کۆمەڵگای بەهدینی. نەودینان لەمەودوا گەرەگە کە لە سەر بنەما و ڕاهێنان و دەستوورەکانی ئولی زەردەشت هەڵسوکەوت بکەن. کۆڵەکەی یەکەمی ئەم ئایینە هوومەتە*، بە واتەی رامانی پاک، کۆڵەکەی دووهەم هۆختە*، بە واتەی گوفتاری پاک و کۆڵەکەی سێهەمیش هڤەرشتە* بە واتەی کرداری پاک. نیشانەی لەش و ڕەواڵەتی دەرەوەی زەردەشتی، پۆشینی شاڵ و بەستنی گرێی پشتوێنە. لە کاتی پۆشینی شەپک و بەستنی پشتوێن ئافەرینەگان و سروودی دڵڕفێن و دەلال دەخوێنرێت. پاشان سترانبێژانی خۆشدەنگ دەست دەکەن بە گوتنی هۆرە و ئاوازی دڵکێش و خۆش و گۆڤەندگرتن، هاوکاتیش میوەی تەڕ وشک و خۆراکی جۆراوجۆریش لە ناو میوانەکان بڵاو دەبێتەوە.

(بەستنی پشتوێن و لێدانی گرێکانی بە بێجیاوازی وەک یەک، بۆ هەر دوو ڕەگەزە و بە واتەی بەستنی گفت و پەیمانی مرۆڤ لەتەک خۆی و بە مانای هەڵبژاردنی ئازادانەی ڕێبازی ئایینی بەهدینییە. گرێلێدانی پشتوێن، نیشانە و ڕەمزی دیاری مرۆڤێکی بەهدینە. پشتوێن لەشی مرۆڤ دەکاتە بە دوو بەش و دەبێت لەمەودوا بەشی سەرەوەی لەشی بەهدین "مێشک"، بڕیار بدات بۆ بەشی خوارەوەی ئەو "هەوا و هەوەس". مرۆڤی بەهدینی هەر سپێدە کە لە خەو ڕابێت، پشتوێنەکەی لە سەر بنەمای سێ درووشمی، ڕامانی پاک و گوفتاری پاک و کرداری پاک، گرێ لێ دەدات و سۆز و پەیمان لەتەک خود و خودای، تازە دەکاتەوە و پێ دەنێتە ناو ئەو ڕۆژە نوێیە. بێگومان ئەگەر تەمەنی گەیشتە، تەمەنی پیرۆزی "پیری" و لە خۆی ڕابینی، ئەوە 7 گرێ، کە بەرزترین پلەی بڕوامەندی و پێگەیشتوویی و ناسینی خودیەتی "ڕوحانی"، دەبەستێت و جێگای ڕێزی هەموو جڤاکی بەهدینییە. هەر وەک هەموومان باش دەزانین، داب و نەریتی پیرۆزی پەیمانی گرێلێدان پشتوێن، لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان ماوە. ڕاستە خەڵک مەبەستی سەرەکی گرێچنینی پشتوێنی لە بیر کردووە، بەڵام بە خۆشیەوە کورد لە پاش ئەو هەموو چەرمەسەریی و داگیرکاری دینی بێگانە، ئێستاکەش لە سەر ڕێچکەی ئایینی بەهدینی بەشێکی زۆر لە داب و نەریتەکانی پاراستووە.)

سروودی تایبەت بۆ ژنان و پیاوانی شاڵپۆش و گرێچنی پشتوێنی پەیمان بەم جۆرەیە:

**بە ناوی یەزدانی دلۆڤانی مێهرەبان**

"مەزنی و پاکی و بەشکۆیی هی ئەهۆرا مەزدای دانا و ئاگایە.

ستایشتی ڕاستی و پاکی و ڕێبازی بەهدینی دەکەم.

ئایینی بەهدینی کە هێنەرەکەی زەردەشتە، **ئازادانە هەڵدەبژێرم** و ڕاوەستاو دەبم لە سەر ئەم ڕێبازە.

ستایشتی ڕامانی پاک و گوفتاری پاک و کرداری پاک دەکەم.

ستایشتی دینی ئەهۆرا مەزدا دەکەم کە سەرزنشت و لۆمەی جەنگ و خوێنڕژتن دەکات و ستایشگەری ئاشتی و لەخۆبوردوویییە.

دینی زەردەشت ئەهۆراییە و مەزدا ئەهۆرا بە بەدیهێنەری هەموو باشییەکان دەزانم و ئەمە پایەی ئایینی مەزدا یەسنایییە.

ئەی ئەهۆرا! هاوڕێ بین، هاوڕێی خاسان و پاکان، لە گوناهو سووچکاران دوور ببین.

لە هەموو جۆرە سووچێک کە بە بیر و گوتە و کردەوە و بە لەش و ڕەوانم کردوومە، لە هەموویان پەشیمانم و پەتەت* دەکەم و بۆ هەمیشە دەستیان لێ هەڵدەگرم.

لە هەر جۆرە گوناهێک کە بە ڕامان و گوتن و کردار، لە من ڕووی دابێت و یا فەرمانیم دابێت، لە هەمووی پەشیمانم و پەتەت دەکەم.

هەر کارێکی باش و پەسەن، کە لە سەر خواستی ئەهۆرا مەزدا بێت، سەرکەوتوو و کامەرانی بهێنێت.

لەناو بچێت هزری خراپ و هەموو بیر و بۆچونێک کە تەڤلی خراپییە".

که ئافەرینەگان خوێندرا و لاوانی زەردەشتی ونەودینان شاڵیان پۆشی و گرێی پیرۆزی پەیمانیان بەست، ئینجا بە جۆشکێکی مەزن دەستیان کرد بە دیلان و سترانی خۆش و ڕەشبەڵەک گرتن، هاوکات میوە و خواردن و خواردنەوەی خوانی ئامادەکراو، دەخوریا و دەنۆشریا. پاشان زەردەشت هەستایە سەر پێ و لەمەڕ ئافەرینگانێک کە خوێندرا، بەمجۆرە دەستی کرد بە ئاخافتن:

"هەروەها کە لە ناوەرۆکی ئەم ئافەرینانە زانیتان، چەمکی پەتەت لە گوناهەکان دێتە باسکردن، ئەمە یەکێکە لە بنچینەکانی ئایینی بەهدینی و بیردۆزیەکانی* منە. چەمکی پەتەت بە واتەی ئەوەیە کە هیچ مرۆڤێک لە بنەڕەت و جەوهەردا خراپ نییە. هەموو مرۆڤی ڕووی ئەم گۆی زەوییە، خاوەنی جەوهەرێکی پاکن، کە ئەگەر لە شوێنکی پاکدا بژین، هەروەها پاک دەمێننەوە. بەڵام ئەمە کار و ڕەنگدانەوەی ژیان و باوەڕ و ئۆل و ڕاهێنان و ناسانی و هەزاران هاندەری دیار و نادیاری دیکەیە، کە کۆمەڵ بەرەو خراپی ڕادەکێشێنێت. هەر مرۆڤێکی بەدرامان و بەدزمان و بەدرەوشت دەتوانێت بە وریابوونەوە و تێگەیشتن لە خراپەکان و ڕیشەی بەدبوون، خۆی ڕێگای شاشی بگۆڕێت و ڕوو بکاتە پاکی و ڕێگای چاکی. لە نەرین و دیتنی من هەر مرۆڤێکی خراپ و سووچبار، هەر ئەندازەش بەد و تاوانباریش ببێت، توانای ئەوەی هەیە کە بە فێربوون و پەروەردە، بێتە سەر ڕێگای ڕاستی و باشی. لەم ڕووەوەیە هەر کەس دەتوانێت لە هەر گوناهێک پەتەت بکات و بێتە سەر ڕێگای ڕاستی و بەهدینی. پەتەتیش ئەوەیە کە بە دڵ لە سووچ و تاوان و خراپەکاریی خۆی پەژیوان ببێتەوە و خۆی لێ ڕزگار بکات و بۆ هەمیشە پایەدار و ڕاوەستاو لە نەکردنی جارێکی دیی ئەو تاوانانە ببێت. هەر تشتێک کە بە گوناهی دەژمێرێت، دووری لێ بکات و هەر تشتێک کە ڕەوا بووە و هەیە و بە جێی نەهاوردە، بە جێی بهێنێت. لە درۆ، بەرەو ڕاستی و لە خراپی، بەرەو چاکی بگەڕێتەوە. لە لووتبەرزی و خۆپەرستی ڕوو بکاتە خۆگری و خاکیبوون و خاکساری. کەنارەگیر بێت لە هەر گوناهێک ئەگەریش بووچکیش بێت و مەردوم بە چاوی پچووک و نزم نەڕوانێت. کەم و کوورپییەکان و بەند و باوەکانی دەروونی خۆی، بدۆزێتەوە و پاکیان بکاتەوە. هەڤاڵبەندی لەتەک خراپەکاران ببڕێت و لەتەک چاکەکاران پەیوەندی پتەو بکات. ڕک و کین و تووڕەیی لە دڵدا فڕێ بدات و مێهرەبانی و نەرمی و لێبوردن لە جێگایدا نیشتەجێ بکات. هەوڵ بدات چاکەی خۆی بەرامبەر بە خەڵک فەرامۆش بکات و خراپیشیان هەر بەم چەشنە. هەر وامێک* کە لە ئەستۆی دایە، بیداتەوە. بەم چەشنە مرۆڤ هەر چەندەش سووچداریش ببێت، دەتوانێت لە گوناهی خۆی پەتەت بکات و ببێت بە ئەندامێکی کۆمەڵگای بەهدینان. دەزانن کە سەرەتای چاکبوونیش لە رامانی پاکە. تا رامـــــان چاک و ڕاست نەکرێتەوە، گوفتار و کرداریش چاک نابێتەوە. لە بەشێک لە ئافەرینەکان، چەواشەکاران و درۆزنان سەرکۆنە کراون، ئەمەش یەکێکی دی لە کۆڵەکەکانی دینی بەهدینییە. پێویستە لەتەک خراپە و خراپەویستان خەبات و بەرخۆدان بکرێت تا بێنە سەر ڕێگای ڕاستی".

"گوتراوە کە هەر کارێکی باش بە خواستی ئەهۆرا مەزدا و ئەمێشەسپێنتەکان ئەنجام بدرێت، سەرکەوتن و کامەرانی دەبێت، ئەمەش شتێکی ڕاستە. هەر کارێک کە سەرچاوەی لە تیشک و تریفەی ئەهۆرا مەزدا و رامانی پاک و ڕاستی و خۆڕاگری و ئارامی و مێهرەبانی و سەربەستی و ئازادی و شادی و ڕەسایی و گەشەکردنی

پایەدار ببێت، دەرئەنجامی ڕزگاری و سەرکەوتن و بەختیارییە. گوتەی بنیات و مەزنی ئەم ئافەرینەگانە ئەمەیە کە، هەڵدەبژێرم دینی بەهدینان...، هەڵبژاردن یەکێک لە ستوونەکانی ئەم ئایینەیە. کچ و کوڕێک ناتوانن تەنها لە ڕێگای دایک و باوکیەوە دینی مەزدا یەسنایی* وەک میرات* پێی بگات و بەشبەری بکات. ئەو دەبێت خۆی پێ بگات و بیر بکاتەوە و بپشکوێت و لەتەک رامان و خێرەتی ڕاوپرس بکات و کاتێک کە توانای ناسین و جیاکردنەوەی باشە و خراپە و دەستنیشانکردنی ڕێگای دروستی ژیانی هەبوو، پاشان دەتوانرێت دینی بەهدینی بەو پەڕی ئازادی هەڵبژێرێت و ببێت بە ئەندامێکی کۆمەڵگای ئۆلی بەهدینی. بۆیە ئاهەنگی شاڵپۆشان و گرێچنین بۆ لاوانی بەهدینی دەگێڕدرێت. یەکێکی تر لە پایەکانی ئایینی بەهدینان کە لە ئافەرینەکان ئاماژەی بۆ کراوە، لۆمەکردنی جەنگ و خوێنڕێژی و بە پێچەوانەشی ستایشتی ئاشتی و خۆڕاگری و گوزەشتە. لە نەرین و دیدگای من جەنگ لە خراپترین، زیانبارترین، بێئاوەزترین، تاوانبارترین و ناحەزترین کارەکانە. هەر کەس دەستپێشکەری یەکەمی جەنگ ببێت، ئەو کەسە دڕندە و خراپەکارێکی چەپەڵە کە ڕەوانی ئالوودە بە تاریکی و ناپاکییە. کاتێک کە ئەم کەسە، کۆمەڵان بۆ کوژتن و وێرانکردنی خانوو و گوند و باژێڕ و کێڵگە و دارستان و جەنگەڵ دەکێشێنێت، هەزاران خەم و دەرد و ئازاری دیی بەدی دێنێت. من سەرزنشتی جەنگ و ستایشتی ئاشتی دەکەم و هەروەها کە لە ئافەرینەکان دیتان و بیستان، لە کاتێ ستایشتی ئاشتی واژەی لەخۆبوردنم هاوردگە. چونکە ئەم گوزەشت و خاکساری و پشوودرێژی لە رامان و خێرەتە، کە دەتوانێت جەنگ و خوێنڕژتن لەناو ببات و ڕەوانەکانی تۆفداروی ڕک و کین و گرژی، بۆ ئارامش و دۆستایەتی و تەبایی و ئاشتی بکێشێنێت. هاویاری و هاوکاری و یەکدڵی و یەکڕەنگی لەتەک پاکان و خاسان لە بنچینەکانی دینی بەهدینییە و هەر بەم هاوکارییەیە کە دەتوانرێت لەگەڵ چەواشەیی و خراپەکاری بجەنگرێت و بەدی لەناو ببرێت".

"لەمەڕ پشتوێن و شاڵیش بێژم، ئەم کارە نیشانە و ڕەمزی پێوەندی نێوانی جەستە و ڕەوانە. لە فەلسەفە و بۆچووی مندا، نێوانی لەش و گیاندا پەیوەندییەکی فرە نزیک و ڕاوەستاو و سفت و هەمیشەیی هەیە. ئەگەر کەسێک لەشی کز و لاواز ببێت، گیان و ڕەوانیشی خەمگین و دەردەدار دەبێت. ڕەوانێکی نەخۆش و دەردەدار، دەتوانێت لەش بەرەو نەخۆشی و پەژمۆردەیی و سیسبوون بکێشێنێت. لەم ڕووەیە کە من بایەخێکی فرە بە پاکی و خاوێنی و دروستی لەش دەدەم. من بۆخۆم پزشک و دەرمانگەرم و باش دەزانم ڕێگای دروستی ڕەوان چییە و ئاوەز و ڕەوانی ساخ و دروست لە لەش و تەندروستیدایە. لە ئالییەکی دیکەوە ئاگادارم کە ڕیشەی زۆربەی دەردەکانی تەن لە ڕەواندایە. شاڵ و گرێ نیشانە و ڕەمزی ئەم لەیەکدان و پێکەوەبوونەوەیە کە لە ڕێگای لەش بە ڕەوان دەگات و بە پێچەوانە هەروەهاش. لە تاف و سەرەتای جەوانی و لە کاتی دەستپێکردن و گەشەسەندنی هێز و توانای ناسین و جوێکردنەوەی چاکە و خراپە، کاتێک کە ئاهەنگ و جەژنێکی ئاوا بەشکۆ بۆ لاوێکی بەهدینی دەگیرێت و شاڵ دەپۆشێت و گرێی پشتوێن دەبەستێت و ئافەرینەگان دەخوێنێت و پەیمان دەدات، هەر لەم ڕێگاوەیە کە پەیوەندی نێوان لەش و ڕەوان کە پێشتر ئاماژەم بۆ کرد، لە ڕەوانیدا نەخش دەبەستێت و پتەو و پایەداریش دەمێنێت. چونکە ئەم کردەوە ڕەوانییە، هاوڕێیە لەتەک کردەوەی تەنی (شاڵپۆشین و گرێبەستن)، بۆیە لە هەموو ڕۆژ و ساتێکدا بەهدین لە ڕێگای لەشەوە، بوونی پشتوێن و گرێ

هەست پێدەکات و لە ڕەوانیشدا بە چەشنێکی نابەخود و نائاگا، ئەو پەیمان و سۆز و بەڵێنانە زیندوو دەبێتەوە و خودبەخود دەیکێشێنێت بۆ ئالی رامانی پاک و گوفتاری پاک و کرداری پاک".

کاتێک کە جەشن و ئاهەنگی پشتوێن گرێدان کۆتایی پێ هات، پاش نیوەڕۆ بوو. زەردەشت و یارانی هەستان و نوێژی ڕاستییان بەجێ هێنا.

## بە ناوی یەزدانی دلۆڤانی مێهرەبان

"نیایشت و ستایشت بە جێ دێنین بۆ ئافەریدەگاری مەزن،

ئەو سەرەتا و کۆتاییە،

ئەو هەر خۆی بووە و هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە،

ئەو ناگۆڕێت و توانامەندی بەشکۆیە،

ئەو یاسادانەرە و هیچکەس نییە توانای ئەوی هەبێت،

ئەو بێهاوتایە،

ئەو زانایە و لەویش زاناتر نییە،

ئاگادارە لە هەموو شتێک کە ڕوو دەدات،

ئاگاداری هەموو ڕاز و نیاز و نەهێنی و ئاشکارێکە،

ئەو مەزنترین ئامۆژگار و باشترین و سوودبەخشترینە،

ئەو ئاگری ژینبەخشی داگرساو و مێهری پەیوەندیدەری گیان و جیهانە،

ستایشت هەر بۆ ئەوە،

پتەو و ڕاوەستاوم لە سەر هەموو کردەکانی ڕاست و چاک،

پەتەت دەکەم لە هەموو گوناهەکانم و ڕێز دەنێم بۆ هەموو کردارە بنیاتییەکان و شەش هێزی ڕەوانم: رامان، گوفتار، کردار، خواست، هۆش و خێرەتم،

ئەو دروستکەری جیهان و هەموو تشتێکە،

ئەو هێنەری ڕاستییە و دروستکەری جیهانی باشی و خۆشییە،

ئەو بەدیهێنەری جوانی و دادپەروەری و دۆستایەتییە،

ئەو مێهرەبان و بەخشەندەیە و هەموو کەس دەتوانێت بیگاتێ و ببێتە پشت و پەنای و هاوڕێی هەموو مرۆڤێک،

دۆستەکانی خۆی خۆش دەوێت،

لە گۆشەگیری و قوربانیکردن بێزارە،

هەرگیز لە هاوپەیمانی خۆی خواپەرەستی کوێرانە و کۆیلەتی ناوێت، بەڵام داوای پەیڕەوکردنی رامانی پاک، گوتەی پاک و کردەی پاکە.

جا دەبێت: ئافەرینگوفتار ببین،
لە زیان و گەزەند و تاڵی و ترس و خەم بەدوور بین،
فرە بژین،
دروست بژین،
شاد بژین،
تا دەژین بە کام و خۆشی بژین،
جیهانمان بە کامی لەشمان بێت و مینوومان بە کامی ڕەوان،
لە چاکان ببین،
هاویاری هەموو پاکان و خاسان ببین،
ڕاستی باشترینە".

بە کۆتایی هاتنی نوێژی ڕاستی، پەندی گەواهگیران خوێندرا و ئاهەنگی شاڵپۆشان و بەستنی گرێی پشتوێن، گەیشتە کۆتایی.

# هەڵبژاردنی دینی بەهدینی لە لایەن کەیگوشتاسپ



شاگوشتاسپ و هەموو فەرزانەکان لە تەلار خڕ ببوونەوە، زەردەشتیش هاتبوو. شاگوشتاسپ دوای دوودڵی و بیرکردنەوەیەکی فرە و فراوان و پرسیار و بەرسڤی زۆر لەتەک خۆی و زانایانی، بە تایبەتی جامئەسپ گەیشتە بڕیاری کۆتایی خۆی، ئەوەش بڕیاری پەژراندنی دینی بەهدینی، ئۆلی زەردەشت بوو. شاگوشتائەسپ تێگەیشتبوو کە ئەو شتەی تا بە ئیمڕۆ پێی بڕوامەند و پابەند بووە، هەرگیز لەتەک هەڵسەنگاندن و کێشانەی رامان و هزری ئەو ناگونجێت. هەروەهاش

زانیبووی کە لە بەرابەری مرۆڤێکی دانا و ژیربێژی وەک زەردەشت، کە گوتەکانی پڕواتە و رامانی بەرز و باوەڕی پتەو و ڕاوەستاو و ڕاهێنانی ڕووناکە، هیچ ڕێگایەک بێجگە لە پەژراندنی دینی زەردەشت نییە. ئیمڕۆش ئەم کۆڕ و دانیشتنە بەرپا ببوو، کە کەیگوشتاسپ ئامادەبوونی خۆی بۆ پەژراندنی دینی بەهدینی بە هەمووان ڕابگەێنێت.

بێدەنگی تەلاری کۆشکی داگرتبوو و هەمووان چاویان بڕیبووە زەردەشت و شاگوشتائەسپ. دوای تاوێک شاگوشتائەسپ هەستایە سەر پێ و ڕووی کردە زەردەشت و گوتی: "ئەی زەردەشت! ئەی زانا، کە زانایی تۆ بێسنوورە! ئەی هۆشمەندی ژیربێژ! ئەی رامانگەری هێژا کە ئاسۆی رامانی تۆ بێئەندازە بەرفراوانە! ئەی فەرزانەیەک کە زانیاریت بانتر لە هەمووان بووە و هەیە و دەشبێت! ئیمڕۆ لەم کۆڕە پیرۆزە مەزنە، لە بەردەم چامئەسپی دانا و فرەشەوشتری زانا و هەموو فەرزانەکانی هەژیر* دەبێژم و بە ئاشکراش دەڵێم کە ئایینی بەهدینی تۆم پەژراند و بۆ دەستمایەی ئەم ڕێگایە، سەر و گیانیشم دادەنێم. ئەی زەردەشتی هێژا! تا بە ئیمڕۆ من هەنگاوم لە تاریکی دەکوتا، دیتنم بۆ جیهان تەسک و تەنگ و تاریک بوو، هزر و رامانم نەڕەسیدە و بێپرووسک بوو. تۆ منت لە جیهانی تاریکایی بەرەو جیهانی ڕووناهی ڕابەری کرد. مێشکم کە لە ناو زلکاوی بڕوا کەونەکان کە هەودا درابوو، کردتەوە و بردتە سەر ڕێگای دروستی بینین و پێواندن. هۆش و ئاسۆی زانیاریمی پەرە پێدا و بۆ وەرگرتنی پترتر، ڕێنوێنیت کردە سەر ڕێبازی دروستی ڕووناکی. هەمان ڕێگا کە تۆ لە سروودە دڵنشینەکانت بە منت نیشان دا".

کە وایە،
پەیڤە هەرە باشەکان بە گوێی هۆش ببیسن و
بە رامانی ڕوون بڕوانن،

هەر یەک لە ئێوە،
یەکێک لەم دوو ڕێگایە بۆ خۆی هەڵدەبژێریت و
بەر لە بویەری مەزن
ڕاپەڕن و بە دروستی،
ئەم ئایینە فێر ببن و پەرەی پێ بدەن.
گاتا، هاتی 30، سروودی 2

پاشان، لە نێوانی ئەو دووانەدا،
پێویستە مرۆڤ،
ڕابەرێکی ڕاستەقینە بۆ خۆی هەڵبژێرێت
کە دروستکردار بێت و
پترکەری رامانی پاک بێت.
ئەی مەزدا..!
هەرگیز ڕابەرەکێکی تەڵەکەباز،
کە خۆی بە ڕاستی و پاکیدا هەلواسیبێت،
ناتوانێت پەیامهێنەری تۆ بێت.
گاتا، هاتی 31، سروودی 10

"ئەرێ زەردەشت، تۆ منت بۆ ڕێگای دروستی دیتن و بیستن و تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنی دروست ڕێنوێنی کرد. ئەم ڕێبازە، لە سەپاندنی زۆرەملی رامان و ستەمگەری و خۆپەسەندی و بایەهەوابوون دوورە، تەنیا یەک شت هەیە، ئەوەش بیرکردنەوە و نرخاندن لە ناو ئازادیدا هەڵبژاردن. لەم ماوە کە گوتەکانی تۆم بیستە و لە بارەیەوە بە وردی بیرم کردوەتەوە و لەتەک رامانم بەراوەردم کردە، ڕێگای دروستی خۆمم دیاری کرد، ڕێگایەیەک کە تۆ یارمەتیمت دا تا بیدۆزمەوە.

ئێستا من لە بەردەمی تۆ و هەموو فەرزانەکان، ئافەرینەگان و سروودی پەژراندنی دینی تۆ دەخوێنمەوە و ئامادەی پۆشینی شاڵ و بەستنی گرێی پیرۆزی پەیمانی پشتوێن دەبم و تا دوایین هەناسەی ژینم لە ڕێگای پەرەسەندن و بڵاوکردنی دین و فەلسەفەی تۆ دەکۆشم".

شاگوشتاسپ هۆرە و ئافەرینگانی تایبەتی خوێند و شاڵی پۆشا و گرێی پشتوێنی بەست و لە ناو جەژن و شادمانی و هەمووان، هاتە سەر ڕێبازی بەهدینی. کەیگوشتاسپ پاشان ڕووی کردە زەردەشت و گوتی: "ئەی زەردەشت! داخوازیم ئێستا لە تۆ ئەوەیە کە لەم ڕۆژە پیرۆزەدا و لە پێش فەرزانەکان و ڕاوێژکاران و کاربەڕێوبەران و کاربەدەستان و سەردارانی سوپا و نوێنەرانی هەموو گەل، ڕێگای دروستی ڕامیاری و فەرمانڕەوایی بۆ من دیاری بکەیت. ئەی زەردەشتی! دانا تۆ باش دەزانی کە من فەرمانڕەوای ئەم نیشتمانە مەزنەم. ئێستاکە کە ئایینی بەهدینیم هەڵبژاردووە، بڕیارم داوە کە لەمەودوا بە داد و ڕاستی فەرمانڕەوایی بکەم. مەردوم لە ئاسایشدا بژین و لە ڕێگای بەختیاری و شادومانی و ساماندارى هەنگاو بنێن. غەم، هەژاری، دەستەنگی، پرسە، ستەم، ئەشکەنجە، خەزانی، گرانی، جیاوازی، بندەستی و باڵادەستی لە سەر ئەم وڵاتە نەمێنێت. من بێگومانم کە تۆ ڕێگای هەمووی ئەمانە دەزانی و دەتوانی من بەم ئامانجانە بگەیەنیت".

ئاخافتنی شاگوشتاسپ گەیشتە کۆتایی و هەموو دانیشتوانی کۆڕەکە لەم گۆڕانکاریەی بیر و ڕامانی گوشتاسپ فرە شاد و کەیفخۆش بوون و هەستانە سەر پا و دایانە چەپڵەلێدان و ستایشت و دروشمی بژی، هەر بژی، پایەدار بیت. زەردەشتیش هەستا سەر پا و بە خۆشییەوە دروودی پێ فەرموو و ئارەزووی تەندروستی و سەرکەوتنی بۆ کرد و دەستی کرد بە ئاخافتن و شیرۆڤەی چۆنیەتی بەڕێوبەریی وڵات بەم چەشنە: "ئەی شاگوشتاسپ! فرە کەیفخۆشم کە بڕیارت داوە لەم خاکە پیرۆزە، ڕاستی و داد و چاکە و ئاسایش و کامەرانی و

ساماندارى و ئاوەدانى بەرپا بكەى و پەرەى پێ بدەى، فرە شادمانم و هێڤى سەربەرزى و سەركەفتنت بۆ دەخوازم لە ئامانجانە. بەڵام لەمەڕ ئامۆژیارى و داواكاریت لە بارەى چۆنیەتى فەرمانڕەوابیت، چون پێشتر پێشبینى ئەم داواكارییەتم كردبوو، بۆیە ئیمڕۆ لەتەك خۆمدا دەفتەرێكى گەورەم هاوردووە، كە لە ناویدا هەموو دەستوور و فەرمانەكان، شایست و ناشایستەكان، چۆنیەتى بەڕێوبەرایەتى وڵات و هەموو شتێك كە لەم بارەوەوە هەبێت، تێیدا نووسراوە. من ئەم دەفتەرەت پێشكەش دەكەم و تۆش دەبێت بە وردى بیخوێنیتەوە و هێڤیدارم كە دەستوورەكانى بە وردى بە كار بهێنیت، بێگومان بە كە كام و ئاواتى تۆ دێنێتە دى".

شاگوشتاسپ بە بیستنى ئەم قسانە زۆر كەیفخۆش بوو و بە گورجى ڕووى كردە زەردەشت و گوتى: "ئەى داناى مەزن! هەرچى زووتر ئەو دەفتەرەم پێ نیشان بدە كە هەر لەم ساتەوە خوێندن و فێربوون و بەكارهێنانى دەست پێ بكەم".

زەردەشت كەوا جۆش و خواستى گەرمى گوشتاسپى بینى، بە ئارمیەوە چوە پێشەوە و دووبارە ئەو دەمكە گەنمە كە جارى یەكەم لە ناو بەرگێكى سەوزدا بوو، لە پێشى داینا و گوتى: "ئەى شاگوشتاسپ! ئەو دەفتەرە كە گوتم ئەمەیە، بە وردى و شێنەیى بیخوێنەوە و زاگۆن و دەستوورەكانى بە جێ بهێنە".

شاگوشتاسپ و دانیشتووانى كۆڕەكە هەمدیسان سەریان سووڕما، بەڵام ئەمجارە بە پێچەوانەى جارى یەكەم كە گرژ و تووڕە بوون و گاڵتە و شۆخییان بە زەردەشت كردبوو و گوشتاسپ ڕەنجا و تەلارى بە جێ هێشتبوو، هەموویان بێدەنگ بوون و چاوین بڕیە دەنكە گەنمەكە. دواى تاوێك شاگوشتاسپ سەرى بەرز كردەوە و گوتى: "ئەى زەردەشتى هێژا! دەزانم دەتەوێت ئەمجارەش دەرسێكى گەورەم پێ بدەیت، بەڵام من لە تێگەیشتنى ئەم وانەیە زوێنم*، بۆیە داوات لێ دەكەم كە خۆت دەسپێشكەرى ڕاڤەكردنى ببە و ئەو شتەى كە گەرەك و پێویستە من تێ بگەم، تۆ بە زمانى خۆت بۆمانى ببێژى".



زەردەشت بە ڕوویەکی هێمن و نیگایەکی دەلال و مێهرەبانەوە دەستی کرد بە ئاخافتن و گوتی: "ئەی کەیگوشتاسپ! تۆ دەزانی گەنم تا زەمانێک نەچێندرابوو، بێدەنگ و بێگیان بوو، کاتێک گیانی گرت و چەکەرەی کرد و گەشەی سەند و دانەی ئافراند، کە خرایە ژێر خاک و بارودۆخ و مەرجی ئاو و خاک و هەوای بۆی ڕەخسا. نیشانەی یەکەمی ئافراندنی ئەوە بوو کە شێوە و ڕەنگی گەنمبوونی خۆی لە دەست دا. بەو واتەیە کە لە خودی خۆی هاتە دەرەوە و گۆڕیا و خۆی بۆ چەکەرەکردن و باڵاکێشان ئامادە کرد. کەیگوشتاسپ! تۆش پێویستە لە کاری وڵاتداری و فەرمانڕەوایی وەک گەنم ببیت، لە خۆت بێیتە دەرەوە و بگۆڕێیت و لە ڕێگای چەکەرەکردن و گەیین، خۆت **ڕەهـــا** بکەیت. ئەگەر وەها نەبیت و بەس

بیر لە خۆت بکەیتەوە و لەگەڵ خۆتدا بیت و لە کۆشکی گەورە و تالاری خۆش و قسەی پڕ لە ستایشت و ئافەرین و بەهبەهی دەوروبەریانت ببیسیت، دەبیتە هەمان گەنمی قوشبنی ئەنبار. نە گیانێکت دەبێت و نە ڕوواندن و نە توانای پەروەردەکردن و دانەدانێک. تۆ کاتێک دەتوانیت گەشە بستێنیت و وڵات بە بوونی خۆت بەهرەمەند بکەیت و بە گوتەی خۆت داد و ڕاستی و ئاوەدانی و سامان لە نیشتمانت بەدی بێنیت و پەرەی پێ بدەیت، کە لە «من» بیتە دەرەڤە و خود ڕەها بکەیت، ئەو منە لەناو ببەی و فەرامۆشی بکەی و بیشکێنی، دڵ و گیان و رامان و ویست و توانات بکەی بە کێڵگەی ڕوواندن و ڕیشەی سازکەری ژیان و ئافراندن".

"ئەی کەی گوشتاسپی دلێر! بزانە و ئاگادار بە، کە دەرچوون لە من و ڕەهاکردنی من "ڕەهابوون لە خود" بۆ فەرمانڕەوایەک کارێکی ئاسان نییە و بەڵکوو زۆر سەخت و دژوارە. تۆ دەبێت فرە زانا و ئاگا و بەتوانا و هۆشمەند و وریا و ئازا بیت، کە توانای ڕەهاکردنی «من» یا خودت هەبێت. من لە ئەهۆرا مەزدای پاک و لە ڕاستی کە هەنجاری بوونە و لە پاکی داواکارم کە ئاوات و ئارەزووەکانی تۆ و پەیڕوانی بە جێ بێنێت و توانای ئەوەت هەبێت کە پەیامی ئەهۆرا مەزدا بە هەمووان ڕابگەیێنی":

ئەی ڕاستی..!
ئەو خەڵاتە بە ئێمە ببەخشە،
کە بەهرەی رامانی پاکە.
ئەی پاکی..!
ئارەزووەکانی گوشتاسپ و پەیڕەوانی بە جێ بهێنە.
ئەی مەزدا..!
وزەمان پێ ببەخشە،

تا پەیامی تۆ بە هەمووان ڕابگەیەنین.
گاتا، هاتی 28، سروودی 7

ئەی زەردەشت..!
کێیە هاوڕێی ڕاستکرداری تۆ؟
کێیە ئەوەی بە ڕاست
بۆ پەرەپێدانی خۆشناوی و سەرفەرازیی ئەنجومەنی مۆغان
کۆشش دەکات؟
لە ڕاستیدا ئەو کەسە
تەنها کەیگوشتاسپی دلێرە.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
خەڵک بەو گوتارانە بانگەواز دەکەم،
کە لە رامانی پاکەوە سەرچاوەی وەرگرتبێت،
تا ڕێگە بە بارەگای تۆ ببیننەوە.
گاتا، هاتی 46، سروودی 14

"ئەی کەیگوشتاسپ! دێتە یادت کە من لە بارەی «جەمشید کوڕی ویەونگەهان*» گوتوومە":

یەکێک لەم سووچدارانە،
جەمشید ڤێەونگەهانە.
ئەو کەسەیە کە بۆ هەوا و هەوەسی خۆی،
پەروەردەگاری جیهانی بە پەست دانا.
ئەی مەزدا..!

من بە داوەریی کۆتایی تۆ
لەمەڕ گوناهکاران بێگومانم.
گاتا، هاتی 32، سروودی 8

"دەمەوێت لە بارەی ئەم سرووده کەمێک ببێژم. جەمشید لە جێگای ئەوە وەک دانەی گەنم خۆی ڕەها و ئازاد بکات، تا بە زایین و گەشەکردن و پشکووتن و دانەگرتن بگات، کەوتە ناو گێژاوی خۆپەرستی و خۆبینی و لە کێڵگەوە چوە ناو ئەنبارەوە و لە ئەنباریشدا گەنە و سن* و مۆرانە تێی دا و زیانێکی فرەی پێ گەیشت. جەمشید گرفتاری دەردی بایی هەوا و خۆویستی بوو. ئەمە باش بزانە کەیگوشتاسپ! بۆ فەرمانڕەوایەک خۆپەسەنی و خۆبینی، سەرەتای هەموو دەردەکانە. لە هەموو دەردەکان گەورەتر هەر ئەوەیە کە گوتوومە «ئەو کەسەی کە بۆ ڕەزامەندی کۆمەڵ و خۆی..». هەم لە ڕەزامەندی جەمشید گوتوومە و هەم لە ڕەزامەندی خەڵک، بۆیە ئەمە ڕاز و نەهێنیی گەورەی ئەم دەردی خۆویستی و خۆپەسەنییە. کاتێک کە فەرمانڕەوایەک خۆویست و خۆپەسەن بوو،فەرمانبەرانیش وەک گیای هەرز لە دەوری سەوز دەبن و خۆیان لێی دەئاڵێنن. خەڵکانی ڕەوان لاواز و دەردەدار لە دەسەڵات دەئاڵن و خۆیان دەپێچنە دەوری دەسەڵاتدار و کلکەسوتەی بۆ دەکەن. کاتێک کە جەمشید دوچاری دەردی «من» منمنی بوو و خۆی بە خواوەندی جیهان زانی و کەسانی ڕەوانەخۆش و نۆکەرڕەوشت و خۆڵتەکەر* ڕوویان تێ کرد، ئینجا جەمشید لە ناو خۆویستی و سەرمەستی بایهەوا «من» مەلەی دەکرد و کوڕنش و ستایشت و خۆڵتەکاری ئەوانی پێ خۆش بوو و بە گەرمی و خۆشییەوە میوانداریيانی دەکرد. خاسەکی* خۆویستی ئەوەیە کە مرۆڤ لە جیهانی گردی خۆی دوور و جودا دەکاتەوە و تەنها دەڕواتە جیهانی منەوە، جەمشیدیش بەم چەشنەی بە سەر هات. تا پێش لەوە دوچاری دەردی منمنکردن و خۆ بە خودازانین بێت، جەمشید لە ناو مەروم

و جڤاک بوو، بەڵام هەر لەو ڕۆژەوە کە خۆی بە هەموو شت زانی، هێدی هێدی دیوارێکی ئاسنی لە نێوانی خۆی و جیهانی دەوروبەری دروست کرد و کەم کەم ئەو دیوارە وەها بەرز و پتەو بوو کە خەڵک ڕاپەڕان و لەناویان برد. بۆیە کەیگوشتاسپی دلێر تۆش وەک جەمشید و هەر مرۆڤێکی دیکە، ئەگەر بۆ منەکەت پەنا ببەی و شێت و شەیدای منت بیت، ڕەوتی ژیانی تۆش وەک جەمشید و هەر خۆپەرست و زۆردارێکی دیکەی لێ دێت. مرۆڤی سووک و ڕەوانزم و چڵکاوخۆر لە گردی تۆ کۆ دەبنەوە و وەکوو گیا کەڵە و هەرێس خۆیان لە دەورت دەئاڵێنن، جا کاتێک کەوتیتە ناو گەمارۆی ئەم تاقم و کەسانە، ئینجا هەموویان ستایشتت دەکەن و لە دوژمنانی خەیاڵی دەترسێنن، یان لە کەسانێک کە ڕۆژێک لە تاج و تەختی پاتشایەتی داتبەزێنن، بەڵام ئەم دوژمنانە کێن؟ ، تاقمی سووک و بەرچاوتەنگەکان توانای دیتنی کۆمەڵانی خاوەن هۆش و بەرزرامانیان نییە، هەموو هەوڵ و کۆششیان بۆ ئەوەیە کە ئەو تۆژە زانا و ڕووناکبیرە لە تۆ دوور ڕابگرن و بەم چەشنە تۆ لە ناو دژێکی پۆڵایی کە بۆ خۆت چێت کردووە، تووش و گرفتاری ترس و گومانت دەکەن و وادەزانیت کە هەموو خەڵک خەریکی لەناوبردن و زاڵبوون و وەدەستهێنانی تاج و تەخت و شکۆی تۆن. لەم ترس و ڕەشبینیەدا، بەدبینی تۆ دادەگرێت و ستەمکاری تۆ دەست پێدەکات. تۆ هەمووی ئەو کەسانە کە گومانت بۆی دەچێت و دەبێژی شایەت ڕۆژێک دژی تۆ ڕاپەڕن، لە سەرەتادا دەیانخەیتە ژێر چاوەدێری و هەر جووڵە و گوتەیەکیان ئەگەریش لە ڕووی نیازپاکی و ئامۆژگاری بێت، بە دڵێکی ڕەش و ناحەز دەڕوانی و بۆ لەناوبردنیان دەست بە کار دەبیت و دەستەکانی تۆ فەرمان دەنووسێت و دەستی جەلادەکانیش کە لە تۆ کۆ بوونەتەوە، دەکەوێتە کار و سەری یەکمین نەیارت بۆ جودا دەکەنەوە. بەڵام ڕەشبینی و خۆویستی و ستەمکاری تۆ لێرە کۆتایی پێ ناهێت، بەڵکوو تازە دەستی پێ کردووە و لە ئەندێشە و گومانی تۆ دیسان نەیارێکی دی سەر هەڵدەدات و تۆش ڕک و

تووڕەیی داتدەگرێت و دووبارە دەستت دەکەوێتە کار و فەرمانێکی دی دەنووسیت و سەرێکی تر لە لەش جودا دەکەیتەوە. لەمەولا کوژتن و فەرمانی لە ناوبردنی نەیارانت، بەشێکی چەسپاو لە نەریت و سازیی فەرمانڕەوایی تۆ دەبێت. تۆ تا دوێنێ پاتشایەکی ساکار و دادگەر بوویت، ئینجا دەبیتە خۆویستێکی ستەمکار".



"دەردی خۆپەسەنی و خۆویستی بەمە کۆتایی نایەت. مرۆڤی خۆپەسەند دەیەوێت هەمان جۆر کە لە دەستەڵاتداریدا لە هەموو بانتر و بەتواناترە، هەر بەو شێوەش دەیەوێت لە هەموو زەمینە و بوارێکدا بانتر بێت. جا لەم بۆیە تۆش کە ئێستا لەم کۆشکە سادە فەرمانڕەوایی دەکەیت، ئینجا دەست دەکەی بە پەرەپێدان و چێکردنی کۆشکی نوێ. دەتەوێت سەرتاسەری جیهان هی تۆ بێت و لە هەموو شوێنێک نیشانە و ئاڵایەکی تۆ بشەکێتەوە. ئیمڕۆ تۆ باسی وڵات و داد و ئاوەدانی دەکەی، بەڵام بەیانی هەمووی ئەمانە دەبێتە یەک شت، ئەوەش کەیگوشتاسپ، هەموو شتێک دەبێت بە حەز و داخوازی تۆ بگۆڕێت و نێو و

شوێنی تۆی لێ دیار بێت و تۆ هەموو شتێک ببیت. نێوی تۆ دەبێت کەوێتە سەر زاری هەمووان، بۆ هەموو شتێک دەبێت بە ناوی تۆ دەست پێ بکات و کۆتایی پێ بهێنرێت. کاری تۆ بەمەش کۆتایی پێ ناهێت، هەر جارێک ملّقێکی خۆپەسەنی دەمژی، توونیتر دەبیت، تاکوو هەنگاڤ دەنێی بەرەو بەرزترین پلە کە خۆت لە هەموو مرۆڤ و گیانلەبەران و جیهان بە مەزنتر بزانی. بە بڕوات ڕەتەوەی تۆ بەرزترین ڕەتەوەی جیهانە، پاشان ڕەگەزت، زێد و جێت، خانوو و باژێر و وڵات و ئایینت. بۆیە بۆ ئەم خۆبەزلزانینە هەنگاو دەنێت و ڕاناوەستێ، هەنگاونانێکی ناپیرۆز، کە کاردانەوەشی خوێن و فرمێسک و وێرانی و لەناوچوونە. ئینجا دەبێت دەسەڵاتداریی خۆت لە سەر هەمووان بسەلمێنیت و بێگومان کەسانێکیش دژت ڕادەوستن و ئەمە سەرەتای جەنگ و بەربەرەکانێ دەبێت و بە دوایشیدا هەزاران دەردی بێکۆتایی ئەم جەنگە ناپیرۆزە".

"ئەی کەیگوشتاسپ! ئیمرۆ لەم سات و شوێنەدا وێستاوی داوای ئامۆژگاری و پەند لە من دەکەی بۆ بەڕێوبەری وڵات، ئەمە گەورەیی و دڵپاکی و دروستیی دەروونی تۆیە، بەڵام بەیانی کە تووش و گرفتاری خۆپەسەنی ببی، نە تەنیا لە من لە هیچ کەس ئامۆژیاری وەر ناگری. لە هەمبەر بووچکترین ڕەخنەدا سەرتاپا گرژ دەبیت و دەسووتی و دەشسووتێنی. ئەگینا وەها خەم و پەژارە داتەگرێ کە دەڵێی کۆتایی جیهانە. لەوانەیە لە کاتی خۆویستیدا جاری وابێت کە ڕەواڵەتی خۆگری و خاکیبوون بە خۆت بگری، بەڵام لە ناو جەوهەر و دەروونی ئەم خۆبەکەم زانینە، هەمباز دەریایەکی شاراوە و نەهێنیی خۆپەسەندی و خۆبەزلزانی هەیە، بۆیە ئەم هێدیبوون و دڵنەرمی و خۆکەمگریەت، بیانوویەکە کە دەتەوێت ستایشت و سەرنجی هەمووان بۆ خۆت ڕابکێشێنیت. ئیمرۆ تۆ ئارام و بێدەنگ گوێ بە گوتەکانی من و کەسانی دی دەدەی، بەڵام سەیزوو کە شێت و شیفتەی خۆت بوویت، کەڵکەڵەی هۆڵمانی و قسەکردن و زۆرگوتن دەبێت و بۆ تاوێک

بێدەنگ نابیت، ئەویش وتەی بێکەڵک و نەگونجاو و بێواتە، کۆمەڵێکیش کە پێشتر باسمان کرد، قسەکانت بە ناسک و بێوێنە پەسن دەدەن".

"ئەی کەیگوشتاسپ! تۆ ئیمڕۆ ڕاوێژکاری وەک جامئەسپ و فرەشەوشترت هەیە و من دەزانم کە ئەم شالیارانەی تۆ، هەر کاتێک هەڵە و نادروستییەک لە تۆ ببینن، بیرت دەخەنەوە و تۆش پێشنیازی ئەوان دەپەژرێنیت، بەڵام بەیانی کە دەردی خۆپەرستی، تۆ و دەروونتی داگرت، ئیدی خۆت بە پێگەیشتوو و تەواو و ڕەسیدە دەزانی. گومانت کە بێکەم و کووڕی و هیچ ناتەواوییەک لە تۆدا نییە و ئەگەر کەسێکیش ئازا و سەرێکی نەترسی هەبێت و ئاماژە بۆ ناڕەساییەکان و کەم و کووڕیەکانت بکات، یان ڕک و تووڕەیی شاڵاوت بۆ دەبات و یان سەهۆڵی پەژاری و ساردی داتەگرێت".

"ئەی کەیگوشتاسپ! ئیمڕۆ تۆ بەڵێن و پرس* دەدەی و بەڵێن و ڕەفتاری تۆ ڕێک و پێک و بەهەنجار و وردبینانەیە و لەتەک ڕامانیشدا گونجاوە، بەڵام کە بەیانی خۆباییبووی و خۆویستی ڕەگ و خوێن و هەموو لەشتی داگرت، ئیدی ڕەوانت لە ژیری و وردبینی و ڕەوشتت لە هەنجار دەترازێت. تۆ هەر شتێک کە پەیوەندیی بە خۆتەوە هەبێت مەزن دەبینی و ئەمە بەشێکی دیکەی دەردەکەیە کە تەشەنە دەکات و دەتەنێتەوە. خۆ بەزلزانین و زۆرگوتن، خوو و ڕەوشتی دووهەمی تۆ دەبێت و ئەم جۆرە هەڵسووکەوتانە جڤاک دەڕەنجێنێت و بڕیار و بەڵێنی زل و بێناوەرۆک، زیانی مەزنی بە دواوەوە دەبێت. بەڵام تۆ نە ڕەنجاندن و نە زیانەکانی گوتە و کردارت دەبینی. ئەو چتەی کە بۆ تۆ بەڕێز و گرانمایەیە، تەنها منی خۆتە کە وەک هەڵۆ بەرز دەفڕی و دەشفڕیت، بەڵام لە ئاسمانی خەیاڵ و گوماندا".

"ئەی کەیگوشتاسپ! ئیمڕۆ تۆ لە ناو ئێمەدایت و گوێت لەم قسانەیە، بەڵام بەیانی کە دەردی شێرپەنجەی* خۆویستی دڵتی گوشی، ئیدی تۆ لەناو ئێمەدا نیت. تەنیا دەمێنیتەوە و ڕەوانی پەنەمیاوت کەس نابینێت کە شایانی دانیشتن و

لەتەکیدا ئاخافتن بکەیت. تۆ کەسانی دی بە نەیاری خۆت دەزانی و هەراسی ئەوە کە نەوەک ڕخنەیەکت لێ بگرن و بتی دەستسازی خۆت بروشێنن. تۆ لەو زیندانە زێڕینە کە بۆ خۆت چێت کردووە، بەند دەبیت. لەو کاتەدا، داخوازی و پێویستی سەرەکی تۆ ئەوەیە کە کەسێک، گرینگ نییە کێ بێت، دەرگای زێڕینی بەندیخانەکەت بکاتەوە و گوڵواژەی ڕەنگاوڕەنگ بۆ ستایشتی تۆ بڵێت و ئەو بڕوات و کەسێکی دی بێت. لەو کاتەدا کاری هەرە مەزنی تۆ هەمیشە ئەوە دەبێت، کە پەردەی وەنەدی و پەنجێرەکان لا بدەیت و دەروازەی کۆشکت ئاواڵە بکەیت، بەو هیوا و مەبەستە کە گەل بتبینێت تا لە دیتنی تۆ شادمان ببن و هەستێنە سەر پێ و هەرا و فریادی خۆشی و چەپڵەت بۆ لێ بدەن".

"ئەی کەیگوشتاسپ! تۆ پاتشای وڵاتی چیای بەرز و کوێستان و دەشتە پان و بەرینەکانی هەوشاریی، لەم وڵاتە مەزنەدا هەموو کەس تۆ دەناسن و هەموو ڕێزت لێ دەنێن. تۆ لەتەک جڤاکدا پەیوەندیەکی نزیکت هەیە و لەتەک هەمواندا مێهرەبانی و مەردومیش لەتەک تۆدا مێهرەبانن و بە چاوێکی پڕ لە خۆشەویستی تواشات دەکەن. بەڵام بەیانی کە نەخۆشی خۆویستی و خۆبەزلزانی هاتە جەستەت و بووی بە بت، سەرەتا خۆت و لە دوایدا کەسانی دیکە هەڵدەستن بۆ پەرستنی ئەم بتە. خەڵک لە دەوری تۆ پەرەوازە دەبێت و تۆ بە هەڵسوکەوتت بڵاوە بە کۆمەڵ دێنی، تەنیا تاقمێک لە دەورت دەمێنێتەوە، ئەویش چڵکاوخوران و خراپەکاران و ساختەچییان و درۆزنانن. ئەم تاقمەش وەکو تۆ دەردەدارن و ئەوانیش بەرەو خۆپەسەنی دەکێشێنێت، بەڵام چون لە بەرانبەر بە خۆیاندا بتێکی جوانتر و گەورەتر و بەشکۆتر و بەتواناتر دەبینن کە پەیکەری خواستی ئاواتی ئەوانە. لە جێگای ئەوە لە ناو خۆیاندا بتی خواستی خۆیان دروست بکەن و بۆ ستایشت و پەرستنی هەستن، ڕێگایەکی ئاسانتر دەبیننەوە، ئەویش ڕووکردن لە بتێکی مەزنتر و قەشەنگتر، گوشتاسپی فووتێکراوی هەڵماسیاوی پڕشکۆ و بەتوانایان".

"تۆ دەبیتە بتی ئەم دەستە و ئەوانیش بە دڵ و گیان ستایش و پەرستشت دەکەن و لە ڕێگای تۆدا ئامادەی هەموو جۆرێ کارێک دەبن. تۆ لە بەرامبەردا سوپاهێک لە خەڵکانی ڕەوان پەرێشان و نەخۆش و لاواز و سووک دەبینی کە لە دەروونیاندا بتی مەزنی گوشتائەسپ جێگیر بووە. ئەم کەسانە ئیتر لە جێگای ئەوە کە لە خۆیان بتێک دروست بکەن و بیپەرستن، تۆیان وەک بت لە ناو دڵ جێگا داوە و دەیپەرستن، تا بەم کارە دەرد و ڕەنج و ئازاری نەخۆشینی شێرپەنجەی دەروونیان دابمرکێت. ئەمانە بە دۆزینەوەی تۆ و پەرستنی تۆ ئیدی رامان و ئەندێشە و هەست و نەستی خۆیان لە دەست دەدەن و دەبنە گورگانێکی دڕندە، کە ئامادەی ئەنجامدانی هەموو کارێکی نامرۆڤانە بەو پەڕی کەیفخۆشی و شانازی. ئیمڕۆ لە لای تۆ زانایان کۆ بوونەتەوە و لە زانست و ئاوەدانی و داد و سامان و بوون و جوانی دەبێژن، لە هزر و ئەندێشە و دانش و بیر و بۆچوونیان یارمەتی وەردەگری. بەڵام بەیانی چ کەسانێک لە گردت کۆ دەبنەوە؟ گورگانی دڕندە و کەسانێک کە خوو و کردار و ڕەفتاریان بەس ئاژاوە و خراپی و چەواشەیی و ماڵوێرانی ڕەشوڕووتان و نەداران دەبێت، کە دێن و بە ئازایەوە بۆتی دەگێڕنەوە و پاشان فەرمانێکی دێوانەواری دیکەت لێ وەربگرن"؟

"ئەی کەیگوشتاسپ! ئیمڕۆ تۆ زانایانە دەپەیڤی و لەتەک ئێمە و هەمووی جڤاک هەڵسووکەوت و کرداری چاکت هەیە، بەڵام کاتێک گورگانی دڕندە دەورەی تۆیاندا و پەیوەندی تۆ لەتەک جیهانی دەرەڤەی ئەم کۆشکە بەس بە بیستنی لوورە و مرخەی گورگان بێت، ئینجا ڕەفتار و ئاکاری باش و هۆشمەندانە لە تۆ دەرباز دەبێت و ڕک و تووڕەیی و شێتی فەرمانڕەوای زاڵی ڕەوان و گیانت دەبێت".

"ئەی کەیگوشتاسپ! پەندێکی دیکەم هەیە کە لە هەموو ئەو شتانەی کە باسم کرد گەورەترە، ئەویش ئەمەیە کە تۆ ئیمڕۆ پاتشا و فەرمانڕەوایت و پەیوەندی تۆ لەتەک مەردومدا، پەیوەندیەکی وڵاتداری و بەڕێوبەری و فەرمانڕەوایانەیە، بۆیە لەم ئاستەدا تۆ دەبێت هەزاران جار لە بیری کرداری پاک و خێرەتمەندی و

هەڵسەنگانی دروست و ڕەوشتی زانستمەندانە بیت. ئەگەر سەرۆکێک یەکجار هەڵە بکات و بەرەو ڕێگای شاش بڕوات، ژێردەستانی هەزاران جار تووشی هەڵە دەبن و بە شاشی ڕێگا دەپێون. ئەگەر پاتشا تووشی تاوان و گوناهێک بێت، فەرمانبەرانی هەزار جار تووشی تاوان دەبن. تۆ ئیمڕۆ دینی بەهدینانت پەژراند، دینێک کە لە سەر ستوونەکانی رامانی پاک و گوفتاری پاک و کرداری پاک دامزراوە. وریا و هێژا بە کە ئەگەر تۆ لەمەولا تووشی هەڵە و هەڵخلیسکانێک ببیت، ستوونەکانی ئایینی بەهدینی سست و لاواز دەکەی و هەموو ئەو کەسانە کە ڕوویان کردوەتە ئەم دینە، دەیانخەیتە ناو ڕێگای چەوت و ناڕاست و ئەمە دەبێتە هۆی سستی و لەرزۆکی ئەم ئایینە ساوایە".

"کەوایە ئەی کەیگوشتاسپ! بە جوانی گوێم بۆ بگرە. فەرمان بدە کە ئاسنگەران دەفرێک* بۆ ئەو دەنکە گەنمە چی بکەن و تۆ هەموو بەیانییەک پێش هەڵاتنی ڕۆژ، دەست و دەم چاوت بشۆرە و ڕوو بکە تیرۆژی خۆر و نوێژی ڕاستی بخوێنە، پاشان سەری دەفرەکە لا بدە و لەتەک گەنمەکە و لەتەک ئەهۆرا مەزدای پاک، بەدیهێنەری تۆ و گەنم و زەوی و ئاسمان، ڕاز و نیاز بکە و هەموو ڕۆژ پشتوێن گرێ بدە و پەیمان تازە بکەرەوە کە وەک گەنمت لێ بێت و لە تاریکی و بێدەنگی بیتە دەرەوە و بەدیهێنەر و بەهرەدار بیت. منەکەت ڕەها بکە و لە خۆت بیتە دەرەوە، تا بتوانیت سەرچاوەی ئافراندنی دانەی تر بیت. لەتەک ئاو و هەوا و خاک و ڕۆژدا پەیوەندی ڕاستەوخۆت هەبێت تا بتوانیت گیانی تازە بگریت و لە خامۆشی و تاریکی بێتە دەرەوە و پا بنیتە ناو پێواژۆی زایەند و ڕەسین و گەیین. لە یادت بێت گەنم تا لە هەمباردا بوو خامۆش و خەوتوو بوو، کاتێک کەوتە ژێر خاک و کاریگەری هەوا و ئاو و ڕۆژ و دەستە پەروەردەکەرەکانی جووتیاری پێ گەیشت، گیانی گرت و و بێدار بووەوە. بەم بێداریە بوو کە گەنم لە شێوەیەک کە بووی بە چەشنێکی دیکەی لێ دەرهات و گۆڕا و ئەو هەموو کار و کاردانەوانە وەک چەکەرەکردن، شینبوون، باڵاکردن، گوڵدان، گەیین و زانینی

بە سەردا هات. تۆش ئەی کەیگوشتاسپ دەبێت وەک ئەو گەنمە بێدار بیت، بێدار".

"ئەی کەی گوشتاسپ! من زەردەشت بۆ ئەمە نەهاتم کە هزر و رامان و ئۆلی خۆم بە سەرتدا داسەپێنم، من بۆ کارێکی فرە مەزن هاتم. هاتگم کە وەک ئەو دەنکە گەنمە بەخەبەرت بێنم. کەوایە ئەی کەیگوشتاسپ وەک ئەو دەنکە گەنمە بێدار بە. لەم سروودانەم بە وردی گوێ بگرە و بیری لێ کەرەوە، ڕێگام بۆت دیاری و ئاشکرا کردووە":

کەی گوشتاسپ،
لە بەر تریفەی هێزی ئەنجومەنی مۆغان و
ئەو سرووده پیرۆزانە،
کە لە رامانی پاک گرساوە و
بە پەیرەویکردن لە ڕاستی،
بە پاداشتی زانستی دەروونی گەیشت.
بە پێی ئەو زانستەیە،
کە مەزدا ئەهۆرا
ڕێنوێنیی بەختیاریمان دەکات.
گاتا، هاتی 51، سروودی 16

ئەوەی کە دەبێتە هۆی
خۆشی و شادومانیی مەزدا،
کە بە رامان و گوفتار و کرداری پاک،
ستایشتی مەزدا بکەن و
لە ناساندنی ئەو تێ بکۆشن.

هەروەها کە کەیگوشتاسپ بە لایەنگری لە زەردەشت و
فرەشەوشتر بە رامانی،
ڕێگای ڕاست و ئایینێکیان هەڵبژاردووە،
کە ئەهۆرا بۆ سوشیانسی ئاشکرا کردوە.
گاتا، هاتی 53، سروودی 2

"ئەی کەیگوشتاسپ! ئەو شتەی کە من سەبارەت بە زانستی دەروونی گوتم، هەمان زانستێکە کە تۆ لە ناوەوە بێدار دەکات. هەر وەک هەمان هێز کە دەنکی گەنم لە دەروونەوە لە خەو و خامۆشی بە ئاگا دێنێت. ئەمەش بزانە کە هەمان جۆر کە گوتم، تەنها زانستێک کە ئێمە بەرەو ڕزگاری و بەختیاری دەگەیەنێت، زانستی دەروونییە. بەئاگاهاتنی ویژدان، بەئاگاهاتنی هێزەکانی بێهاوتا و توانامەندی مەغز* و بەئاگاهاتنی وزەکانی هەمیشەیی و نەمری ڕەوانە. هەر وەهاش گوتومە کە کەیگوشتاسپ ڕێگای ڕاست و ئایینێکی هەڵبژاردووە کە ئەهۆرا بۆ سوشیانسی* ئاشکرا کردووە و تۆ دەزانی کە لە دین و رامان و باوەڕی من، سوشیانس مانای گۆڕانکارییە. سوشیانس بە واتەی هێزێک کە جیهان و کۆمەڵان لە نووستن و وەنەوزدان بەئاگا دێنێت و دەیانکێشێنێت بۆ جیهانێکی نوێ. دانش و ڕێگەی سوشیانسیش هەروەک ئەو هێزە دەروونی گەنمەیە کە ئاگاهێنەر و بزوێنەر و گەشەسێنەر و نوێکەرە".

"ئەی کەیگوشتاسپ! گوتاری خۆم کۆتایی پێ دێنم، ئەو شتەی کە پێویست بوو بیڵێم،گوتم و ئێستا ئەمە تۆیت کە بڕیار دەدەی و ڕێگات هەڵدەبژێریت. کار و کاردانەوەی تۆیە کە دەرئەنجام نیشانی دەدات تا چ ئەندازە لە دینی بەهدینی قاڵ بوویت و هەنگاوی بۆ دەنێیت. درووود و ڕێزی بێ پایان بۆ خۆت و هاوڕێیانت. هیوای سەرکەوتن و سەرفەرازیت بۆ دەخوازم و ئۆمێدم وایە کە لە

ڕێگای ڕزگاری و ئازادی و داد و خۆشبەختی خۆت و گەلاندا پێشڕەو و پێشاهەنگ بیت".

# دینی ژیان و شادومانی



"چ دەڵەی فرەشەوشتر؟ لەو ڕۆژەوە کە گوتەکانی زەردەشتم لە تەلاری کۆشک بیستووە، ئارام و ئۆقرەم لێ براوە. بەردەوام وتەکانی زەردەشت دێتە یادم و هەر لە گوێچکەمدا دەنگ دەداتەوە. ئەو نیگا قووڵانە و ئەو گوتارە شیوا و دڵنشینانە تا بە ئیمڕۆ لە کەسم نەبیستووە. بە ڕاستی شیرۆڤەی زەردەشت لەمەڕ فەرموودەکانی خۆی چەندێک پەسەن و بە جێگا بوو، بە تایبەت کە ڕاستەوخۆ لەتەکماندا دەئاخفێت".

ئەی جامئەسپ هیۆگە..!

ئەی زانا..!

ئێستا بە هۆنراوە فێرت دەکەم،
تا بە دڵ وەری گری و پەرستیاری بیت،
کار و کۆشش لە سستی و تەوەزنی بڵندپایەترە،
هەر کەس دانا لە نادان
جویێ بکاتەوە،
مەزدا ئەهۆرا،
لە بەر پرشنگی ڕاستیدا،
بە توانای خۆی ئاگاداری دەبێت.
گاتا، هاتی 46، سروودی 17

ئەی فرەشەوشتر هیۆگۆە..!
لەتەک یارانی بڕوامەندی خۆت،
کە ئێمە هەر دوو بۆیان،
ڕووناکی و بەختیاریی هەمیشەییان ئاواتەخوازین،
بەرەو ئەو جێگایە بڕۆ،
کە تێیدا ڕاستی لەتەک خۆبەختکاری پێکەوە پەیوەستن،
لەوێ، رامانی پاک و توانامەندی،
فەرمانڕەوایی دەکەن و
شکۆمەندیی مەزدا ئەهۆرا ئاشکرایە.
گاتا، هاتی 46، سروودی 16

فرەشەوشتر هیۆگۆە،
گەوهەری بە شکۆی بوونی خۆی،
بە دڵێکی پاک و بۆ ئایینی بەهدینی

سپاردیە دەستی من،
هیوادارم کە مەزدا ئەهۆراش
ئاواتی ئەو
کە گەیشتن بە ڕاستییە،
بە جێ بهێنێت.
گاتا، هاتی 51، سروودی 17

"ئەم ڕاڤەکردنە تەنیا کەسێک دەتوانێت بیکات کە خاوەنی رامانێکی ورد و قووڵ و نەرین و دیتنێکی دروستی هەبێت. کەسێک خاوەنی ئەم گوتانەیە، کە دانا بێت، وێژەر بێت، وێژەوان و وێژەناس بێت و هەروەها دارای دڵێکی پاک بێت. هەرگیز لە دڵێکی ڕەش و تاریک، گوتەی ئاوا ڕۆشن ناوەشێتەوە. من گوتەکانی زەردەشتم هەمیشە لە یادە و هەڵیان دەسەنگێنم و بە وردی لێیان دەکۆڵمەوە تا بنج و بناوان و مەبەستی قسەکانی تێبگەم".

"ئەی جامئەسپی دانا! قسەی دڵی منت کرد. منیش وەک تۆ بۆ گوتەکانی زەردەشت دەچم. گوتەکانی زەردەشت دوڕ و گەوهەر و مروارییە کە لە قالکی* رامان دەرهاتووە، قالکی دیتن و تێڕوانن و لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن و هەڵبژاردن. منیش وەکوو تۆ لەو ڕۆژەوە کە فەرموودەکانی زەردەشتم بیستووە، ئیتر لە چەشنی پێشووی خۆم دەرهاتووم و هیچ بیرێکم نییە، هەر فەرموودەکانی زەردەشت دێنمە یادم و بە وردی بیری لێ دەکەمەوە. ئێستاش ئەو چتەی کە مێشکی منی بە خۆی خەریک کردووە، ئەو ڕستەی زەردەشتە کە ڕاستەوخۆ بە شاگوشتاسپی فەرموو. مەبەستم ئەوە کە «لە "من" بێ دەرەوە، "من" فەرامۆش بکە، "من" ڕەها بکە». من واتەی دروستی ئەم قسانە نازانم و لە مەبەست و ناوەڕۆکی «لە خۆ دەرهاتن»ی زەردەشت تێ ناگەم. بڵێی چ مەبەستێکی

هەبێت؟ من وا بە باشی دەزانم کە بچین بۆ لای زەردەشت و خۆی ڕاستەوخۆ ئەم بابەتەمان بۆ شی بکاتەوە".

"ئەی زەردەشتی هێژا! ئەی دانای مەزن! لەو ڕۆژەوە کە ئەو فەرموودانەو لە تەلاردا فەرمووی، ئێمە ئارامان لێ براوە. لە بیری ئەو گوتانەین. هەوڵمان دا واژە بە واژە و بەند بە بەندی ئەو گوتارە پڕبەها و بەنرخ و پڕواتانە شی بکەینەوە و مانا و مەبەستی هەر کامیان تێ بگەین، بەڵام گرینگترین بەشێک کە هۆش و بیری ئێمەی بە خۆیەوە خەریک کردووە، ئەو بەشەی «لەخۆ دەرهاتن، لە من ڕەهابوون»یە کە چەندین جار دوبارەت کردەوە و زۆریش لە سەری سوور بوویت".

"وردبینی و چڕبوونەوەی ئێوە لە سەر ئەم گوتانە فرە باشە، چون زەندی* ئەم بابەتە زۆرە و دوور نییە کە شیرۆڤەیەکی سەهوو، ئەنجامێکی هەڵە بە بار بێنێت. بۆیە سەرەتا پێم خۆشە کە بزانم نەرینی خۆت لەمەڕ ئەم دێڕە چۆنە"؟

"ئەی زەردەشتی هێژا! پێشەکی دەمەوێت بیرەوەرییەکت بۆ بگێڕمەوە تا لە یادم نەچووە، کە پێم وابێت پەیوەندی هەیە بەم بابەتەی ئێمەوە. سەردەمێک بوو کە بە دوای ناسین و دۆزینەوەی ڕێگای ڕاستی ڕزگاری بووم. ڕۆژێک گوزەرم کەوتە زۆزانێک، لە بەر دەم زیڤینگ*ێکدا کۆمەڵە خەڵکێکم بینی کە پیس و چڵکن و بەرگی شڕ و دەستیان لە خۆ شۆرا بوو. کاتێک لە بارەیانەوە پرسیارم کرد، زانیم کە ئەوانە نە کارێکی دروست و ڕێکوپێکیان هەیە و نە خانوو و سامان و منداڵێک. هەمیشە سەرگەردانن و لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دی کۆچبەرن و لە ڕێگای سواڵەوە نیاز و پێویستی ژیانیان بە چەشنێکی سووک دابین دەکەن. بە هیچ جۆرێک ڕێزیان بۆ خۆیان نەبوو و هەوڵ و کۆششیان ئەوە بوو کە خۆیان ورد و تێک بشکێنن، ئەوان بەم جۆرە دڵخۆش و خۆشنوت بوون. لە شوێنی نزم دادەنیشتن و برێکیان لەشیان بە پیسایی دەئالاند و بەرگی پیسیان لە بەر

دانەکەند. خۆراکی کەم و شپەرزە و پۆخڵیان دەخوارد، هیچ بایەخێکیان بە ڕازاندن و جوانی و خاوێنی و ئاراێشت نەدەدا و گوتەکانیان ساویلکانە بوو".

"من خۆمم لێیان نزیک خستەوە و وتووێژێکی فراوانم لەتەکیاندا کرد، تێگەیشتم کە ئەوانە بە بڕوای خۆیان لێکۆڵینەرانی ڕێگای ڕەهایی و ڕزگاری و ئازادین. ڕزگاری و بەختیاریان لەوە دەدی و دەزانی، کە جیهان و هەرچی کە لە ناویدا و هەروەها ژیان بە هەموو شێوەکانی کە پەیوەند بەوە، هەمووی بە پڕوپووچ و بێ ئەرزش بزانن و لە سەر ئەم بنچینەیە ژیانیان دەبردە سەر و ئەمە رامان و نەریتیان بوو. ئەمانە دەیانگوت مرۆڤ دەبێت منی خۆی ڕەها بکات، ڕەها لە هەموو بەند و پاوەنێک. چۆنکە ئەوان هەر بەندێکی ئەم جیهانەیان بە مایەی چارەڕەشی و بەدبەختی دەزانی. من لە زاری ئەمانە وشەی ڕەهاکردن و ئازادکردنی دەروونم دەبیست. ئەو ڕۆژە کە واژەی ڕەهابوونم لە زاری تۆ بیست، خێرا کەوتمە بیری ئەو خەڵکە، بەڵام هەر زوو تێگەیشتم و زانیم کە لە نێوانی ڕەهابوونێک کە تۆ دێژی و ئەو ڕەهابوونە کە ئەوان مەبەستیان بوو تەوفیرێکی فرە هەیە. ڕەهابوونی تۆ دەستپێکی ژیان و ئاوەدانییە و ئەو ڕەهابوونەی ئەوان چاوکانی وێرانی و نابووتییە".

زەردەشت قسەکانی فرەشەوشتری پەسەن کرد و پاشان فەرمووی: "چەندە باش و بە جێگایە ئەم بابەتە هێنایە گۆڕێ، دوور نییە زۆر کەس بە جۆرێکی تر لەم مژارە تێگەیشتبێتن و لەتەک ئەو شتەی کە من مەبەستمە جیاوازیەکی فرەی هەیە و نابێت بە هەڵە شیرۆڤە بکرێت".

زەردەشت ئەمەی فەرموو و گەنمێکی تێکچوو و ڕەش هەڵگەڕاتووی لە بەردەم فرەشەوشتر و جامئەسپ داننا و پرسیاری کرد: "لە بارەی ئەم گەنمە چلۆن بیر دەکەنەوە"؟

جامئەسپ گوتی: "ئەو شتەی کە ڕوون و خۆیایە، ئەم دەنکە گەنمە تێکچووە و هۆی تێکچوونیشی مرۆڤ دەتوانێت ئاماژە بۆ زۆر شت بکات. بەڵام تایبەتمەندی گەنمی خراپ و تێکچوو ئەوەیە کە ناخورێت و ناڕوێت".

زەرەشت فەرمووی: "ڕاستت.

گوت جامئەسپ. بۆ ئەوەی گەنمێک بڕوێت، گەرەکە گەنمەکە ساخ و دروست بێت و لە هەر چەشنێک نەخۆشی و زیانێک بە دوور بێت و ڕەسیدە و گەییوو بێت. جا مرۆڤیش هەروەک دەنکی گەنم وایە. مەرجەکانی مەزنی ڕواندن و پشکووتن و گەیین و بەهەرەمەندی مرۆڤیش، دروست بوونی لەش و ڕەوانیەتی. هەرگیز ڕەوانێکی نەخۆش و وردکراو، توانای ڕوواندن و باڵاکردن و گەشەسەندن و بەدیهێنەری نییە. ڕەوانێکی ئاوا وەک گەنمێکی تێکچووە، کە زیان هێزی ڕواندن و بەهرەدانی ئەوی لەناو بردووە. دەزانین هۆی ساخی و دروستیی ڕەوانی مرۆڤ، کە دەیگەیەنێتە قۆناخی گەیین و ڕەسایی و داهێنەری و نەمری بە واتەی گوڵدان و زایین چییە؟ **«ڕاستی»**یە. بەو واتەیە هەنجاری ڕەوان لەتەک هەنجاری هەستی یەک دەگرن و سازبوون و ڕێکبوون و یەکگرتن لە نێوان رامان و گوفتار و کردار بەدی دێت. یەکگرتن و ڕێکبوونی رامان و گوفتار و کردار لە خێرەت و لە ڕووناکی دڵ و پاکی و خۆپارێزییە. هەر وەک ئەو جۆرە کە من لە سروودەکانم گوتوومە":

مەزدا ئەهۆرا،<br>
بە شکۆمەندی و مێهری خۆی،<br>
پێگەیشتن و جاویدانبوون<br>
بە کەسێک دەبەخشێت،<br>
کە کردار و گوفتاری،<br>
لە بەر تریفەی رامانی پاک و

باشترین ڕەوشتدا و
لە سەر پایەی ڕاستی بێت.
گاتا، هاتی 47، سروودی 1

ئەی مەزدا..!
دوو خەڵاتی پێگەیشتن و جاویدانبوونی تۆ،
مرۆڤ بەرەو ڕووناکی ڕێنوێنی دەکات.
هەروەهاش ڕامانی پاک و ڕاستی و جوانمەردی،
بەرخۆدان و توانامەندیی مینوویی پترتر دەکەن.
هەمووی ئەمانەیە،
سەرکەوتن بە سەر نەیاراندا،
مسۆگەر دەکات.
گاتا، هاتی 34، سروودی 11

مەزدا ئەهۆرا،
بە زانست و سرووشی خۆی
خەڵاتی پێگەیشتن و جاویدانبوون،
ڕاستی و توانامەندیی مینوویی و
یارمەتیی ڕامانی پاک
بە کەسێک دەبەخشێت،
کە لە ڕامان و کرداریدا
هاوڕێ و ئەڤینداری بێت.
گاتا، هاتی 31، سروودی 21

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئارمانج و ئەرکەکانم پێ بناسێنە،
تا لە بەر پرشنگی رامانی پاکدا،
ئەنجامیان بدەم.
ئەی مەزدا..!
هەڵبەستی ستایشتم
کە لە دڵێکی ڕاستەوە سەرچاوە دەگرێت، بپەژرێنە،
خەڵاتی هەمیشەیی،
گەشەکردن و جاویدانبوونم
پێ ببەخشە.
گاتا، هاتی 33، سروودی 8

ئەی مەزدا..!
دوو گەوهەری پترکەری مەزنیی و ڕاستی:
گەشەکردن و جاویدانبوون،
کە لە تۆوەوەیە،
بە زانست و دڵێکی ڕووناک بە دەست دێت.
هیوادارین
لە بەر تریفەی باشترین هزرەکاندا،
لە بەخششی ئاسمانیی
ئەم دوو مینووی هاوکردار و یەکسانە،
کامەران ببین.
گاتا، هاتی 33، سروودی 9

پاشان زەردەشت ڕووی کردە جامئەسپ و فەرمووی: "لەم سروودانە کە خوێندمەوە چیت وەرگرت"؟

جامئەسپ گوتی: "پێش لەوە لە سروودەکانت شتێک وەرگرم، دڵم هاتە جۆش و ژێکانی نادیاری دڵم کەوتە جمان. پێشەکی با ئەمە بێژم، نازانم لە سروودەکانی تۆ چ شتێکی شاراوە هەیە کە بە تایبەت ئەو کاتەی کە خۆت بەو دەنگە خۆشە و تەموورە بەجۆشەت دەیخوێنیتەوە، یەکێک لە ژێکانی دڵم، کە دەڵێی تایبەت بە سروودەکانی تۆیە، دەکەوێتە لەرین. ئەو ژێیە نادیار و شاراوەیە کە هیچ شتێک ناتوانێت بیلەرێنەتەوە، مەگەر هۆرەکانی تۆ. کاتێک کە تەموورە و هۆرەکانی تۆ دەبیسم، بێ ڕاوەستان دەچمە جیهانێکی ترەوە، جیهانی پڕسۆزی رامان، رامانێکی قوول لەمەڕ بنچینەی گەردوون، ئەو هەست و سۆزانەی کە گەرم و خەمڕەوێنە و دیاردەکانی جوانی بوون ئاشکرا دەکات. بە بیستنی هۆرەکانی تۆ، دەشتێکی شینی پڕ لە گەنم و گوڵاڵەسوورە لە بناری چیاکانی هەورامان و چریوەی مەلانی دەنگخۆش و ئاسمانێکی ساماڵ بە خۆرێکی پڕ تیشک دێتە پێش چاوم. بۆنی خۆشی چنوورە* و شەوبۆ و بەرزەنگڵ* و شنەی بای سەر چیا و پێدەشتەکان، بۆنی پونگەی تازەڕوواوی کەنار جۆگە و مێرگەکان، ئاوازی قاسپە قاسپی کەو، پەرەسێلکەکان کە لە ڕێگای دوورەوە هاتوون و دەنگ و هەرای بێنەو ببەی خەلەو خەرمان و کوتان و شەنکردن و خشەخشی گەڵای درەختەکان لە نیوەشەودا هاوڕێ لەتەک مەلی تاکتاککەرە، تیشکی مانگی تابان دەبینم لە شەوەکانی هێمنی هاوین و دەنگی قووقەی کەڵەشێر لە کاتی سپیدەی بەیاندا و دەنگی خوڕەخوڕی ئاوی تاڤگە و دەنگی شمشاڵی شوان و سەپان لە دوورەوە و ئاوازی گمەگمەی کۆترەکان لە کاتی جووتویستن و..".

زەردەشت گوتەکانی جامئەسپی بڕی و فەرمووی: "ئەی جامئەسپ دەزانم کە لە کانگای دڵەوە ئەم هەست و سۆزە دەردەبڕی، بەڵام تکایە، لە دڵەوە داوات لێ دەکەم کە هەرگیز ستایشتم نەکەی. کەوایە گوتەکەت کۆتایی پێ بێنە و بچۆرەوە

سەر بابەتی سەرەکی. باسی ئەو تاقمەمان دەکرد کە لەشیان نەدەشۆرد و ئاوارە و پەرێشان ژیانیان دەبردە سەر و باوەڕیان وا بوو کە ئەمە ڕەهاییە. دەیانگوت کە ئامانجی ئێمە ڕزگاری و پالاوتنی ڕەوانە و بەم مەبەستەیە کە دەخوازین هەموو بەند پاوەنەکانی ژیانی ئەنبووژەنی و ئەم جیهان و گەردوونە بپچڕێنین، تا ڕەوانی ئێمە ئامادەگیی ڕۆیشتن بۆ جیهانی مینوویی و ئاسمانی و خۆشیەکانی ئەو جیهانەی دی پەیدا بکات".

زەردەشت بە دووپاتە کردنەوەی ئەم بابەتانە، چوە ناو بیرێکی قووڵ، دوای تاوێک سەری بەرز کردەوە و فەرمووی: "ئاخ! ئاخ لەم بیر و باوەرانە، ئاخ لەم ڕەفتارە چەوت و وێرانگەرانە کە ڕیشەی هەموو باشییەکان لە ڕەوانی مرۆڤ وشک و بێبەر دەکات و ئامادەیان دەکات بۆ هەر جۆرێک ناپاکی و خراپەکاری و کاڤلکارییەیک".

زەردەشت پاشان ڕووی کردە شاگردان و فەرمووی: "ئەو شتەی کە دەبێژم بە زەریفی گوێی لێ بگرن و بە یادتان بیسپێرن و بە کاری بهێنن، سەرەتا هەوڵ بدەن لەم سروودانە بە باشی تێ بگەن":

ئەی مەزدا..!
لە ڕاستیدا، تۆ ئافەریدەگاری ڕامانی پاکی،
ئەو کاتەی کە کۆمەڵان لەتەک ڕامانی پاکدا،
پرس و ڕایان دەکرد،
تۆ بۆ ئەوان،
ئەم زەوی و جیهانە شادیهێنەرەت ئافراند و
بۆ ئاوەدانی و ڕابەریشی،
خۆبەختکاریت کردە دیاری.
گاتا، هاتی 47، سروودی 3

هیوادارین کە پاتشایانی چاک،
بە کرداری باش و بە زانست و جوانمەردی،
فەرمانڕەوایی ئیمە بکەن،
نەک پاتشایانی خراپ.
پاکی بۆ کۆمەڵ،
لە چاخی لە دایکبووندا بەهرەیە.
بۆ ئاوەدانیی جیهان دەبێت تێ بکۆشرێت،
دەبێت جیهان بە دروستی سەرپەرشتی و پەروەردە بکرێت و
بەرەو ڕووناکی ببردرێت.
گاتا، هاتی 48، سروودی 5

ئەی ئەهۆرا مەزدای فرە بینا..!
بۆ بەهرەداربوون لە خۆشبەختی و شادمانی،
بەخششی بێهاوتات
کە لە شکۆداریی تۆ و ڕامانی پاکەوەیە،
بۆ منی ئاشکرا بکە.
ئەی پاکی..!
لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
ویژدان و ڕووناکیی دڵ
بە من ببەخشە.
گاتا، هاتی 33، سروودی 13

ئەی مەزدا..!

هەموو چاکی و خۆشیەکانی ژیان،
کە هەبوون و هەن و دەشبن،
هەروەها هەموو ئەوانە کە لە تۆدایە،
بە مێهرەبانی خۆت بە ئێمەی ببەخشە،
تا لە بەر تریفەی رامانی پاک و
توانامەندی مینوویی و ڕاستیدا،
تەندروستی و بەختیاریی ئێمە پترتر بێت.
گاتا، هاتی 33، سروودی 10

بە دروستی باشترین بەهرەکان
دەبێتە بەشی مرۆڤێک
کە لە ژیانی ئەنبووژەنی و مینوویی،
ڕێگای ڕاستی بەختیاریمان
پێ فێر بکات،
ئەو ڕێگایە کە ئێمە بەرەو بارەگای ئەهۆرایی دەگەیەنێت.
ئەی مەزدا..!
لە ئاکامدا
لە بەر تیشکی زانستی باش و پاکی و جوانمەردیدا،
دڵدارانت بە تۆ پەیوەند دەبن.
گاتا، هاتی 43، سروودی 3

ئەی مەزدا..!
بە هەمان چەشن کە مرۆڤی جوامێر و ئازا،
بە هاوڕێی خۆی شادمانی دەبەخشێت،

تۆش بە شکۆداریی خۆت و
لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
بە لایەنگیرانم شادومانی
خەڵات بکە.
من و هەموو ئەو کەسانەی
کە هۆنەری هۆرەی رامانجۆشێنەری تۆین،
ڕادەپەڕین و پاڵپشتی ڕاهێنانەکانی تۆ دەبین.
گاتا، هاتی 43، سروودی 14

کاتێک کە
زارۆک و نەوەکانی فەریانەی تۆرانی
ڕوو بکەنە ڕاستی و
بە خۆبەختکاریی،
بۆ پێشکەوتن و ئاوەدانیی جیهان تێ بکۆشن،
پاشان مەزدا ئەهۆرا،
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
ئەوان بە یەکەوە پەیوەند دەدات و
ڕزگاری و خۆشبەختییان،
بۆ ئاشکرا دەکات.
گاتا، هاتی 46، سروودی 12

ئەی مەزدا..!
ئەو کەسانەی کە بۆ جیهان
هێمنی و شادومانی دەخوازێت و

هەمیشەش خوازیاری ئاوەدان بوونەوەیەتی،
چلۆن ژیانی لە بەر تیشکی ڕاستی و
پڕشنگی درەخشاندا دەباتە سەر؟
چلۆن لە نێوانی ڕاستکاران و
سەرای هۆشیاراندا
جێگای دەبێتەوە؟
گاتا، هاتی 50، سروودی 2

ئەی مەزدا..!
کەسێک کە بێجگە لەم ئایینە،
لە ڕێگای وێرانکردنی جیهاندا تێ بکۆشێت،
لە خێڵی درۆ و
لەو کەسانەیە کە
چەوت بیر دەکەنەوە و گێلن.
هیوای ڕاستی
بۆ خۆم و یارانم دەخوازم،
تا بەرەو ڕووی ئێمە بێت و
بە پاداشتی چاکەمان بگەیەنێت.
گاتا، هاتی 51، سروودی 10



"بەڵێ دینی من، دینی شادی و گۆڤەند و خۆشی و ئاوەدانی و سازکەری و تەندروستی و کامەرانی و تەیاربوون و پێشکەوتن و داهێنانە، دوژمنی هەر جۆرە باوەڕ و نەرین و بۆچوونێکە کە ئامانجی چەواشەیی و کاولکردن بێت، کە مەخابن لایەنگیرانی ئەم بیر و باوەڕانەش زۆر و زەمەنن. لەم بیر و بۆچوونانە تەنیا تێکچوون، دواکەوتووی، شاشی، برچیەتی، بەلەنگازی، کەنەفتی دەوەشێتەوە. کاتێک کە مرۆڤ لەتەک ئەم کەسانە دەکەوێتە گفتوگۆ، باوەڕیان وایە کە گوایە ئەم جیهانە زیندانی ڕووناکییە و بەندیخانەی مرۆڤی چاکە. ئەم جیهانە سەرای ڕەنج و ناکامی و ناحەزی و ناشیرینی و خراپەییە. باوەڕیان وایە کاتێکیش مرۆڤ لەم دەرد و ڕەنج و ئازارانە ڕزگار دەبێت و دەکەوێتە خۆشی و ئاسوودەیی و نەمری، کە دیوارەکانی ئەم زیندانە بشکێنێت و بۆ جیهانێکی دیکە بڕوات. ئەمانە دەبێژن پێویستە لەم جیهانە هەر تشتێکی هاندەر و بزوێنەر بۆ ژیانێکی خۆش و شاد و جوان پێویستە بەری بدەین و بە پێچەوانەوە، ڕوو بکەینە هەر شتێک کە ئێمە دەخاتە ناو گێژاوی سیابەختی، داماوی، دەستەنگی، برسیەتی گەدایی و پەستی. لە رامانی ئەم کەسانە چاکی و خاسی لە ناو ئەم دیاردانەی ناحەز و

دڵئێشێنەر و ناشیرین دایە و هەروەهاش خراپی و ناشیرینیش لە ناو دیاردەکانی جوان و دڵبزوێنەر و شادیهێنەردایە".

"بە ڕاستی چ جیاوازی و تەوفیرێکی مەزن هەیە، چ ناڕێکی و ناسانییەکی خورت لە نێوانی ڕەهابوونێک کە من دەبێژم و ڕەهابوونێک کە ئەم خەڵکانە دەبێژن. ڕەهابوونی من، ڕەهاکردنی دانەی گەنم بۆ چەکەرەکردن و ڕووبین و گەشەسەندن و گوڵدان و دانەدان و ڕەسیینە، ڕەهابوونی ئەوان بۆ تێکچوون و ڕزان و ڕەشبوونی دانەی گەنمە. کەوایە بە ئێوە دەبێژم و بە دەنگێکی زۆڵاڵ و ڕاشکاو ڕایدەگەێنم کە لەتەک ئەم جۆرە باوەڕ و ئەندێشانە و ئەم ئامانجە خراپ و وێرانگەرانە بەربەرەکانێ بکەن و لایەنگیرانی ئەم ڕێبازە بە گوتن و ئامۆژگاری و ڕاهێنان، لە دۆزەخی تاریکی و نەزانی ڕزگاریان بکەن و بۆ ڕێگای دروستی ڕەهابوون، کە هەمانا چەکەرەکردن و سەوزبوون و گەیینە، بیانگەێنن. بەمانە ببێژن، بە ڕاستی ئارمانج و مەبەستی ئافراندن، بەم هەموو سەیر و سەرسوورهێنەرییەی کە هەیەتی هەموو سپیدەیەک ڕۆژ هەڵدێت و جیهان ڕووناک و گەرم دەکات، هەور باران دەبارێنێت و زەوی بەهرەدار دەکات و با هەڵدەکات و گەنم لە کا جودا دەکاتەوە و زۆزانی پڕ بەهرە و گشت ئەم جۆش و خرۆشە کە لە گیانلەبەران و جیهانە، هەمووی بۆ ئەوەیە کە تۆ ئەی مرۆڤ پشت لەم ژیانە بکەیت و دەستەوئەژنۆ بخزێیتە سووچێکی تاریک و ژیانێکی هەژاری و بێدەرەتانی و نزم هەڵبژێریت و لەوێشدا لە ناو بچیت؟ ئارمانج و داخوازی ئافراندن ئەوە بووە کە تۆ خۆت بە چەشنی کرمێکی ناو چڵکاو و قۆڕاو ببینی و وەک گڵەخۆرکەیەک ژیان ببەیتە سەر؟ ئامانج و مەبەستی ئافەرینش ئەوە بووە کە تۆ خۆت وەک مشکێکی کوێر بزانی و هەمیشە لە ژێر زەوی و لە جێگای تاریکدا بژی، یان وەک شەمشەمەکوێرە بە بنمیچی ئەشکەوتەکان لە ناو تاریکیدا خۆت هەڵواسی؟ مەبەستی ئافراندن ئەوە بووە کە تۆ دەست لە هەموو شت بشۆری و هەموو ژیانت بە هەژاری و خاکەسەری و کۆیلەتی و ڕووتووقوتی و غەم

و شینپۆشین و نەکەنین ببەیتە سەر؟ بە سەهوودا چوون، ڕابن، ڕابە ئەی هەژای بەلەنگاز. لە جێی ئەوە کە وەک گرەخۆڵکەیەک بخزیتە ژێر زەوی، هەستە ئاسنی سەخت و توند بە یارمەتی ئاگر و دەستەکانت سوور بکەرەوە و گاسنی لێ چێ بکە و زەویەکانتی پێ بکێڵە و گەنم و تۆی لێ بچێنە و دروێنەی بکە و بە خۆشیەوە بیهاڕە و بیکە بە هەویر و نان و کولێرەچەورەی لێ دروست بکە و بە شادمانی بیخۆ و خۆڕەم ببێژە و پێکەنە و هۆرە و هەیران بچڕە و سەرچۆپی بگرە و دیلان و گۆڤەند و چەپڵەرزان چێ بکە. لە کونی پیس و تاریکت بێرە دەرەوە و نەمامی درەختی بەردار بنێژە و پەروەردەی بکە و لە بەر و میوەکەی بخۆ و لێشی ببەخشە و لە ژێر سێبەری تێر و ئاسوودە ماندوویی دەر بکە. بەیانییان بە کەیفخۆشی لە خەو ڕابە و ئامرازی کارکردن بە دەستەوە بگرە و بە شادی کار بکە و بە شادیش پشووی خۆت بدە. ئەی مرۆڤی هەژار و بندەست، خۆت ڕزگار بکە لەو زیندانە کە بە دەستی خۆت چێت کردووە، خۆت لە ئەندێشە و باوەڕی ناڕاست و تاریک ڕەها بکە، خۆت لە تێکچوون و لەناوچوون ڕزگار بکە. ڕەهابوونێک کە من دەبێژم ڕەهابوونی دانەی گەنم لە ئەنباری تاریک بۆ سەوزبوون و ڕەسین و بەهرەدان و تێرکردن و شادومانکردنی خۆت و گەل و نیشتمانە، ئەمەیە شێوە و چۆنیەتی ڕەهابوون. ئەگەر بەم جۆرە بکەیت دەکەویتە ناو زنجیرەی ژیان و وەکوو هەر دیاردەیەکی زیندوو و گەشەسێنەری دیکە دەکەویتە ناو پێواژۆی ئافراندن و پێگەیشتن و ڕەسین، جا لێرەدایە کە مەرج و فەلسەفەی زیندووبوون و بوونی خۆت بە ئەنجام دەگەیەنی. هەستە خۆت ڕەها بکە".

# له ڕێگای ناسینی
# ئەهۆرا مەزدای دەلال



"له کوێوه دێن، دەبینم که زۆر شەکەت و ماندوون، جل و بەرگتان هەمووی شڕ و ئالۆزه، ئێره مەکۆی هەموو دەردەدار و سەرگەردان و ماندووانه، گوڵ به پاتانەوه خۆش هاتن".

"ئەی هەڤاڵ! سەربوری* ئێمه دوور و درێژه، ئێمه له ڕێگای زۆر دوورەوه هاتووین. له وڵاتی ستەم و بێدادی که مەکۆی گومڕێیان و ستەمگەرانه. به ئەڤینی هزر و رامانی زەردەشت بەرەو ئێره هاتین، هەموو گیانمان تامەزرۆی بیستنی هۆرەکانی زەردەشته، هاندەری سەرەکیی ئێمه بۆ هاتن بۆ سەر ئەم چیا سەرکەشانه، دیتنی هۆرمزگا* و مێهراوی زەردەشته. له دەمی ئەم و ئەو بیستوومانه که زەردەشت خودایەکی دیکه و ئایینێکی تازه و ڕەوشت و ڕێبازێکی نوێ بۆ ژیان و مرۆڤایەتی هەڵبژاردووه. هۆرموزگای زەردەشت جێگای تیشکی مەزدایه و جێگای ڕووناهی دڵه. خودای زەردەشت خودای مێهرەبانی و ئافراندنه، ئاگرەسوورەی تیشکهاوێژی شادیهێنەره و ژیانەکان بەدی دێنێت، بۆ ڕازاندنەوەشی گەوهەری هزر و خێرەت به کۆمەڵان دەبەخشێنێت و به تریفەی پڕ تیشکی رامان،

دەیخەملێنێت. ئێمە چەند کەس بووین، بڕیاری ئەوەماندا، کە بە هەر نرخێک بووە خۆمان بگەیەنینە هۆرمزگای زەردەشت. بۆ گەیشتن بەم چیا سەرکەشانە، کوێرەوەریەکی زۆرمان کێشا، تەنانەت تا ئاستی بەختکردنی گیانمان. لە ڕێگادا پێویست بوو لە زەریاچەیەک بپەڕینەوە. بۆ ئەم مەبەستە سواری بەلەمێکی گەورە بووین. چارۆکەکانی بەلەمەکەیان هەڵدا و خۆمان دا لە ئاوی خرۆشانی زەریا. هەر یەکەمان هیوایەکمان هەبوو، ئەویش گەیشتن بە سەرا و هورمزگای زەردەشت بوو. هەر کەس لە ئێمە خاوەنی بیر و ڕای خۆی، خودای جیاواز و دیاریکراوی خۆی بوو. هەر کەس خۆدای خۆی بە ڕاستتر و گەورەتر دەزانی و خودای ئەوی دی بە ناڕەوا و درۆ و لە دڵیدا دژی بوو".

"ئێمە بێدەنگ و لەسەرخۆ سەوڵمان* لێ دەدا و بەرەو پێش دەچووین، شنەی با دەستی پێ کرد  و هێزی با چارۆکەکانی خستە جووڵە و ئێمە دەستمان لە سەوڵەکان بەر دا. جووڵەی بەلەمەکە تا پێ دەچوو فرەتر دەبوو و دەریاکەش کەوتبووە شڵپ و کوت. شەپۆلەکان تا دەهات توندتر و سەنگینتر دەبوون. هەموومان ترسمان لێ نیشتبوو. لە ناکاو شەپۆلێکی زۆر گەورە خۆی کوتا بە سەر بەلەمەکە. چارۆکەکانی دڕاند و گوریس و پەتەکانی پساند. ترس و بێهیوایی هەمووومانی داگرتبوو. هەموو کەوتبووینە هاوار و ناڵە، ڕاسپێریمان بە یەکتر دەکرد کە ئەگەر من مردم تۆ چی بکەی. هەر یەک لە خودای خۆی دەپاڕایەوە و داوای یارمەتی و ڕزگاربوونی لێ دەکرد. هەموومان لە مردن نزیک ببووینەوە و هەموو کێشە و جیاوازیەکانمان فەرامۆش کردبوو.

لە نێو ئێمە یەکێکمان کە خوداکەی پەیکەرێک بوو و بە دەستی خۆی لە دار دروستی کردبوو، لە بەرانبەری خۆی دانابوو و کوڕنوشی بۆ دەبرد و بە چەشنێکی زۆر بەبەزیی و تکاکارانە دەگریا و دەلالآیەوە و داوای یارمەتی و فریاکەوتنی لێ دەکرد. یەکێکی دیکەمان کە خوداکەی زەروان بوو، خوای زەمەنی بێکەران، خودای بەش و بەهر* و چارنووس و بەخت و ناوچاوان، بە پاتشای

جیهان و گەردوون  دەزانی، بڕوای وا بوو کە هەموو شتێک لە سەر خواست و ویستی زەروان ئەنجام دەدرێت، هیچ شتێک ناگۆڕدرێت، مەگەر لە سەر ویستی زەروان نەبێت. بە بڕوای ئەو زەروانی نەمر و هەمیشەی ویستی لە هەموو شتێک بەرزتر و بە سەر هەموو شتێکدا زاڵ و دەسەڵاتدارترە. زەروان چارەنووسەکان دەنووسێت و یەکیشیان دەخات. زەروان بەدیهێنەری ژیان و بوونە. زەروان خۆشیسێنەر و دروێنەکەری ژیانی بوونەوەرەکانە. زەروان گاسنەکەی لە دوو کەڵی ڕەش و سپی بەستووە و بە سەر کێڵگەی ژیان دەیکێشێنێت و تۆی ژیانی پێدا دەپرژێنێت، بەڵام درەنگێکی پێ ناچێت لە بەرگی دروێنەکارێکی ڕدێنسپی بە تەمەن، بە داسێکی تیژ دێتە سەر ڕێگا و ڕیشەی ژیان لە چاوترووکاندنێکدا دەبڕێت. ئاوازی خۆشی گاسنەکەی لە کاتی جووتکردن و چاندنی تۆی ژیان و هاڕەی وشکی داسەکەی لە کاتی دروێنەکردنی ژیان، لە گوێی زەرواندا یەکێکە و هیچکام لەم دووانە هەستێک لە دڵی زەروان نابزوێنێت. کاتێک کە مرۆڤ شاد و دەم بە پێکەنینە و کاتێک کە دەردەدار و نەخۆش و گریانە، زەروان هەر دووکیان دەبینێت و دەبیسێت، بەڵام ناڵەکان و شادیەکان ناتوانێت ئەو دابچڵەکێنێت. کەس توانای ڕاوەستان و بەربەرەکانێی زەروانی نییە، گەرەکە ملکەجی خواست و فەرمانی ئەو بیت و چارەیەکیش نییە. جا ئەوەی کە خوداکەی زەروان بوو، هێمن و ئارام لە سووچێک دانیشتبوو و بە پێچەوانەی ئەوانی تر نەیدەناڵاند و هاوار و فوغانی نەدەکرد. باوەڕی وا بوو کە زەروان چارەنووسی ئەوی بەم شێوە نووسیوە کە لە شەوێکی وا تۆفانی تێدا بچێت، هەروا کە لە سەر ویستی زەروان لە شەوێکی ئاوادا بە خواستی زەروان لەدایک بوو و چاوی بەم جیهانە پشکووت، ئێستاش لە سەر هەمان خواست و ویست دیدەی لە جیهان دەبەستێت".

"یەکێکی ترمان بۆ هەر دیاردەیەکی ئەم جیهانە، پەیکەرێکی بۆ خودا لە چەشنی خوو و ڕەوشت و ژیانی مرۆڤ هەبوو. ئەو با و تۆفانی لە خواست و توانای

خودای تۆفان دەزانی و دەستی پاڕانەوەی بەرز کردبوو و لە خودای تۆفان تکای دەکرد کە لەم مەرگەساتە ڕزگاری بکات".

"یەکێکی دیکەمان بڕوای بە مێهر و ڕۆژ بوو. و بەو شەوە تاریکە کە نە هەتاو دیار بوو و نە هیچ، رووی کردبووە ڕۆژهەڵاتی زەریاکە و لە ڕۆژ دەپاڕایەوە کە لە تاوان و گوناهەکانی ببورێت و لەو تۆفانە ڕزگاری بکات و پەیمانی دەدا کە ئەگەر لەو گێژاوی مەرگە ڕزگاری ببێت، دەچێتە مێهرگا* و جوانترین و باشترین جوانەگاکانی قوربان و نیازی دەکات".

"یەکێکی دیکەمان بوو، کە خودایەکی سەخت تووڕە و ڕکاویی هەبوو و بەندەکانی بە کەمترین هەلە و گوناهێک، سزایەکی زۆر توند و سەختی دەگەیاند. باوەڕی وا بوو کە خوداکەی بۆ ئاگادارکردنەوە و سزاگەیاندنی بەندەکانی کە شکۆ و مەزنیی ئەویان لە بیر کردە، ئەو مەرگەسات و تۆفانەی نابووەوە. ئەم خودایە هیچ جۆرێک نەرمی و مێهرەبانیەکی لە دڵدا نەبوو. هەر چی بوو توندی و دڵڕەقی و خوێنرژتن و سزا و ئازار و ئەشکەنجە بوو و لە بەندەکانی دەویست کە فەرمانی ئەو بە کار ببەستن و لە ڕێگای خۆشنوتی و خواستی ئەو چەواشەکان بگرن و خۆیان بیانکوژن".



"لە ناو ئێمەدا کابرایەک هەبوو کە خودای تایبەت بوو. خودای ئەو تیشک بوو، هێزی ئافراندن و هێزی بەهەنجاری رامان و هەستی. ئەو تۆفانی لە ڕک و تووڕەیی خواکان نەدەزانی و بە ئێمەی دەگوت لە جێگای شیوەن و ناڵین و پاڕانەوە، هەستن و بە هەموو هێز و تواناوە سەوڵ لێ بدەن و خۆتان ڕزگار بکەن، خۆشی کۆششی دەکرد. لەو کاتە کە ئێمە دەگریان و دەلاڵایەنەوە ئەو بێ ڕاوەستان سەوڵی لێدەدا و بە لەز و چابۆکی لەتەک شەپۆلەکاندا دەست و پەنجەی نەرم دەکرد، تا سەرئەنجام کارێکی وای کرد کە هەموومانی هاندا و کەوتینە خۆمان و دەستمان برد بۆ سەوڵەکان و بێوچان کەوتینە جەنگ لەتەک شەپۆلەکان. تێکۆشان و یەکگرتوویمان، بووە هۆی ئەوە زاڵ ببین بە سەر تۆفانەکە. لە دوورەوە ڕووناکی دەرکەوت و هاواری وشکی وشکی هەموو بەلەمەکەی داگرت. ئێمە لەو فەرتەنە ڕزگار بووین و پێمان نا نێو وشکی و ڕێگای دوور و سەختی دەشت و ئەم چیا سەرکەشانەمان گرتە بەر و دوای مانگێک شەکەتی و ماندووی، ئێستاش لێرەین و لە دوای ئەو ئەزموونە سەخت و ترسناکانە، دەمانەوێت بچینە هۆرمزگای زەردەشت و لە زمانی خۆی خوداکەی بناسین و هەنگاو بنێنین بەرەو ژیانێکی نوێ و ڕێبازێکی پرتیشک و بەختیاریی، ڕێبازی چاکی و کۆشش و دینی بەهدینی و ببین بە ئەندامێکی ئەم ئایینە پیرۆزە."

زەردەشت بە ڕوویەکی شاد و کراوەوە لە مێهرگاکەی هاتە دەر و بەرەوپیری میوانەکان چوو و زۆر بە گەرمی خۆش هاتنی لێ کردن و ڕایسپارد کە لە جل و بەرگی پاک و خاوێن بێنن بۆ میوانەکان و نان و خۆراکیان بۆ ئامادە بکەن. هاوڕێیانی زەردەشت خێرا دەستوبردیان کرد و میوانەکانیان تەروپۆشتە کرد و خۆراکیان پێ دان، پاشان زەردەشت بانگیانی کرد بۆ باخچەی خۆی و گوێی

گرتە مەبەست و بەسەرهاتیان و لە سەرخۆ دەستی کرد بە وەڵامی پرسیارەکانیان. پێشەکی زەردەشت چەند سروودی بەم شێوە خوێندەوە":

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کردار و گوفتار و نیایشتانە،
کە بە مرۆڤ
جاویدانی و ڕاستی و
هێزی گەشەکردن دەبەخشێنێت،
پێشەکی هەموویان
بە تۆ پێشکەش دەکەین.
گاتا، هاتی 34، سروودی 1

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
مرۆڤی پاک و خۆپارێزی بیرچاک،
کە ڕەوانی لەتەک ڕاستیدا ئاوێتەیە،
هەموو رامان و کرداری خۆی
بە تۆ پێشکەش دەکات،
هیوادارم بتوانم،
بەو سرووده پیرۆزانە
دەیهۆنمەوە
هەروەها بە نیایشتەکانم،
لێت نزیک ببمەوە.
گاتا، هاتی 34، سروودی 2

ئەی مەزدا..!
ئەی ڕاستی..!
ئەی رامانی پاک..!
لە ڕاستیدا من تێگەیشتم
کە ئێوە بانتر و بە تواناتر لە هەمووانن.
ئارەزوومەندم لە سەرتاسەری گۆڕانکارییەکانی ژیان،
ڕێنوێنیم بکەن.
تا بە ستایشت و نیایشتی دڵ،
بەرەو ڕووتان بگەڕێمەوە.
گاتا، هاتی 34، سروودی 6

ئەی مەزدا..!
کەوایە بەرەو ڕاستیی دڵخوازم
ڕێنوێنیم بکە،
تا بە پەیڕەوکردنی پاکی بیبینمەوە.
پرسیار و ئەزموونی خۆتم ئاراستە بکە،
کە پرسیار و تاقیکردنەوەی تۆیە،
هێز و دلێری
بە ڕابەران دەبەخشێت.
گاتا، هاتی 43، سروودی 10

ئەو دانایە،
کە گوتەی پاک و ڕەسەنی من،
کە بۆ کۆمەڵان پێگەیشتن و گەشەکردنی جاویدانی، ڕێنوێنی دەکات،

به گوێیان بگەیەنێت،
لە باشترین پاداشت و بەختیارییەکان بەهرەمەن دەبێت،
بێگومان مەزدا ئەهۆرا،
لە بەر پرشنگی رامانی پاکدا،
توانامەندیی ئەو کەسە پتر دەکات.
گاتا، هاتی 31، سروودی 6

زەردەشت ڕووی کردە ئەو کەسە کە پەیکەرێکی بە دەستی خۆی چێ کردبوو و نێوی خودای لێ نابوو و دەیپەرەست، فەرمووی: "سەرەتا باش بزانە کە من ڕێزم هەیە بۆ بیر و بڕوات، تۆ ئازاد و سەربەستی و دەتوانی بێ هیچ ترس و بیمێک بە هەر شێوە کە ئایینی تۆ دەبێژێت خودای خۆت ستایشت بکەی و هەروەهاش بزانە کە من هەرگیز نیازی جەنگ و کێشەم لەتەکدا نییە. هەرگیز من لە بەر بڕوا و ئایینی کەسێک کە دەیپەرستێت لەتەکیدا ناجەنگم، چۆن باوەڕ و ئایینی هەر کەس شایستەی مێشک و خێرەتی خۆیەتی و خودای هەر کەسێک هەمانە کە رامانی دەستنیشانی دەکات و من لە بەر ئاستی رامانی ئەو کەسە، لەتەکی تێ ناگیرم. **من مامۆستام و کاری من ئەوەیە کە ڕێگا بە کۆمەڵان نیشان بدەم و هزر و رامانی کۆمەڵان بۆ بزوان و لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوە و دۆزینەوە هان بدەم تا خۆیان ڕێگای روون بدۆزنەوە و بە ڕاستی و ڕۆشنایی بگەن. من فێر دەکەم، بەربەرەکانێ ناکەم. بەربەرەکانێی من بەس لەتەک نادانی و تاریکییە و بۆ جەنگ لەتەک نادانی و تاریکی، خەنجێر ناکێشم، بەڵکوو چرا دادەگرسێنم.** ئەمەش باش بزانە کە ئەگەر وای لێ بێت کە بۆ بڕوا و ئۆل لە ناو گەلاندا جەنگ تێ بگیرێت، بە تایبەت بەو لاسەنگی و ڕادەی تێگەیشتن و جیاوازی و فرەبڕوایی کە لە ناو گەلاندا هەیە، جیهان بۆ هەمیشە دەبێتە مەیدانی جەنگ و بە یەک هەڵداچوونی جیهانبینی و رامانەکان و کۆمەڵانی جیهان بۆ ساتێک ڕووی ئاشتی و هێمنی بە

خۆیانەوە نابینن. هەروەها کە دەزانن من بێجگە لە مامۆستایەتی، پزشکیشم. لە ئەزموونی پزشکیم ئەمە تێگەیشتم کە ئەو رامان و ئاکارانە کە چەوت و ناڕاستن، دەبێت وەک نەخۆشی سەیریان بکرێت و پێویستە لە جێگای ئەوە خاوەنی ئەو رامان و ئاکارانە سزا و ئازار و بکوژرێن، گەرەکە دەرمان و چارەسەر بکرێن.

ئێستاش ڕووم لە تۆیە، ئەی کەسێک کە بە پەیکەری دارین کە دەستکردی خۆتە و بە خودای خۆتی دەزانی و دەیپەرستی! باش بزانە کە کاری تۆ لە چاوی منەوە دروستە، تۆ خودا لەو پەیکەرە دەبینی و دەیناسی، بەڵام ئەمەش بزانە کە داری ئەو پەیکەرە لە سەرەتادا بەو چەشنە نەبووە. ئەم پارچە دارە لە پێشدا دەنکێک بووە کە لە درەختێکی دیکە وەک خۆی کەوتوەتە ناو زەوی و گیانی گرت و لە بەر تیشکی ڕۆژ و بە هۆی ئامادەبوونی زەمینەکانی ئاو و هەوا و خاک، باڵای ستاند و دوای چەند ساڵێک بوو بە درختێکی بڵند، کە لقێک لەو درەختە بە شێوەی  خودا لە بەرانبەرتدایە. کەوایە کاکەبرا چاوت هەڵێنە و لەم لەتکە دارە پێشتر و فراوانتر بڕۆ و بڕوانە. بڕوانە دەنکەکە، بڕوانە ئەو جووڵین و گۆڕین و سەوزبوون و باڵاکردن و گەیین و زایینەی دەروونی دەنکەکە. بڕوانە ئاو و خاک و هەوا و خۆر و ئەو هێزانە کە هەموو ئەم دیاردانەی لێ هەڵقوڵیوە، هێزی ئافراندن، ڕوو بکە هێزی ئافراندن و بەدیهێنەر بە هەموو دیاردەکانی. بڕوانە هەموو جێگایەک بڕوانە، لە ئاسمان و هەتاو و ئەستێرەکان و کەشکەشانەکان، لە زەوی و لە خاک و وشکی و چیا و زۆزانەکان، لە چۆم و ڕووبار و هەزاران دیاردە و وێنەی تر. ئەمەش بزانە براگیان، ئەم گوتانە بۆ ئەوە نییە کە هەر چیم گوت تۆ دەبێت بیپەژرێنی، نا، تۆ بۆ خۆت بیر و مێشکت هەیە. گەورەترین دیاردەی هەستی، کە دەتوانێت لە جێگای ئەو پەیکەرە ببێتە بتی تۆ و بیپەرستی، رامان و مێشکی خۆتە، کە وایە لەتەک هزر و رامانی خۆت ڕاوێژ بکە. فرە بیر بکەرەوە و کۆشش بکە کە لە ڕێگای رامان و خێرەتی خۆتەوە بۆ ناسینی خودا یارمەتی

وەر بگری، نە ئەو شتانەی کە پێشتر بە تۆیان گوتووە و دەیلێن، بە تایبەت ئەو گوتانەی کە بۆ گومان و خەیاڵ و ڕۆژگارانی کۆن دەگەڕێتەوە".

"هەروەها تۆ ئەی کەسێک کە زەروان بە خودای خۆت دەزانی، ڕێزم هەیە بۆ بیر و ڕات. تۆش وەک هەر مرۆڤێکی تر جێگای ڕێزیت. بە ڕاستی بیری تۆ دروستە کە هەموو ڕووداوەکانی سەیری زەمان لە ناو دەفری زەمان ڕوو دەهات و هەموو شتێک لە ناو بێشکەی زەمان ڕەوانە. بەڵام زەمانی بێجێگام پێ نیشان بدە. زەمانی جودا لە جێ، لە کوێیە؟ لە هەر کوێ زەمان هەیە، لەوێ جێگایەکیش هەیە و ئەمە شوێنە کە بە زەمان شێوە دەبەخشێت و لە هەر شوێنێک و لە هەر کاتێکدا بە چەشنێک دەری دەهێنێت. شێوەی زەمانێک کە ئێستا لێرە دەیبینی لەتەک شێوەی زەمانی شوێنێکی تر جیاوازە. ئەگەر تۆ زەمان لەتەک شوێن گرێ بدەی و ئەو دووانە بە یەک بزانیت، ئینجا لە زەمان و شوێنی یەکبووندا، بە هێزی ئافراندنی هەستی و خێرەتی هەستی و هەنجاری هەستی دەگەیت و خودای راستەقینە دەناسیت. بەڵام بیری تۆ لەمەر چارەنووس ناڕاستە و شاشە. تۆ هەموو شتێکی گەردوون لە ژێر فەرمانی زەمان دەزانیت و بۆ خواست و رامان و ویستی خۆت، دەرفەت و توانایەک ڕەوا نابینی و ئەمە بە باوەڕی من چەوتە. ئایا تۆ لە توانامەندی خۆت و هێزی هزر و رامان و مێشکی خۆت ئاگاداریی؟ ئایا دەزانی کە تۆ لە مەزنترین هێزەکانی بوون بەهرەمەندی و تەنها تۆی مرۆڤیشی کە لەم هێزانە بەهرەمەندی؟ چما تۆ هێزی رامان بەم کەم دەزانی؟ هێزێک کە هەموو شتێکی تۆ بەوە پەیوەند بووە و هەیە و دەشبێت. بڕوانە دەوروبەری خۆت، بڕوانە ئەم تاڤگە و ئەو خاڵۆی ئاشەوانە. ئەو ئاشەوانە بە مێشک و رامانی خۆی وزەی ئاوی ئەو تاڤگەیەی خستووەتە ژێر ڕکێف و فەرمانی خۆی و ئەو بەردە سەنگینەی ئاسیاوی پێ دەچەرخێنێت و ئاردی لێ وەر دەگرێت. تا دوێنێ ڕووبارەکە فەرمانی دەدا و بە سەر خاڵی ئاشەوان زاڵ بوو، بەڵام ئیمڕۆ ئاشەوانەکەیە بە سەر ڕۆیشتن و خوڕەی ئاوەکە فەرمان دەدات. کەوایە ئەمە

ڕامان و هزری تۆیە، کە ئەگەر بکەوێتە کار، دەتوانێت ژیان و چارەنووسی تۆ دروست بکات و بیگۆڕێت، نەک زەمان. ڕامان و خێرەتی خۆت بخە کارەوە، زەمانیش دێتە ژێر فەرمان و ڕکێفی تۆ".

"بەڵام تۆ ئەی کەسێک بۆ هەموو دیاردەیەکی ڕووی زەوی خودایەکت لە ئاسمان بۆ دیاری کردووە و هەموو شتێکی سەر زەوی لە ژێر فەرمانی خودایانی ئاسمان دەزانی. گوتەی تۆش پڕوپووچ نییە. ڕامانی تۆ، تۆی بۆ ئەمە هان داوە کە بۆ هەر دیاردە و وێنەیەک لەم سرووشتە خودایەک لە ئاسمان ببینیتەوە، خودایەک کە دەستکردی ڕامان و پنداری خودی خۆتە. ئەگەر فراوانتر بیر بکەیتەوە و سنووری گومان کەمتر بکەیتەوە و ڕوو بکەیتە ڕامان و زانست و فرەتر بۆ وەرگرتنی دانش بایەخ بدەیت، پاشان خێرەت و زانستی تۆ دەتگەیەنێتە هەمان هێزی بێهاوتا و تاکی ئافراندن. ئەگەر بێت و تۆ بەم چەشنە بکەیت ئەوە هەموو ترسی تۆ لە ناو دەچیت و هەرگیز بۆ خۆشنوتی و کەیفخۆشی خوداکانی ئاسمان باشترین جوانەگا و شەکی پەروارت ڕەوانەی قوربانگا و لە ڕێگایاندا قوربانی ناکەیت و لەتەک مەردوم ناجەنگیت و لە ڕێگای خوداکان خوێنی گەلان نارێژێنیت. ئەم بابەتە زۆر باڵکێش و جێگای پرسیارە، کە ئێوە پێڕەوانی خوداکانی ئاسمانی، چ سوودێک دەبینن لەوە کە ئاژەڵێکی بە نرخ و بە سوودی خۆتان سەر دەبڕن و خوێنیان دەڕژێنن؟ ئەم خودایانەی ئێوە چ نیازێکیان بەم کوژتنانەی ئێوە هەیە و ڕژتنی خوێن لە ملی ئەم گیانلەبەرانە چ کەیفخۆشییەک بۆ خوداکان بەدی دێنێت؟ سەیرە..! خوداکان ئاژەڵ دەئافرێنن و پاشان بۆ کەیفخۆشیی خۆیان لە مەردوم داواکار دەبن کە ئەم گیانلەبەرانە لە ڕێگای ئەوان سەر ببڕن و خوێنیان بڕژێنە سەر زەوی، بەڕاستی سەیرە..!"

"هەروەها تۆ ئەی کەسێک کە هەتاو و مێهر بە خودات دەزانی، بیر و بۆچوونی تۆ بۆ ئەو کاتەی کە لە ڕۆژانەکانی باکوور دەژیات بڕێک دروست بوو. لەو دەشتە سارد و زوقماوی و بەستەڵەکانە کە ساڵ دوانزەی مانگ ساردە، ژیان گرێدراوی

ڕۆژ و تیشک و گەرمای هەتاوە و تۆ دەبووایەت خۆر و مێهر بە خودات بزانی. بەڵام ئیمڕۆ تۆ لەو ناوچە هەمیشە بەفراوی ساردانە ناژێت و رامان و خێرەتیش وەک ئەو سەردەمە نییە. تۆ ئیمڕۆ لەو وڵاتە سەردسێرانە کۆچبەر بوویت و هزر و رامانیش گەشەی سەندووە. ئیدی تۆ دەزانی کە خۆریش دیاردەیەکە و تەنها خاسەکی و تایبەتمەندیشی ئەوەیە کە لە خۆی تیشک و گەرما دەدروشێنێت. کەوایە ئەی براگیان، ڕاستە کە ژیانی ئێمەی مرۆڤ، بەندە بە گەرما و تیشکی ڕۆژ، بەڵام بەرزتر لە ڕۆژیش هێزێکی تر هەیە، ئەو هێزە کە ڕۆژیش سەرچاوەی لێ دەگرێت، ئەوەش وزە و توانای رامانی هەنجاری ئافراندنە. کەوایە ئیتر لە ڕۆژ مەترسە و لە ڕێگای هەتاو ئاژەڵەکانت قوربانی مەکە و لەوەش خراپتر لە ڕێگایدا مەردوم مەکوژە. هەر چەندە تۆ گومانی وا دەکەی کە بە کوژتنی مرۆڤێک کە ڕۆژ بە خودای خۆی نازانێت، بەهرە و پاداشتی مەزن وەردەگری، بەڵام لە ڕاستیدا، تۆ بەم کارەت تاوان و گوناهێکی فرە گەورەت کردووە، ئەوەش گەورەترین تاوان کوژتنی مرۆڤە، لە ڕێگای دین و باوەر و گوایە خودا".

"بەڵام تۆ ئەی کەسێک کە خودا بە فەرمانڕەوایەکی تووڕە و توندخوو و بێبەزیی و فریوکار دەزانی. بینیت کە من ڕێزم بۆ هەموو خوداکانی ئەم کەسانە داننا، بەڵام خودای تۆ بە هیچ چەشنێک ناپەژرێنم. خودایەک کە تۆ بانگەشەی بۆ دەکەی و دەیپەرستی، ڕەنگدانەوەی هزر و ئەندێشەی تاریک و دڵی ڕەقی تۆیە. تۆ مرۆڤێکیت کە هەموو دڵ و ڕەوان و گیانت پڕە لە دەرد و ئازار و ڕەنج. ڕەواڵەت و چێهرەی گرژ و مۆنت نیشانەی دەروونی تۆیە. دڵت وەک بیابانێکی وشکە کە دڵۆپە ئاوێکی بارانی خۆشەویستی و ئەڤینی بە خۆیەوە نەدیوە، بۆیە هەموو ئەم ڕەفتارە ستەمگەرانەی تۆ، لەم دڵە وشک و بێ ئاوە سەرچاوە دەگرێت و دیتن و تێڕوانینشت لە بارەی خودا هەر لەم دڵە وشک و هزرە ناڕاستە بەدی دێت. تۆ ئەگەر پچێک رامانت ڕاست بوایە و تۆزێک ئەڤین و خۆشەویستی لە دڵت بوایەت، هەرگیز دەستت بەم خراپەکارییانە نەئەدا و بەم

چەشنە ژیانی مەردومت بە خاک و خوێن نەدەکێشا. سەرچاوەی هەمووی ئەم کردارە خراپانەی تۆ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خودایە کە تۆ دەیپەرستی، خودای تۆ بێجگە لە فەرماندەیەکی ستەمگەر شتێکی دیی نییە و تۆش فەرمانبەریی دەکەیت. بە ڕاستی خودا ئەوەیە کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە؟ گەلۆ ئەم هەموو دیاردانەی ئافەرینش و ئەم هەموو جۆش و خرۆشەی گەردوون، تەنیا بۆ ئەوەیە کە تۆ بتوانیت بۆ نزیکبوونەوە و بۆ خۆشنوتیی خوداکەت هێرش و دەستدرێژی بکەیتە سەر سامانی کۆمەڵان و فەرهووودیان بکەیت و خوێنیان بڕژێنیت؟ سەیرە..! لەم خودایە کە تۆ دەیپەرستی و سەیرتریش ئەو کارانەیە کە تۆ بۆی دەکەی. براله با پێت بێژم خودای تۆ خودایەکی ناڕاستە و خۆت لەم خودایە ڕزگار بکە. ڕوو بکە ئەم سەوزەڵانیە، بڕوانە نیشانەکانی خودا، ناو گوڵبەرگی گوڵ و گیاکان ببینە و پاشان گرێی ناوچاوانت بکەرەوە و نیگا و تەماشات نەرم بکە و لەش و بەرگت بشۆرە و بۆنی ناخۆش لە خۆت پاک بکەرەوە و لە جێگای ڕک و توندی و گرژی، لێوت بە خەندە بێت و لە جێی بیر لە دزین و کوژتن بکەیتەوە، بیر لە چاندن و دروستکردن بکە. خودا بە هێزی ئافراندن بزانە و لە ڕاژەی هێزی ئافەرینشدا بکۆشە. بە هەموو گەلان و جیهان و بە گەردوون و بە هەر تشتێک کە نیشانێکی لە ئافراندنەوە پێوەیە، خۆشەویستی و دڵسۆزی بنوێنە و ئافراندن بڕوێنە و پەروەردەی بکە. لە جێگای ڕژاندنی خۆێن، گوڵ و نەمام بچێنە و لە جێگای ئازار و ئەشکەنجە و یەخسیرکردنی ڕێبوانی ماندوو، ئاو و میوەیان پێشکەش بکە. ڕابە و دەست و برد کە بۆ ژیانێکی نوێ، ژیانێک کە لە ژێر سەیوانی تیشک و ڕووناکی و لە ژێر سێبەری ئەهۆرا مەزدا، کە سەرچاوە و چاوکانی هەموو چاکییەکان و باشییەکانە، ئەهۆرا مەزدایەک کە هزری بوون و هەنجاری بوون و ئەڤینی بوون و خودی بوون و زاتی بێسنوور و بنەڕەتی هەموو شتێکە".

"ئێستا ڕووی دەمم لە هەمووتانە، گەر دەتانەوێت خودا بناسن، پێشەکی ئەو خودا کە لە مێشک و هزرتانە و دروستکراوی خەیاڵ و گومان و دەستکردی ترس و نیگەرانی و خواست و ئارەزوو و هیوا و تەنیایی و نائاگایی و بێهانایی ئێوەیە و بە پەیکەر و چەشنی مرۆڤ، لە ئاسمانەوە لە سەر رامان و دڵ و گیانی ئێوە فەرمان دەدات و جاری واشە دەتانترسێنێت، یان هیوادارتان دەکات، جار جاریش سزا و پاداشتان دەداتەوە و هێندێک ڕاش دەتانلاوێنێتەوە یان دەتانچزێنێتەوە، لە مێشک و هزرتان دەری کەن، ئینجا چاوتان هەڵێنن و لە جیهان و گەردوون و لە خۆتان بڕوانن و بیر لە بەدیهاتن و لەدایکبوونی خۆتان بکەنەوە کە چلۆن لە گرساندنی تۆوەکان، لە ناو زێدانی دایک دروست بوون. لە دەستپێکدا پلێک خوێنی بەستراو بوون و پاشان شێوەتان لێ نیشت و بە کەرەسەیەک کە لە لەشی دایک و لە ڕێگای خوێنەوە بە ئێوە گەیشت، هێدی هێدی ئەندامەکانی جۆراجۆری لەشتان بە زەریفی و جوانی چێ بوو و دوای تێپەڕینی نۆ مانگ، بە چەشنی مناڵێکی ساوا لەدایک بوون، ئەویش زۆر بە سەیر و بە وردی و ناسکی کە بە هیچ کێشانەیەک لە جیهاندا ناپێوێندرێت. پاشانیش بە شیری مەمکی دایک باڵاتان کێشا و وردە وردە بوون بە خاوەنی هۆش و خێرەت و هزری کردار و ناسین و وەرگرتن، دوایی کەوتنە ئاخافتن و وەرگرتن و فێربوون و دەبڕینی هەست و نەست و بیرتان و تێگەیشتن لە هزر و هەستی ئەوانی دی. ئینجا پاتان خستە ناو گۆڕەپانی هەوراز و نشێوی ژیان و بەم جۆرە تلتان خوارد و بەرەو پێش هاتن. ئێستا، ئایا باشتر نییە لە جێگای ئەوە بۆ ناسینی خودا بچنە ناو جیهانی گومان و خەیاڵ و کرداری نازانستانە و ئازاری جڤاک بدەن و بیانکوژن، ڕوو بکەنە ئەم شتە سەیرانەی پەوەردەگاری بەدیهێنەر و ناو ئەم دیاردانە، پڕ پرس و ناوێزە بدۆزنەوە و بە لێکۆڵینەوە لەم دیاردانە، رامانی خۆتانی گەشە پێ بدەن؟ چاوتان هەلێنن و بڕواننە ئاسمان، چاوتروکاندنی ئەستێرەکان، خەرمانەی مانگی تابان، قووڵایی کاکەشان کە درێژایی و پانی و بەرینی بێسنوورە. لە

سپیدەی ڕۆژ و هەڵاتنی خۆرشیت و بروانە گەرمی و درەوشاندنەوەکەی، زۆزان و درەخت و گیانلەبەران و رووبار و تاڤگە و هەر چی لە گەردووندایە. گۆڕانکاریەکانی هەستی بخەنە بەر چاوتان، وەک هاتنی ڕۆژ و ڕۆیشتنی شەو، هاتنی بەهار و سەوزبوون و چرۆ و شکۆفەکردنی درەخت و گوڵ و گیا، هاتنی هاوین و گەرما و جۆش و خرۆشی زەوی لە وەرزەکانی پاییز و زمسان".



"کاتێک کە دانا و ئاگا بوون و خوداتان لە ڕێگای زانست و هۆشیارییەوە بە سەر چەرخی گەردوون ناسی، ئینجا ئەو خوای گومان و خەیاڵیی ئێوە، لە تەختی ستەمگەری دادەبەزێت و بەرەو دۆڵی لەبیرچوون و تاریکی دەچێت و لە جێگایدا خودایەکی دیکە لە ناو رامانتان بەدی دێت، خودایەک کە خۆی لە ناو گەردووندا دەنوێنێت، هێزی ئافەراندنێکە کە لە گڵی مردگ گوڵی زیندوو دەڕوێنێت و دوبارە دەیکاتەوە گڵ، لە ناو تۆوی وشک و لە چڵی درەختدا، چەکەرەی ناسک و چووزە نمامی تازە دەڕوێنێت و گوڵ و میوە و بەری لێ بەدی دێنێت. ئەو هێزە کە لە

ناو زێی دایكدا، تۆو دەكاتە خوێن و خوێن دەبێتە منداڵ و منداڵیش دەبێتە بوونەوەرێكی بەروومەت. هێزی ئافەرینشێك، هەموو پانتایی و مەزنایی بوون و خودی بوون، مەیدانی شانۆیەتی، بوونیش لە دەرەوەی بوون نییە و ناسینیشی تەنیا بە ناسین دەكرێت. ئەگەر ڕوو بكەنە ئەم خودایە و لە بارەیەوە بیر بكەنەوە، پاشان دەبینن كە خودای پێشووتان هەڵقوڵێوی گومان و خەیاڵ و تووڕەیی و خۆویستی و زەبوونی و سستی و ترسی ئێوە بووە. ئەگەر ئارمانجی ئێوە دۆزینەوەی خودا لە مەیدانی ئافراندندا بێت، ئەنجامی ئاكارەكانتان لەتەك هەموو دیاردەكانی ئافەرینش دەگۆڕێت و خۆویستی و چۆڵپەرستی و ڕەشبینی و ڕك و تۆڵە و ستەم و دەستدرێژی و ئەشكەنجە و ئازاردان و كوشتن لە دڵ و كرداری ئێوە دێتە دەرەوە و دڵتان دەبێتە چاوكانی ئەڤین و دڵسۆزی و خۆشەویستی بۆ هەموو سرووشت و مرۆڤایەتی. لەم گۆڕانكارییانەیدایە كە ئەو بەهەشتە كە بە دوایدا وێڵن، بە دەستی خۆتان لەم جیهانە بەدی دێنن. لە ڕێبازی من، بەهەشت واتەی هزری پاكە، گوتەی پاكە و كردەی پاكە، دۆژەش مانای ژیانی بندەستی و كۆیلەتی و هەژاری و ناخۆشی و بێكاری و درۆیە، جێگایەك كە لە ناویدا تووڕەیی و ڕك و چاوچنۆكی و دڵڕەشی و لوتبەرزی و ستەم فەرمان بدات، دۆژەیە".

"كەوایە لە ئیمڕۆ بەولاوە بەرەو ناسینی خودای نوێ ڕابن. ئەو پەروەردەگارە كە پەیكەری تیشكە و ڕەوانی ڕاستییە و پرووسكەی هەموو ڕووناكییەكانە، تریفەی ئاسمان و زەویە، خەرمانەی جاویدانییە و هەموو شتێكی ئەم جیهانە ژیلەمۆیەكە لە تریفەی ئەو. كاتێك كە پەروەردگارتان ناسی، ئینجا خۆشتان دەبنە تریفەی ڕووناكی و كانیاوی تیشك و گەرما و بەدیهێنان و ڕواندن و گەشەسەندن. بەم ناسینەیە كە دڵ و گیانی خۆتان و خەڵكانی دی گەرم و تابان و ڕووناك دەكەنەوە و بۆ خۆشنوتی یەزدان تەنیا یەك ڕێگا دەگرنە بەر، ئەوەش دروست

کردن و ئاوەدانکردن و یارمەتیدان و جوانمێری و داد و بەخششە. بەم سروودانە کە لەمەڕ خودایە گوێ بدەن و هەمیشە بیخوێنەوە":

ئەی مەزدا..!
کاتێک کە لە رامانی خۆم ورد بوومەوە،
تێگەیشتم کە
تۆ سەرەتا و سەرئەنجامی بوونی،
تۆ سەرچاوەی رامانی پاکیت.
ئەو کاتەی کە بە ویناوم تۆم بینی،
لەوە گەیشتم کە تۆی
بەدیهێنەری ڕاستیی ڕاستەقینە،
هەر خۆت داوەری دادگەری هەموو کردارێکی ئەم جیهانەی.
گاتا، هاتی 31، سروودی 8

ئەوە کە لە سەرەتادا،
بە هزری خۆی،
ڕۆشنایی بە گەردوون بەخشی و
بە خێرەتی خۆی
هەنجاری بوونی ئافراند،
تا چاودێر و پشتیوانی،
رامانە هەرە باشەکان بێت.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەی ئەوەی کە مینای یەکسانیت..!
بە هێزی پیرۆزی مینووی خۆت،

ڕووناک و سەرفرازمان بکە.
گاتا، هاتی 31، سرووودی 7

# ئەمیشەسپێنتەکان

## (هەمیشە پیرۆزەکان)



"ئەی زەردەشت لە ئاخافتنەکانی پێشووت هەمیشە ناوی ئەمێشەسپێنتەکانت دەهێنا، پێمان خۆشە ناوەڕۆک و جەوهەری ئەمانەمان پێ بناسێنیت.

"بۆ ناسینی ئەمێشەسپێنتەکان هەمدیسان گەرەکە ڕوو بکەینە دەنکە گەنمەکە و بە جوانی بیناسین. ئەگەر دەنکە گەنمەکە باش بناسین ئەوە هەموو گەردوون و زاکۆنەکانی فەرمانڕەوا بە سەریشیدا دەناسین. من لە جامئەسپ داوا دەکەم کە ئەو شتەی لە دانەی گەنم دەیزانێ و دەیناسێ، بۆمانی ببێژێت".

"سەرەتا دێتە بیرم ئەو ڕۆژە کە گەنمت لە زەوی چاند و لە زیندووبوونی گەنمەکەت بۆ باس کردین، فەرمووت کە هەرچەندە دەنکی گەنم بێ گیان دەنوێنێت، بەڵام هەر کە لە ئەنبار هاتە دەر و لە ناو خاکدا چێندرا، گەوهەری زیندووی دەکەوێتە جووڵە و دەڕوێت و هەڵدەدا و لە خودی خۆیەوە دەنکی گەنمی تر بەدی دێنێت. واژەی «ئەمێشە» کە بەشێکە لە واژەی ئەمێشەسپێنتە، ئەمە لە خۆیدا هەمیشەیی و جاویدانی و زیندوویی و بێمەرگییەی دەنکی گەنم دەگەیەنێت. بەم واتەیە کە خۆی زیندووە و ژیان بە دەنکێکی دیکە دەگەیەنێت و دەیبەخشێنێت. لە لایەکی ترەوە کاتێ مرۆڤ دەیخوات، دەبێتە مایەی ژیانی و

کایەکەشی بۆ ئاژەڵ و مەڕ و ماڵات سوودمەندە. «سپێنت»یش بە مانای پاک و پیرۆز و پترکەر و دەرمانبەخش. کەوابوو ئەمێشەسپێنتەکان دەبێتە پترکەرانی سوودگەیەنێر و پاکانی پیرۆز و دەرمانبەخشانی هەتاهەتایی، هەمان زاگۆنی ناو دەروونی دەنکی گەنم کە گەوهەری دەخاتە بزاڤ و باڵاکردن و هەڵ دەدات و گەشەی پێدەستێنێت و بە زایینی دەنکەکانی دیکە دەگەیەنێت. ئەگەریش لە دەنکی گەنم ژوورتر بچین، ئەوە لە هەر دیاردە و دیمەنێکی بووندا ئەم زاگۆنانە بەدی دەکەین. تا ئەو جێگایە من دەزانم و دەیبینم و بیرم بۆی بچێت، کاتێک گەنم دەڕوێت و دەبێتە گەنمی فرەتر، ئەبێت لە خاکدا چێندرابێت و ئاو و هەوا و تیشکی هەتاوی پێ گەیشتبێت، کەوایە گەوهەری گەنمی وەدەستهاتوو، لە خاک و ئاو و هەوا و هەتاو گرساوە".

"ئایا دەتوانرێت لەمەڕ ئاو و خاک و هەوا بیر بکەیتەوە و بۆ ئەوانیش جەوهەرێک ببینیتەوە"؟

"بەداخەوە توانای وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەم نییە، ئەی زەردەشتی زانا! لە ڕاستیدا بیرم بۆ هیچ کوێ ناچێت، داوام وایە کە بەرێزتان بۆ خۆت وەڵامی ئەم پرسە بدەیتەوە".

"وایە پرسیارێکی دژوارە، من بەم شێوە دەبێژم، گەنم کە چێندرا و هەوا و ئاو و خۆری بۆ لوا، دەڕوێت و هەڵدەدات. ئەگەر هەر کام لەم کەرەسانەی نەبێت، گەنم ناڕوێت، جا هەر چەندە هەر یەک لەم کەرەسانە جودا لە یەکن و هەر یەک بۆ خۆی تایبەتمەندی جودای هەیە، بەڵام لە ئەنجام و کۆتایی و لە بە یەک گەیشتندا، هەموو بە یەک شت دەگەن، ئەوەش ڕووناهییە. لە گەردوون و جیهانی ئێمەدا هەموو شتێک لە ڕووناهی جاویدانی گرساو و هەڵقوڵیوە و هەر دیاردەیەک کە هەیە، شتێک نییە بێجگە لە شێوەیەکی شەبەقی ڕووناهی جاویدان. چاوکانی و گەوهەری بوون بە هەموو دیاردەکانی جیهان و گەردوونەوە، هێزی جاویدانی ئەهۆرا مەزدایە، هێزی ئافراندن و ئەڤین و هێزی یەگانەیە، بێسەرەتا، بێکۆتایی،

بێکەران و بێهاوتا و نەگۆڕ بەدیهێنەر و توانامەندە. لە جیهانی بووندا، شتێک نییە لە دەرەوەی هێزی جاویدانی ڕووناهی یان تیشکی تیشکەکان و ڕەخشینی ڕەخشەندەکان. هەموو شتێک لە جیهاندا لە وزەی شەبەقی جاویدانی ئەهۆرا مەزدا هەڵدەستێت و بە هێزی ڕووناهی ئەو کۆتایی پێ دێت. ئەهۆرا مەزدا ڕووناکی ڕووناکییەکان، ڕەخشینی ڕەخشەندەکان، تریفەی ئاسمان و زەوی، هێزی ئافراندن، وزەی هەنجاردار و هزرداری ئافەرینشت، گەوهەر و بنیاتی بوون و ئاوەزی بوون، جەوهەری بێکەران و بێسنوور و بێپانتایی هەموو شتێکە. ئەهۆرا مەزدا سەرشار* لە تریفە و بوونی پێویست* و گەوهەری سەرەتا و ڕووناکی گشتی و ئازادی بێسنوورە کە هەمیشە پرتیشک و داگرساوە و لە ڕێگای داگرسان و ئافراندنە کە دیاردەکانی لێ بەدی دێت و پەیدا دەبێت و بە شەبەقی ڕووناکی خۆی ژیانیان پێ دەبەخشێت. هەموو شتێک لەم جیهانە لە ئاگر و ڕووناهی بەدی هاتووە و هەر دیمەنێکی جوان و قنج، ڕەسیدە و پێگەیشتوو لەوە. هەموو هێز و دیاردەکانی بوون لەتەک یەکدا پەیوەست و پەیوەندن و هەر یەک بەوەی دیکە ڕاوەستاو و دیارە و لە ڕیشە و بناخەدا یەکێکن. لە گەردووندا یەک گەوهەر هەیە کە هێزە و هەموو دیاردەکان ڕەنگدانەوە و نمایشتی ئەو هێزەن. گەردوون و هەستی یەگانەن، بۆیە یەگانەبوونی ئەهۆرا مەزدا ستوون و بنیاتی ڕێبازی منە".

"مرۆڤیش هەر وەک هەموو دیاردەکانی گەردوون، نموونەیەکە لە هێزی ئافراندن و هێزی ڕەخشندە و ترۆپکی تیشکی کۆکراوی ڕووناکییەکان و لە زنجیرەی دیاردەکانی بە یەک بەندکراو، بازنەیەکی پەیوەند بە بازنەکانی دیکە. ڕزگاریی کۆتایی مرۆڤ لە جیهاندا، پەیوەندە بە ناسینی خۆی و ڕووناککردنی مێشک و دڵی و پەیوەندبوون بە تریفەی هەرمانی و داگرسان و شەماڵە کردنی ڕووناهییە.

"ئەمە بزانن کە مرۆڤ ڕێگایەکی دوور و درێژی پێواوە کە مێشکی لە چەند خودایەوە بەرەو تاکە خودایی ئیمرۆ بگات. بڕواننە ڕۆژپەرەستان کە خۆر و مانگ

و ئەستێرە و ئاو بە خودا دەزانن و بۆ هەر دیاردەیەکی دیکە خودایەکیان دیاری کردووە، دروست خودایەک کە پڕ بە حەز و تایبەتمەندیەکانی مرۆڤە. تەنانەت بڕێک لەو کەسانە کە بڕواشیان بە جۆرە خودایەکی تاکیش هەیە، لە هزر و ئەندێشەیاندا خودا بە پاتشایەکی فرە مەزن و تاک دەزانن کە بە توانا و هێزی بێسنوور و بە حەز و هەست و خووی مرۆڤێکە کە لە سەر تەختی خۆی لە ئاسمانەکاندا دانیشتووە و لە ناو فریشتە و پەرییەکانی جۆراوجۆری کە لە دەورین، بە سەر جیهاندا فەرمان دەدات. ئەم کۆمەڵانە خودا ئاوا دەناسن و دەبینن، بەڵام خودای من بەم چەشنە نییە. ئەهۆرا مەزدایەک کە من پێی پابەند و بڕوامەندم، جیهانی شەبەق و ڕووناهی و جیهانی بێکەرانە. خێرەت و هەنجاری بوون و گەشەسەندنی هەستی و شەماڵەی هەستییە. من خودا نەک لە ئاسمان، لە هەموو شوێنێک دەبینم، لە پشکوتنی گوڵێک، لە خەندەی منداڵێکی ساوا، لە ڕامانی مرۆڤێکی پاک، لە دڵی گیایەک، لە هەموو شت و هەموو کەس و بەرزتر لە ئەڤینی جاویدانی".



"بەڵام لەمەڕ ئەڤین ببێژم، جوانترین، دڵڕفێنترین، پڕپەهاترین، خۆشەویستترین، بەڕێزترین، بەهرەمەندترین، شیرینترین، خۆشترین و باشترینی وشەیەک کە لەم جیهانەدا هەبێت تەنیا یەک وشەیە، ئەڤین. ئەڤین دوو واتەی گرینگی هەیە، ئەڤین بە واتەی ڕووناهی و ئەڤین بە واتەی ڕاکێشان. هەموو بوون، لەو دوو واتای ئەڤینەوە گرساوە بەو دوو واتەی، بۆیە منیش بەم وشە و دوو واتەکەی، ڕووم لە خودا و ڕوو لە ڕزگاربوونم کردە. هەروەها کە پێشتر گوتم لە واتەی یەکەمدا، جیهان بێجگە لە ئەڤین و دیاردەکانی ئاخنراو لە ئەڤین. شتێکی دیی نییە و واتەی دووهەمی ئەڤین کاتێک دەتوانێت بکەوێتە بزاڤ و گەڕیان و هەموو ئەم دیاردانەی بێسنوور لە بوون و جیهاندا بەدی بێنێت، کە لە ناو ئەڤین، بە واتەی دووهەمەکەی، «پاڵنەر» و «ڕاکێشەر» بێت. هەر جووڵە و گەڕیان و

گەشەکردن و تەنانەت هەر مردنێکیش لە جیهاندا، بەدیهێنەر و هەڵخرێنەری، بە هۆی پاڵنەر و ڕاکێشەریی ئەڤینە. ئەمە ئەڤینە کە گەڕیانی چەرخی ڕۆژگار و سروود و حەیرانی بوونی لێ بەدی دێت. ئەمە ئەڤینە کە ئەگەر تیشکی لە ناو دڵتاندا بدرەوشێتەوە، ژێکانی شاراوە و کوژاوەی دڵتان دەهێنێتە جۆش و خرۆش و گۆڤەند. ئەڤین ژێکانی دڵتان دەخاتە چرین و هۆنراوەی ناسکی بوونێکی نوێ ئاوازی ژیان بە گوێتان دەگەیەنێت. سەرای دڵتان وەک زۆزانی قەشەنگی هەورامان، وەک ئاسمانی ساماڵ، کە بێجگە لە جوانی و بەهرە و زایین، شتێکی دیکەی تێدا نییە. لەم کوێستان و ئاسمانەدایە کە شەپۆلەکانی قەشەنگی ستران و هۆنراوە و هەڵبەست چێ دەبێت.



شلێری خاکسار و بۆنی خۆشی بەرزەنگڵ و چنوورەی جوانی بەرۆکی کیژان و نیبلوپەری* سەر ئاوان ڕوو لە هەتاو دەپشکوێن. لەم ئاسمانە دڵکێش و خۆشەدایە کە لە دوای وارانێکی ژینبەخش پەلکەزێڕنەی ڕەنگاوڕەنگ ڕوخساری ئاسمان دەخەملێنێت و نیگای سەوداسەران بەرەو ئاسمان ڕادەکێشێنێت و ژێکانی دڵتان دەژەنێت و ئەستێرەی ڕووناکی گیانبەخش تیشکی جوانی خۆی دەهاوێژێت. ئەو تیشکە ژینبەخشە کە خەرمانەی نیگای گەرم و شیرینی دەخاتە خرۆش و تابانی دەکات و لە وەڵامی نیگاکانی ئێوە، دڵتان هاوساز و هاوئاوازی

خۆی دەبێت، هاوساز و هاوئاهەنگییەک کە هیچ ستران نەوا و هۆرە و حەیران و بەستەیەک بە خۆشی و جوانی ئەو ناگاتەوە".

"ئەی زەردەشت سوپاست دەکەین کە ئاوا شیرین و شیوا و شیرین، گەوهەر و یەگانەیی بوونت بۆ ئێمە شی کردەوە. ئێستاکەش دەخوازین کە هەمدیسان سەربەندی مژارەکە بە دەست بگری و ئێمە بەرەو جیهانی دڵبزوێنەری ئەمێشەسپێنتەکان ببەیت".

"دیسان بۆ دەنکە گەنمەکە بگەڕێنەوە، لە ئێوە دەپرسم، ئایا لە سەر دروستبوون و ڕواندن و گەیینی دەنکە گەنمەکە، ڕێکوپێکی و یاسایەک دەبینرا؟ ئایا ئەگەر گەنم بچێنین، دەنکی جۆ سەوز دەبێت، یان لە گەنم تەنها گەنم و لە جۆ تەنها جۆ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر ڕوونە، لە گەنم هەر گەنم بەدی دێت. هەموو ئەو گۆڕانکارییەکان کە لە سەر گەنم بەدی دێت، هەر لە چاندن تا دروێنەی، دەبێت لە سەر بناغە و پایەی زاگۆن و هەنجار بێت. جا ئەم زاگۆن و ڕێکوپێکییەی دەروونی گەنمە، نێوم ناوە ئەمێشەسپێنتەکان. زاگۆنەکانی فەرمانڕەوا لە ناو دەنکی گەنم و لە ناو هەموو دیاردەیەکی هەستی و گەردوون یەک شتە. ئێستا زاگۆن و ناوەرۆکی ئەمێشەسپێنتەکان وەهومەن (وەهمەن، بەهمەن، بێمەن)، ئاشاوهێشتا (ئۆردیبەهەشت)، خشترەئیریە (شەهریوەر)، سپەنتئارمەئیتی (ئەسپەند، ئەسفەند)، هەئورتات (خۆرداد) و ئامەرتات (ئامۆرداد) شی دەکەینەوە و هەر کامیان بە تێر و تەسەلی لە سەری دەدوین".

"بەهمەن، ئاوەزی بوون و بیری چاکەی مرۆڤە. دانەی گەنم هەر چەندە بێگیان دەبینرێت، بەڵام گیانی تێدایە و زیندووە و لە سەر شێوە و چۆنیەتی و هەموو گۆڕانکارییەکانی ژیانی گەنم، ئاوەز و هەنجارێک زاڵە. خۆی ئاوەزداریی گەنم لەوەدایە کە لە گەنم بێجگە لە گەنم نەڕوێت و دەیان دیاردەی باڵکێش و سەرسوڕهێنەری دیکەشی تێدایە، وەک شینبوون، چەکەرەکردن و باڵاکردن و ڕەسین و دانەدان و لە دواییشدا دەخورێت و دەبێتە هێز. بەهمەن لە دینی

بەهدینی ترۆپکی هزری هەستییە و لە مرۆڤیشدا ژیری و رامانیەتی کە زانست و پەروەردەکردن و فێربوون و چاندی لێی دەهەڵنجێت. ژیری و هزر جوێکەرەوەی مرۆڤ لە ئاژەڵە و ئەمە بەرزترین و پلەمەندترین بەهرەی و هاتی مرۆڤە".

"واژەی بەهمەن لە دوو واژەی «بەهـ» بە واتەی باش و پاک و «مەن» بە واتەی رامانە. بەمجۆرە وشەی بەهمەنی لێ چێ بووە و لە بەرانبەریشدا رامانی خراپ «ئەنگەرەمەن، ئەهریمەن» هەیە کە هاندەری مرۆڤە بۆ خراپە و ناحەزی. بەهمەن یان رامانی پاک، ڕابەری مرۆڤە بۆ ئاشتی و دۆستایەتی و یەکبوون و ناهێڵێت توورەیی و ڕک و کەلەڕەقی و خیرەسەری لە دڵی مرۆڤ بەدی بێت. بەهمەن لەناوبەری و ستەم و بێدادی لە ناو کۆمەڵاندایە و دژی کاری ناشایستە و دروستکاری و هۆشمەندی و دووربینی لە هزر و رامان، توانای ناسین و وەرگرتن و زانست و بینایی، هەمووی لە بەهمەنەوە سەرچاوە دەگرێت. لە بەرانبەری بەهمەن و ئاوەز و ژیریدا، ئەکۆمەن* یان بیری و رامانی خراپ کە بە پێچەوانەی بەهمەن مرۆڤ لە کردەی چاک ڕادەوەستێنێت و گەلان بەرەو خراپەکاری ڕادەکێشێنێت و جەنگ و دوژمنی و دژایەتی و دووبەرەکی لە نێوان گەلان بەدی دێنێت و ڕک و کینە و خیرەسەری و کوشتن و برین و ستەم و خوێنڕژتن بەدی دێنێت. مرۆڤ بە پەیرەوکردنی ئەکۆمەن، پێ لە سنووری ئاوەز و ژیریی دەخاتە دەرێ و کاری بەد و ناشاز و ناشایست دەکات. ئێستا بەم چەند سروودە لەمەڕ رامانی پاک و خراپ گوێ بدەن":

ئەی مەزدا..!
ئەو کەسەی کە رامانی
باش یا خراپ بێت و
هەر چییەک کە هزری بە ئازادی هەڵیبژێرێت،
ویژدان و گوفتار و کردار و بڕواشی

پەیڕەویی لێ دەکات.
بەڵام لە ئەنجامدا،
ئەمە خێرەتی تۆیە
کە چاکە و خراپە لە یەکدی جیا دەکاتەوە.
گاتا، هاتی 48، سروودی 4

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
هەر کەس چ پیاو بێت چ ژن،
ئەو شتەی کە تۆ لە ژیاندا بە باش و پەسەند دەیژمێریت،
بە جێی بێنێت،
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
لە پاداشتی ڕاستی و بەهرەی مینوویی
کامەران دەبێت.
من ئەو کەسانە
بۆ ستایشتی ڕێگای تۆ ڕێنوێنی دەکەم و
لە تێپەڕگای داوەری دەیانپەڕێنمەوە.
گاتا، هاتی 46، سروودی 10

"ئۆردیبەهەشت، دووهەمین یاسای فەرمانڕەوا و هەنجارە بە سەر دانەی گەنم و هەموو دیاردەکانی گەردوون. لە جیهانی بووندا، ڕێکوپێکی و هەنجارێکی پتەو و گران فەرماندەرە و هیچ شتێک لە دەرەڤەی فەرمانی هەنجار و ئۆردیبەهەشت نییە. هەنجار لە ڕەوانی مرۆڤدا، ڕاستی و پاکییە. دوژمنی هەرە مەزنی ڕاستی و داد و مرۆڤ، درۆیە. ڕاستی لە ڕەوانی مرۆڤ، مایەی خۆشی و خوڕەمی و شادمانییە و هەر چاکەیەک کە لە جیهاندا هەیە، لە ڕاستی هەڵدەستێت و لە

هەمبەری ڕاستی، درۆیە. درۆ مایەی خراپەکاری، فریو، خەم، دڵتەنگی، گوناهو گرژی لە مرۆڤدایە. سروودی من لە بارەی ڕاستی بەم شێوەیە":

هەموو مرۆڤێک لەم جیهانەدا،
پێویستە کردارەکانی لە سەر پایەی ڕاستی بێت،
چونکە ڕاستی بنیاتی ئایینی ژیانە.
پێویستە ڕابەری دادگەر،
لەتەک چەواشەکاران و ڕاستکاران و
هەروەها لەتەک ئەوانەی کە کرداری چاکە و خراپەیان
تەڤلی یەکدی کردووە،
بە گونجاوترین ڕەوشت هەڵسوکەوت بکات.
گاتا، هاتی 33، سروودی 1

ئەی ئەهۆرا..!
لە کاتی پاداشت و
ئەو کاتەی کە سەرکەوتنی ڕاستی بە سەر درۆدا
مسۆگەر دەبێت و
فریوی ئەکۆمەن (بیری خراپ) و لایەنگرانیان
بۆ هەمیشە ئاشکرا دەبێت،
ئەوسا، لە بەر پرشنگی بەخشایشت،
ستایشتی تۆ و
خۆشەویستی بە تۆ پتر دەبێت و
بەر و بەهرەی بەختیاری بە ئاکام دەگات.
گاتا، هاتی 48، سروودی 1

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کاتەی کە لە دڵەوە
بانگت دەکەم،
بێجگە لە ڕاستی و
ڕامانی پاکی تۆ،
چ کەسێک یارمەتیی ڕەوانی من دەدات؟
کێ پشتیوانی من و
یارانم دەکات؟
گاتا، هاتی 50، سروودی 1

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەی بەتواناتر لە هەمووان..!
ئەی پاکی..!
ئەی ڕاستی گەردوونگێڕ..!
ئەی ڕامانی پاک..!
ئەی توانای مینوویی..!
گوێم لێ بگرە،
ئەو دەمەی کە پاداشتی هەر کەسێک دەدەی،
بۆ منیش بەخششت هەبێت.
گاتا، هاتی 33، سروودی 11

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
لە بەر تریفەی ڕامانی پاک و

لە بەر پرشنگی تۆدا،
ئاكامی دوو لایەنی چاكە و خراپە،
ڕوون دەبێتەوە و
بە پەرەگرتن و پتربوونی ڕاستی و پاكی،
فرە لە پەیجۆران،
ڕێگای تۆ هەڵدەبژێرن.
گاتا، هاتی 47، سروودی 6

"شەهریوەر سێهەمین یاسای فەرمانڕەوا بە سەر بووندایە. ئەمە شەهریوەرە كە ڕێكوپێكی، هاوسەنگی، سازكەری لە جیهان، فەرمانڕەوایی چاكی، توانامەندی مینوویی، خۆڕاگری و مامناوەندیبوون لە ڕەوانی مرۆڤدایە. جیهانی بوون مەیدانی بەربەرەكانێی دو ڕاكێشەری هاوزاد و دژ بە یەكە. ڕێكوپێكی و ڕاگرتنی لاسەنگی، لە بەگژداچوون و سازگاری دوو ڕاكێشەر بەدی دێت و ناڕێكوپێكیش لە لاسەنگی. لە پێواژۆ و ڕێتكەی ئافراندندا، بوونی دیاردەكانی هەستی لە ڕێكوپێكییە و لە كاتی لاسەنگی دیاردەكەش ڕێگای تێكچوون و خراپی دەگرێتە بەر و لە ئاكامدا لە ناو دەچێت".

"لە ڕەوانی مرۆڤیشدا دوو ڕاكێشەری هاوزاد و دژ بە یەک هەیە كە بە چەشنی خواست* و ئارەزوو دەبینرێت و ڕێكوپێكی و هاوسەنگی و لەسەرخۆیی یا هەمان شەهریوەر كاتێكە كە مرۆڤ توانای ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوانی خواست و ئاوەزی خۆی ڕا بگرێت و حەز و خواستی لە ژێر ڕكێف و فەرمانی ئاوەزی دەرهێنابێت. خۆی ئەم توانامەندییە كە سەرچاوەی هەموو وزەكانە و بە مرۆڤ ئاسایشت و خۆشی و شادومانی دەبەخشێنێت. لەسەرخۆیی و هێمنی و داد و دادگەری لە توانامەندی مینوویی وەدەست دێت. ستەمكاری، توندڕەویی، زیادەڕەویی*، دەستدرێژی، چەواشەبوون و كاری ناشایست هەمووی لە نەبوونی

هێزی خۆڕاگری و توانامەندی مینووییە. بۆیە توانامەندی مینوویی لە پاڵ داد و ڕاماندا، بەڕێز و پیرۆزە، من هەمیشە ڕێز و ستایشتی دەکەم".

ئەی مەزدا..!
ئیسە ستایشتی تۆ و ڕاستی و
پاکترین هزرەکان و
توانامەندیی مینوویی دەکەم،
دەمەوێت لە ڕێگای ڕاستدا بم و
لە سەرای سروود،
گوێ بۆ سەوداسەرانی تۆ،
بگرم.
گاتا، هاتی 50، سروودی4

ئەو کەسەی کە ڕێگای چاکە هەڵدەبژێرێت،
توانای مینوویی،
رامانی پاک و ڕاستیی دەست دەکەوێت و
پاکی بە تەن و گیانی ئەو،
پایەداری و توانامەندی دەبەخشێت.
بێگومان چونکە ئەو لە لایەنی تۆ بووە،
لە ئەزموونی گرانی ژیاندا
سەردەکەوێت.
گاتا، هاتی 30، سروودی 7

"ئەسفەند ڕاکێشەری هەموو هەستییە. لە هەستیدا دوو ڕاکێشەر فەرمان دەدەن، «دوورکەر» و «کێشەر» کە هەموو دیاردەکانیەوە کار و کاردانەوەیان تێدا دەبینرێت. هێزێک لە ناو دەروونی گەنم هەیە کە بەشێک لە گەنم بەرەو خاک و ئاو ڕاکێش دەکات و بەشێکیشی بەرەو ڕووناکی و ڕۆژ و هەوا دەچێت، هەر دووی ئەم هێزە دوورکەر و کێشەرە. گوڵی گەنم گەرمی و تیشکی خۆر ڕادەکێشێت و لە خۆشی هێزێک بەرەو هەتاو بڵاو دەکاتەوە. لە هەر دیمەن و نموونەیەکی بووندا، ئەم کار و کاردانەوە و کێشەر و دوورکەرەوە هەیە و ئەمە دەبێتە مایەی باڵاکردن و گەیین و گەڕیانی ئەو دیاردەیە. کێشان و دوورخستەوە و کار و کاردانەوە و ڕەنگ و ڕەنگدانەوە لە مرۆڤدا بە چەشنی ئەڤین، لەخۆبوردن، داد، بەخشش، ڕامانی دروست، هەڵسەنگاندنی ڕاست، خۆپارێزی و پاکی و خاسی دەبینرێت، کە ئەمانە دەبێتە مایەی خۆشی و شادومانی و کەیفخۆشیی دڵەکان و گیانەکان".

ئەی مەزدا..!<br>
تەنیا ئەو کەسانە دەتوانن<br>
دل و گیان و کەسایەتیان،<br>
لەتەک ڕامانی پاکدا پەیوەند بدەن،<br>
کە لە ڕێگەی جوانمەردی و ڕاستی و زانایی<br>
هەنگاڤیان نابێت،<br>
لە ئاکامدا ئەم کەسانە،<br>
جیهانی جاویدانیی تۆیان<br>
پێ دەبەخشرێت.<br>
گاتا، هاتی 49، سروودی 5

من،

بەو هۆرە بە جۆش و گەرمانە
کە لە دڵمدا هەڵمبەستوون،
دەستەوتکا،
ڕوو لە تۆ دەکەم،
بە ڕاستی و بە لەخۆبوردوویی مرۆڤێکی خۆبەختکار،
بۆ تۆ نوێژ دەکەم و
لە بەر تریفەی باڵکێشی رامانی پاکدا،
لە تۆ نزیک دەبمەوە.
گاتا، هاتی 50، سروودی 8

ئەی مەزدا..!
من رامان و ڕەوانی پاکی ڕاستکاران،
لە بارەگای تۆدا
بە ئێوە دەستپێرم،
تا ئاگاداری ئەوان بیت.
هەروەهاش ستایشتی جەوانمەردی و
خواستەکانی دڵ دەکەم،
ستایشتی تۆش دەکەم،
چونکە پاتشای
مەزنیی و پایەداریی و جاویدانیت.
گاتا، هاتی 49، سروودی 10

"خۆرداد باڵاکردن و گەیینە، لەو کاتەوە کە دانی گەنم دەچێندرێت تا ئەو کاتەی کە دەنکی گەنمی فرەی لێ بەدی دێت، لە ناو پێواژۆی باڵاکردن و پێگەیشتندایە.

لە دەروونی گەنمدا هێزێکی شاراوە، دانی گەنم بەرەو سەوزبوون و گوڵدان دەبات. هەستی و هەموو دیاردەکانی بە خواست و ڕاکێشانی زاتی دەروونی یان لە کۆششی هەمیشەیی و بێوچانی گەشەسەندندایە. لە جیهانی بووندا ڕاوێستان نییە و هەموو دیاردەکانی هەستی هەمیشە لە جووڵە و ڕۆیشتن و لە پێواژۆی بووندان. جیهانی هەستی لە گەڕیان و گەشەسەندنی هەمیشەیی خۆیدا بە چەشنی جۆراجۆری زایین، مردن، فرەهی، کورتاسی، دابڕین و لکاندندایە. ڕۆیشتن و گەشەسەندنی جیهانی هەستی دارای شێوەگەلی بەردەوامبوون، چەندوچۆنی، ڕەسەنی و جەوهەرییە. لە پێواژۆی ئەم جووڵە و گەڕیانەدا، هەر یەک لەم شێوانە بە یەکدی دەگۆڕێن".

"لە پێواژۆی گەڕیان و باڵاکردندا، وزە بە شێوە دەردێت و شێوەش بە وزە. ئارمانجی گەڕیان و بزاڤ لە بووندا باڵاکردن و ڕەسینە. هەموو دیاردەکانی بوون لە یەک ڕێگەدا گەشەکەر و بە یەک پەیوەندن و لە ڕێگای ئەم باڵاکردن و پێگەیشتنەدا هەر گاڤ لە گاڤێگی پێشتر بانتر و لە گاڤی دواتریشدا درێژترە و ڕێتکەی گەڕیان و باڵاکردن لە بووندا، بێوچان و گاڤ بە گاڤە. لەم ڕێتکەیەدا توندی و پێشکەوتن و گەشەسەندن و زەریفی و وردیی هەر گاڤ لە گاڤی پێشتر زۆرتر و پتەوتر دەبێت. ڕۆیشتن و باڵاکردن و گەشەکردنی جیهانی بوون، پێواژۆیەکی بێگەڕانەوەیە، یەک ڕووە و بە تەوژم و لەز و پێشڕەوە. هەر چی جیهانی هەستی بەرەو پێش بچێت، گەشەکردن و باڵاکردنیشی پترتر دەبێت. زاگۆنی خۆرداد لە ڕەوان و ڕامانی مرۆڤ، پشکووتن و ڕەسین و شادبوون و لەشساخییە، هەر ئەمەشە کە مرۆڤ بەرەو ڕووناهی و ڕاوەستاوی و توانامەندی دەبات".

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو شتەی کە شیاوی تۆ و لە ڕێگای ڕاستیدایە،

به ڕێزەوه بۆ تۆ
به جێی دەهێنین و
پێشکەشی تۆی دەکەین،
ئارەزوومەندم که هەموو کۆمەڵان،
له بەر تریفەی رامانی پاک و شکۆداری تۆدا،
به پێگەیشتن بگەن.
ئەی مەزدا..!
به دڵنیایی مرۆڤی دانا
هەمیشه له وزەی مینوویی تۆ خەنی دەبێت.
گاتا، هاتی 34، سروودی 3

"ئامۆرداد بوونی نەمر و جاویدانییه. هێزی ئافراندن هەمیشه له ئافراندن و زایین و مردندایه و ئەم کاروباره هەمیشەیی و جاویدانییه. ئەمەی که گوترا، ناساندنی ئەمێشەسپێنتەکان له بوون و ڕەوانی مرۆڤدایه که هێندسەی* بوونی لێی بەدی دێنێت. له هێندسەی هەستی جیهانی پچووکدا، بنیات و زاگۆنێک که به سەر دەنکەکانی گەنم فەرمان دەدەن، هەر دروست وەک جیهانی مەزنه و هەر دوو وەک یەکن و له یەک زاگۆنیش فەرمان دەبن. مرۆڤ جیهانێکی پچووکه له جیهانی مەزن و له هەمان کاتیشدا ژێر کاریگەری و فەرمانی زاگونەکانی جیهانیی و ئەمێشەسپێنتەکانه. جا ئەگەر تیشکی ئەمێشەسپێنتەکان به سەر ڕەوان و زیندەگانی بکەوێت، ئەوه شادی و بەختیاری و خورەمی ژیانی دادەگرێت و دەبێته ئاوێنەیەک بۆ دیمەنی هەستی و ئاوەزی گشتی و دەبێته تیشکی درەخشان و هەنجاری بوون و ئەهۆرا مەزدا. ئەمێشەسپێنتەکان له گۆڕەپانی ڕەوان و ژیانی مرۆڤدا، هەنگاوەکانی پاڵافتن و ڕازانەوەی ڕەوانن که له رامانی پاکەوه دەگرسێت و دوای پێوانی هەنگاوەکانی ڕاستی، داد، خۆپارێزی، لێبووردیی، ئەڤین، پاکی،

گەشەسەندن و پشکووتن بە ئاموورداد بە واتەی جاویدانی دەگات. لە دینی بەهدینی هەموو مرۆڤ کە ڕێپێوەرانی ڕێگای ڕاستی و ڕووناهی و چاکین، گەرەکە ئەم هەنگاوانە بۆ خۆرداد و ئامۆرداد، کە هەمان پێگەیشتن و شادی و خۆڕەمیی هەمیشەییە بنێن".

# وڵاتی بەهدینانی زەردەشت



"ئەی زەردەشتی زانای مەزن..!، سپاسی فراوانی تۆ دەکەین کە ئەمێشەسپێنتەکان و هێندسە و هەنجاری بوونت بۆمانت ڕوون و ئاشکرا کرد، بەڵام پرسیارێکی دیکەم هەیە. ئەو ڕۆژە کە تۆ ڕازی ئەمێشەسپێنتەکانت ئاشکرا کرد، شەوەکەی هەموو بیر و هزرمی بە خۆیەوە خەریک کردبوو و هەر بەم بیرەشەوە خەوم لێ کەوت و پاشان خەونێکی سەیرم بینی. لە خەونم بینی لە جاڕێکی* گەنمدا ڕاوەستابووم، گەردوونەیەکی ڕووناکم بینی کە بەرەو ڕووی من دەهات. گەردوونەکە بە لامدا تێپەری و بەرەو شارێک کە لە نزیکی جاڕەکە بوو، دەڕۆیشت. کاتێک کە گەردوونەکە نزیکی دەروازەی شارەکە بووەوە، تاکی دەروازەکان کرایەوە، لە سەر دەروازەکان کرد، نووسرابوو «شارباژێری ڕووناکی زەردەشت». گەردوونەکە چوە ناو باژێرەکە و لە ناکاو هەرا و هاواری شادی و

خۆشی، دانیشتوانی شارەکەی داگرت. منیش کە تامەزرۆی بینینی شارەکە بووم، بە گورجی لە دوای گەردوونەکە چوومە ناو باژێرەکە و لەوپەڕی سەرسوڕهێنەری لە یەک ساتدا، هەموو جوانییەکانی جیهان لە پێش چاوم ئاشکرا بوو. شارێکی خۆش و پاک و پڕ لە جوانی، دانیشتووانی شارەکە لەشساخ و بەدەماخ و شاد بوون، هەموو خەریکی کار و خەبات و خوێندن بوون، هەموو لێو بە خەندە و شاد و کەیفخۆش بە چەشنێکی بێ وێنە. لە هەر سووچێکی شار دەنگی خۆشی پێکەنین دەبیسرا. سەرانسەری شار بە درەخت و گوڵ و سەوزەڵانی داپۆشرابوو. شار پاک و خاوێن بوون، خەڵکەکەشی جامە و ڕەخت و بەرگی شایان و ڕازاو و پاکیان لە بەر بوو. شارەکە لە ژێر چەتری داددا دەژیا و دادپەروەران و دادگەران پتەو و ڕاوەستاو لە سەر شار فەرمانیان دەدا، بە چەشنێک کە بە قەد دەنکە هەرزەنێک ستەم لە کەسێک نەدەکریا. ئای کە شارێکی خۆش بوو، چەنێک خەڵکی شار ئاسووە و بێ خەم بوون، چەنێک شاد و فرەمەند* و دڵخۆش بوون. بە هۆی ئەوە کە سواری گەردوونەکە بووم، توانیم هەمووی شارەکە ببینم. پاش گەڕانی هەموو شارەکە، گەردوونەکە لە دەروازەی دیکەی شارەکە چوە دەرەوە و من خۆمم لە ناو جاڕە گەنمەکە بینیوە. بەیانی بە ئاواز و چریکەی چڤیک و کەڵەشیری لە خەو ڕابووم.

ئێستا ئەی زەردەشتی هێژا..! دەمەوێت لە ڕازی ئەم خەونە سەیرە ئاگادارم بکەی".

"ئەی جامئەسپی بەڕێز..! خەونێکی هێژا و جوانت بینیوە، خەونی شاری نموونەیی و چاکی کە ویست و ئاواتی منە و هەوڵ و کۆششی بۆ دەکەم، هیواشم وایە کە هەموو گوند و باژێران ڕۆژێک بەم چەشنەی لێ بێت. ئەو باژێرە کە تۆ لە خەونت بینیوتە، باژێرێکە کە ئەهۆرا مەزدا و ئەمێشەسپێنتەکان فەرمانی لێ دەدەن، ئەمەش باش بزانە هەروەها کە پێشتر وتم ئەمێشەسپێنتەکان شەش یاسای فەرمانڕەوا بە سەر بوون و ڕەوانی مرۆڤدان کە لە سەر ژیانی کۆمەڵایەتیی

مرۆڤیشدا بە شەش شێوە ئاشکرا دەبن، ئەنجام و کاردانەوە و بەکارهێنانیان ئەو شارە دەبێت کە تۆ لە خەونەکەت بینیوتە. ئێستا دەخوازم شاری هیوا و ئاوات، وڵاتی پاکی و باشی، وڵاتی بەهدینان، بە ئێوە بناسێنم".

"هەروەها کە ئاماژەم بۆ کرد باژێری چاکە، باژێرێکە کە لەوێ ئەهۆرا مەزدا و ئەمێشەسپێنتەکان فەرمانی لێدەدەن. بەڵام با بزانین فەرمانڕەوایی ئەهۆرا مەزدا و ئەمێشەسپێنتەکان و چۆنیەتی شێوەی بەڕێوبەرایەتی وڵاتی بەهدینان بە چ چەشنێکە. هەروا کە پێشتر زانیتان، هەستی دارای گەوهەرێکی تاک و یەگانەیە، کە ئەوەش هێزی ڕووناهییە و هەموو دیاردەکانی هەستی گرساو و هەڵقوڵیو لەو و چەشنێکی ئەوە. ئەم باژێرە پیرۆز و بەهاتەش خاوەنی گەوهەرێکی بنیاتییە کە ئەم گەوهەرەش دانیشتوانی باژێرەکەیە، کە ئافەریدەی داداری مەزنن. هەموو کۆشش و هەوڵدانی باژێرەکە بۆ ژیانێکی خۆشتر و ئاسوودەتر و پڕئاسایشتی دانیشتووانی باژێرەکەیە، بۆیە هەموو شتەکانیشی بۆ دانیشتوانی باژێرەکەیە. لەم باژێرە خەڵک بڕیار دەدەن و خۆشیان زاگۆنەکانی جێ بە جێ دەکەن و بە کاری دەبستن. لە وڵاتی بەهدینان هەموو شتێک بە ناوی گەل دەست پێ دەکات و بە ناوی گەلیش کۆتایی پێ دێت. لەم باژێرە هیچ چینێک بە سەر چینێکی تر تایبەتییەکی بانتر و سەرتری نییە، تەنیا جیاوازیەک هەبێت لە نێوانیاندا بە هۆی ئاگایی و پاکی و زانستە. کۆڵەکەیەکی گرینگی دیکە لە ژیانی باژێروانانی ئەم شارە، کارکردنە. کار نرخێکی سپەندی* هەیە و بە چاوێکی پیرۆز لێی دەڕوانن. جا هەر لەم ڕوانگاوەیە کە هەر کەس دەبێت بەهرەی کاری خۆی بخوات و بژێت و پێویستیشە کە هەر کەس کارێکی دروست و سوودبەخشی هەبێت کە شیاوی کۆمەڵگاکەی ببێت. دەرئەنجامی هەر کارێک، کە بە چەشنێک بۆ ئەندامانی کۆمەڵگا زیانمەند بێت، ناڕەوا و مەناومەنە*. لەم باژێرە بەدەستهێنانی هەر جۆرێک پێداویستی و دەرامەتێک، بێجگە لە ڕێگای کارەوە ناڕەوایە، بەڵام تەنها کەسانێک دەتوانن لە خەزێنەی گشتی و یارمەتییەکانی کۆمەڵگا ئالیکاری

وەربگرن کە هەرگیز توانای ئەنجامدانی کاریان نەبێت، کە ئەویش کۆشش دەکرێت بە جۆرێک بۆ ئەو کەسانە کارێکی شیاو بدۆزرێتەوە".

"گەوهەرێکی دی کە سەرچاوەی زیندووبوون و هەبوونی وڵاتی بەهدینییە، چاند و هونەر و شارستانیەتیەتی. فەرهەنگ هەوێن و شیرەی مرۆڤایەتییە، فەرهەنگ ئەنجامی ڕەوشت و توانامەندی و چۆنیەتییەکانی جەوهەری و مینوویی کۆمەڵگایە، بە درێژایی ژیانی بوونی. لە ڕەوشت و ئاکار و خوو و خەدە و ڕەفتارەکانی کۆمەڵگایەک لە ڕۆژگارێکی درێژدا، فەرهەنگی ئەو گەلە بەدی دێنێت. هەر ئەم فەرهەنگەشە کە بە چەشنی سروشت و ویژدانی کۆمەڵگا، گەوهەر و سەرچاوەی کردار و ڕەوشت و چۆنیەتی کۆمەڵ لە کۆمەڵگادا دادەڕژێنێت. بۆیە چاند، ڕێکوپێککەر و خەمڵێنەری ژیانی گەلانە. ژیانی جڤاک بێ چاندی ڕاستەقینە و ڕەسەن و سازکەر، سست و خوار و پەرێشانە".

"چاندی وڵاتی بەهدینی، چاندێکیە کە پا بە پای گۆڕانکارییەکانی سەردەم و ژیانی جەوهەریی دەگۆڕدرێت و گەشە دەکات و هاوئاهەنگ لەتەک نیاز و پێویستییەکانی زەمان، خشت و ڕێک دەبێت. چاندی ئەم شاربازێرە، سازکەر و مرۆڤانەیە و لە ڕێگای بەختیاریی کۆمەڵ و خۆشی و ئاسایشت و ئاسوودەیی هەمووانە. دانیشتوانی باژێرەکە هاوکات لەتەک ئەوە کە چاندی خۆیان ڕادەگرن و هەموو دامودەزگاکانی گشتیی، لە فەرهەنگ و هەوێنی خۆیان تێرئاو دەکەن، دژی هەر جۆرە کۆنەپەرستی و دواکەوتوویی و لاساری و هەر ڕەفتار و ئاکارێک کە دەبێتە هۆی چەوتی و بەردی سەر ڕێگای پێشکەوتن و نوێکردن، ڕادەوستن و بۆ پەرەپێدانی زانستیش دەکۆشن. دانیشتووانی باژێرەکە لەتەک ئەوە فەرهەنگی خۆیان دەپارێزن،لە چاند و شارستانیەتی خەڵک و گەلانی تر سوود و بەهرە وەردەگرن. هەر دیاردەیەکی چاندیی جیهانی کە بە چەشنێک بۆ چێبوون و باشترکردنی ژیانی کۆمەڵگا یارمەتیدەر بێت، بێ هیچ کەلەڕەقی و خیرەسەرییەک

وەری دەگرن و بەکاری دەهێنن، بەو مەرجە کە ئەو وەرگرتنە نەبێتە هۆی خۆ لەبیرکردن".

"گەوهەریکی دیکەی ئەم شارستانە، سامانی ژینگەیە، وەک ئاو و ئاگر و خاک و هەوایە کە هەمووی جێگای ڕێزە و بۆ پاک و خاوێنڕاگرتنیشی جڤاک دەکۆشن و پیسی ناکەن. خەڵکی شارەکە هۆشیان بە مێرگ و شوێنە سەوزەڵانییەکان هەیە و درخت و ڕەز و گوڵ دەچێنن و هەوڵ بۆ ڕاگرتن و پەرەپێدانی ئاژەڵی سوودمەند دەدەن".

"بەڵام لەبارەی فەرمانڕەوایی ئەمێشەسپێنتەکان لە شاری باش و نموونەیی بەهدینان دەبێژم و سەرەتاش لە فەرمانڕەوایی بەهمەن دەست پێ دەکەم. هەمان جۆر کە بەهمەن لە ڕەوانی مرۆڤدا مانای رامان و هزر دەهات، لە نەرینی کۆمەڵایەتیش هەر ئەم واتەیەی هەیە. لەم شارە ئەنجومەنی زانایان بەڕێوبەری شارەکە دەکەن و هەموو کارەکانی شارەکە لە ژێر فەرمانی ئەم ئەنجومەنەدایە. چۆنیەتی بەرپاکردن و چێبوونی ئەنجومەنەکەش بەم جۆرەیە کە هەفت ساڵ جارێک مەردوم لە نێوانی پاکترین و هۆشیارترین و تێگەیشتووترینی شارەکە هەفت کەسی بە ساڵاچوو هەڵدەبژێرن، کە بۆ ماوەی هەفت ساڵ، بەڕێوبەری شار دەخەنە سەر ئەستۆیان. ئەوانیش لە ناو خۆیاندا یەکێکیان دەکەن بە سەرۆکی شارەکە، هەر کەسیش بۆی هەیە تەنیا یەک جار ببێتە ئەندام و جارێکیش سەرۆکایەتیی ئەنجومەنەکە بکات".

"ئۆردیبەهەشت، دەستووری ئۆردیبەهەشت لە ژیانی کۆمەڵایەتیی شارستانی چاکیدا، داد و دادگەرییە. داد واتەی بوونی هەر تشتێک لە ڕێگا و جێگای خۆیدا. لەم شارەدا هەر کەس لە پەنای داد دایە و هیچ کەس بە هیچ جۆرێک بێدادیی لێ ناکرێت، داد بۆ هەمووان یەکسانە. لە باری ژیانی ئابووریشدا، داد پەخشکاری دەرامەتە. ئەو شتەی کە دادگەری لەم شارەدا بە جوانی و شایستەیی بەڕێوە دەبات، سزا و پاداشتە. لەم شارە هیچ تاوانێک بێ سزا و هیچ چاکەیەک بێ

پاداشت نامێنێت. کەیفەر و پاداشت لەو پەڕی وردبینی و هۆشیاری و دروستی و بوردباری و دووربینی لە بەر چاو دەگیرێت. سزا لە ڕیشەی خراپی دەئاڵێت و تەفر و توونای دەکات، سزا هاوڕێ لەتەک ڕاهێنان و باشکردندایە و سزا پڕ بە پێستی تاوانە، هەر تاوانبارێک گەرەکە بتوانێت لە خۆی بەرگری ڕەوا* بکات".

"شەهریوەر یا ڕێکوپێکی، زاگۆنی شەهریوەر لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا ڕێکوپێکی و خەملان، ڕازاوەیی و زەریفی لە رامان و گوفتار و لە هەموو شتێکدایە. خەملاندن و جوانی بە واتەی هەنجار و هاوئاهەنگیدایە. لە شارستانی باشی هەموو شتێک لەتەک یەکدی ڕێکوپێکە و دامودەزگاکان و هەموو بەشەکانی بەڕێوبەری لەتەک یەکدی سازگار و هاوئاهەنگن و هیچ شتێک نارێک و ناکۆک نابینرێت. لە ناو دەروونی ئەم ڕێکوپێکی و سازگاریدا، هونەر دەگرسێت، کە زۆر بەڕێزە و لای گەلیش پلە و پایەی تایبەتیی هەیە. شەهریوەر ئەو وزەیە کە نێوانی هێز و ڕاکێشانەکانی جۆراوجۆری ڕەوانی و کۆمەڵایەتی، هێڵی مامناوەندی و ئەندازەداری لە ڕووی گەل ئاشکرا دەکات. لەم ڕێگاوەیە کە تیرێژی خۆبەخشی و لەخۆبوردوویی و باشبوون و نرخاندنی دروست و ئاشتی لە ناو تاکی کەس و کۆمەڵگا بەدی دێنێت".

"ئەسفەند یا ڕاکێشان، زاگۆنی ئەسفەند لە ژیانی کۆمەڵایەتی بە شێوەی ئەڤین، دڵسۆزی، هاوژینی، یەکیەتی، جوانمێری، خوێنگەرمی، بەڕێزی، وڵاتپارێزی، یاوەری دەدرێت".

"خۆرداد، دەستووری خۆرداد گەشەپێدانی کۆمەڵگا و گۆڕاندنی هۆکارەکانی منخوازی و منویستی بۆ بەرەو گشتیخوازی و گشتویستییە. هەروەهاش خۆرداد بە واتەی دەوڵەتمەندی و بەهێزی و ئاسایشت و دڵنیایی و ئاسوودەیی و بێنیازی جەوهەری و مینوویی و پشکوتنی هەموو توانامەندیەکان مرۆڤ و پێشکەوتن و ئاوەدانییە".

"ئامۆرداد یان جاویدانی، زاگۆنی ئامۆرداد نەمریی و جاویدانییە. چێکردن و دامرزاندن و ساز و بازکردنی بازێری چاکی لە هەموو بوارەکانی جەوهەری و مینوویی بە چەشنێکە کە بۆ هەمیشە دایدەرژێنێت".

"ئەمە چۆنیەتیی فەرمانڕەوایی ئەمێشەسپێنتەکان لە شارستانەکەی ڕووناکی بەهدینییە. لە سەر ئەم دەسەڵاتدارییە کە فەڕ و شکۆ و جوانی و خۆشی و شادمانی و داد و دادگەری لە شارەکە بەدی دێت و هەموو شتێک لە ڕێگای گەشەسەندن و باشتربوونی ژیان و بەختیاری و ئاسوودەیی و ئاسایشتی هەمووان هەنگاڤ دەنرێت. لەم بازێرە و لە سەر بناغەی فەرمانڕەوایی ئەمێشەسپێنتەکان هەر کەس خەریکی کاری خۆیەتی و کەس کاری بە کەس نییە. ترس و پەژارە لە دڵی خەڵکدا نییە. هەموو کارێک ڕەوایە، مەگەر دژی داد و خێرەت و بناغە گشتییەکانی کۆمەڵگا بێت. مەردوم بە سۆز و بەڵێنی خۆیان فرە پابەندن. ڕێگا بۆ گەیشتن بە بەڕێوبەرایەتیی شارەکە تا بەرزترین پلە، بۆ هەر کەس کراوەیە و هەر کەس دەتوانێت شایستەیی و توانامەندیی خۆی بنوێنێت. لەم ڕێگاوەیە کە هەمیشە پاکترین و زاناترین و پلەمەندترین و تێگەیشتووترینی کۆمەڵگا فەرمان دەدەن. پێشکەوتنی هەر کەسێک بە ئەندازەی پاکی و نرخەکانی مینوویی و کردار و ڕەوشتیەتی. جڤاک لە ڕێگای دەوڵەتمەندی و سامانی گشتی و بەهرەگرتنی هەر چی زۆرتر و گشتیتر لە سەرمایەکانی نەتەوەیی دەکۆشێت. چۆنیەتی و چێکردنی بازێر هاوکات لەتەک پترکردنی دارایی و سامان و دەرامەتی گشتی و ئاسوودەیی ئابووری و پەخش و بڵاوکردنی دادگەرانەی دەرامەت بە چەشنێک کە نیازەکانی ڕەوا و دروستی هەر کەس بە ئاسانی و بە ئەندازەی پێویست بە جێ بێت. پێوانەی دابەشکردنی دەرامەت، کارە و هەر کەس کاری پڕبەهاتر بکات، لە دەرامەتی فرەتر بەهرەمەند دەبێت. هەر چی کار لە رامان و دانش پاراوتر بێت، بەڕێزترە. نێوانی زەمانی کار و کاتی پشوو ڕاژەیەکی ڕێکوپێک و دروست هەیە. جەنگ و هەرا و نەیاریی و لێدان و زەبر و زەنگ و

ئەشکەنجە و کوژتن و هەر تشتێک کە نیشانەی خوو و ڕەوشتی ئاژەڵی بێت، لەم شارە نییە. مەردوم لە کاتی نارێکی و یا شتێک کە دژی خواست و نەرین و بڕوای ئەوان بێت، دەکۆشن تەنها لە ڕێگای گفتوگۆ و داوەری، کێشەی خۆیان بکەنەوە و لە ناوی بەرن. بەم بیر و بۆچوونەیە کە لەم باژێرە بیری جەنگخوازی، ڕەگەزپەرستی، جیاوازی لە نێوان گوندی و شاری، ناوچەگەری، لاساری، توندڕەوی، خۆویستی، دەسەڵات و پاوەنخوازی، دەستدرێژی، ناکۆکی و جیاوازی دینی و تاکەپەرستی نییە. چۆنیەتی دروستبوونی تۆژ و چینەکانی شارەکە و شێوەی پەیوەندی و بەڕێوبەرایەتیی ئەجومەنی زانایانی شارەکە، بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە لەتەک هەموو لایەکدایە. هزر و رامانی ئاشتیخوازی وەها بەهێز و پتەو لە ناو جڤاکدایە، کە بەردەوام بۆ گەیشتن بەم مەبەستە دەکۆشن تا کۆمەڵگایەک لە جیهان بەدی بێنن کە هەموو شارەکانی جیهان ببن بە شارباژێری چاکی و هەر کیشوەرێک بە ڕاگرتنی داب و نەریت و فەرهەنگ ڕەوشتی خۆی، لە یەک بەڕیوبەرایەتیی مەزنی جیهانی کە ئەجومەنی زانایانی هەموو کیشوەرەکانی جیهان بەڕیوبەری بکەن، پێڕەوی دەکەن. لەم ڕێگایەوەیە کە بۆ هەمیشە جەنگ و دوو بەرەکی لە جیهان لە ناو دەچێت و خۆشبەختی و ژیانی خۆش و ئاشتیی جیهانی، بەدی دێت. چۆنیەتی ڕۆیشتن و پێگەیشتنی رامان و کرداری خەڵکی شارەکە بەم چەشنەیە کە لە جێگای تاکەکەس و تاکپەرستی، بە کۆ و بە گشتی بڕیار بدەن. بەم جۆرەیە کە جڤاک، شارەکە بە ماڵی خۆیان دەزانن و هەموو خەڵکی شارەکەش بە ئەندامێکی خێزانی خۆیان دەزانن. ئەمە ڕەوشتی بەخشین و لەخۆبردنە کە گشت ئەم گۆڕانکارییە پیرۆزانەی بەدی هاوردە. خەڵکەکە دارای ڕەوشتێکن کە لە جێگای ئەوە تەنیا بە سوود و خۆشی و ئاسایشتی خۆیان بیر بکەنەوە، لە بیری سوود و خۆشی و ئاسایشت و بەرژەوەندی گشتی هەن. خەڵک لە بیری خۆشی و ئاسایشتی خۆی و شاردایە و خۆشی و ئاسایشتی شار و هەمووان لە سەر سوود و خۆشی و ئاسایشتی خۆی بەرزتر دەزانێت و دەڕوانێت.

ڕەوشتێکی دیکە کە شاری بەم چەشنە لێ کردووە، خوو و ڕەوشتی ئازایخوازی و جوانمەردییە. ئازادیخوازی بەم واتەیە کە ڕەهابوون لە بەند و پاوەن و کۆیلەتی و لە هەموو شت و هەموو کەس. مرۆڤ کاتێک بەم ئاستە دەگات کە هەموو شت و هەر کەسی بوێت، بەڵام بە ئەندازە، نە زۆر نە کەم. ئەندازەیەک کە هزر و ژیرییەکی دروست و هەڵسەنگاندنێکی ڕێکوپێک، دیاریی دەکات. ئەندازەخوازییەک کە مرۆڤ لە پەرستنی بت و گرفتاربوون بە نەخۆشینی چاوچنۆکی ڕزگار دەبێت و هانی دەدات بۆ پەرستنی ڕاستی و داد، کە ئەندازە و پێوەری دروستی هەر تشت و هەر کەس و هەر کارێکە. پیت و بەهرەی لەخۆبردوویی و ئازادیخوازی بۆ دانیشتوانی شارەکە، ئاسایشت، دڵخۆشی، ئاسوەیی، کامەرانی و دڵفراوانی بە ئەرمەغان دێنێت. دانیشتویەکی ئازادیخواز و مرۆڤێکی بێفیز و خۆکەمگر، هەمیشە لە ڕێگای یارمەتی کەسانی دیکە هەنگاڤ دەنێت. کاتێک لەو شارەدا هەموو ئازایخواز و بێفیز و خاکسار بوون، ئەو کات بە مسۆگەری سێبەری ئاسایشت و بەختیاری بە سەر شاردا دەکێشرێت. نیشانەیەکی دی بۆ بەختیاری شارەکە، هەستی ناسکی هەڤاڵبەندی و شادیخوازانەیە. لەم تیشکەیە کە دەروون و دیمەنی قەشەنگی جەژنەکان بەدی دێت. ئەم شارە، شاری جەژن و هەڵپەرکێ و پلەزیقانە، شاری بەستە و هۆرە و ڕەشبەڵەک و دیلانە. خەڵکی شارەکە بۆ کەمترین شت جەژن ساز دەکەن و هەموو جەژنەکان ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە سرووشت و خەڵکەوە هەیە. لەم شارە باسێک لە شین و ڕۆڕۆ و پرسە و گریان و خۆڕنین نییە، مەگەر تەنیا ڕۆژێک لە ساڵدا بۆ جوانەمەرگان و گیانبەختکەران لە ڕێگای بەرگری لە زێد و خاکیان، ئاهەنگێک ساز دەکرێت.

لەم شارە، هەر چەندە منی زەردەشت بانگەوازی خەڵک دەکەم بۆ دینی بەهدینی، بە هەمان جۆر لایەنگیرانی ڕێباز و دینەکانی دی، بە ئازادی بانگەوازی خۆیان بکەن و ببن بە ئەندامی بەڕیوبەرایەتی ئەنجومەنی زانایان و هەموو بە ئاشتی و برایەتی بژین و هەرگیز بەهدینێک لە سەر دین لەتەک کەسێکی دیکە دژایەتی

ناکات. لە وڵاتی بەهدینی خەڵک لەتەک کەژ و شاخ و دەشت و مێرگ درەخت و گوڵ و گیا و هەموو دیمەنە جوانەکانی سروشت پەیوەندی و وابەستەگییەکی ڕاستەوڕاستیان هەیە. یەکێکی دی لە ڕێگاکانی بەختیاری گشتی لە وڵاتی بەهدینی ئەوەیە کە جڤاک بەشێک لە داهات و دەرامەتی خۆی بخاتە ناو خەزێنەی گشتی، کە بۆ کارەکانی ئاوەدانی و گشتی بە کار بهێنرێت. ڕێگای زێڕینی بەختیاریی بۆ ڕۆیشتنی وڵاتی بەهدینی، مامناوەندیبوونە، کە ئەم ڕێگایە بەر بە خواستە سەرکێشەکان دەگرێت و مەردوم لە نێوانی ترس و بێباکی، ڕێگای دلێری دەگرێتە پێش و لە نێوانی سستی و توندی، دووربینی هەڵدەبژێرێت و لە نێوانی دڵڕەقی و بەزەیی، ڕێگای جوانمێری و لە نێوانی لەز و خاویی، ڕێگای دروستبینی و دروستنرخاندن دەپەژرێنێت و لە نێوانی خواستی تاکەکەسی و خواستی گشتی، ڕێگای پێوان و چارەسەرکردن و لە نێوان فەرمانبەرداری بێبۆ و سەرکەشی، ئازادی و ڕەوشتی بێزیان هەڵدەبژێرێت. بەم جۆرە مرۆڤ بە شێوەیەک ڕەفتار دەگات کە زیان نەگەێنێت و لە نێوانی بەرەڵایی و زەبروزەنگ، ڕێکوپێکی و لە نێوانی دەستقونجاوی و دەستبڵاویی، مامناوەندی دیاری بکات. بە هۆی ئەوەیە کە یەکێک لە بناغەکانی ئەمێشەسپێنتەکان گەشەسەندن و گەیین و باڵاکردنە، ڕێگاکەشی فێربوون و پەروەردەکردنە، بۆیە لەم وڵاتە فێربوون و پەروەردەبوون فرە بەڕێزە. ڕاهێنان و پەروەردەکردن لە هەمان تەمەنی زارۆکی و لە ناو خێزان و بنەماڵە دەست پێ دەکات و تا کۆتایی ژیان بە شێوەی جۆراجۆر ئەنجام دەدرێت. پەروەردە و فێربوون لە سەر ستوون و بنچینەی ناسینی ڕازەکانی گەردوون و زانست و لە ڕوانگای ڕەوشت و خوو و خەدە، بەدیهێنانی تیرێژەکانی ڕاستی و پاکی، سامان و باریکبینی، کۆشش و پشوودرێژی، بڕوا بەخۆبوون و هەبوونی کەسێتی، سەربەخۆیی بیروڕا و ڕێکوپێکی، ڕاژە بە خەڵک و کۆمەک بە کۆمەڵگا، تەندروستی و شادمانی و سوودوەرگرتنی بەجێ لە کات و ڕۆژگار، ڕاوەستاوە. بەڵام لەمەڕ پەروەردەکردنی

تەن و لەش، مەردوم بە وەرزش و بەهێزکردن و پەوەردەکردنی لەشیان حەزی تایبەتیان هەیە. مرۆڤ لە هەمان سەرەتای زارۆکی تا کۆتایی ژیانی و لە هەموو پێواژۆکانی ژیانی، وەرزشی شیاوی خۆی دەکات و هیچ کاتیش دەست ڕاناگرێت. لەمەڕ ڕەفتاری پەروەردەش، مرۆڤ لە هەر گاڤێکی زیندەگانیدا، ڕەفتاری شایستە و شیاوی ئەو سەردەمەی هەیە و لە ڕەفتارەکانی ناشیرین و ناحەز دووری دەکات. گۆشەگیری و بە تەنهایی ژیان بردنە سەر، جێگای گلە و لۆمەیە. مەردوم خۆشی ژیانی هاوبەش و تێکەڵبوون و پەیوەندی دەبینیتەوە. یەکێک لە ئامانجەکانی پەروەردەکردن و ڕاهێنان، بەدیهێنانی هەست و خووی تەڤلیهەڤبوون و هاویاری لە ناو مەردومدایە. یەکێکی تر لە داب و نەریتەکانی جوانی وڵاتی بەهدینی، ڕێزداری و پلەمەندی ئاهەنگی زەماوەن یان بریاری هەلبژاردنی هاوسەرە. کچان و کوڕان لە تەمەنی لاوی هاوسەر هەڵدەبژێرن و شایی دەکەن. بێگومان هاوسەریی لە سەر بنیاتی ئەڤین و خۆشەویستییە، ئارمانجی هاوسەریی ئاسوودەیی و ژینی باشتری دوو لایەنە و بەدیهێنان و پەروەردەکردنی زارۆلەی بەکارە. لە وڵاتی بەهدینی، لەشفرۆشی و هەموو بابەتەکانی بەرەڵایی و بێبەندوباری نامۆ و بێگانەیە. درۆ مەزنترین تاوان و گوناهە، درۆ تەنیا گوتنی قسەی ناڕاست نییە، بەڵکو هەر شتێک کە لە ڕاستی رامان و زمان و گوفتار دوور بێت، درۆیە. گوناهی وەک دوو ڕوویی، خاپاندن، دەسکیسی*، خوڵتەکاری، خوسپکردن*، سوێندی ناڕەوا، جنێو و ناسزاگوتن، شپرزی و بێکاری هەمووی ئەمانە دیاردەی درۆیە و پیس و ناپەسەنە. دژی درۆ ڕاستییە کە بەرزترین و گەورەترین کەرپەیە*، ڕاستیش وەک درۆ هەر قسەی ڕاستگوتن نییە، بەڵکوو ڕەوشت و ئاکارێکە کە لە رامان و ڕەفتار و گوفتار، وردبینی، هۆشیاری، زانایی، دادگەری و دادپەروەری، ئەرکشناسی، بەئەمەگی، خۆڕاگری، هێمنی و لەسەرخۆیی و هەموو دیاردەکانی ڕاستی خۆی دەبینێتەوە. نێوخوازی و نەوژەنسازی، داهێنان و ئافراندن لە دیاردەکانی وڵاتی بەهدینییە،

هەموو وزە و توانامەندییەکانی مەردوم بۆ داهێنانی شتی نوێ و کۆشش و دۆزینەوە و لێکۆڵینەوە و ئافراندنە. رامانەکان بەدیهێنەرن و هەر ساتێک لە مێشکێک شتێکی نوێ بەدی دێت و گۆڕانکاریی گشتی لە ژیانی کۆمەڵان دەست پێ دەکات. بارودۆخ و ژینگەی شار بە چەشنێکە کە بوار بۆ وەرزشی رامان و داهێنان کراوەیە و هەر کەس دەتوانێت پا بنێتە ناو ئازموونگای ئافراندن. ئەو شتانە کە مایەی داهێنەری رامان و ئەندێشەیە و بیر و هۆش تا سنوورەکانی بەهرەوەری و زایین دەگەیەنێت ئەمانەن: بزاڤ، گەڕیان، وەرزش، لەیەکدان، گفتوگۆ، گوێگرتن،نرخاندن و پەوەردە و لێکۆڵینەوەی رامانەکانە، لەم وڵاتە شارە فەرهەنگ و هونەر گەشە دەکات. وڵاتی بەهدینی، وڵاتی هیوای ڕووناکی منە، هەر بەو جۆرە کە من بۆ گەیشتن بەم ئاواتە لە سروودەکانمدا ناساندوومە":

مەزدا ئەهۆرا،
ئەو کەسانە دەناسێت،
کە لە ڕووی ڕاستییەوە،
باشترینی پەرستشەکان بە جێ دەهێنن،
چ لە ڕابردوودا بووبێت و
چ لە ئێستادا بێت.
من ئەو کەسانە ستایشت دەکەم و
بە ڕێز ناو و یادیان دەکەم و
بە هۆرە و دروودەوە بەرەو پیرییان دەچم.
گاتا، هاتی 51، سروودی 22

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
مرۆڤی پاک و خۆپارێزی بیرچاک،

که ڕەوانی لەتەک ڕاستیدا ئاوێتەیە،
هەموو رامان و کرداری خۆی
بە تۆ پێشکەش دەکات،
هیوادارم بتوانم،
بەو سرووده پیرۆزانه
که دەیهۆنمەوه
هەروەها بە نیایشەکانم،
لێت نزیک ببمەوه.
گاتا، هاتی 34، سروودی 2

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئایین و خواستی تۆ چییه؟
ستایشت و پەرستشی شایانی تۆ کامەیە؟
ببێژه و بۆمانی ئاشکرا بکە،
تا له پاداشتی دەستوورەکانی تۆ تێ بگەین و
له بەر تریفەی ڕاستیدا،
ڕێگای خۆناسی و ڕەوشت پاکی بناسێن.
گاتا، هاتی 34، سروودی 12

ئەی مەزدا..!
من بە،
بەخرۆشترین سروودەکانم و
بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن،
ستایشتت دەکەم و

بە تۆ پەیوەند دەبم.
تا لە بەر پرشنگی ڕاستی و ڕامانی پاکدا،
پشتیوان و ڕێپیشاندەرمان بیت.
گاتا، هاتی 50، سروودی 7

ئەی مەزدا..!
کە وایە زەردەشت
پاکترین ڕامان بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت.
بەو هیوایەی
کە لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
ژیانی ئەنبووژەنیمان بە هێز بێت،
خۆبەختکاری و توانایی مینوویش
دڵی ئێمە ڕووناک بکات و
ڕامانی پاک،
بە کارەکانمان پاداشتی چاکە بدات.
گاتا، هاتی 43، سروودی 16

ئەی مەزدا..!
ئەو دەمەی کە خێرەتی پاکی تۆ،
بێتە خوارەوە،
هێزی مینوویی و ڕامانی پاک،
بە کاردانەوەیان،
جیهان بەرەو ڕاستی و پێشکەوتن دەبەن.
پاکی، دڵی مێرخاسان ڕووناک و

بەرەو ڕاستی ڕێنوێنییان دەکات.
کەس توانای خاپاندنی تۆی نییە.
گاتا، هاتی 43، سروودی 6

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کارانەی کە لە ڕابردوو ئەنجامم داون و
ئەو کارانەی کە لە داهاتوودا ئەنجامی دەدەم و
ئەو شتەی کە رامانی پاک دەوەشێتەوە،
هەر وەک تیشکی هەتاو و
گزینگی بەرەبەیان،
کە بە دیدەی تۆ شایستەیە،
هەمووی لە ڕێگای ڕاستی و
بۆ نیایشت و ڕێزلێنان و
فەڕ و شکۆی تۆ بووە و دەشبێت.
گاتا، هاتی 50، سروودی 10

ئەی مەزدا..!
بە دڵنیایی
ئەو کەسە ڕوو لە ڕاستی دەکات،
کە توانامەندیی مینووی و رامانی پاک،
ئامۆژگاری بێت،
هەر لە بەر پرشنگی ئەم بەخششانەدایە،
کە ئەگەر چەواشەکاران دەوریشان تەنیبێت،
هەر لە ئاوەدانکردنەوەدایە.

گاتا، هاتی 50، سروودی 3

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
کەی سپیدەی ئەو ڕۆژە دەبینرێت،
کە ڕاستی بۆ پاسەوانی جیهان بدرەوشێتەوە؟
کەی سوشیانسەکان،
بە ڕاهێنانی پترکەری و زانایانەی خۆیان دێن؟
رامانی پاک
هاریکاری چ کەسێک دەکات؟
ئەی ئەهۆرا..!
تەنها من ڕاهێنان و ئایینی تۆ دەپەژرێنم.
گاتا، هاتی 46، سروودی 3

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
چییە خواستی شکۆداریی باشی تۆ؟
چییە بەخشش و پاداشتەی تۆ
بۆ من یارانم؟
چەندە بە ئاواتم،
کە لە ڕێگای ڕاستییەوە،
ئێوە بۆ باوەڕمەندانت ئاشکرا ببیت،
تا بە هاریکاریی رامانی پاک،
بۆ پێشبردنی کارەکانی خۆیان تێ بکۆشن.
گاتا، هاتی 48، سروودی 8

"ئەمە وڵاتی بەهدینی بوو کە من شێوە و چۆنیەتی ئەوم بۆ ڕوون کردنەوە، ئێستاش لە جامئەسپ دەخوازم کە لە جامی جیهانبینی خۆی، لەو باژێرە بڕوانێت و بۆ هەموومانی بینوێنێت و باسی کەی، چونکە لە داهاتوو، لە سووچێکی ئەم جیهانەدا، وڵاتی بەهدینی بە دیی دێت".

"ئەی زەردەشتی پاک و هێژا..! ئەی مامۆستای مەزن..! هەزاران ئافەرین و درووود بۆ ئێوە کە وڵاتی پاکی بەهدینی خۆتت بۆ ئێمە ڕوون کردەوە. من بە باشی وڵاتی پاکی بەهدینی لە جامی جیهانبینەوە دەبینم، خەڵک بە تۆ باوەڕیان هەیە و ڕاهێنانە بە نرخەکانی تۆیان خستووتە ئاراوە. لەم وڵاتە ستوونی ژیان هەمان کۆڵەکەی گرینگی ئایینی ڕاستی، ئایینی بەهدینییە و سێبەری شادی و ئاسایشت و فرەهی و یەکسانی و دادگەری، باڵی بە سەر باژێردا کێشاوە. من لە جامی جیهاننماوە ئاوا دەیبینم".

# جەژنی پەیمانی هاوسەریی
# (زەماوەند)



چ کات و ساتێکی پیرۆزە، چ کارێکی بەهات و جوان و خۆشە. هەرگیز ئەم هەموو شادمانی و خۆشییە بە یەکەوە ئاوا لە هیچ کوێ ڕووی نەداوە. لە ناو تەلاردا رۆژ لە سەر کورسییەک ڕونیشتبوو و مانگیش لە گەڕیانی خۆی دەستی هەڵگرتبوو و هاتبوە خوارەوە و ڕۆژی خەملاندبوو. ئەستێرەی ڕووناکی سوهەیل*

و گەلاوێژی* بارانزاش لە تەنیشتیان بوون. بارانی پڕ پیت و فەڕ و بڕشتی گەلاوێژ، هەزاران گوڵی ڕەنگاوڕەنگی ڕواندبوو. سترانبێژی ئاسمان و پاسەوانی ڕووبار و چۆم و دەریا و ئاوەکان، چەنگی دەژەنی و سروودی دەچڕی و لەتەک ئاوازی تاڤگە و بەستە و سرووده خۆشەکانی ئاناهیتا، یەکیان گرتبوو. هەموو شوێنێک جوانی و شادی و خۆشی و ستران و دیلان و چەپڵەرێزان جەژنە، جەژنی شایی بانوو پووروچیستا* و جامئەسپە. کیژی زەردەشت، مانگی چواردە ئیمڕۆ دەست دەخاتە ناو دەستی جامئەسپی دانا بۆ بەستنی پەیمانی هاوسەری و ژیانێکی نوێ، ژیانی کەیبانوویی و هاوسەری و پەرەستاری* و دایکیی. پوورەچیستا ڕۆڵەی زانستە و ئەرکی دایکیش هەر وەک مۆم داگرساوە و گیانی منالآن بە زانست، ڕووناک و دەڕازێنێتەوە، هیوادارم پێشڕەو و نموونەی ئایینی بەهدینی و ڕاستی و پاکی بێت و هەم خانووی خۆی بە سۆز و هەستی بەرزی خۆی بخەملێنێت، هەروەهاش شار و وڵاتی خۆی و هەموو جیهان دروست و سەرفەراز بکات.



پوورەچیستا، بە ڕوویەکی گەش و دڵێکی پڕ لە هیوا و شادمانەوە دەستی لە ناو دەستی جامئەسپ بوو. چونکە هەر کات پەیمانی هاوسەری لە سەر بنەمای خۆشەویستی و ئازادی هەڵبژاردن و بە دڵ و گیان بێت، ئەوە خۆشی و شادی لە دڵ و چاوەکان دەگرسێت و پەیمانی هاوسەریی پتەو و هەمیشەیی دەبێت. لەم ئاهەنگە بەهات و پیرۆزەدا، زەردەشت بە خەرمانێک تیشک و لێوێکی خەندان و دەنگێکی خۆش، سروودی دەخوێندەوە:

ئەی پوورەچیستای ئەسپنتمان هێچدسپان..!
ئەی جەوانترین کچی زەردەشت..!
مەزدا ئەهۆرا،
ئەو کەسەی کە بە هزری باش و
بە پاکی و ڕاستییەوە پابەندە،
وەک هاوسەرێکی باش بۆ تۆ دەدات.
کە وایە لەتەک بیری خۆت ڕاوێژ بکە و
بە ئەڤینی پاک و زانستی باش ڕەفتار بکە.
گاتا، هاتی 53، سروودی 3

کاتێک زەردەشت ئەم سروودەی خوێندەوە، بانوو پوورەچیستا بە دەنگ و ئاهەنگێکی فرە خۆش کە گیان و دڵی لاونا* و نەوازشت دەکرد لە وەڵامی بابی خۆی فەرمووی:

بێگومان ئەو کەسەی،
کە بۆ ئەندامەتی هاوڕێیان و خانەوادە،
هەروەک باوک و سەروەر هەڵبژێردرابێت،

خۆشم دەوێت و هەڵیدەبژێرم.
هیوادارم کە تریفەی ڕامانی پاک،
بەر منیش کەوێت و
ژنێکی جەوانمەرد و داوێنپاک و شایستە بم لە ناو پاکاندا.
ئارەزوومەندم مەزدا ئەهۆرا،
بۆ هەمیشە لە ئۆلی بەهدینی
کامەرانم بکات.
گاتا. هاتی 53، سروودی 4

زەردەشت بە کەیفخۆشی گوتەی کچە دڵبەند و ئازیزەکەی بیست و پاشان ڕووی کردە هەموو کیژ و کوڕانی بانگهێژکراوی ناو شاییەکە و فەرمووی:

ئەم گوتانە بۆ ئێوە دەڵێم،
ئەی تازەبووکان و تازەزاوایان..!
پەندم بە ڕامان ببیستن و بە یادی بسپێرن و
بە ویژدانێکی ڕۆشن وەری بگرن و بە کاری بهێنن:
هەمیشە ژیانتان بە ڕامانی پاک ببەنە سەر و
کۆشش بکەن کە لە ڕاستیدا،
پێشبڕکێی یەکدی بکەن،
تا لە ژیانێکی پڕ لە خۆشی و بەختیاریی
بەهرەمەند ببن.
گاتا، هاتی 53، سروودی 5

ئەی پیاوان و ژنان..!

ئەمە بە چاکی بزانن کە لە لەم جیهانەدا،
درۆ خاپێنەرە،
خۆتانی لێ بپارێزن و پەرەی پێ مەدەن.
ئەوەش بزانن کە،
ئەو خۆشیەی کە لە خراپەکاری و چەواشەکردنی ڕاستی و
بێچارەکردنی کۆمەڵان وەدەست دەکەوێت،
ئاکامی پەژارییە.
ئەو چەواشەکارانەی کە ڕاستی لە ناو دەبەن،
ژیانی مینوویی خۆیان لە ناو دەبەن.
گاتا، هاتی 53، سروودی 6

پاداشتی ئەنجومەنی مۆغان،
تا ئەو ڕۆژە بۆ ئێوە دەبێت،
کە لە ژیانی هاوسەریی خۆتاندا،
چ لە هەبوون و چ لە نەداریدا،
لەتەک یەک سازگار بن و بە مێهرەبانی بژین.
بەڵام ئەگەر ئەندێشەی درۆ بە سەرتاندا زاڵ بێت و
ئایینی ئەنجومەنی مۆغان ڕەها بکەن،
ئەنجامەکەی تەنیا خەم و ڕەنج و ئەفسۆس دەبێت.
گاتا، هاتی 53، سروودی 7

بە دڵنیایی لە ئاکامدا،
چەواشەکاران و خراپەکاران،
فریو دەخۆن و گاڵتەیان پێ دەکرێت و سەرزەنشت دەبینن،

بەڵام لە ژێر ڕێبەرایەتی دروست و دادگەردا،
ژنان و پیاوان لە گوند و شاریاندا،
بە ئاشتی و ئاسایشت دەگەن.
خراپەکاریی و فریوکاریی
کە وەک زنجیرێک
گرێدراوی مەرگن،
لە ناو دەچن.
مەزدا ئەهۆرا، کە لە هەمووان مەزنترە،
ڕوو لە ئێمە دەکات.
گاتا، هاتی 53، سروودی 8



دوای ئەوە کە ئەم سرووده خۆشانە خوێندرایەوە، پرس و پەیمانی هاوسەری لە نێوانی پوورەچیستا و جامئەسپ بەسترا و ئەڵقەی پەیمان گۆڕایەوە و پاشان گەواهی گەواهەکان خوێندرایەوە:

**"یەک دڵ و ڕاست بە، لەتەک یاران نەرم و بۆردبار و گەشبین بە، تووڕە مەبە، خوەسن مەدە، چاوبرسی مەبە، دڵفراوان بە، رەشک* مەبە، هەوەس و کەڵکەڵە پەروەردە مەکە، بە هەوڵ و کۆششی خۆت پشت ببەستە، بۆ پاکان و خاسان سوودمەند ببە، لە چاوچنۆک و دەستقونجاو دووری بکە، هاوڕێیەتیی نادان و جنێوفرۆش مەکە، پەیوەندی لەتەک بەدناو مەکە، لەتەک دوژمناندا دادگەر ببە، ڕێزی ویستی دۆستانت بگرە، بەربەرەکانێی هەژاران مەکە، لە کۆڕ و ئەنجومەندا ئاگاداری ئاخافتنت ببە، هەرگیز ئازاری دایک و باوکت مەدە، وەک ئەوان ناودار بە، لەتەک ڕاستیدا کامکار و بەختیار بە".**

دوای خوێندنەوەی پرسنامەی* هاوسەری و پەیمان، هەموو میوانان بە چەپڵەڕێزان و گۆڤەند و دوو دەستماڵە و شاواش و پیرۆزباییان لە وەوی* و زاما*یان کرد و بۆ ماوەی هەفت شەو و هەفت ڕۆژ شایی و چۆپی و ڕەشبەلەکیان گێڕا.



# ئەنجومەنی پیری مۆغان



"ئێستا دەمەوێت لەمەڕ بنەما و ناوەڕۆکی ئەنجومەنی پیری مۆغان بدوێم. ئەنجومەنێک کە بۆ پارێزگاری و پەرەپێدان و ڕێکخستنی دینی بەهدینی لەتەک پێداویستییەکانی ڕۆژگار دادەمزرێت. ئەرک و بەرپرسیاریی مەزنی ئەم ئەنجومەنە، زێرەڤانی* چاند و شارستانیەتی وڵات و کۆشش بۆ دامەزراندن و گەیشتن بە ئاشتی هەمیشەیی و ژیانی باشتر و مسۆگەر بۆ هەمووان دەبێت. من ئەو شتەی کە پێویست بوو لە بارەی ستوون و کۆڵەکەکانی ڕێبازی بەهدینی و ڕێگای ڕاستی بەختیاری و ئاسایشت و ژیانی خۆش بۆ کۆمەڵان ببێژم، گوتوومە، بەڵام گوفتارەکانی من و بڕواهێنانی ئێوە بەس نییە. هەر گوند و بازێر و وڵاتێک، تەوزیم* و پێویستی بە پاسەوان و نیاگابان هەیە و پێویستیشی بەوە هەیە کە هەنگاو بە هەنگاوی چەرخ و گۆڕانی ڕۆژگار، بگەشێتەوە و هاوشان لەتەک خواست و نیازەکانی زەمان، خۆی نوێ بکاتەوە و ئەم کارەش نابێت و ناکرێت

گەر لە هەر سەردەمێکدا پاکترین، بەرزترین، زاناترین، ئازاترین، ئاگاترین، داناترین، لەخۆبردوترین و جوانمێرترین خەڵکان، کاری ڕابەری دین و ئارمان و کاری پاسەوانی وڵاتیان پێ نەسپێردرێت. بەڵام لە بارەی پلە و پایەی باوەڕهێنەرانی ئۆلی بەهدینی: کەسانێک دێنە سەر ڕێبازی بەهدینی و بڕوامەند دەبن، هەموویان لە یەک ڕێز و پلەدا نین، هەموویان ناتوانن بە ئاستی مەکۆی ڕابەری بگەن. من پەیڕەوانی بەرجستە و هەڵکەوتووی ئایینی بەهدینی کە بە ئاستی ڕێبەرایەتی گەیشتوون، بە سێ جۆر دابەش دەکەم، «خێش» و «هاوکار» و «یاوەر».



"دەستەی یەکەم یاوەرانن، کە لە پلەی خۆپارێزی و ڕاستی و پاکی، ئاستێکی بەرچاویان پەیدا کردووە و نازناویان بە «دۆست» یان «یاوەر» بە ناوبانگەن".

"دەستەی دووهەم هاوکارانن کە هەنگاوی یەکەمیان ناوە و بەرەو پلە و ئاستی خاکساری و خۆبەخشکەری گەیشتوون و ژیانیان بۆ ڕاژەی ڕەش و ڕووتان و ڕەنجبەران تەرخان کردووە، بۆیە بە «هەڤاڵ» یا «هاوکار» بەناوبانگن".

"دەستەی سێهەم خێشانن، کەسانێکن کە دوو گاڤی یەکەم و دووهەمیان تێپەراندووە و بەم پلەی «خێش» گەیشتوون. ئەم دەستەیە ئاواهی دینی بەهدینییان پەژراندووە و بە ئاستێکی خۆبەخشکاری و خاکساری گەیشتن، کە نازناوی خێشانیان وەرگرتووە. ئەم دەستە ئەو کەسانەن کە ئامادەیی ئەندامبوونیان لە ئەنجومەنی پیری مۆغانیان پەیدا کردووە. من ناوی ئەم سێ دەستەیەم لە سروودەکانم بردووە و بەرپرسیارییەکانیشیانم دەستنیشان کردووە".

ئەی ئەهۆرا..!
کەسێک کە لەتەک ڕاستڕەوان،
چ خێش بێت و چ هاوکار و چ یاوەر،
باشترین ڕەفتاری هەبێت و
هەر کەسێک کە بە کۆششی
خۆی جیهان ئاوەدان بکاتەوە،
بە ڕاستی ئەو کەسە،
لە سەرای ڕاستی و ڕامانی پاک بەهرەدار دەبێت.
گاتا، هاتی 33، سروودی 3

ئەی مەزدا..!

دەتپەرستم و لە بەرت دەپاڕێمەوە:
کە نافەرمانیکردن و بیری خراپە لە ناو بچێت،
لە خێشان، دڵپیسی و خیرەسەریکردن،
لە هاوکاران، درۆ و دوژمنی خزمان،
لە یاوەران، جنێودان و ناسزاگوتن،
لە گشت جیهانیشدا،
ڕابەری خراپ و درۆزن لە ناو بچێت.
گاتا، هاتی 33، سروودی 4

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
بۆ بەهرەمەندبوون لە مەزنترین خۆشبەختییەکان،
خێشان، هاوکاران و یاوەران،
نوێژ بۆ تۆ دەکەن،
دێڤپەرستانیش بە هەمان مەبەست،
ستایشتت دەکەن.
ئێمە هیواداریین
پەیامهێنەری تۆ بین و
بەدخوازان لە دوژمنایەتی و ئازاردانی لایەنگرانی تۆ
دوور ڕاگرین.
گاتا، هاتی 32، سروودی 1

"گەورەترین تایبەتمەندیی ئەندامانی ئەنجومەنی پیری مۆغان ئەوەیە کە مژار و هۆکانی هاندەر بۆ نێوداری و ناوزڕاندن و خۆنیشاندان لە دەروونی خۆیاندا بۆ هەمیشە مراندبێت. بۆیە تەنها کەسانێک دەتوانن ڕوو بکەنە ئەم ئەنجومەنە کە لە

بەرزترین ئاستی هۆشیاری و سنووری پلەمەندی و پایەبەرزی و پاکیی خوو و ڕەوەشتدا بن. کۆڕی پیری مۆغان لە هەر ڕۆژگارێکدا، پێویستی و نیازی ئەو چەرخ و سەردەمەی کە تێدا دەژیت، ڕەچاو دەگرێت و بەرپرسیاریی و ئەرکی پێویستی خۆی بە کار دەبەستێت. دەزگای ئەنجومەنی پیری مۆغان لە سەر دوو کۆڵەکەیە: یەکەم پەیام و دووهەم بەرپرسیاریی.

ئەنجومەن لە هەر چاخێکدا نیاز و پێداویستی ڕۆژ دەستنیشان و دەدۆزێتەوە و ئەرک و بەرپرسیاریی خۆی دیاری دەکات و لە ڕێگای پەیامەوە، بەرپرسیاریی ئەندامان دیاری دەکات و پێیان ڕادەگەیەنێت، ئینجا ئەندام دەمێنێتەوە و ئەرکێک کە لە سەر شانی سپێردراوە. چوارچێوە و سنوور و هەڕەشە و زەبروزەنگ بۆ ئەنجومەن نییە، تەنها یەک بنچینەیە کە ئەنجومەن پێڕەویەتی، ئەوەش بڕوامەندی بە دڵ و گیان بە ڕێبازی ئازادی بەهدینی و بەختیاری و سەربەخۆی وڵات و ئاشتی و ژینی پاک و باش بۆ هەموو جیهانیان. ئەما چما بنیاتی ئەم ئەنجومەنەم دادەڕژێنم؟ بۆچی گەرەکە ئەنجومەن هەبێت و هەمیشە و بێ ڕاوەستانیش بێت؟ بێگومان بۆ بەرگیری لە هێرش و چەواشەکاری دوژمنان بۆ سەر ئایینی بەهدینی. بۆیە هەبوونی ئەنجومەنی پیری مۆغان بە پێویست و گەرەک دەزانم. لە سروودەکانم ناوی بڕێک لە ئەندامانی پیری مۆغان ناوزەدم کردووە وەک، فرەشەوشتر و جامئەسپ و میدیا. ئەندامانی ئەنجومەن لە ناو خۆیاندا زاناترین، ئاگاترین، هۆشیارترین، پاکترین و شیاوترین کەس هەڵبژێرن، کە بە پیری مۆغان یان سرووشی زەمان دەناسرێت. پیری مۆغان یا سرووش، ڕابەر و سەرۆکی ئەنجومەنی پیری مۆغانە و بەرپرسیار و چاودێری هەموو ئەرک و کۆششەکانی ئەنجومەنی مۆغانی بە دەستەوەیە. پیری مۆغان، سوشیانسی وڵاتانە کە لە هەموو سەردەمێکدا هەیە و بەرپرسیاری خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێت، بەو جۆرە کە من گوتوومە":

ئەی مەزدا..!
سوشیانسەکانی وڵاتان،
ئەو کەسانە دەبن کە
بە پێڕەوکردنی رامانی پاک،
ئەرک و بەرپرسیاریی خۆیان بە ئەنجام دەگەیەنن.
کرداریان لە سەر پایەی ڕاستی و ڕاهێنانەکانی تۆیە،
لە ڕاستیدا بۆ سەرکەوتن و
تێکشکاندنی ڕک و کینە ڕاسپێردراون.
گاتا، هاتی 48، سروودی 12

"ئەنجومەنی پیری مۆغان، ئەنجومەنی دۆستایەتی و هەڤاڵایەتییە. گەرەکە دۆستایەتی و برایەتی لە نێوان کۆمەڵان و هەروەها پەرەپێدانی ئارمانی پاکی ئەمێشەسپێنتەکان بە ئامانجی خۆی بزانێت. لەم سروودانە کە دەیخوێنمەوە دووبارە بەشێک لە بەرپرسیاری و تەوزیمەکانی ئەنجومەن و هەروەها ناوی چەند لە ئەندامانی ناوزەند دەخەمە بەر چاو".

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
کەی ڕاستی و رامانی پاک و توانای مینوویی
ڕوو لە ئێمە دەکات؟
کەی ئەنجومەنی مۆغان،
ئەم ئایینەی تۆ دەپەژرێنێت؟
ئێستا کە یاوەرێک گەیشتووتە ئێمە،
ئێمەش ئامادەی ئاریکاریی ئەوین.
گاتا، هاتی 29، سروودی 11

ئەی لە هەموو باشترین..!
ئەی مەزدا..!
بەرەو ڕووی من وەرە و
خۆتم بۆ ئاشکرا بکە،
تا لە بەر تریفەی ڕاستی و ڕامانی پاکدا،
گوتەکانم لە دەرەڤەی ئەنجومەنی مۆغان،
بە گوێی پەیڕەوانم بگەیەنم.
ئینجا بەرپرسیاریی و ستایشتی پێویست،
کە شیاوی تۆیە،
بۆ ئێمە ڕوون و ئاشکرا ببێت.
گاتا، هاتی 33، سروودی 7

پاداشتێک کە زەردەشت
بە ئەنجومەنی مۆغان مژدەی داوە،
سەرای هۆرە و ستایشتە،
ئەو جێگایەیە کە هەر لە سەرەتادا،
جێگای گەیشتن بە مەزدا ئەهۆرا بووە.
من ئەم پاداشتە،
کە لە بەر تریفەی ڕامانی پاک و ڕاستیدا
وەدەست دێت،
بە ئێوە مزگێنی دەدەم.
گاتا، هاتی 51، سروودی 15

ئەی مەزدا..!
هاوڕێی زەردەشت ئەسپنتمان کێیە؟
کێیە ئەو کەسەی
کە لەتەک ڕاستیدا خەریکی پرسیار و ڕاوێژە؟
کێیە ئەوەی کە ڕووی لە پاکییە و
بە ڕاستی و رامانی پاک و خۆبەختکاریی،
لایەنگری ئەنجومەنی هەڤاڵەتیی مۆغانە؟
گاتا، هاتی 51، سروودی 11

ئەی مەزدا..!
بەم سرووده پیرۆزانە و
لە ڕێگای ڕاستەوە و
بەو کارانەی کە لە رامانی پاک هەڵدەستێت،
بەروەپیریی تۆ دێم،
تا گەیشتن بە ئارمانجی دڵخوازی خۆم،
هەروەها تامەزرۆی وەرگرتنی زانستی چاکە دەبم.
گاتا، هاتی 50، سروودی 9

«جامئەسپ هۆگۆ»ی دانا،
کە خوازیاری ڕۆشنبوونەوە بوو،
لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
ئەو زانستەی هەڵبژارد و
بە رامانی پاکەوە
بە توانامەندیی مینوویی گەیشت.

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو زانستەش
بە هەموو ئەوانەی کە سەوداسەر و
دالْدەی تۆن ببەخشە.
گاتا، هاتی 51، سروودی 18

«مەیدیا مانگ»،
کە لە دودەمانی ئەسپنتمانە،
لە دوای ناسینی ئۆلی بەهدینی،
بە دڵ و گیان بۆ پێشکەوتنی ئەم ئۆلە
ژیانی خۆی سپاردەتە دەستی من.
ئەو بە فێربوونی ئایینی مەزدا،
بە کردار لە ڕێگای هەرچی باشتربوونی تێدەکۆشێت.
گاتا، هاتی 51، سروودی 19

ئەی جامئەسپی دانا..!
ئەو خەباتکارە کە بۆ ڕزگاریی کۆمەڵان دیاری کراوە،
ئەبێت بەم پەندە بە ژیری گوێ بدات:
هەرگیز مرۆڤی ڕاستگوفتار،
بیر لە هەڤاڵبەندیی
مرۆڤی گومڕێ و چەواشەکار ناکاتەوە،
ئەو کەسانەی کە کەسایەتیان
لەتەک ڕاستیدا پەیوەستە،
لە باشترین پاداشتەکان بەهرەمەند دەبن.

# جەنگی رامان



هیچ کاتێک جامئەسپ تا ئەم ڕادەیە خەمبار و شڵەژاو و هەراسان نەبینرابوو. هەر لە سپیدەوە لەتەک کەس قسەی نەکردبوو و چوبووە گۆشەیەک و دەستەوئەژنۆ دانیشتبوو و لە بیرکردنەوەدا بوو. پەریشانی و پەژاری لە چاوی دەباری و خەفەت بە تەواوی دایگرتبوو. یەکێک لە شاگردەکانی زەردەشت چووە نزیکیەوە و هۆی نیگەرانی و پەرۆشی پرسی. جامئەسپ کەوتە قسە: "ئێمە کەوتینەتە نێو پێواژۆیەکی شپرز و ناپیرۆز. پێواژۆیەک کە گیانەکان لە ناو دەبات و بڵێسە و ئاگری ڕک و کینە ژیانەکان دەسووتێنێت. تۆفانی لاساری و کەلەڕەقی، خۆویستی و تاریکبینی، گێلی و بێمێشکی دەریای ژیانەکان دەشێوێنێت. دەرد و بەدبەختیی گەورە ئەوەیە کە ڕەنج و تاڵیی ئەم ڕۆژە ناخۆشانە کۆتاییەکی نییە، تا ڕۆژگار هەبێت و کۆمەڵانی خەڵک بەم چەشنە بڕوا و خوو و ڕەوشتانەیان هەبێت، ڕۆژانی ئاوا ڕەش و سیا دێتە دی".

شاگردەکە لە گوتەکانی جامئەسپ هیچ تێ نەگەیشت و گوتی: "ئەتوانی بۆمی شی بکەیتەوە کە چی قەوماوە و چی ئاوا پەشێو و غەمبار و نائۆمێدی کردی"؟ جامئەسپ نامەیەکی دەرهێنا و گوتی ئەم نامەی «ئەرچاسپ» بخوێنەوە".

ناوەڕۆکی نامەکە بریتی بوو لەوە: "... بیستوومانە کە ئێوە بە دڵخوازی خۆتان دینی باو و باپیرانی خۆتانتان بەر داوە و گوێتان لە کابرایەکی خرف و نەزان گرتووە و داب و نەریت و یاسای پاتشایەتیتان بەر داوە و ... و شاڵ و پشتوێنتان بەستووە و بەرگی شاهانەتان فڕێ داوە، ئەمە زۆر نەنگ و سووکایەتییە بە گەورە پیاوانمان... چیتان پێویستە لە زێڕ و ئەسپ، بۆتان بنێرین، بەڵام بگەڕێنەوە سەر دینی باوباپیرانتان، دینی ڕۆژپەرستی، ئەگینا دەکەونە ژێر هێرش و پەلاماری ئێمە و هەموو گوند و باژێڕ و وڵاتتان تاڵان دەکەین و هەمووتان دەکەین بە کۆیلەی خۆمان".

جامئەسپ گوتی: "ئێستا هۆی خەم و پەرێشانی منتان بۆ دەرکەوت؟ جارێکی تر نامەکە بخوێننەوە و بیری لێ بکەنەوە. ئێمە و شاگوشتاسپ بە ڕاهێنانە زانستییەکانی زەردەشت، خۆرپەرستیمان بەر دا و بۆ ناسینی ئەهۆرا مەزدای یەگانە، ڕوویمان تێ کرد. زەردەشت ئێمەی ئاگا کرد کە ڕۆژ خودا نییە و باڵاتر لە ڕۆژ و مێهر، هێزێکی تریش هەیە. دانا و

بەدیهێنەرێکە کە ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکان و ئاسمان و زەوی و گەردوونی ئافراندووە و لە جێگای ئەوە کە هەمیشە چاومان لە ئاسمان بنوقێنین و ستایشتی ڕۆژ و مێهر بکەین، تیشک و تریفەی یەزدانی خۆی لە هەموو دیاردەکانی هەستی، ڕوون و ئاشکرایە. هەروەهاش لە جێگەی ئەوە کە بە ترسەوە بیپەرستین، دەبێت بکۆشین تا ئەو بناسین. زەردەشت ئەم وانانەی فێر کردین و ئێمە چۆن ئەمانەمان پێ ڕاست و ڕەوا بووە، پەژراندمان و ئێستاش لە جێگای خۆر و مانگ و ئەستێرەکان و ئاو و ئاگر و گیا و زەوی و دەیان یەزدانی جۆراجۆر، تەنیا یەک هێزی هەستیبەخشێنەری دانای مەزن، ئەهۆرا مەزدا بە خودای تاک دەناسین. بە پێچەوانەی ڕۆژ و مێهر، لە ئەهۆرا مەزدا، ترسێکمان نییە و ئەو بە هێزی بەدیهێنەر دەزانین، کە دەبێت بە زانست و دانایی ڕووی تێ بکەین و بە زانستەوە جیهان بناسین. زەردەشت بۆ ئێمە سێ کۆڵەکەی ڕزگاری و بەختیاریی دیاری کردووە، «ڕامانی پاک» و «گوفتاری پاک» و «کرداری پاک». بە ئێمەی گوت کە باشی بە واتەی داد و ڕاستییە و ڕێگا لە جیهاندا یەک ڕێگایە، ئەوەش ڕاستی‌یە. ئێمە ئایین و ڕێبازێک کە زەردەشت پێمانی ناساند و فێرمانی کرد، پەژراندمان. بەڵام ئەوە ئێستا ئەرچاسپ کردوویەتە سەرمان، کە ئێمە وەک خۆی لە سەر ئایینی ڕۆژپەرستی بمێنینەوە. ئێستا لە دژی ئێمە هەستاوە و دەڵێت کە چۆن ئێوە دینی باوباپیران و شاهانی خۆتانتان بەر داوە، منیش دێم کۆشک و کێڵگە و ژیانی ئێوە دەسوتێنم و لە ناوتان دەبم و سەری پیرەکانتان دەبڕم و ژن و منداڵتان بە کۆیلەتی دەبەم".

"سەیر لەو هەموو دڵڕەقی و دڵڕەشییە! بێ ئەوە کە ئێمە ئازارێکمان بۆ کەس یا لایەنێک. بووبێت ئێمە لە بڕوا و ڕێبازی نوێی خۆمان کە بە ڕامان و بیرکردنەوە هەڵمانبژاردووە و گرتوومانەتە بەر، ئێستا کەسێک ئەم بڕوای ئێمەی بە دڵ نییە و کەیفی پێ ناهێت و دەیەوێت لە ناومان ببات، بۆچی؟ بۆ ئەوە ئێمە دیسان وەک جاری جاران ڕۆژ پەرستش بکەین و بە خودای خۆمانی بزانین و ئاژەڵەکانمانی بۆ قوربانی بکەین و سەدان ڕەوشتی چەوت و ناڕاست و ستەمگەرانەی دیکە بگرینە بەر؟ گەلۆ لەمە تاوان و خراپەکاری مەزنتر هەیە؟ ئێستا زانیت بۆچی پەشێوم؟ گرینگی شتەکە لەوەدایە کە پێشتر لەم هەرەشە و گڕوشانەمان زۆر بیستە و جەنگ و لە یەکدانی زۆرمان بینیوە و تێیدا بەشدار بووین و زیانی زۆریشمان بینیوە، بڕێک جار ئێمە سەرکەوتوو بووین بڕێک جار ئەوان، بەڵام ئەو جەنگانە زۆربەی لە سەر ئاو و مێرگ و زەوی بووە. دەجەنگیان و لە ئەنجامدا بە چەشنێک کۆتایی پێ دەهات و هەر کەس و لایەنێک دەچووە سەر کار و ژیانی و کاشانەی خۆی و ئاشتی سەری دەگرتەوە. ئەما ئەم جەنگە نوێیە، جەنگ لە سەر باوەڕ و ڕامان و هزرە. ئەم جەنگە پایانی نییە، تا مرۆڤ هەیە و ئاوات و ئارمان و هزر و ئۆل هەیە، تا لاساری و تاریکبینی و کاڵ و کرچی هزر و ڕامان هەیە، ئەم جەنگەش هەیە".



"ئەو شتەی کە ئەرچاسپی نادان و دڵڕەش خەریکی بەرپاکردنیەتی، بەڕاستی چەندێک جیاواز و دژە لەتەک رامانی زەردەشت. زەردەشت لەبارەی چەواشەکاران و نەیارانی خۆی دەبێژێت، ئەگەر گومڕاییەک لە کەسێک داوای یارمەتی کرد، دەبێت ئەو کەسە بە هانای بچێت و لە گومڕایی ڕزگاری بکات، کە ئەگەر وا نەکات ئەوە بۆ خۆی دەکەوێتە ناو داو و پیلانی گومڕێییەوە".

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەگەر توانامەندێکی دانا،
کە بە ڕێگای ڕاست دەژی،
لە سەر بنچینەی ئایینی بەهدینی،
یان لە ڕێگای سۆزی مرۆڤایەتیەوە،
گومڕایەک کە داوای یارمەتی بکات،
بە گەرمیەوە بەرەو هانای بچێت،
دەتوانێت بە هۆشمەندی خۆی
ئەو لە چەواشەیی و زیانمەندی ڕزگار بکات و
بەرەو خۆناسیی بگەیێنێت.
گاتا، هاتی 46، سروودی 5

بەڵام، ئەگەر ئەو توانامەندە
یارمەتی ئەو کەسە نەدات،

که داوای ئاریکاری لێ کردبوو،
ئەوە خۆی دەکەوێتە داوی فریو گومڕاییەوە،
چونکە، لە سەر یاسای ئایینی مەزدا ئەهۆرا،
کە هەر لە سەرەتاوە دایمەزراندووە،
کەسێک کە سەرکەوتن بۆ گومڕێ بخوازێت،
خۆی گومڕێیە،
ئەو کەسەش کە بۆ ڕاستکرداران ڕێز دابنێت،
خۆی لە ڕاستکردارانە.
گاتا، هاتی 46، سروودی 6

"زەردەشت لەمەڕ کۆمەڵان و ژیانی دروستی ئەوان بەم چەشنە بیری دەکردەوە و ئەرچاسپیش ئاواهی".
لە هەموو شوێنێک باس هەر باسی نامە هەڕەشەئامێزی ئەرچاسپ بوو و پرسیار ئەمە بوو، دەبێت چی بکرێت؟ ئایا پێویستە دینی نوێ ڕەها بکرێت و بۆ داب و نەریت و ڕێبازی پێشوو بگەڕێنەوە، یا گەرەکە ڕاوەستن و بەرخۆدان بکەن؟ شاگوشتاسپ پترتر لە هەمووان لە ناو بیر و خەفەتدا بوو زۆر بە نامەی ئەرچاسپ پەشێو و دڵنیگەران بوو.
وەکوو لە چیرۆکان دەگەڕێنەوە شاگوشتاسپ سوپاسالارێکی هەبوو بە ناوی «تەهمزەرێر» کە برای خۆی بوو. هاتە لای شاگوشتاسپ و گوتی: "ئەگەر پاتشا وەرامی بدات من بۆ خۆم فەرمانی ئەم نامە دەدەمەوە". شاگوشتاسپ ڕێگەی پێدا و زەرێر بەرسڤی نامەکەی بەم چەشنە دایەوە: "ئێمە دینی بەهدینی بەر نادەین و لەتەک ئێوە هاوبیر نابین و بۆ جەنگیش ئامادەین".
پەیک نامەکەی وەرگرت و گەڕایەوە، ئەما بێدەنگی هەمووانی داگرتبوو و لە ناو بیرکردنەوەیەکی قووڵدا بوون. بیری جەنگ و ئاشتی و ئەگەریش جەنگ ڕوو بدات، چۆنیەتی و ئەنجام و کۆتایی جەنگ. شاگوشتاسپ ڕووی کردە جامئەسپ و گوتی: "باش دەزانم کە تۆ ئاگاداری زۆر شتی و ئەزانی کەی باران دەبارێ و دەشزانی کام هەور بارانی لێ دەبارێ یا نابارێ، بڵێ ئەنجامی ئەم جەنگە چییە و کێ دەمێنێت و کێ دەمرێت"؟



وەڵامدانەوە ئەم پرسیارە فرە سەخت بوو بۆ جامئەسپ، چونکە ئەو بە داهاتووی ئەم جەنگە هیچ گەشبین نەبوو و ئەمە گەلێک شاگوشتاسپی پەرۆش کردبوو. چەند ڕۆژ دوای گەیشتنی پەیامی شاگوشتاسپ، پەیامیان هێنا کە سوپای ئەرچاسپ بە لەشکەرێکی گران خۆی ئامادەی جەنگ کردووە. جەنگێکی نابەرابەر دەستی پێ کرد و لەم جەنگەدا زەرێر سوپاسالار و کوڕی جامئەسپ و سەربازێکی زۆر لە هەر دوولا کوژران. هەڵگرسێنەری جەنگ ئەرچاسپی نابەکار لە دوای سووتاندنی وڵات و کوژتن و بەدیلدانی سەربازێکی زۆر، پێی لێ نا و هەڵات،

جەنگ کۆتایی پێ هات، ئەما بە نرخێکی پڕ گران. برای پاتشا و نەوەی زەردەشت «گەرامیککەرت» کە کوڕی پوورەچیستا و جامئەسپ بوو لەتەک سەدان پاڵەوان و دلاوەری دی ژیانی خۆیان وندا کرد. جەنگێکی ڕەش و کرێش کە ئەرچاسپ دایگرساندبوو و دەیویست کە خوداکانی جۆراجۆری پێ دڵخۆش بکات و کۆمەڵگای بەهدینی بۆ ستایشت و پەرستشی ڕۆژ و مێهر بگێڕێتەوە، لە ڕەواڵەتدا کۆتایی پێ هات. باڵکێش ئەوە بوو کە زەردەشت پێشتر لەم بارەوە گوتبووی:

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!<br>
ئەمە لە تۆ دەپرسم،<br>
بە دروستی بە من بێژە،<br>
هەروەک چۆن تۆ بەتوانایت و<br>
لە بەر تیشکی ڕاستیدا پەنای ڕاستانی،<br>
کاتێک کە دوو لایەنی نەیار بە یەک دەگەن و<br>
بە پێی ئەو ئایینەی کە تۆ داتمەزراندووە،<br>
بە چ لایەنێک و لە کوێ<br>
سەرکەوتن دەبەخشێت؟<br>
گاتا، هاتی 44، سروودی 15

زەردەشت لەمەڕ تێکهەڵچوونی لایەنەکانی نەیار و دوژمن فەرمووبووی: ئەم جەنگانە تا لە ناوچوونی نەزانی و چەواشەکاری و تاریکی هەر هەیە و لە کۆتاییدا، زانایان و هۆشمەندان سەرکەوتن بەدەست دێنن. ڕۆژێک دێت کە مرۆڤی دڵڕەش و تاریکبین، ڕێگای ڕاستی و ڕزگاری و بەهدینی پێش دەگرێت و ئەو کاتە خەبات و جەنگ لە ڕێگای خودا کۆتایی پێ دێت و کۆمەڵان لە جێگای کوژتنی یەکتر، بۆ خۆشنۆتیی خواوەند دەست دەخەنە ناو دەستی یەکتر و بۆ ئاوەدانکردنەوە و ئاشتی و دۆستایەتی و شادومانی جیهان دەکۆشن.

# دواهەمین وتاری جاویدانی




هۆرمۆزگای ئاهیرنۆش* بە ئاگری گەش لە ئاگردانی، بە ئەسپایی دەسووتا و هەر وەک ڕۆژانی پێشوو پڕ بوو لە مەردمێکی فرە کە لە شوێنانی جیاواز و دوورەوە هاتبوون، بە تەمووره و ئاهەنگی خۆش، خەریکی خوێندنی هۆرەکانی زەردەشت بوون و پەیمانی ڕاستی و پاکییان لە دڵ و گیانیان دووبارە زیندوو دەکردەوە.

زەردەشتیش لە ناو جەماوەر بوو و خەریکی گوتارخوێندنەوە بوو. زەردەشت هەموو ڕۆژانی چوارشەمە، تیرشید*، سەردانی ئاگرگای دەکرد. خەڵک نیگەران بوون و بیستبوویان کە سوپایانی ئەرچاسپ هەمدیسان خۆیان ئامادەی تۆڵە سەندنەوەی شکستی جەنگ کردووە. «لەهراسپ»ی پیر باوکی شاگوشتاسپ نیگەران بوو. زەردەشتی پیری مەزن وەک هەمیشە چوە سەر سەکۆ و دەستی کرد بە گوتاردان، سەرەتا بە چەند سرووودێکی خۆشی خۆی دەستی پێ کرد:

ئێستا لەمەڕ بنەمای ئایینی ژیان دەدوێم،
ئەو شتەی کە مەزدا ئەهۆرای دانا،
بە منی گوتووە:
ئەو کەسانەی کە
ئەم گوتار و پەیامە پیرۆزانە،
بەو جۆرەی من فێری بووم،
بە کاری نەهێنن و پەیڕەوی نەکەن،
کۆتایی ژیانیان،
لەتەک پەشیمانی و ئەفسۆس دەبێت.
گاتا، هاتی 45، سرووودی 3

ئێستا دەدوێم،
گوێ بگرن و ببیستن،
ئەی ئەو کەسانەی کە داواکاری بیستنن..!
ئەی ئەو کەسانەی کە لە دوور و نزیکەوە هاتوون..!
هەمووی ئەم گوتانە بە چاکی بە یاد بسپێرن،
نەکا ئامۆژگاری خراپ،
جارێکی دی،
ژیانی ئێوە لە ناو ببات و
چەواشەکار بە گوتە و بڕوا نادروستەکانی،
ئێوە بەرەو چەواشەیی ببات.
گاتا، هاتی 45، سروودی 1

ئێستا لەمەڕ ئەو دوو مینووەوە دەدوێم،
کە هەر لە سەرەتای ئافراندنەوە هەبوون،
لە دوو مینوویە،
مینووی پاک بە ئەوی دیکەی گوت:
لە ئێمە دووانە،
نە رامان و نە ڕاهێنان،
نە خێرەت و نە باوەڕ،
نە گوفتار و نە کردار،
نە ویژدان و نە ڕەوانمان،
لەتەک یەکتردا سازگار و هاوڕێن.
گاتا، هاتی 45، سروودی 2

ئێستا لەمەڕ ئەو شتەی کە لە ژیاندا باشترینە دەپەیڤم،
ئەمەش لە بەر تریفەی ڕاستییدا تێگەیشتم:
مەزدا بەدیهێنەری ڕاستییە،
مەزدا سەرچاوەی رامانی پاکە،
رامانی پاکیش بۆ تێکۆشانە.
مەزدا پەروەردەگاری خۆبەختکارییە،
خۆبەختکاریش سەرچاوەی کرداری چاکە.
مەزدا لە هەموو شتێک بینایە و

ناتوانرێت بخاپێنرێت.
گاتا، هاتی 45، سروودی 4

ئێستا لەمەڕ ئەو شتانە دەدوێم،
کە مەزدا ئەهۆرای پاک بە منی گوتووە،
ئەو گوتانەی کە بۆ هەموو کەسێک بیستن و بە کارهێنانی باشترینە:
ئەو کەسانەی کە ڕاهێنانەکانی من لە دڵەوە ببیستن و
ڕێزی بۆ دابنێن و بۆ کاری بهێنین،
بە گەشەکردن و جاویدانبوون دەگەن،
هەروەها بەو کردارانەی کە لە ڕامانی پاک سەرچاوە دەگرێت،
لە پرشنگی ڕووناکبەخشی ئەهۆرا،
بەهرەمەند دەبن.
گاتا، هاتی 45، سروودی 5

ئێستا لەمەڕ ئەوە دەدوێم،
کە لە هەمووان مەزنتر و بانترە و
بە ڕاستییەوە ستایشتی دەکەم،
ئەو سەروەری زانا و
هەموو جاویدانە پاکەکانی.
هیوادارین کە مەزدا ئەهۆرا،
بە خێرەتی پاکی خۆی ستایشتی ئێمە ببیستێت.
تا بە مێهر و خۆشەویستیەوە
لە بەر تیشکی ڕامانی پاک
بە ئەو پەیوەند ببین.
ئومیدوارین بە خێرەتی خۆی،
ئەو شتەمان فێر بکات، کە باشترینە.
گاتا، هاتی 45، سروودی 6

ئەو کەسێکە کە هەمووان
ڕزگاریی خۆیان لەو دەخوازن،
چ ئەوانەی کە پێشتر بوون،
چ ئەوانەی کە هەن و

چ ئەوانەش کە دەبن.
ئەمەش بزانن کە ڕەوانی پاکان
هەمیشە سەرفەراز و کامەران دەبن و
چەواشەکاریش هەمیشە بە دەرد و ڕەنجەوە سەر دەنێتەوە.
ئەمەش یاسایەکە،
مەزدا ئەهۆرا بە شکۆداریی خۆی دایمەزراندووە.
گاتا، هاتی 45، سروودی7

بە ستایش و نیایشتەکانم
ڕوو لە مەزدا ئەهۆرا دەکەم و
بە وێنام دەیبینم،
بە رامان و گوفتار و کرداری پاک و
لە بەر پرشنگی ڕاستیدا،
ئەو بە پەروەردەگاری دانای مەزنی دەناسم،
بۆیە نزاکانم بە ئەو و
بە بارەگای سروودی ئەو،
پێشکەش دەکەم.
گاتا، هاتی 45، سروودی 8

بە ڕێز و پاکی ستایشتی ئەو دەکەین و
بەرز دەیبینین.
ئەوە کە هەمیشە بە
هەستیبەخشێنەری دانای مەزن نێو دەبرێت،
لە بەر پرشنگی ڕاستی و رامانی پاکدا
بە توانامەندی و شکۆداری خۆی،
مژدەی گەشەکردن و نەمربوونی بە مرۆڤ داوە،
هەروەهاش تەندروستی لەش و
پایەداریی ڕەوانیان پێ دەبەخشێت.
گاتا، هاتی 45، سروودی 10

ئەو کەسانەی کە،
دوژمنی لەتەک دێڤپەرستان و لایەنگرانیان دەکەن و

ڕێگاشیان جودایە لەوانەی،
کە بە سووکی دەڕواننە مەزدا ئەهۆرا و
خۆیان بە جوانی بیر لە مەزدا ئەهۆرا دەکەنەوە و
سوشیانسەکانی زانا و یاوەرانی ئایینی
بە دروستی دەناسن،
مەزدا ئەهۆرا،
بە چاوی هاوڕێی خۆی و
بۆیان وەکوو برا و باوک دەبێت.
گاتا، هاتی 45، سروودی 11



زەردەشت سروودەکانی خۆێندەوە و پاشان فەرمووی: "ئەی خەڵکینە، ئەی ئەوانەی کە لە ڕێگای دوور و نزیکەوە هاتوون..! لەم ڕۆژە بەهاریەدا بڕواننە ئاسمان و تیشکی گەرمی رۆژ، بۆنی خۆشی بەرزەنگڵ و پشکوتنی گوڵ و خونچەکان، سەوزەڵانیی دەشت و زۆزان، خوڕەی ڕووبار و چۆمەکان و هەزاران دەنگ و ئاوازی خۆشی دیکە. ئەی جەماوەر..! بکۆشن کە هەمیشە وەک بەهار گەشاوە بن، دڵتان لە درۆ و تاریکی دوور ڕابگرن. رامانتان لە پەژاریی و لاساری و دەمارگیری و خیرەسەری پاک بکەنەوە، ڕەوانتان لە ڕەنج و خەم دوور ڕابگرن و جیهان بە کاری خۆتان ئاوەدان و دروست بکەن. بڕوا بکەن کە هەر چی چاکە و خۆشی و باشی هەیە، لەم جیهانەدایە و ئەو شتەی بە هی خۆتان بزانن، کە بەخشیوتانە. لەتەک نەزانی و تاریکبینی و ڕک و تووڕەیی و ناحەزی و دەستدرێژی و ستەمدا بجەنگن، جیهانێک دروست بکەن کە داد باڵادەست و فەرمانڕەوایی لێ بکات. ڕوو بکەنە ئۆلی بەهدینی و ئایین بکەنە پەیژەی

گەیشتن بە ڕووناهی رامان و پاڵافتنی گیان و ڕازانەوەی ڕەوان و ژیانی باشتری خۆتان و جیهان، دوور ببن لەوە کە دین بکەن بۆ..."

لەم کاتەدا دەنگەدەنگ و جەنجاڵێک بەرپا بوو، سوپای ئەرچاسپ چوار دەوری ئاترگای تەنیبوو، سەربازانی ئەرچاسپی نابەکار کە خۆیان پێشتر ئامادە کردبوو، پێیان نا نێو هورموزگای ئاهیرنۆش، «تۆربەراتئەوریش»ی ناپاک بە شمشێرەوە ڕووی کردە زەردەشت و بە هەموو هێزیەوە شمشێرێکی کوتا بە سەر زەردەشتی کاڵ. خۆێن بە ناو چاوانی پاکی زەردەشت هاتە خوارەوە و لەشی سست بوو و کەوتە سەر زەویی هورموزگا، خوێنی ئاڵی زەوی هورموزگای سوور کرد. زەردەشت لە دوا هەناسەی کە ڕووی لە بڵێسەی ئایر بوو، پەرتووکی سروودەکانی لە دەستیدا گووشی و دڵی لە لێدان وێستا و ناوی مەزنی بۆ هەمیشە بە جاویدانی پەیوەست بوو.

پاشان یارانی زەردەشت، پەیکەر و تەرمی زەردەشتی هەفتاوهەوت ساڵەیان هەڵگرت و بە هۆرە و دەهۆڵ و سوڕنا و چەمەری بردیان بۆ گۆڕستانی بەرز و مەزنی هەورامان، بەڵام هێشتا دواهەمین سروودەکانی زەردەشت لە گوێچکەیاندا، دەنگی دەدایەوە:

مەزدا ئەهۆرای بە توانا
بەم چەشنە دایناوە:
خۆشبەختی بە ئەو کەسەیە
کە بەختیاری بە کەسێکی دی ببەخشێت.
من بۆ پێشکەوتن و ڕاگرتنی ئایینی ڕاستی،
داوای پایەبەرزی و توانامەندی
تەن و ڕەوانم دەکەم.
ئەی وزەی خۆبەختکاری..!
لە ئەو تریفەیە
کە پاداشتی ژیانی ڕەوشت پاکانە،
بەهرەدارم بکە.
گاتا، هاتی 43، سروودی 1

ئەی مەزدا..!
کاتێک لە سەرەتادا،
بە رامانی خۆت،
لەش و خێرەت و ویژدانێت
بۆ ئێمە ئافراند،
گیانت بە لەشی ئێمە
بەخشی و

توانای گوفتار و کردار و ڕابەریت پێ بەخشین،
ویستت ئێمە رامانی خۆمان
بە ئازادیی تەواو هەڵبژێرین.
گاتا، هاتی 31، سروودی 11

# کۆتایی

لە ڕۆژی 1997.04.29 تەرگومان و دروێنەی ئەم پەراوە کۆتایی پێ هات، بە هێڤی کاری مەزنتر و تێکۆشان و وزەی بێوچان بۆ ڕاژە بە نەتەوەی لەبیرکراو و ستەملێکراوی کورد.

**بابان سەقزی ـ دانمارک**

لە چاوخشاندن و دووبارە نووسینی ئەم بابەتە، سپاس و پێزانیی خۆم پێشکەشی هاوڕێ و دۆست و هەڤاڵانی خۆم دەکەم کە بە شێوەی جۆراجۆر پاڵپشت و یارمەتیدەر و ئامۆژگارم بوون و تێبینی و بۆچوونەکانیان توانی ئەم بابەتە دەوڵەمەندتر بکات. بە سپاس لە هەموو ئەم خۆشەویستانە:

مامۆستا عوسمان، مامۆستا شەرمین هەڵەبچەیی، بەڕێز پەیمان، مامۆستا خاڵەحەمە، هەڤاڵ نەورۆز شاهین، مامۆستا ئاسۆ گەرمیانی، مامۆستا عەبدوڵا پەشێو، بەرێز جەلال دەباغ، کاک دیاکۆ حەیدەری و کەیبانووم تابان.

هەروەها بە شێوەی جۆراوجۆر سوودێکی فرەم بینی لەم کاناڵانە ئاسمانییە کوردیانە: مەدتیڤی، مەدیاتیڤی، کوردستانتیڤی، کوردسات، میتسوپاتامیاتیڤی و هەروەهاش رادیوکانی دەنگی ئەمریکا، دەنگی میتسوپاتامیا، هیوادارم وێنەیان فرەتر بێت بۆ ڕاژەی بەرژەوەندی باڵای نەتەوەیی کورد، بۆ بەدیهاتنی وڵات و دەوڵەتێکی سەربەخۆ و سەرفەرازی کوردی.

**بابان سەقزی ـ دانمارک 2003.05.21**

تێبینی:

بۆ زانیاری زیاتر و تێبینی و ڕەخنە و پێشنیارتان، دەتوانن بەم ماڵپەڕ و ناونیشانانە پەیوەندی بکەن. بابان سەقزی

www.kurdavesta.tk
avesta1@msn.com
kurdavesta@hotmail.com
avesta1@ofir.dk

# فەرهەنگۆک

ئاپۆرە کۆسپ، پەتەر، وەی

ئاتر ئاگر، ئایر، ئازەر، ئاهیر

ئاترگا به زمانی هەورامی ئاهیرگە، هورموزگا، جەمخانە، ئاتەشگە، ئەو شوێنەی کە بەهدینان بۆ ڕاز و نیاز و گرتنی کۆڕی و ئاهەنگی ئایینی تێدا کۆ دەبنەوە، وەک کەنیسا و مزگەوت.

ئاترەخش به ئاڤێستایی: ئاتر+ ڕەخشان = ئاترڕەخشان، ئازەرەخش، به واتەی پرشەی ئاگر، تیشکی ئاگر (ڕەخشان، ڕەخشندە، ڕەخشن ناوی کچانە لە زبانی کوردی).

ئاخ زەوی، زێد، خاک، نیشتمان

ئاخاڵ پاشماوە، ڕێقنە، ڕێخنە، پیسی، چەپەڵی

ئاخایۆک          کەسێک کە خۆی بە گەورە دەزانێت بە بێ ئەوە کە لێی بوەشێتەوە.

ئافەراندن          دروستکردن، بەدیهێنان، چێکردن، خولقاندن

ئافەریدە          دروستکراو، بەدیهاتوو

ئافەریدەگار          خودای بەدیهێنەر

ئافەرینش          ئافراندن، بەدیهێنان، داهێنان، خولقاندن

ئافەرینشت          بوون بە واتەی گشتی، هەستی

ئارمان          ئارمانج، ئامانج

ئارمەئیتی          ئەسپەند، ئەسفەند، یەکێکە لە ئەمێشەسپێنتەکان، ئەسفەند ڕاکێشەری هەموو هەستییە. لە هەستیدا دوو ڕاکێشەر فەرمان دەدەن، «دوورکەر» و «کێشەر» کە لە هەستیدا بە هەموو دیاردەکانیەوە کار و کاردانەوەیان دەبینرێت. لە هەر دیمەن و نموونەیەکی بووندا، ئەم کار و کاردانەوە و کێشەر و دوورکەرەوە هەیە و ئەمە دەبێتە مایەی باڵاکردن و گەیین و گەڕیانی ئەو دیاردەیە. کێشان و دوورخستەوە و کار و کاردانەوە و ڕەنگ و ڕەنگدانەوە لە مرۆڤدا بە چەشنی ئەڤین، لەخۆبوردن، داد، بەخشش، ڕامانی دروست، هەڵسەنگاندنی ڕاست، خۆپارێزی و پاکی و خاسی دەبینرێت، کە ئەمانە دەبێتە مایەی خۆشی و شادومانی و کەیفخۆشیی دڵەکان و گیانەکان، لە بڕێک شوێندا بە واتەی (موراد) و جوانمێریش هاتووە.

ئاری          چاوگی وشەی ئاری لە «ئایر» هاتووە، ئەو گەل و نەتەوانە کە ئاگر بە لایەنەوە پیرۆز بووە، ئەو گەلانەی کە باوەڕیان بە ئایینی بەهدینییە.

ئاژ          زگ یا بەرچاوبرسی، ڕەچاو، ئاز، (تەماح)

ئاشا          واژەیەکی ئاڤێستاییە کە بە واتەی ڕاستی، ماف، دروستی، دادگەری، سامانی جیهان، یاسای ئافەرینش، ڕێکوپێکی، سازگاری، سەقامگیری، سازیی و دامەزراوی تەواو، بەشێکی سەرەکیی لە ناوی ئەمێشەسپێنت «ئاشا»وەهێشتایە، لەم ڕووەوەیە کە لێکۆڵینەرانی دینی بەهدینی واژەی ئاشا بە بێوەرگێڕان لە ناو نووسراوەکانیاندا بە کار دێنن، ئاشا یەکێک لە کۆڵەکەکانی بناغەیی و گرینگی دینی زەردەشتە کە لە سەرتاسەری ئاڤێستا هەمیشە دێتە گوتن و دەتوانرێت ببێژین کە هەموو ڕێگاکانی ڕزگاری بە ڕاستی یا ئاشا کۆتایی پێدێت کە هەمانا ڕاستییە.

ئاشاوەهێشتا          ئەمێشەسپێنت ئاشاوەهێشتا یان ئۆردیبەهەشت، جیهانی بووندا ڕێکوپێکی و هەنجارێکی پتەو و گران فەرماندەرە و هیچ شتێک لە دەرەڤەی فەرمانی هەنجار و ئۆردیبەهەشت نییە. هەنجار لە ڕەوانی مرۆڤدا، ڕاستی و پاکییە. دوژمنی هەرە مەزنی ڕاستی و داد و مرۆڤ، درۆیە. ڕاستی لە ڕەوانی مرۆڤ، مایەی خۆشی و خورەمی و شادمانییە و هەر چاکەیەک کە لە جیهاندا هەیە، لە ڕاستی هەڵدەستێت، ئۆردیبەهەشت، فریشتەی ڕاستی و دروستی و پاکی.

ئاشوو          مرۆڤی پاک و بە ویژدان، جوانمێر، پیرۆز، هاف، (حەزرەت)

ئاگر          لە ڕوانگای دینی بەهدینی پێنج جۆر ئاگری جیاواز هەیە: یەکەم بۆرزیسەوە، کە لە پێشگای پیرۆزی ئەهۆرا مەزدا هەیە. دووهەم وەهوفەریانە، کە لە ناو لەشی مرۆڤ و گیانلەبەرانی دی هەیە. سێهەم ئاورِوازیشتە، کە لە ناو گیادایە. چوارەم وازیشتە، لە ناو هەوردایە. پێنجەم سپەنیشتە، کە بۆ بەکارهێنانی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ بەکار دێت و لە هەمان کاتییشدا بە نیشانەی ڕووناکی و پاکی و زانایی لە هەمبەر تاریکی و ناپاکی و نادانی پێناسە دەکرێت.

ئالی لایەن، لا

ئالیکاری ئاریکاری، هاریکاری، یارمەتی

ئامۆژگار ئامۆژیار، ئامۆزگار، مامۆستا، فێرکار

ئامیان هەوێن، سرشت، جەوهەر

ئامەرتات فریشتەی تەندروستی و تەمەندرێژی، ئەمێشەسپێنت ئامۆرداد بوونی جاویدانییە. هێزی ئافراندن هەمیشە لە کاری ئافراندن و زایین و مردندایە و ئەم کاروبارە هەمیشەیی و جاویدانییە. مرۆڤ جیهانێکی پچووکە لە جیهانی مەزن و لە ژێر کاریگەری و فەرمانی یاساکان و زاگونەکانی جیهانی و ئەمێشەسپێنتەکان. جا ئەگەر تیشکی ئەمێشەسپێنتەکان بە سەر ڕەوان و زیندەگانی ئەو بکەوێت، ئەوە شادی و بەختیاری و خورەمی ژیانی ئەو دادەگرێت و دەبێتە ئاوێنەیەک بۆ دیمەنی هەستی، ئاوەزی گشتی، تیشکی درەخشان، هێندسە، هەنجاری بوون و ئەهۆرا مەزدا. ئەمێشەسپێنتەکان لە گۆڕەپانی ڕەوان و ژیانی مرۆڤدا، هەنگاوەکانی پالآفتن و ڕازانەوەی ڕەوانن کە لە ڕامانی پاکەوە دەگرسێت و دوای پێوانی هەنگاوەکانی ڕاستی، داد، خۆپارێزی، لێبووردیی، ئەڤین، پاکی، گەشەسەندن و پشکووتن بە ئامورداد بە واتەی جاویدانی دەگات.

ئاوەردگا مەیدانی جەنگ، گۆڕەپانی جەنگ

ئاوزەنگ ڕکێف و ئاسنی سەرکەوتنی خوانی زین و زەنگی

ئاوەنیا ڕەپستە

ئاویدەر ئاویەر، بە ئاڤێستایی «ئەوشێدرینە»، لە سەر کۆچبەربوونی زەردەشت لێکۆڵینەوەیەکی ورد و زانستی و بێ لایەنانە تا بە ئێستا نەکراوە، بێگومان هۆی تایبەت و دیاریکراوی خۆی هەیە. بەڵام بە گشتی دوو بیروڕا هەیە، یەکەمیان زۆربەی نووسەرانی بیانی بە تایبەت فارس پێ لە سەر ئەوە دادەگرن کە زەردەشت خەڵکی دەوروبەری "ورمێ" لە ڕۆژهەڵاتی کورستان بووە و کاتێک کە کۆچبەر بووە بەرەو شاری "بەلخ" لە ئەفغانستان چووە، هەڵبەت بڕێک نووسەر بە بێ بەڵگە و بێ سەرچاوە پێ لەوە زیاتر دادەنێن و دەنووسن زەردەشت لە ڕۆژئاوای ئێران "خۆراسان" لەدایک بووە و لەوێشەوە بۆ شاری بەلخ کۆچی کردووە و گۆڕەکەی لە شاری "مەزارشەریف" دایە. بەڵام بیری دووهەم کە لە ئەدەبیات و ئاڤێستای نوێ سەرچاوە دەگرێت و گومانشکێنە، شوێن و جێگای کۆچبەری زەردەشت دیاری دەکات. بۆ نموونە ڕەوانشاد "عمادالدین دەوڵەتشاهی" نووسەری هێژای کرمانشانی لە پەرتووکەکانی "چیاکانی نەناسراوی ئاڤێستا" و "ڕۆستەم و زۆراو بە زمانی ئاڤێستا" بە سەرچاوەگرتنی ئەدەبیاتی زەردەشتی "یەشتەکان"، شوێن و جێگای کۆچبەری زەردەشت بەم چەشنە دەستنیشان دەکات. یەکەمجار زەردەشت پەنا دەباتە بەر زۆزانی "ئەوشێدرینە" کە بە درێژایی مێژوو ئەم وشەیە بە چەشنی "ئاویدەر، ئاویەر" لە هەریمی شاری "سنە" لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ماوەتەوە. پاشان زەردەشت لەوێشەوە دەڕوات بۆ چیای "هۆگر" کە لە دوایدا دەبێتە چیای "هەژیر، هەجر، هەجیر" ئێستا ئەم ناوچەیە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بە "دینەوەر" بەناوبانگە. لەم شوێنەدا بەشی دووهەمی سروودەکانی گاتا بۆ زەردەشت داهۆنرا. کەی گوشتاسپ کە کۆشکەکەی بە ناوی "گەنگ شا" ناو دەبریا و لە سەر چیایەک دروستی کردبوو، ئایینی ئەوی پەژراند، بوو بە گەورەترین پاڵپشتی زەردەشت و یارانی. ئەم شوێنە ئێستا لە باژێری "سەحنە"یە کە لەو سەردەمە بە شاهیندژ، شاییندژ، سایيندژ" بە ناوبانگ بوو. زەردەشت هەروەها ئاگرگایەکی (بە ناوی ئاترنۆش، ئاگرنۆش، ئاهیرنۆش، ئازەرنۆش) لە "باکتەریا" دایمزراند. ئەم شوێنە لە دوای هەزاران ساڵ بە ناوی "پارسینە" لە هەریمی "دینەوەر"ی

کرمانشا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ماوەتەوە. پاشان باکتەریا گۆڕیا بە "باختەر" و ئەم گوندەش ئێستا ماوە. "ڕۆستەم و زۆراو بە زمانی ئاڤێستا". نووسەر و زمانەوان م. ئە. هەورامانی لە هەفتەنامەی "ئاویەر" لە ژمارەی 52 ساڵی 3 لاپەڕەی 12 باسێکی لەسەر ئاویەر نووسیوە کە جێگای سەرنجە: "لە ڕەواڵەتدا ئەم وشەیە ناساکارە "ئاویەر" وەها خۆی دەردەخات، کە فرە کۆن بێت! ئەگەریش وەها بێ، دەبێ بەم جۆرەی خوارەوە لێک بدرێتەوە واتە، وشەی "ئاویدەر" لە هەر دوو دۆخی لێکدانەوەدا لە دوو بەشی سەرەکی پێک هاتووە و ئەوە شایانی باسە کە دەبێ لەم ڕووەوە بوترێ ئەوەیە کە فەرهەنگە پارسیەکان و جوگرافیاناسەکان هەوڵیان داوە کە سەرپاکی ناوە کوردیەکان بۆ زمانی پارسی وەربگێڕن و ئەمەش جۆرە کارێکە کە دەستی بە سنگەوە ناگیرێ و جۆرە تاوانێکی مێژوویی و جوگرافیایی و ئینسانیشە کە هەرگیز لە بیر ناچێتەوە! پاش ئەم لێکدانەوەیە دەبێ ئەوە لە یاد نەکەین کە ئاویەدەر یەکێک لەو جێگا پیرۆزانە بووە کە زەردەشت لە کاتی هاتووچۆکردنی لە "شیز"ەوە بەرەو "لوڕستان" بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لە ئاویدەردا ماوەتەوە و ئەوجا بەشی دووەمی ڕێگابڕینەکەی گرتووەتە بەر کە لە هاتن و چوونەوە و گەڕانەوەدا ڕێگاکەی بە قەراغی "سیروان"دا تێپەڕیوە". بە باوەڕی من گوندی بەڵخە ئێستا لە هەورامان لە سەر سنووری دەستکردی "ئێران و ئێراق" هەڵکەوتووە و ماوە. ئەم شوێنە سەردەمی خۆی باژێرێکی مەزن بووە و کۆشکی بە ناوبانگی کەی گوشتاسپی لێبووە، هەرچەندە ئێستا لە شێوەی گوندێکی چەند ماڵی لێ ماوە، بەو مەرجە کە لە دوای داگیرکەری عەربە موسوڵمانەکان و هێرشی بێ بەزیی مەغۆل و تاتارەکان و پاشان سەردەمی عوسمانی و ڕژێمی بەعس ئەم گوندەی شتێکی وای لێ بە جێ نەماوە. ئەم گوندە لە نێوانی گوندەکانی «دەڕەی مەڕ، دەرکێ، هانەگەرمەڵە، ڕەشین و دزڵی» و شارەکانی «هەڵەبجە و مەریوان» هەڵکەوتووە.

ئاهیرنۆش ئاتەشگای ئاهیرنۆش، ئاترنۆش، ئاگرنۆش یان ئازەنۆش بە دەستی زەردەشت لە هەورامان لە بەڵخە دروست کرا، هەڵبەت مامۆستا دەوڵەتشاهی باوەڕی وایە کە ئەم ئاگرگایە لە "باکتەریا" دامەزراوە، ئەم شوێنە لە دوای هەزاران ساڵ بە ناوی "پارسینە" لە هەرێمی "دینەوەر"ی کرمانشا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ماوەتەوە. پاشان باکتەریا گۆڕیا بە "باختەر" و ئەم گوندەش ئێستا ماوە. "ڕۆستەم و زۆراو بە زمانی ئاڤێستا".

ئەرچاسپ ناوی پاتشای تۆراوەکان بوو و هەروەهاش برازای ئەفراسیاو بوو، لە دوو واژەی ئاڤێستایی ئەرج + ئەسپ، دروست بووە بە واتەی ئەسپی پڕبەها، بەڵام لە ئەدەبیاتی زەردەشتی ناوی لەتەک درۆ و دوژمنی سەرسەختی زەردەشت یاد دەکرێت، لە هێرشێ بۆ سەر شاگوشتاسپ گوایە دوو کچی پاتشای بە ناو «هۆما و وەهئافەرید» بە دیل گرت. پاشان براکەیان «ئەسپەندیار» هێرشی بردە سەر ئەرچاسپ و خۆشکەکانی ڕەها کرد و ئەرچاسپی کوشت و دینی بەهدینی گەشە پێ دا. دانشنامەی مەزدایەسنا. جیهانگیری ئۆشیدەری.

ئەرژمەند ئەرجمەند، هێژا، بەڕێز، ڕێزدار

ئەسپێنتمان نازناوی بنەماڵەی زەردەشتە، لە واژەی سپی گیراوە بە واتەی سپی ڕەگەز و ناوی نۆهەمی پشتی زەردەشتە.

ئۆل دین، ئایین، کیش

ئەتک وشەیەکە بۆ بێڕێزیکردن و سووککردنی کەسایەتی ژن بە کار دێت و ترۆ بۆ پیاو بەکار دێت.

ئەختەرناس ئەستێرەناس، پیری ئەستێرەناس، خەوگێڕ، خەوناس، ئەستێرەژمێر. لە پێشدا کوردان خاوەنی شارستانیەتی وەهابوون کە زانستی ئەستێرەناسی سەرتۆپی زانستەکانی ئەو سەردەمە بوو.

ئەرخەوانی سووری ئاماڵ بەنەوش

ئەرمەغان دیاری، پێشکەشی، کەونە شارێکی کوردانە لە کوێستاندا. کوردستان. گیوی موکریان.

ئەستووره واژەی ئەستووره واژەیەکی هیند و ئەورووپییە. لە زمانی سانسکریتیدا ستووره بە واتەی داستانە، هەڵبەت لە داستانەکانی بوودایی فرە جار بە کار هاتووە، لە زمانی یۆنانی وەک هیستوری بە واتەی گەڕیان و لێکۆڵینەوە و ئاگاییە. لە زمانی فەرانسەوی و ئەنگلیسیشدا بە دوو جۆری ستوری بە واتەی چیرۆک و داستان و پەندی دیرۆکی و مانای مێژوو، گوزارش و بابەتی دیرۆکی.. بە کار هێنراوە. بەڵام لە واتەی تەعریبکراوی زبانی عەرەبی بە واتەی گوتەی پڕوپووچ و ئەفسانە و شتی بێ بناغە مانا کراوە. لە زمانی کوردی بە چەشنی سادەی خۆی بە کار هاتووە.

ئەفسۆس ئەپسۆس، پەشیمان، بەداخەوە

ئەفسەر ئەپسەر، تاج و کڵاویی پاتشاهی

ئەکۆمەن لە ئاڤێستادا بە «ئەگەمەنگە» و بە مانای بیری خراپ و بەد و کرداری ناحەز هاتووە، لە سەردەمی ئیمپراتۆری ساسانیەکان، ئەکۆمەن واتەی ناوی دێوێکی گرتە خۆی.

ئەمێشەسپێنت واژەی «ئەمێشە» بە واتەی هەمیشەیی و جاویدانی و زیندوویی و بێمەرگیی. «سپێنت»یش بە مانای پاک و پیرۆز و پترکەر و دەرمانبەخش. کۆی ئەمێشەسپێنت دەبێتە ئەمێشەسپێنتەکان، پترکەرانی سوودگەیەنێر و پاکانی پیرۆز و دەرمانبەخشانی هەتاهەتایی. کە بریتین لە شەش ئەمێشەسپێنت: وەهومەن (وەهمەن، بەهمەن، بێمەن)، ئاشاوهێشتا (ئۆردیبەهەشت)، خشترەئیریە (شەهریوەر)، سپەنتئارمەئیتی (ئەسپەند، ئەسفەند)، هەئورتات (خۆرداد) و ئامەرتات (ئامۆرداد) کە بە ئەهۆرا مەزداوە دەبنە 7. بۆیە ژمارەی 7 لای جڤاکی بەهدینان پیرۆز دەژمێردرێت. کاردانەوی پیرۆزی ژمارەی 7 لە سەر زۆربەی دینەکان و داب و نەریتەکانی گەلانی جیهان بە چەشنێکی بێ وێنە دیار و بەرچاوە، ژمارەی 3 و 7 لە دینی بەهدینی پیرۆز دەژمێردرێت. ژمارەی سێ لە بەر سێ دروشمی بەناوبانگی زەردەشت: رامانی پاک، گوفتاری پاک و کرداری پاک، ژمارەی هەفتیش بە بۆنەی شەش ئەمێشەسپێنەکان و ئەهۆرا مەزدا پیرۆزی تایبەتیان هەیە. لەم سەردەمەی ئیمڕۆ بە شێوەی جۆراجۆر ڕەنگدانەوەی ژمارەی 7 لە ژیانی کوردان و کۆمەڵان و ئایینەکانی جیهان و تەنانەت لە ناو سرووشت و زانست و موسیقا دەبینرێت، بۆ نموونە:

موسوڵمانان لە کاتی سووڕ بە دەوری «کعبە» 7 جار سووڕ دەخۆن ـ لە کەنیسەی جوولەکەکان هەموو مۆمدانەکان هەفت پایەی هەیە، لە سەری ساڵی زایینی لە بەر پەنجێرەی خانووەکان 7 مۆم دادەگرسێنن، خوارنەوەیەک هەیە بە ناوی «سڤێنئاپ» لە سەر ئەو واتەیە کە گوایە ئاوی 7 کانی تێکەڵ بە یەک دەکرێت و هەر کەس بیخواتەوە، ئەوە تەمەنی جاویدانی دەبێت (ئاو بە ئاڤێستایی دەبێتە ئاپ)، نۆتی موسیقا 7 دانەیە، باڵەبان کە ئامێرێکی کوردییە، 7 کونی هەیە، لە سەر گۆی زەوی 7 کیشوەر هەیە، مناڵی 7 مانگە وەک منالی نۆ مانگە دەتوانێت بژیت لێ دوای لەدایکبووندا، زانستی پزشکی سەلماندوویەتی کە مناڵ لە ناو سکی دایکی بە ناو 7 قۆناخ تێ دەپەڕێت، ئینجا لە دایک دەبێت، گوایە ئاسمان و زەوی 7 تەبەقەیە، کۆڵەکەزێرینە یان پەلکەزێرینە 7 ڕەنگە، 7 ئەستێرە لە ئاسمان هەیە وەک پیتی ک بە ئالفابێتی ئارامی، کە بە هەوتبراله یا حەوبرا ناسراون، هەفتە 7 ڕۆژە، لە ناو کوردەواریدا مناڵ دوای 7 ڕۆژ ناوی دەنێن، مردو دوای 7 ڕۆژ، هەفتەی بۆ دەگێڕێت، هێندێک لە چێشتەکانی کوردی لە هەفت جۆر شت دروست دەکرێت وەک هەوتڕەنگە، شەلەم، پشتوێن لە تەمەنی ڕۆحانی و پیربووندا 7 گرێی لێ دەدەن، زەماوەن وا باو بوو کە

هەفت شەو و هەفت ڕۆژ دەگیریا، هەرێمێکی پان و بەرین لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەیە بە ناوی هەوشار، خوانی نەورۆز 7 شتی تێدا هەیە، بووک لە کاتی گوازتنەوە، مامە یا خاڵۆی زاوا دێت و بە نیشانەی پەیمان 7 گرێ لە پشتوێنەکەی دەدات، میدییەکان کە پێشنیانی نەتەوەی کوردن، 7 هۆز بوون... "حەفتە" بە زمانی ئاڤێستایی «هەپتە» بووە، بە هۆی تێپەڕبوونی کاتێکی زۆر گۆڕانی بە سەردا هاتووە، وشەی حەفتە لە هەپتە گیراوە، پیتی «هـ» بووە بە «ح» و پیتی «پ» بووە «ف». پیتی «ح» لە ئالفابێتی زمانی ئافێستاییدا نییە.

ئەنبووژەن شینبەر، کەرەسەیی، واتەیی، (مادی)

ئەنجومەن هەنجەمەن، هەنجومەن، کۆڕ، دانیشتن، نشست، کۆمەڵە، یانە

ئەنجومەنی مۆغان ئەنجومەنی پیری مۆغان کۆمەڵێک لە یارانی زانا و ژیری زەردەشت بوون کە لە سەر داوای زەردەشت ئەم ئەنجومەنەیان دروست کرد، بۆ چاودێری و پەرەپێدانی دینی بەهدینی. ئەنجومەنی پیری مۆغان کەسانێک بوون کە باوەڕی تەواویان بە ڕاهێنانەکانی زەردەشت هەبوو و لە ژێر سەرپەرشتی زەردەشت بنیاد نرا بۆ گەشەپێدان و ئاوەدانکردنەوە و هەروەها بەرگری بکات لە لادانی دین بەرەو ڕێگای ناڕاست. ئەندامانی بە ناوبانگی ئەنجومەنە کە لە ناو ئاڤێستا ناویان هاتووە ئەمانەن: مەدیامانگ، جامئەسپ، فرەشەوشتر، گۆشتاسپ.

ئەوشێدرینە ناوی ئاڤێستایی چیای ئاویەرە، لە شاری «سنە» لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

ئەرج نرخ، ڕێز

ئەوج نووک، سەر، لای هەرە ژووروی شتێک

ئەهۆرا ئەهورا، ئاهورا، ئاهۆرا، ڕەوانشاد بابا مەردۆخ لە پەرتووکی مێژووی کورد و کوردستان لاپەڕەی 60 دەفەرمێت: ئاهورا لەتەک ئاهیر مانای یەکە، «ئا» لە زبانی کوردی کۆندا بە مانای «هات» و «ور» بە مانای ئاورە ئەو ڕووناکییە کە لە ئاورەوە پەیدا ئەبێ... مەولەوی،یش دەفەرمێت:

ئازیزم، ئاهیر دووری باڵای تۆ

جەستەم کەرد وە بوول، شەماڵ بەرد پەی کۆ

ورشەی پرشەی تاو کوورەکەی جوستەم

شەرارەی لوولەی پێشەی شکستەم ..، دیوانی مەولەوی

خۆی موسوڵمانانیش باوەڕیان وایە کە (الله نووره).

باپیرە مەزن لێرە مەبەست ئەو کەسەیە کە پاشان بە ئادەم و حەوا لە چیرۆکی مووسا ڕەنگ دەداتەوە، ئەم چیرۆکە پێش موسا، لەناو بابلییەکان باو بووە، بەڵام لە چیرۆکەکەی مووسا حەوا وەک ژن، تاوانبار دەژمێردرێت و دەبێتە هۆی دەرکردنی مرۆڤ لە بەهەشت. ئەم چیرۆکە پاشان لە دینەکانی فەلە و ئیسلامیش ڕەنگ دەداتەوە. لە دینی جوولەکە بڕوا وایە کە حەوا لە لایەن شەیتانەوە فریو دەدرێت و سێوێک کە نابووایە بیخوات، دەخوات و ئەمە دەبێت بە هۆی دەرکردنیان لە بەهشت.

بڕست توانا، وزە، هێز

بژون پاکیزە، پاک و خاوێن

بوت بت، خودای دەستکرد بە شێوەی پەیکەر

بوردبار بوردەبار، وشەیەکی کۆنی هەورامییە، لەسەرخۆ، هێمن، مەولەوی دەفەرمێت:

تۆ تیره کەی وێت ـ وە زامداریی وێم!

تۆ بێ باکیی وێت ـ «بوردەبار»یی وێم

ئەو وەخت پای کاو هەرد دڵ تەم بۆ

ئەساسەی دووریی ئازیزان جەم بۆ .... دیوانی مەولەوی.

بویەر رووداو

بوونی پێویست بوونی گەرەک، (وجود واجب)

بوونی گشتی بوونی رووت، بوونی رەها، بوونی رەبەق (وجودی مۆتلەق)

بەجەستەکردن خەیاڵ، پندار، (تجسم)

بەدخوو نەگونجاو، بێئاکار

بەدەن لەش، جەستە، قاڵب، دیواری بەرزی حەوش

بەرزەنگڵ بەرزەنگڵ وەک چنووره گیایەکی بۆن خۆشە، رەنگی وەک تووکی ژیژشکە، کەمێک بەرەو شین، لە هەر شوێنێک دایبنێت بۆنی بۆ ماوەیەک دەمێنێتەوە، لە هەورامان لە دوا مانگی بەهاردا لە سەر لووتکەی چیاکان ئەیرننەوە و لە ناو سیپاڵ و شاڵ دایدەنێن، یا خود لە ناو ماڵدا هەڵی دەواسن بۆ ئەوەی ماڵ، بۆنی خۆشی لێ بێت... خەڵکی هەورامان باوەڕیان وایە کە بۆنی خۆشی ئەم گیایە، بە هارەقی پێغەمبەری مەزن ئاشوو زەردەشت ئاو دراوە و رواوە و خوای ئاگر و ئاو، هەموو خراپەی تێدا سووتاندووە و تەنیا بۆنی خۆش و وێنەی چاکی لێ بە جێ هێشتووە. پەرتووکی بووکەسوورە. حەمە رەوف مورادی.

بەرسڤ وەرام، وەڵام

بەرگری رەوا بەرگری یاسای، (دفاع حقوقی)

بەروومەند بەروومەن، بەرووەمەت، وەرومەند، «بەر» بە واتەی بەری میوە و «مەند، مەن»یش بە واتەی خاوەن، سەنگین و پشوو لەسەرخۆ، ئەم دو وشە بە سەر یەکەوە دەبێت: سوودمەند، بەهرەمەند، بارەدار، میوەدار، کامەران، گیای مەندۆک، مەندێ، مەنێ، (مەندێ لە هەمان کاتدا ناوی ماندانا کیژی دواهەمین پاتشای میدیاکان، ئاستیاگ بوو کە بووە بووکی ماڵە پارسووەکان و گوایە هەخامەنشەکان بەرەی ئەم دایکەن)

بەرەوپیری پێشوازی

بەڵخە بەلخە، گوندی بەڵخە ئێستا لە کوردستان لە هەورامان لە سەر سنووری دەستکردی "ئێران و ئێراق" هەڵکەوتووە و ماوە. ئەم شوێنە لە سەردەمی خۆی بازێرێکی مەزن بووە و کۆشکی بە ناوبانگی کەی گوشتاسپی لێبووە، هەرچەندە ئێستا لە شێوەی گوندێکی چەند ماڵی لێ ماوە و لە دوای هێرشی عەربی موسوڵمان و هێرشی بێ بەزیی مەغۆلەکان و تاتارەکان و پاشان لە سەردەمی رژێمی بەعس ئەم گوندەی شتێکی وای لێ بە جێ نەماوە. ئەم گوندە لە نێوانی گوندەکانی "دەرەی مەڕ، دەرکێ، هانەگەرمەڵە، رەشین و دزڵی و شارەکانی هەڵەبجە و مەریوان" هەڵکەوتووە.

بەهـی بە واتەی چاکی، بەهـ لە زمانی کوردیدا وشەی پەسەنکردنە و لە زمانی ئاڤێستایی «وەهـ» بووە. زۆر وشەی کوردیمان هەیە کە بە «وەهـ» یا «بە» دەست پێدەکات، وەک: بەهبەهـ، بەها، بەهر، بەهەشت، بەهدین،

بەهدینان، بەهمەن، بەهزاد، بەهرۆز.. ئێستاش لە بڕێک شوێنی کوردستان هەر بە چەشنی وەهـ بە کار دێت، وەک: وەفر بووە بە بەفر یان بەرف، واران بووە بووە بە باران، وەهار بووە بە بەهار.

بەهدینی دینپاکان، بڕوامەندانی ڕێبازی زەردەست، بەهدینان، تەنیا شوێنێکی جۆگرافیایی کە نێوی دینی زەرەشتی پێوە ماوە، هەریمی بەهدینان لە باشووری کوردستانە، ئەمە خۆی بەڵگەیەکی موتمانەدارە بۆ سەلماندنی ئەوە کە ئایینی زەردەشت لە کوردستانەوە سەری هەڵداوە.

بەهر بەش

بەینەت ئەمەگ (وەفا)

بیردۆزی بیروڕای زانستی، (تیۆری، نەزەریە)

بێڵ پێمەڕە

بێندۆ بە ئاڤێستایی بەنداڤ، ناوی یەکێک لە دوژمنانی سەرسەختی زەردەشت و هاوپەیمانی گراهمای ئاژاوەچی بووە.

بێکەران بێسنوور، بێکۆتایی، بێئەندازە

بێوەڵە بەچکەی ساوای ورچ

بیرناسی فەلسەفە

پاداشتیچاکە مەبەست لە پاداشتی چاک، هێمنی رامان و ویژدانێکی ڕووناک و دڵێکی بینا و توانامەندیی مینوویی و بێنیازبوون لە هەوا و هەوەس و خۆشنووتیی هەمیشەییە.

پارسکیکردن گەدایی کردن، سواڵکردن

پاقژ پاکژ، پاکیزە، پاک، خاوێن

پایان کۆتایی، ئەنجام

پرس پەیمان، بەڵێن، گفت

پرسنامە پەیماننامە

پەژواک خەنیدن، زایەڵە، فەرتوور، ئۆڵان، هۆڵان

پشتوێن شاڵ، پژبێن، پشتێن، پشتان، کەمەربەند، قەیوەن، هەموویان یەک واتەن و بۆ یەک مەبەستن. پشتوێن یەکێک لە بەشەکانی بەرگی کوردییە کە بەستنی بۆ مرۆڤی بەهدینی پێویستە. لە دینی زەردەشتی گەورەترین ڕووداو بۆ هەر مرۆڤێک بەستن و پۆشینی شاڵ و شەپک یا کەمەربەندە. هەر لاوێک چ کچ بێت و چ کوڕ، کە تەمەنی گەیشتبێتە تەمەنی پانزە ساڵی، دەتوانێت لە ئازادی تەواودا، دینی بەهدینی بۆ خۆی هەڵبژێرێت و ببێت بە یەکێک لە ئەندامانی کۆمەڵگای بەهدینی. ئارمانجی ئەم کارە لە ڕوانگەی دینی زەردەشتەوە لەدایکبوونێکی نوێیە، لەدایکبوونێکی ئۆلی و مینوویی بۆ گەنجی بەهدینی، بەو واتەیە کە لەمەولا ئەو کەوسە خۆی ناسیوە و دەتوانێت سەربەخۆ لە چارەنووسی خۆی ئازاد بێت و خۆی بریار بدات، تەنانەت لە هەڵبژاردنی هاوسەریش. واتەیەیکی دیکەی ڕەمزی پشتوێنەکە ئەویە کە بە بەستنی پشتوێنەکە لەشی مرۆڤ بە دوو بەشی خوارەوە و سەرەوە دابەش دەبێت. بە شێوەیەکی ڕەمزی بەشی سەرەوە بریار دەدات بۆ هەموو لەشی. لە کاتی بریاردانی نەودین کە دەیەوێت بێتە سەر دینی بەهدینی، ئەوە لە کاتی بەستنی پشتوێن، سێ گرێ لە پشتوێنەکە دەدات. بە نیشانەی پەیمان بە سێ دروشمی

زەردەشت: رامانی پاک و گوفتاری پاک و کرداری پاک. کە هەڵبەت لە تەمەنی پیری کە پلەی پاکی و زانستی گەیشتە ئاستی مرۆڤێکی فەرزانە، ئەو کات دەتوانێت 7 گرێی لێ بدات، یان گرێچنی بکات. پشتوێن نابێت ڕەنگی ڕەش بێت، شاڵی نەودین لە کاتی جەژنی هەڵبژاردنی دینی بەهدینی، دەبێت ڕەنگی سپی یان ڕۆشن بێت. بە خۆشیەوە هێشتا لە زۆر ناوچەی کوردستان داب و نەریتی جوانی گرێچنین هەر باوە، بەڵام ناوەرۆک و مەبەستی ڕاستەقینەی ئەم دابە لە بیر کراوە. بەو هیوایە کە لاوانی کورد داب و نەریتی جوان و ڕندی ئەم ئایینە بە ناوەرۆکی ڕاستی خۆیەوە زیندوو بکەنەوە. مێژووی بەستنی پشتوێن گوایە دەگرێتەوە بۆ سەردەمی زۆر کۆنتر لە هەبوونی ئایینی زەردەشت، سەردەمی جەمشید، بەڵام زەردەشت وەک دابێکی ڕەمزی ئایینی پەرەی پێدا. ئەم دابە پاشان لە ناو هیندوەکانیش بینرا و لە دواییدا لە ناو جوولەکەکانیش باو بوو کە پێی دەڵێن «سیسیت» و وەک زەردەشتییەکان چێی دەکەن. پاشان لە دینی فەلەکان، خاچپەرستەکانیش بوو بە باو، کە بە «زنار» بەناوبانگە.

پڵشت چڵکن، پیس

پوورەچیستا بە ئاڤێستایی: پورئورچیستەر، ناوی کچی پچووک و سێهەمی زەردەشتە و هاوسەری جامئەسپ بوو. بابەتی زەماوەندەکەی لەتەک جامئەسپ لە نێو سروودەکانی گاتا هاتووە.

پورشئەسپ پوورەئەسپ ناوی باوکی زەردەشتە کوڕی پترئەسپ، بە ئاڤێستایی بە واتەی خاوەنی ئەسپی زۆر.

پۆتک چەکوشی ئاسەنگری، ئاسنکوت، پتک

پەتەت پەئیتیتە واژەیەکی ئاڤێستاییە بە واتەی (توبە)، پاشگەزبوونەوە

پەرەستار پارێزەر، کەسێک کە چاوەدێری منداڵ و نەخۆش و لێقەوماو دەکات.

پەژراندن قایلبوون، (قبول)کردن

پەسپەسەکۆڵە کاکڵەمووشان، جالجاڵوکە، ماماڵە، داپیرۆشکە

پەست نزم، کەم، بێنرخ، سووک، بێئەرزش

پەسن (سفەت، تاریف)، ئەمەگ، وەفا

پەڕاو دەفتەر، پەرتووک

پەژواک دەنگدانەوە لە ناو چیا و ئەشکەوت، زایەڵە

پەیڤین وتووێژ، گفتوگۆ، قسەکردن

پەلەوەر باڵندە، پەڕەندە، چەڤیک

پەیک تەتەر، نامەبەر

پەیجۆر شوێنگێڕ، تۆژەرەوەر، لێکۆڵەر، مینەکار، تۆژینەر

پەیکار جەنگ، خەبات، (شەر)

پندار خەیاڵ

پیر، پیرەک پێشەوا، ڕێنما، (شێخی تەریقەت، مرشد)، ڕابەری دینی بەهدینی و بەرزترین ئاستی ئایینیی لە ناو دینی زەردەشت، کە دەتوانێت ژن بێت و هەم پیاو، لە هێندێک هەرێمی کوردستان بۆ ژنی پیر، دایکی باوک، دایکی دایک، مامان، پیرەک دەگوترێت. (سان، بەرزترین پلەی ڕامیاری و سەربازی لە کۆمەڵگای بەهدینی)

پیری مۆغان        موغ، مەغ، ناوی مەوبدە، پیری مۆغان، سرووشی زەمان، سوشیانسی وڵاتانن کە دەبێت لە هەموو سەردەمێکدا هەبن و بەرپرسیاری ئایینی خۆیان بە ئەنجام بگەیەنن. پیران و دانا و بەرپرسیارانی ئایینی بەهدینی کەسانێکن کە بە فەلسەفە و ئامۆژگارییەکانی زەردەشت شارەزا بوون و بێجگە لە بابەتی ئایینی، شارەزای زانستی سەردەمیش بوون، وەک : کشت و کاڵ، مەتەمەتیک، کیمیا، ئەستێرەناسی، کەشناسی، پزشکی.. لە دیرۆکی کوردان، کەسێک بە پاتشایی نەدەگەیشت مەگەر لە لای مۆغان خوێندنی تەواو نەکردبایەت. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەر بەردنووسەکانی بێستون، چەندین جار ئەم وشەیە نووسراوەتەوە. یەکێک لە 7 هۆزی میدیاکان، هۆزی مۆغەکان بووە، کە لە دوای هێرشی ئیسلام، بەشی زۆریان لە هەورامان گرسایەنەوە، 99 پیری هەورامان ئێستاش هەر بەناوبانگە. واژەی مۆغ لە ناو هەموو زمانەکانی ئەورووپی هەیە. یۆنانیەکان ئەمەیان بە لاوە سەیر بوو کە مرۆڤێک شارەزایی ئەم هەموو زانستە بێت، بۆیە برێکیان پێیان وابوو ئەمانە جادووگەر یا زۆر خەڵکێکی مەزن و سەیرن و ناوی مۆغ بۆ ئەوان بە مانای ئاوەڵناوی جادووگەر یا مرۆڤێکی فرە بەڕێزە. تا ئێستاش بە هەر دوو واتە لە زمانی ڕۆژئاوای بە کار دێت. لە ڕۆژئاوا وشەکانی «مەجیک» بە واتەی جادوو و یا «مەجستیک» یا «مەجیستی» بە واتەی مەزنی و گەورەیی بە کار دێت کە لە واژەی مۆغ گیراوە. «دینۆ» نووسەری یۆنانی لە پەرتووکی «پەرسیا» ئاماژەی بۆ ئەو خاڵە دەکا کە مۆغەکان لە جادووگەری بێزار بوون و هەرگیز ڕوویان لە جادوو نەکردە. کاتێکیش مرۆڤ سەیری ئاڤێستا دەکات، زەردەشت ڕاستەوخۆ دژایەتی جادوو و جادووگەری دەکات. مۆغ لە زمانی یۆنانی بەم شێوە هاتووە: «ماگۆ» و هەروەها لە لاتینینش بەم جۆرە هاتووە: «ماگی» و لە زمانی ئەرمەنی «مۆگ»، عەرەبەکانیش لە ئەوانیان وەرگرتووە، بەڵام چونکە لە زمانی عەرەبی پیتی «گ» نییە، بۆیە ئەوان «مەجوس»ی پێ دەڵێن. لە قورعان، سورەی «حج»، ئایەی هەڤدە، ناوی مەجوس هاتووە. بۆیە تا ئێستا موسوڵمانەکان بە هەڵە بە مرۆڤی بەهدین دەڵێن «مەجووس». شایانی باسە کاتێک کە عەرەبەکان نیشتمانی میدیا (کوردستان)یان داگیر کرد، دینی مەجووسیش وەک دینەکانی جوولەکە و خاچپەرستی ڕێزی لێ دەگیرا و تەنیا باجیان (جزیە) وەردەگرت و ئایینی بەهدینی ئازاد بوو، بەڵام کە دەستەڵاتی ئیسلام پتەو بوو، بە بیانووی ئەوە کە ناوی زەردەشت لە قورعان نەهاتووە، ئەم ئایینەیان (یاساخ) کرد و بۆختانی ئاگرپەرستیان سەپاند بە سەر ئۆلی بەهدینی. زۆر زانا و هەڵبەستوانی هێژای کورد لە نێو هەڵبەست و پەخشانی خۆیان ناوی پیری مۆغانیان بە کار هێناوە، وەک زانای فەرزانە مەولەوی:

ئازیزم، ئامای، ئای بێ قەرار و وێم!
ئای ئای چەمەڕا، ئای ئەنتزار وێم!
مەوتەنە کەی چەم دیدەش ها نە ڕێت
غەریبی تا کەی، بۆ وە ماوای وێت
های ساقی! بازار جلیوەی دڵدارەن
سەودای خریدار، دانەی دیدارەن
یەکێ وە مایەی گەنج (کەی)ەوە *
چون منیچ وە تای فەرتووت نەیەوە
ئەو سەد هەر کەسێ پەی وێش وە راوەن
وە قیمەت نی یەن، ئەخلاس حەساوەن

مایل کەر باڵای وەی لادا چون نەی

دەسێوت دەف بۆ، ئەو دەس جام مەی

با بێدار کەرۆ تا کەی بۆ غافڵ

دەف وە سەدا گیان، جام وە ڕەشحە دڵ

با کلافە بۆ، ئاخر لەوانم

خاک پای حەزرەت «پیر موغان»م

چون دەف، بەرگ پۆس ئیرادەت پۆشم

غولام بەر دەس حەڵقە نە گۆشم

خۆم ئاسا خەیلێن وەتن مەیخانەم

چون پیاڵەی واق شیشەی پەیمانم ...... دیوانی مەولەوی

پێوازۆ پێڤاژۆ، ڕێتکە، قۆناخ، (مەرحەلە، پرۆسە)

پێوانە هەندەسە، پیاڵەی مەی، قاپی بەراوەردکردن

تاب توانا، (تاقەت و تەحەمول)

تاڤێنن دەروشینەوەی مانگی تابان، تاڤ، مانای تیشکی مانگ، تاڤ هەیڤ بە واتەی تیشکدانەوەی مانگ کە لە ڕاستیدا تیشکی هەتاوە، تاودان.

تاکتاکەرە قژاوکە، توتاک، مەلێکە شەوانە دەخوێنێت، تاقتاقکەرە

تۆم توو، تۆو، توخم، دانە

توندڕەوی خێرەسەری، پێی زیادە داگرتن لە سەر هەر شت، کەلەڕەقی، (ئیفرات، تەعەسوب)

تەوزیم ئەرک، کاری سەر شان، کارێک کە پێویستە بکرێت.

تەوەزەل تەوەزن، تەمبەڵ، تەپ

تەڤلیبوون تێکەڵبوون

تەلەسەنگ تەلەبەرد، پارچەیەکی پانکەڵە لە بەرد

تەیار ئامادە

تیتاڵیکردن شۆخیکردن، گاڵتەپیکردن

تیرۆژ تیر+ ڕۆژ، تیشکی ڕۆژ

جاڕ کێڵگەی گەنم

جان گیان، (ڕۆح)

جانەوەران بوونەوەران، جووڵەوەران

جاویدان (جان لە بەدەن)، ژابیدان، واژەیەکی کۆنی میدییە کە گۆڕانێکی فرەی بە سەر هاتووە و وشەگەلی ژن و ژیانی لێ بە جێ ماوە، واژەی ژاویدان گوزارە لە هەمیشە، پایەندە، پایەدار، هەرگیز نەمردن، هەرمان و نەمری و جان لە بەدەن دەرنەکردن (ئەبەدی) دەکات. بەرابەر بەم واژەیە «یەئێتڤان» بە ئاڤێستایی هەیە.

جڤاک کۆمەڵگا

جماندن		جولاًندن

جوانمەردی		جوانمێری، مرۆڤی باش و مەزن، مەردایەتی، مێرخاسی، جوانمەردی و مەردبوون هەم بۆ ژنە و هەمیش بۆ پیاوە.

جەستەی گیانلەبەر	لەشی گیاندار

جەژنی سەدە		10ی ڕێبەندان هەر ساڵ (29ی ژانیوەری)، کۆتایی چلەی گەورە و دەستپێکی چلەی پچووک، جەژنی پیرۆزی سەدە بە ئاگر و مەی پێشوازی لێ دەکرێت.

جەمشید		جەمشیدی پێشدادی کە بە ئاڤێستایی «جەمیویوەنگەهان» یان «ییمە» هاتووە. جەم لە ئاڤێستادا بە چەند جۆر پەسنی هاتووە، وەک «خشەئیتە» کە بووە بە «شیت» کە لەواژەی خۆرشیت، خۆرشید دەبینرێت و بە واتەی درەخشان یا شاوێنە هاتووە. جەمشید لە ئەفسانەکانی نەتەوەیی وەک یەکێک لە گەورەترین پاتشاکانی چەرخی پێشدادیان دەژمێردرێت. دوای جەمشید «تەهمورس» هاتووە. جەمشید داهێنەر و فێرکاری بەرگدرووی و هەلاجی و کەشتی و پزشکی و خەڵکی فێری دەرهێنانی گەوهەر لە کانەکان کردووە، هەروەها داهێنەری برێک کەلوپەلی جەنگی و دامەزرێنەری شاری «شیز» شوێنی لەدایکبوونی زەردەشت بووە. هەروەها دەبێژن جەژنی نەورۆز دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جەمشید. مەی (شەراب) لە سەردەمی ئەو بە ڕێکەوت چێ بووە. گوایە 650 ساڵ دەستەڵاتداری کردووە و لە ماوەی 300 ساڵ پاتشایەتی ئەو هیچ جۆرێک نەخۆشی و مردنێک نەبووە. لە سەردەمی ئەو بە هۆی خۆشبوونی کەش و هەوا، گیانلەبەران و باڵندەکان زۆر دەبن، بەڵام بە هۆی دەستپێکردنی زستانێکی سارد و بەردەوامبوونی ئەو سەرمایە، دژێک ساز دەکات بۆ داڵدەدانی خەڵکەکەی و گیانلەبەران، کە بە «وەرجەمکەرت» بە ناوبانگ دەبێت. ئەوی کە لە سەرچاوەکان دەردەکەوێت جەمشید لە دواییدا تووشی لوتبەرزی و لەخۆباییبوون دەبێت و ڕوو لە ستەمگەری و بێدادی دەکات. بۆیە فەڕی یەزدانی لێی دەڕمێ و مەردومیش پشتی لێ دەکەن و دژی ڕادەپەڕن و ئەویش، گوایە بەرەو وڵاتی «چین» هەڵدێت، کە خەڵک دەیدۆزنەوە و پاشان لە ناو درەختێک کە خۆی شاردبووەوە، بە ئەرەیەک لەتەک دارەکە دوو کەرتی دەکەن. پاشان دوای ئەو فەڕ دەگەڕێتەوە بۆ لای «فەرەیدوون». خۆی ڕەنگدانەوەی ئەفسانەی جەمشید لە ناو میتۆلۆژی دینەکانی سامی لە چیرۆکی «سولەیمان» دەبینرێت. وەک ئەوە ئەو پاتشایە زۆر شتیان وەک یەک دەچێت، بە خزمەتگرتنی دێو و جنۆکە و بەرزبوونەوە و گەڕیانیان لە ئاسماندا. لە زمانی عەرەبی جەمشید بە «مەنوشلەخ» بە ناوبانگە. لە کوردیدا جەمشیر، جەمشێر و جەمشید دەگوترێت.

جیهانی بەرین		جیهانی هەموار و سەرتر

چاڤ		چاو

چاکوێژ		زمانپاک، ڕەوشتپاک، درووستکار، دڵپاک

چاند		فەرهەنگ، خوێندەواری، ڕۆشنبیریی

چاوبرسیەتی		(تەماح)

چاونژێر		ڕژد، چرووک، دەستقونجاو، (بەخیل)

چت		شت

چتێک		شتێک

چنووره گوڵێکی زۆر جوانه و بۆنی زۆر خۆشه، کیژان دەیکەن بە بەرۆکیاندا و له ناو خانووەکان بۆ بۆنخۆشی هەڵدەواسرێت، بۆ دەرمانیش کەڵکی لێ وەر دەگیرێت، له هەوراماندا بۆ بەرگری له بۆگەنکردن و خراوبوونی گۆشت، چنووره دەخەنه ناو گۆشت. (بووکەسووره، حەمەرەوف مۆرادی)

چەمک مەبەست، واتە، (مفهوم)

چەمەک (لۆژیک، مەنتق)

چەنگ (هارپ)، له سازەکانی کۆنی کوردییه که 46 سیم یا تەل درووست دەبێت و بە پەنجه دەژەنرێت.

چلۆن چۆن

چەواشه شاش، ناڕاست، دژ، پێچەوانه، تێکچوو، شێویاگ

چەواشەکار گومڕێ، لادەر، زیانکار، چەواشەکاران ئەو کەسانەن که له ڕێگەی گومڕێی و چەوتی کۆمەڵگا هەنگاو دەنێن، که بریتیشه له درۆ و زیانمەندی و ئازاردان و ناپاکی و وێرانی و کاولکردنی ژێرخانی کۆمەڵگا، له ئاڤێستادا درۆ به چەشنی «دۆڕگوەنت» هاتووه.

چەندوچوون کردن (حیساب)کردن

چەنگەرگاچا چەنگەرەهاچە، فەرزانەی هێندی چەنگەرگاچا نووسەری "ڕیگڤیدا"یه که به چەشنی سروود نووسیویەتی. ڕیگڤیدا له نووسراوەکانی هەره پیرۆز و گەورەی ڕۆژهەڵاته. پەرتووکێک هەیه به ناوی «چەنگەرەهاچەنامه» که «ئانکوتیل دوپرۆن» لێکۆڵینەر و زمانەوان و ئایینناسی فەرانسەوی، بۆ یەکەم جار له ساڵی 1775 له هیندوستانەوه بۆ ئەورووپای هێنا.

چێڤێک باڵنده، مەل

چێره «چڕ» کورتکراوەی چێرەیە، چڕوچاو، چێهره، ڕوومەت، (ڕەنگی چێهرەیی به واتەی ڕەنگی پەمەیی)

خاپاندان فریودان، لەخشتەبردن، هەڵخەڵتاندن

خاپوورکردن لەناوبردن، نابووتکردن، سامانساکردن (سامانساکردن، له ناوی سەلمانسەر پاتشای وێرانکاری ئاشوورەوه هاتووه)

خارا بەردی خارا، بەردی ڕەقی گرانیت

خاس باش

خاسەکی تایبەتمەندی

خاکسار بێفیزبوون، بێهەواییبوون، خۆبەزلنەزان، خاکی

خاکی مرۆڤێکی بێفیز و ساده و خۆبەزلنەزان

خامه پێنووس، (قەڵەم)

خشته ئاوەز، ژیری، خێرەت

خواست ویست، ئارەزوو، نیاز، خواستک، هەناو، هەوا، (نفس)

خواسته هەناو، هەوا، خۆزگە، (نفس)

خوسپ پاش‌مله‌گوتن (غیبت)

خوسپکردن پاشمله‌گوتن، (غیبت)کردن

خۆشنووت ڕەزامەند، قایل

خۆکەمگر خۆبەکەمزان، بە پێچەوانەی لووتبەرز، دڵنەرم

خۆڵتەکەر چاپلووس، چاپباز، ماستاوچی، کیسەکێش

خۆویستی خۆپەسەنی، لەخۆڕازی، گورێخی

خوەسن جنێو، جوێن

خۆربڕان ئاوابوونی خۆر

خۆرداد مانگی جۆزەردان، جۆخێنان، بەختەباران یا زەردان، مانگی سێهەمی بەهار

خۆردادڕۆژ نێوی شەشەم ڕۆژی مانگەکانی ئاڤێستایی

خۆڕەم شاد، بەکەیف، شادمان

خەنی کامەران، دڵخۆش

خیرەسەر خودسەر، کەلەڕەق، دەمارگرژ

خێرەت خیرەت، خرەد، ئاوەز، زانایی، زانست، هۆش

خێرەتی سپەند زانایی پاک و پیرۆز

خێش خۆمانە، خۆیی، خزم. وشەکانی (خێش و هاوکار و یاوەر) وەرگێڕاوی واژەگەلی ئاڤێستایی «خائێتوش» و «ڤێرزنەم» و «ئائیریەمنا»یە، ئەم کەسانە دۆست و یار و هاوڕێی نزیکی ئاشوو زەردەشت بوون و لە لایەن پاکی و جوانمێری و بڕوامەندی لە هەمووان بەرچاوتر بوون. ئەم کەسانە بە زانابوون و زاڵبوون بە سەر هەوەس و دەروونی خۆیاندا و بە لە خۆبردوویی و بەئەمەگی بەناوبانگ بوون. ئەندامانی ئەنجومەنی پیری مۆغان لەم سێ دەستەیە درووست دەبوون. خێشەکان لە هەموو لایەنەوە وەک زانست و تێڕوانین و پاکی و ڕاستی و خۆپارێزی شایستەتر بوون و فرەتر بە زەردەشت نزیک بوون و جێگای ستایشتی زەردەشت بوون. ئەمانە لە ڕێگای دینی بەهدینی ئامادەی بەختکردنی گیانی خۆیان بوون.

داپ داب، ڕەوشت (دابونەریت)

دادوستەد سەندن و فرۆشتن، داد لە دانەوە وەرگیراوە و ستەد لە ستاندن وەرگیراوە

دارشت ڕۆزی، فەڕ، بەز، دەستەنە، خەز، (خیر، برکت، نعمت)

دادار خواوەند، یەکێک لە سەدویەک ناوی ئەزدان لە ئۆلی بەهدینی

دانش زانست

داوەر (قازی، حەکەم)

دەبستان ئەو شوێنە کە مرۆڤ لەوێ فێری زانست و زانیاری و داب دەبێت (مکتب، قوتابخانە). دەبستان لە دوو وشەی (داب و ستان) دروست بووە، چاوگ و ڕیشەی «دەب» لە واژەی کۆنی «دیپ» گیراوە کە بە مانای «نووسین» لە بەردنووسەکانی «بێستوون» هاتووە. لە زمانی هەورامی کۆندا «دەپیر» یان «دەبیر» بە نووسەر دەگوترا و بە شێوە نووسراوەکەش دەگوترا «دەپیرە» یان «دەبیرە» و شوێنی نووسینەکەش «دیوان» دەوترا

(اداره)، ئەو شوێنەی کە شاگردەکان لەوێ فێر نووسین و زانست و فێربوون دەبوون دەگوترا «دەپستان» یان «دەبستان، دەبیرستان». وشەی داب کە ئێستا لە زمانی کوردی لەتەک نەریت هاوکات بە کار دێت (دابونەریت) لە واژەی دەپ هاتووە. وشەگەلی (ادب) کە لە زمانی عەرەبی بە کار دێت لە چاوگی وشەی دابی کوردی گیراوە، ئەم واژەیە لە سەردەمی (اموی)یەکان بە هۆی وەرگێڕانی کۆمەڵێک پەرتووکی هەورامی کۆن کە ئایینی و زانستی بوون، بۆ سەر زمانی عەرەبی (تعریب) دەبێت و پاشان دەیان وشەی (اداب، ادبیات، ادیب، مودب، ادبا...) لێ چێ کریا. بۆیە ئەم وشەگەلە لە قورئاندا بەدی ناکرێت و لەمەڕ زمانەوانیەوە هیچ ڕیشەیەک بۆ ئەم واژەیە لە ناو زمانی سامییەکان نادۆزرێتەوە.

دروود　　درووت، ستایش، پەسن، (سڵاو، دۆعا مەدح، تاریف، رەحمەت)

درێغ　　پەشیمانی، ئەفسۆس

دشنە　　دەشنە، خەنجێری دەمڕاست، کارد

دنەدەر　　جووڵێنەر، بزۆک، هاندەر، (محرک)

دۆزەخ　　دۆژە، ناخۆش

دوغدۆ　　دەغدۆ، دەغدو، «فەڕهومەرڤان» ناوی دایکی زەردەشتە. دەغدۆ دایکی زەردەشت لە گوندی «لەج، ڕەج» لە «شارویران»ی «مەهاباد» لەدایک بووە، «لەج»ێی ئیمڕۆ پێشتر بە زمانی ئاڤێستایی «رگا» بووە. واتەی دوغدۆ بە ئاڤێستایی «شیردۆش، بێریڤان» دەگرێتەوە. واژەی «دادۆ»ی ئێستا لە زمانی کوردی کە بە واتەی دایک لە زاراوەی کرمانجی سەروو بە کار دێت لە وشەی ناوی دایکی زەردەشت گیراوە. هەروەهاش واژەی «دادە» لە زۆر شوێنی جیاوازی کوردستان بۆ دایک و خۆشک و ژنی مەزن و بۆ ڕێزنان بە کار دێت، لە ناوی دایکی زەردەشت گیراوە. گۆڕی دایکی زەردەشت لە گوندی «ئەمبێ، ئەمبە» لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان نزیکی باژێری «ورمێ»یە.

دوودەمان　　خانەدان، هۆز، خێڵ

دۆژە　　دۆزەخ، ناخۆش

دەجوێت　　جووڵاندن، جووڵین

دە هێزی دەر و ناڤ　　مەبەست لە دە هێزی دەر و ناوەوەی مرۆڤ ئەمانەن: بیستن، بینین، چێژتن، بۆنکردن، هەستکردن، توانامەندبوون، داهێنان، خێرابوون، تێگەیشتن، دووربین بوون یان پێشبینی کردن، هەموو مرۆڤێک خاوەنی ئەم دە هێزەیە مەگەر ناساخ بێت.

دەیتاڤێنن　　دەدرەوشێنن، تاودان، درەوشینەوە وەک مانگی تابان، تاڤ مانای تیشکی مانگ، تاڤە هەیڤ بە واتەی تیشکدانەوەی مانگ، کە لە ڕاستیدا تیشکی رۆژە.

دەد　　دڕندە، گیانلەبەری کێوی

دەرس　　دەرز، وانە، واژەیەکی کورتکراوی «دەرێسەرە» بە مانای تێگەێشتن و بەبیرمانەوە و بە قووڵی خوێندن و فێربوونە، «دەرێس»یش بە واتەی نیگا و تەماشا لە ئاڤێستا هاتووە.

دەمباس　　(روایت)

دەفر　　جام، قاپ

دەسکیسی　　سیخوڕیی، (جاسوسی)

دەیئاخنێت پڕکردن، دەیتەپێنێت

دیدەوانی چاوەدێری، پاسەوانی، برێڤانی

دینانە شێتانە

دێبەر کێڵگە، بەری دێ، بەردەم ئاوایی

دێویەسنان دێڤیەسنایان، دێوپەرستان، داسنی، ئەو کەسانەی کە ستایشتگەرانی دێویان لا پیرۆزە، کورتکراوەکەی لە زمانی کوردی دەبێتە «داسنی». مانای واژە دێڤ بە پێچەوانەی ئەوی کە لە سەر زاری مەردوم باوە کە گوایە دێڤ شتێکی ناڕێک و قەبە و نالەبار یان گیاندارێکی شاخداری ئەفسانەیی، «دێڤ» لە زمانی ئاڤێستایی دەکاتە درەخشان و ڕووناکدانەوە و تاباندن. واژەی «یەسنا»ش دەبێتە نیایشت و پەرستش، کە بە سەر یەکەوە دەکاتە «ستایشتگەرانی ڕۆشنایی» یا بە زمانێکی سادەی ئیمڕۆیی «ڕۆژپەرست». (پەرتووکی واژەگەلی ئاڤێستایی، بەرگی 3)

ڕابن ڕابوون، ڕاپەرین، شۆڕش

ڕابە ڕاپەڕە

ڕاد بەخشێنەر، دەسواز

ڕاژە ئوودە، (خزمەت، خدمت)

رامانی پاک بیر و هزری پاک و چاک، کە بە ئاڤێستایی دەکاتە «هوومەتە»، یەکەمین دروشمی زەردەشتە بۆ هەر مرۆڤێک

ڕامش ئاسوودەیی، سەرخۆش و دڵنیایی

ڕان ڕانەمەڕ، گەلەی پەز، مێگەل

ڕاهێنان پەروەردەکردن، فێرکردن، یاددان، مەشقدان، دەرسدان

ڕژد بەرچاوتەنگ، بەئێرەیی، ئێرەیی، ئیرەیی ڕەشک، (حسود)

ڕسکاو داهێنەر، وەدیهاتوو

ڕک ڕق، کینە، (پیتی ق لە زمانی ئاڤێستایی نییە، ڕک یان ڕق لە زمانی عەربی، بووتە چاوکی وشەی ڕەقیب و کۆمەڵێ وشەی تر)

ڕماندن ڕووخاندن، تێکدان، ڕووخان

ڕۆژەڤ بابەت، بابەتی ڕۆژ، (بابەتی ئەکتۆئیل)

ڕۆژەکانیمانگ لە ئۆلی زەردەشتی هەموو ڕۆژەکانی مانگ نێوی تایبەت بە خۆیانیان هەیە، نێوی ڕۆژەکان بەمجۆرەن:

1 ـ «هورمزد»، کورت کراوەی ئەهۆرا مەزدا، گیان بەخشی یەگانە و لە گەورەیی و زانایی بێهاوتایە.

2 ـ «بەهمەن»، وەهمەن، رامانی پاک

3 ـ «ئەردیبەهەشت»، باشترین پاکی

4 ـ «شاریوەر»، ئاشاوەهێشتا، پاتشایەتی بەهێز

5 ـ «سپندارمەز»، سپەنتەئارمەئیتی، ئەسفەند، لەخۆبوردوویی و مێهرەبانی

6 ـ «خۆرداد»، هەئورتات، تەندروستی و ڕێکوپێکی (ڕۆژی لەدایکبوونی زەردەشت)

7 ـ «ئەمورداد»، ئامورداد، ئامەرتەت، بێمەرگی، جاویدانی، هەتاهەتایی

8 ـ «دەیبەئازەر»، دادار، دادپەروەر، بەدیهێنەر

9 ـ «ئازەر»، ئایر، ئاتر، ئاگر، تیشک

10 ـ «ئاوان»، ئاپان، ئابان، ئاوەکان، کاتی ئاو

11 ـ «خۆر»، هۆرەخشیتم، خۆرشیت، هەتاو

12 ـ «مانگ»، مانگ، هەیڤ

13 ـ «تیر»، تیشتریە، ئەستێرەی باران

14 ـ «گەئوش»، گۆیی زەوی، گێتی، ژیان، بوون (زۆربەی نووسەران بە هەڵە بە گا یان مانگا وەریانگێڕاوە)

15 ـ «دەیبەمێهر»، دەتهۆش، دادپەروەر

16 ـ «مێهر»، میترا، سۆز و دۆستایەتی و پەیمان و بەڵێن و هەڤاڵبەندی

17 ـ «سرووش»، فەرمانبەرداری لە ئۆلی ئەزدانی

18 ـ «ڕەشەن»، دادگەری

19 ـ «فەروەردین»، فەڕەوەشی، فەڕوەهەر، هێزی پێشکەوتن و پاسەوان و ڕەوان و جەوهەری کەرەسەی ئافراندنی گەردوون

20 ـ «وەهرام»، وەرەهرام، بەهرام، وێرێترەغنە، سەرکەوتن

21 ـ «ڕام»، ڕامە، ئاشتی و ئاسایشت و خۆشی و هێمنی

22 ـ «با»، وات، هەوا، با

23 ـ «دەیبەدین»، بەدیهێنەر، دادپەروەر

24 ـ «دین»، ڕوانینی دەروون، ویژدان

25 ـ «ئەشی»، ئارد، بەختەوەری، سامان و ویست و داواکارای

26 ـ «ئەشتاد»، ئارشتاد، ڕاستی و دروستی

27 ـ «ئاسمان»، ئاسمان

28 ـ «زامیاد»، زەوی

29 ـ «مانترەسپەند»، مێهرسپەند، گوتەی پیرۆز، وتەی چاکە

30 ـ «ئەنارام»، ئەنغرە ڕەئۆچە، تیشک و ڕووناکی بێپایان و هەتاهەتایی

ڕۆخ ڕەخ، کەناری چۆم یا دەریا

ڕۆژانی هەفتە کوردەکان لە کۆندا، ڕۆژەکانی حەوتوویان بە نێوگەلی ئەستێرەکان دەژمارد. ئەورووپاییەکان، ئەم کردەوەیان لە کوردەکان وەر گرت و ئێستاکە نێوی ڕۆژەکان لە زبانە ئەورووپیەکاندا لە نێوگەلی ڕۆژانی هەفتەی کوردی کەونئاراوە گیراوە. 1 (کەیوانشید = شەممە)، 2 (مێهرشید = یەکشەممە)، 3 (مانگشید = دووشەممە)، 4 (بارامشید = سێشەمە)، 5 (تیرشید = چوارشەممە)، 6 (هورمزشید = پێنجشەممە)، 7 (ناهیدشید = هەینی) ڕۆژەژمێری کوردی ئاڤێستا. فاروق بۆرەکەیی

ڕووش مرۆڤی جەنگخواز و نەگونجاو

ڕەخشان پڕتیشک

ڕەسایی گەیین، پێ گەیشتن، (کامڵبوون)

ڕەسین گەیین، ڕەسایی ڕەسا، ڕەسیدە، پێڕاگەیین

ڕەسیدە گەیشتوو

ڕەمز نیشانە، (سەمبول)

ڕەوان جان، گیان، (روح)، هەر شتێک کە لە ڕۆیشتندایە و نەگات و وێستانی نەبێت وەک ئاوی ڕەوان، خوێندنەوەی ڕەوان و بێگرێ

ڕەوەند شێوە، ڕەفتار، ڕەوشت

ڕووگە (قیبلە، قبلە)

ڕەشگ (حسود)

ڕێڕەو (سیستم)

ڕێژەیی (نسبی)

زات واژەیەکی ئاڤێستاییە، زات، دارا، خاوەن، بوون، ڕاستی هەر شتێک، جەوهەر

زاگۆن زاکۆن، یاسا، بەربەست

زاما زاوا

زایشت بەدیهاتن، زایین، لەدایکبوون

زرێ ڕەخت و بەرگی جەنگی

زوێن داماو، ناتەوان

زۆنگاو ئاوی وەستاو و گەنیو

زەردەشت لە سەر ناوی زەردەشت منیش بڕوام وایە کە پێشتر زەردەشت ناوی ڕاستەقینەی «سیمیار» بووە و نازناوی «زەردەشت» لە دواییدا پێی دراوە. پیری شالیاری زەردەشتی لە بەرهەمی خۆی «ماریفەت» ناوی زەردەشت، بە «سیمیار» ناو دەبات، پیرشالیاری زەردەشتی دەفەرمێت: **(گۆشت بڕوانە پیر شالیار بۆ / هۆشت جە کیاستەی زانای «سیمیار» بۆ)**، مانای: "بە وتەی پیری شالیار گوێ بگرە و هۆشی خۆت بدە بە نووسراوەی زانای سیمیار". فەرهەنگی دێهخودا. بەرگی 13. «سیمیار» لە دوو واژەی سیم و یار دروست بووە، دەزانین سیم بە واتەی زێوە و بەشێک لە ناوی زەردەشت، واژەی زێڕی تێدایە، کە ئێستاش نرخی زێڕ لە زێو زیاترە، بۆیە ڕێی تێدەچێت کە ناوی سیمیار بۆ زەردەشت کەم بووبێت، بۆیە لە پاشان نازناوی زەردەشتیان پێ داوە. عمادلدین دەوڵەتشاهی ناوی زەردەشتی بەمجۆرە لە یەک داوەتەوە: زەرەساوشەتەرئائی، «زەرە» بە مانای زێڕ و تیشکی تەڵا، «ساویانتا» بە واتەی درەوشانەوە و تابان، «وەشەتەر» بە مانای بارین، «ئائی» بە مانای هاتن یا ئایی هاتووە، کە بە سەر یەکەوە دەکاتە «بارین و درەوشاندنی تیشکی زێڕینی ڕۆژ»، زەردەشت نازناوی «سیمیار» بووە. (ڕۆستم و زۆراو بە ڕەوایەتی ئاڤێستا.)

زەروان ناوی خوای زەمەنی بێکەران، خودای بەش و بەهر و چارنووس و بەخت و ناوچاوان، پاتشای جیهان و گەردوون، لە زەروانیسم بڕوا وایە کە هەموو شتێک لە سەر خواست و ویستی زەروان ئەنجام دەدرێت، هیچ شتێک

ناگۆڕدرێت، مەگەر لە سەر ویستی زەروان نەبێت. زەروان نەمر و هەمیشەیی، ویستی لە هەموو شتێک بەرزتر و بە سەر هەموو شتێکدا زاڵ و بەدەسەڵاتدارترە. زەروان چارەنووسەکان دەنووسێت و یەکیشیان دەخات. زەروان بەدیهێنەری ژیان و بوونە. زەروان خۆشیسێنەر و دروێنەکەری ژیان و بوونەکانە. زەروان گاسنەکەی لە دوو کەڵی ڕەش و سپی بەستووە و بە سەر کێڵگەی ژیان دەیکێشێنێت و تۆی ژیانی پێدا دەپژێنێت، بەڵام درەنگێکی پێ ناچێت لە بەرگی دروێنەکارێکی ڕدێنسپی بە تەمەن، بە داسێکی تیژ دێتە سەر ڕێگا و ڕیشەی ژیان لە چاوترووکاندنێکدا دەبڕێت. ئاوازی خۆشی گاسنەکەی لە کاتی جووتکردن و چاندنی تۆی ژیان و هاڕەی وشکی داسەکەی لە کاتی دروێنەکردنی ژیان، لە گوێی زەرواندا یەکێکە و هیچکام لەم دووانە هەستێک لە دڵی زەروان نابزوێنێت. کاتێک کە مرۆڤ شاد و دەم بە پێکەنینە و کاتێک کە دەردەدار و نەخۆشە، زەروان هەر دووکیان دەبینێت و دەبیسێت، بەڵام بە بێ ئەوە ناڵەکان و شادیەکان بتوانێت ئەو دابچڵەکێنێت. کەس توانای ڕاوەستان و بەربەرەکانێی لە بەرانبەری زەروان نییە، مرۆڤ گەرەکە ملکەچی خواست و فەرمانی ئەو بیت و چارەیەکیش نییە. لە ناو عەربەدا بە (دەهریە) بە ناوبانگە و دینی ئیسلام زۆر کەوتەتە ژێر کاریگەری زەروانیسم، بابەتی (قەزا و قەدەر) ڕاستەوخۆ لە زەروانیسم گیراوە. مرۆڤ بە گشتی لەم ئایینە بێدەسەڵاتە، چونکە زەروان لە ڕۆژی یەکەمەوە هەموو شتێکی بۆ مرۆڤ دیاری کردووە و هەموو ڕووداوەکان لە سەر (قەزا و قەدەر) ڕوو دەدات و دەکرێت و دەبێت. واژەی زۆر و زۆران و زەمان لە کوردیدا، لە چاوگی زەروان گیراوە. سەردەمێک زەروانیسم یەکێک ئایینیەکانی باوی کوردستان بووە و لە سەر زۆربەی ئایینەکان کاریگەری خۆی هەبووە.

| | |
|---|---|
| زەند | ڕاڤە، شیروڤە، شیکردنەوە، لێکۆڵینەوە، (تفسیر) |
| زەنگین | دارا، ساماندار، دەوڵەمەند |
| زیڤینگ | ئەشکەوتێ کە خەڵکی تێدا بژی |
| زیندەگی | ژیان |
| زیادەڕەوی | زیاڕۆیی، (ئیفرات، تەفریت) |
| زێ | مناڵدان، پسدانی دایک |
| زێرەڤانی | چاوەدێری، دیدەوانی |
| زێنۆ | شێوە |
| ژیار | شارستانیەت، (تمدن) |

ژیان و ناژیان ژیان و ناژیان، بوون و نەبوون، هەستی و نیستی، لێرە مەبەست لە ناژیان و نەبوون و نیستی، مەرگ نییە، ناژیان بە واتەی ژیانێکی بێ سوود و بێکەڵک، یان پڕ لە درۆ و دووڕوویی و کرداری ناپەسەنە، کە لەتەک هەنجاری ژیان ناگونجێت.

| | |
|---|---|
| ژیربێژی | (مەنتق)، ڕادەی وتە |
| ژیرکاری | (حکمەت)، ئافەرین، ڕێئونی |
| ژینگە | سرووشت |
| ساکوولٚ | قوولٚ، کوولٚ |
| سالۆر | ژیر، بەئاوەز |
| سپڵە | بێئەمەگ، بێ (وەفا، سفەت) |

سپێد		سپی، چەرمگ، سفید
سپێدەدەم		دەمیبەیان، کازیوە
سپەهر		سپەر، ئاسمان
سپەند		پاک، پیرۆز، خاوێن، بێخەوش، پاکژ
سپیئار		دارێکی بەرزی شۆخ و شەنگ کە بێبەرە و تا بیست میتر باڵا دەکێشێت و بە ناوی سپی ئار و بە داری عەرعەر بە ناوبانگە و تۆخڵەکەی سپییە.
ستران		گۆرانی، لاژە
سرشت		جەوهەر، هەوێن، بنیات
سروودبێژ		هەڵبەستوان، هۆنەری هەڵبەست و پەخشان، ئەوەی کە سروود دەبێژێت
سرووش		ئاوازی ویژدان، خۆرپەی دڵ، بەدڵاهاتن
سزاوار		شایان، شیاو، شایستە
سەدە		چەرخ، هەر سەد ساڵ یەک سەدەیە
سەرا		ماڵ، خانە، کۆشک، خانوو، (بەشێک لە وشەگەلی کاروانسەرا، کەیسەرا،یە)
سەرسەری		سەرچڵ، بێبیرکردنەوە، وازوازی، هەر دەمێک لە خەیاڵێک (بێکارە و خوێڕی)
سەرشار		پڕ، لێواولێو
سەرگوزەشت		بەسەرهات، سەربوری
سن		جانەوەرێکی پچووکە خڕی بۆرە و ئافەتی گەنمە
سنجری		ئاسنی سورۆبووە
سندان		سنان، دەزگای شت لەسەر کوتانی پینەچی و ئاسنگەر، وەک جنێویش بە کار دێت
سۆز		گفت، پەیمان، بەڵێن
سۆزمانی		مرۆڤێک کە لەشی خۆی دەفرۆشێت
سوێند		سوێن، سۆند، سۆکەند، هەموویان لە یەک ڕیشەی واژەی سوکەندی ئاڤێستایی گیراوە کە دەکاتە کەرەسەیک کە ئێستا بە «گۆگرد» دەناسرێت. کاتێک مرۆڤ لە ڕێزمانی زمانی کوردی ورد دەبێتەوە، دەبینێت کە واژی سوێند لەگەڵ وشەی خواردن بە یەکەوە بە کار دێت (سوێندخواردن) و لە ڕاستیشدا سوێن، شتێک نییە وەک نان و میوە بخورێت. ئەما بۆ وا دەڵێن؟ لە سەردەمی زنجیرە پاتشایەتی کەیانی و میدیاکان سوێندخواردن بەم شێوەی ئیمرۆ نەبووە، بەڵکوو هەر کات پێویست بوایە کە کەسێکی تاوانبار بۆ دڵنیاکردنی دادگا ڕاستی بسەلمێنێت، دەبوایەت جامێکی «سۆکەند»ی (سۆدەی گۆگرد) دەخواردەوە، جا ئەگەر لە سەر ڕاستی بوایە، ئەوە بێگومان هیچ زیانێکی پێ نەدەگەیشت، بەڵام ئەگەر سوێنی بە درۆ بخواردایەتەوە، ئەوە سۆکەندەکە هێدی هێدی لەشی لە ناوە دەسووتاند و هەلاهەلای دەکرد. ئەگەریش بێتاوان ببوایەت، ئەوە وەک دەروێشەکانی ئیمرۆ، بێزیان لە تاقیکردنەوە دەهاتە دەرەوە. ئەم جۆر ئازموونە بۆ ئەو سەردەمە بۆ ڕەوابوونی قسەی گومانلێکراو زۆر باو بووە. بۆیە ئێستا لە زمانی کوردی سوێندخواردن وەک دەستەواژە ماوەتەوە، بەڵام خودی کارەکە لە بیر کراوە. هەڵبەت ئازموون و تاقیکردنەوی دی لەو زەمانە هەبووە وەک تێپەڕبوون بە ناو کۆمای ئاگر یان ڕژاندنی ئاسن یا مسی تاواو بە سەر پشتی گومانلێکراو بۆ

ڕاستبوون یا ناڕاستبوونی. لە ئەفسانەی باوکی «کەیخەسرەو» پاتشای مێژووی ئێمە کوردان «سیاوەش»، بۆ بەرپەرچدانەوەی بوختانێک کە لە لایەن باوەژنەکەی بۆی هەڵبەسترابوو، بۆ سەلماندنی ناڕاستبوونی قسەی زڕدایکی بە ناو کۆمای ئاگرەکە تێپەڕی و بە بێزیان لەو دیو ئاگر هاتە دەرەوە.

سۆزرەت — سەیر، نائاشنا

سوشیانس — ڕزگارکەر، ڕێپیشاندەر، پێشەوا، پەیامبەر، ئازادیخواز، سوودگەیەنەر

سووچ — گوناح، تاوان

سەوداسەرانی مەزدا — ئەو کەسانەی کە بە دڵ ئەڤێنداریی خودای تاک دەکەن.

سەیزوو — سبەی، سۆزی، بەیانی

سەوڵ — سەڵپ، (پارووی بەلەم و قایەقرانی)

سوهەیل — سوەیل، ئەستێرەیەکی ڕووناک و پرشنگدارە کە لە باشووری ئاسمان دەردەکەوێت، دەرکەوتنیشی بە واتەی کۆتایی پێهاتنی وەرزی گەرمایە.

شاگرد — هاوشت، (قوتابی)

شاندن — ناردن، ڕەوانەکردن

شاڵ — شەپک، سێتەرە، بەرگی سپی بێملیوانی مرۆڤی نەودینە کە لە کاتی هەڵبژاردنی ئۆلی بەهدینی بە واتەی بەرگی ڕامانی پاک دەیکاتە بەر. لە هەورامان شاڵ و لە بۆتان شەپک دەگوترێت، شەپک و شاڵی بۆتان و هەورامان ئێستاش لە کوردستان بەناوبانگە. لە بڕێک شوێن، بە نێوەکانی ڕەنک و چۆخەش ناو دەبرێت. شاڵپۆشان لە ئۆلی بەهدینی بە واتەی لەدایکبوونی نوێیە. ناوی دیکەی شاڵ بە زبانی لۆڕی «سێتەرە»یە. لە کاتی بەجێهێنانی جەژنی شاڵ یا سێتەرەپۆشی سروود و ئافەرینگانی تایبەت بۆ هەڵبژاردنی دین دەخوێندرێت و داب و نەریتی تایبەت ئەنجام دەدرێت.

شالیار — شەهریار، پێشکار، وەزیر، پیری شالیاری هەورامان

شایست — (حلال)، ئەو شتەی کە لە ڕوانگای هزر و ڕامان ڕەوایە

شۆخی — گاڵتە، گەمە

شۆدار — شێدار، نمدار، تەڕ

شەوت — دزەکردن، ڕەخنەکردن، چوونەژورەوە و کاریگەربوون لە ناو دەروونی کەسێک

شەیدا — ئەویندار، شێتی ئەوڤین، ڕووناکی، (بەشێک لە ناوەکانی خۆرشید و جەمشید لە شید یا شەید دروست بووە، کە بە واتەی هاڵاو و گەرما و ڕووناکییە).

شەوەکە — شەبەکە، تۆڕ

شیز — شیز، هورمزگای ئاگرگەشئەسپ، ئازەرگەشسپ، یان تەختی سولەیمان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە نێوانی شارەکانی «سەقز» و «تیکاب» و «سایەنقەڵا، شاهیندژ» هەڵکەوتووە. شوێنی پیرۆزی دیرۆکی زەردەشتییەکان بووە و شوێنی لەدایکبوونی یەکەمین پەیامهێنەری مەزنی دینی یەکتاپەرستی ئاشوو زەردەشتە. تا بە ئێستا لە سەر شوێنی لەدایکبوونی زەردەشت لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆ نەکراوە و زۆربەی بۆچوونەکان لەمەڕ شوێنی

لەدایکبوونی زەردەشت لە پشت تەم و مژدا، خۆی حەشار داوە، کە بە باوەڕی من، دەستێکی ئەنقەزی تێدا دەبینرێت. هەر چەندە بڕێک لە ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی ڕۆژئاوایی وەک: دارمستێر، نۆلدکە، هرتسفیلد، برونوهنینگ، راولینسۆن و... لە سەر ئەم بڕوان کە زەردەشت خەڵکی باشووری دەریاچەی «ورمێ»یە و لە وڵاتی میدیاکان لەدایک بووە. بەڵام بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و ئاکادامی لەم بارەوە، کاری پێویستیان نەکردووە. باشووری ورمێ دەکاتە ناوچە و گوندەکانی «بەردەزەرد» و «مەمێند» و «شاروێران» لە ڕۆژهەڵاتی ئیمڕۆی کوردستان. «جەکسۆن» گومانی وایە کە زەردەشت لە دەوربەری گوندێکی وەک «خورخورە» ژیابێت، ئەم گوندەش لە چەند شوێنی هەرێمەکە هەر بەم ناوە هەیە، یەکێکیان لە باکووری مەهاباد لە ناوچەی شاروێران. شادڕەوان «مەردووخی کوردستانی» زەردەشتی بە خەڵکی میدیا زانیوە. (مێژووی وێژەی کوردی. سدیق بۆرەکەی. مێژووی زانایانی کورد. بابامەردووخی رۆحانی شیوا)

شەپک لە واتەی شاڵدا هاتووە.

شەماڵەکردن داگرساندنی ڕووناکی، گڕ، تیشک (شەماڵ بە واتەی مۆمی داگرساو، شەم واژەیەکی کوردییە)

شێرپەنجە نەخۆشینی (سەرەتان)

فرووزە نیشانە، شوێن، چۆنیەت

فەرتەنە تۆفان

فەڕ گەورەیی، شکۆ، دەبدەبە، جوانی، تیشک، پیرۆزی، هۆیشانازای، بەهرە، (خێر)، پێچەوانەکەی بەدفەڕ، بێفەڕ

فەڕی جەمشیدی فەڕ نیشانەیەکی یەزدانییە، ئەو فەڕەیە کە جەمشیدی کیانی پاتشای وڵاتی ئاریایی خاوەنی بوو، بەڵام بە هۆی لەخۆباییبوون و ڕووکردن لە درۆ و تووشی خۆپەرەستی و نەخۆشینی «من» بوو و فەڕی یەزدانی وەک مەلێک لێ دوور کەوتەوە.

فەرزانە لە دوو وشەی «فرە و زانا» دروست بووە، مرۆڤی زانا و جیهاندیدە

فەرزانەیی زانایی، دانایی

فەروەردین مانگی خاکەلێوە، نەورۆزمانگ، مانگی یەکەم لە ساڵی کوردی و زەردەشتی

فرەشەوشتر بە ئاڤێستایی بە مانای خاوەن وشتری کارامەد و پشودرێژ، فرەشەوشتر برای جامئەسپ، هەر دوو شالیاری شاگوشتاسپ بوو، هەر دوو ئەندامی ئەنجومەنی پیری مۆغان بوون.

فرەمەند ژیرو بەشکۆ

فەلە خاچپەرست، (مەسێحی)

ڤیدایی ناسیاری (عرفان)

قارەمان دلێر، پاڵەوان، لە دوو وشەی «کار و رامان» دروست بووە، پیتی «ک» بووە بە «ق» و لە ئالفابێتی ئاڤێستایی پیتی «ق» نییە.

قالک (سەدەف)، قاڵب، تووێکڵی گوێز و چتی تر، قاووخ، کاسەی سەر

کاربین زانا، پسپۆڕ

کارزار مەیدانی جەنگ، لە پێشدا واژەی «کار» بە واتەی «جەنگ» بە کار دەهات

کارێز ئاوێک کە لە بن زەوییەوە دەرهێنرابێت و سەری داپۆشرابێت

کارێزکەن ئەو کەسەی کە کارێز هەڵدەکەنێت

کرداری پاک کردە و ڕەوشتی پاک و چاک کە بە ئاڤێستایی «هڤەرشتە» دەگوترێت و سێهەمین دروشمی زەردەشت لە ئۆلی بەهدینییە. بۆیە سێهەمین دروشمە، مەرج نییە هەر کەس رامانی پاک بێت و گوفتاری پاک، دەتوانێت کرداریشی پاک بێت، بۆیە کرداری پاک سەنگی ترازووی رامان و گوفتاری پاکە.

کالا شتومەک، کۆتاڵ

کالب قاڵب، تەن، بەدەن، بێژان، چوارچێوە، ڕێژە

کاوی کەی، میر، پاتشا، دەسەڵاتدار

کرِوکاش لەدووکەوتن، لێکۆڵینەوە، لەشوێنگەڕیان، دۆزینەوە، پەیجۆری

کلاوخوود کالاوی ئاسنی جەنگاوەر

کوچک بەرد، هەرد

کوور قووڵ

کەبار زەردەپەڕی ئێوارە

کەرپان مەلا یا کیشبانی ئایینی ڕۆژپەرستی، دوژمنی سەرەکی زەردەشت بوون و دژایەتی ڕاستییان دەکرد

کەرپە بەخشش، (خێر، احسان)

کەرپەککاران کەسانێک کە کە کاری باش (احسان) دەکەن

کەروێشکەکردن لەنگانەوە و شەپۆلێدانی گوڵی گەنم بە دەم باوەوە

کەشکەشان کاکەشان، کاکێشان

کەی کاوی، بەڕێز، سەرۆک، پاتشا، میر و خاوەن تاج و تەخت، توێژی دەسەڵاتداری سەردەمی زەردەشت کە بڕێکیان زۆر بە توندی دژایەتی ئۆلی بەهدینییان دەکرد. وشەی کەی لەتەک ناوی زۆر پاتشای دیرۆکی کورد گرێی خواردووە، وەک: کەیخەسرەو، کەیقوباد، کەیکاووس. کاکەی ئیمرۆی زمانی کوردی لە چاوگی وشەی «کەی» ئاڤێستایی گیراوە. کەی لە زمانی کوردی سەرناوی ژنان و پیاوانی بەڕێز و پیرە. هەروەهاش واژەی کەی لەتەک وشەی دی لە زمانی کوردی ئێستاکەش بە کار دێت وەک: کەیسەرا بە واتەی سەرا و کۆشکی پاتشا، کەیبانوو بە واتەی ژنی پاتشا، شاژن، کابان، کەیخوا، کوێخا، کەیخودا بە واتەی پیاوی ژیر و بەمشۆر، کەیل بە واتەی سەرکۆمار و سەردار و سەرۆکی ئێڵ و هۆز، کەینەک بە واتەی کەنیشک و دۆێترە، کچ. مەولەوی نەمر لە دیوانەکەی ئاماژەی بە «کەی» کردە:

غەریبی تا کەی، بۆ وە ماوای وێت
های ساقی! بازاڕ جیلوەی دڵداران
سەودای خڕیدار، دانەی دیدارەن
یەکێ وە مایەی گەنج «کەی»ەوە
چون منیچ وە تای فەرتووت نەیەوە
ئەو سەد هەر کەسێ پەی وێش ڕاوەن

وە قیمەت نی یەن، اخلاس حەساوەن

کەڵەشێر          کەڵەباب، (دیک)

کەیگوشتاسپ          کاوی ویشتاسپە، پاتشایەکی ناوچەی هەورامانی ئیمڕۆ بوو کە هانای زەردەشتی دا و پاشان دینی زەردەشتی پەژراند. ناوەکەی بە ئاڤێستایی بە مانای پاتشای خاوەن ئەسپی ئامادە.

کیژان          کامیان

کیس          چرک، ئەستووربوونی پدۆ

کین          قین، ڕک

گازندە          گازنج، گلەیی، بناشت، (شکایەت)

گوفتاری پاک          وتە و گوتەی پاک و باش، بە ئاڤێستایی «هۆختە»، دووهەمین دروشمی ئۆلی بەهدینییە.

گومانچنین          خەیاڵبافی

گرۆ          دەستە، پۆل، پەل، گروپ، گرۆ، گروهـ واژەیەکی کۆنی هەورامییە.

گۆشەنشینی          (خەڵوەت)نشینی

گوزارە          واتە، مانا

گیانبەخش          زیندووکەر

گەجەستەک          نفرەتلێکراو، ناپاک

گەشەکردن          پێگەیشتن، هەراشبوون، لێرە مەبەست (تکامل).

گەلاوێژ          تیشکدەر، ئەستێرەی تیشتەر، لە سپێدەی بەیانیانی هاوین پێش لە هەڵاتنی خۆر دەبینرێت، بە لاتینی (سیرووس) و بە عەرەبی (شعرای‌یمانی) دەگوترێت.

گەمارۆ          شاڵاو، دەورگیران، پەلامار

گەناو          ئاوی وەستاو و بۆگەن، زۆنگاو

لاونا          نەوازشت، نەوازشن

لف          هاوزاد، دوونە

لەچەری          ڕژدی، ڕەزیلی، یەکدەندە

لۆهراسپ          کەیگوشتاسپ کوڕی لۆهراسپ یان لهرائەسپە، کە پاتشایەکی کۆنی ناوچەی هەورامانی ئێستا بووە. دەقی ناوەکەی بە ئاڤێستایی "ئەئۆروەت ئەسپە" کە بە واتەی خاوەن ئەسپی توندڕەو.

مامۆستا          هیربۆد، ئاهیربۆد، مەوبۆد، ئامۆژگار، ئاهیربۆد لە مەوبۆد گەورەترە.

مانی          ماندوو، شەکەت، وشەی کوردی ماندوو پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە «مانی» پێغمبەرەوە هەیە. کاتێک لە زمانی کوردی بە کەسێک کە کارێکی زۆری کردبێت و زۆر شەکەت بێت، دەبێژن مانی نەبی، یان ماندوو نەبی، بە واتەی ئەوەیە وەک «مانی»ت بە سەر نەیەت، یا وەک مانیت لێ نەیەت. کە ئەمەش پەیوەندی بە بەسەرهات و چارەنووسی تاڵ و ناخۆشی مانیەوە هەیە. مانی بناغەدانەری ئایینی مانی‌یە. برێک سەرچاوە دەڵێن خەڵکی شاری هەمەدان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووە و برێکی دی لەسەر ئەو باوەڕەن خەڵکی شاری ماردین لە باکووری کوردستانە، کە ئەو سەردەمە پایتەختی «سلوکیەکان» بووە. مانی لە ساڵی 215ی زایینی لەدایکبووە و لە ساڵی 273 یان

276ی زایینی لە «گوندیشاپوور، جوندیشاپوور» لە سەر دەروازەی شار بە ئازارێکی زۆر هەڵواسرا. مانی کوڕی «پاتەک، فاتەک» لە بنەماڵەیەکی خانەدان بووە، هەر لە تەمەنی لاوی فێری زانست لە هەموو بەشەکانی ئەو سەردەمە بووە. لە دینەکانی بەهدینی و بودایی و جوو و عیسایی و ئایینەکانی ئەو سەردەمە لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراوانی کردووە، پاشان لە تەمەنی 24 ساڵی خۆی وەک پەیامهێنەرێکی نوێ ناساند. سەرەتا لە میزۆپاتامیا (بين‌النهرين) دەستی بە بڵاوکردنەوەی دینەکەی کرد، پاشان بە بۆنەی «فەیرۆز» برای «شاپوور» کە پاتشا بوو و دینەکەی پەژراندبوو، بە شاپووری ناساند و یەکێک لە پەرتووکەکانی بە ناوی «شاپوورگان» پێی پێشکەش کرد. شاپوور لە سەرەتادا فرە ڕێزی گرت و لایەنگرانی مانی بە ئازادی خەریکی چالاکی و پەرەپێدانی دینەکەیان بوون، بەڵام پاشان شا پشتی تێ کرد و کەوتە بەر بێمێهری شاپوور و لە وڵات دووریان خستەوە و دەریانی کرد. مانی لە کاتی ئاوارەبوونی لە هیندوستان و تەبەت و چین، سەردانی کرد و دوای مردنی شاپوور لە ساڵی 272ی زایینی گەڕایەوە بۆ ناو وڵات. «هورمز» جێنشینی شاپوور زۆر بە ڕێزەوە پێشوازی لێ کرد و دیسان ئازادی خۆی لەمەڕ بڵاوەپێدانی دینەکەی وەر گرتەوە. مانی لە ناو فەلەکانی میزۆپاتامیا لە باشووری کوردستانی ئیمڕۆ خەریکی پەرەدانی دینەکەی بوو تا کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی هورمزشا. ئینجا «وەهرام» یان بەهرامی یەک، هاتە سەر تەخت و مانی قۆڵبەست کرد و فەرمانی هەڵواسینی مانی دا، برێک سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن تا پشتوێنەی مانییان لە ناو خاک چاڵ کرد و پەیڕەوەکانیشی لە بەر چاوی خۆی بە پێچەوانە بە سەرەوە لە ناو زەوی تا پشتوێنە چاڵیانی کرد. مانی دەسنووس و پەرتووکی فرەی نووسی، بۆ خەڵکی نەخوێندەواریش ئامۆژگارییەکانی بە چەشنی نیگار و وێنە دەکێشا، بۆیە بە «مانی نیگارکێش» یش بەناوبانگە. پەرتووکە هەرە بە ناوبانگەکانی «ئەرژەنگ یا ئەرتەنگ» بوو. بە کوژتنی مانی لایەنگرانی مانی هەر مانەوە و بە ناو جیهاندا بڵاو بوونەوە و دەورێکی سەرەکییان بینی لە پێشکەوتن و پەرەگرتنی و بڵاوەپێدانی چاند و هەنەر و پیشەسازی میزۆپاتامیا لە جیهانی ئەو سەردەمە. دینی مانی تا سەردەمی خەلیفەکانی بەغدا مابوو، بەڵام خەلیفەکان فتوای بنبڕکردنی ئەم دینەیان دا. هەر لە تەبەت و چین، تا باشووری فەرانسە ئەم دینە تەشەنەی کرد، بە چەشنێک کە لەرزی خستە پشتی کۆڵەکەکانی مەسێحییەت، بەو جۆرە تا سەدەکانی 13 و 14، لقەکانی ئایینی مانی لەتەک مەسێحییەت کێبەرکێی دەکرد. مانی بێجگە لە زمانی کوردی دایکی خۆی، باش شارەزای زمانەکانی ئارامی و سەریانی و یۆنانی بوو. دەڵێن لە مانی شەش پەرتووک بە سەریانی و پەرتووکێک بە زازایی کۆن ماوە. (بەشێکی ئەم زانیارییانە لە: فەرهەنگی دێهخودا. بەرگی 43 وەرگیراوە).

متمانەمەند	دڵنیا

مداراکردن	مۆداراکردن، بەپشووبوون، دانبەخۆداگرتن، کۆڵنەدان، (سەبر و حەوسەڵەکردن)

مردگ	مردوو

مەردوم	مەردۆم، خەڵک، کۆمەڵگا

مەزدا	مەزن، گەورە، بەشکۆ، وشەی مەزدا کە پەسنی ئەهۆرایە، ئێستا لە زمانی کوردی وەک «مەزن» ماوە کە بە واتەی گەورە و بەرز و بەشکۆیە.

مەزدایەسنایی	مەزدایەسنایی، مێزدیسەنی، ستایشت و پەرستشی ئایینی ئەهۆرا مەزدا، پێچەوانەکەی دەبێتە «دێویەسنایی»، مامۆستا گیو موکریانی باوەڕی وایە کە مەزدایەسنەیایی لە سێ وشە دروست بووە: «مە» بە واتەی

گەورە، «زدا» بە واتەی زانای بێ هاوتا، «یەسنە» بە واتەی پەرستن، دەبێتە زانای بێهاوتای، پەرستنییە بە تایبەتی بۆ ئایینی زەردەشتی (فەرهەنگی کوردستان)

مۆغ (لە پیری مۆغان واتەکەی نووسراوە)

مەغز مێشک، بە ئاڤێستایی «مێرێز» کە بە واتەی مۆخی ئێسک یا پێشە (ئێسقان) مانا دەدات.

مەناوەمەن لە دەرەوەی زاگۆن، ناڕەوا، (ممنوع، یاساخ).

میدیاما میدیا، میدیامانگ، ئامۆزای زەردەشت و سەرۆکی یەکێک لە مەزنترین هۆزەکانی میدیاکان بووە، لە سروودی نەتەوەی کورد هاتووە: ئێمە رۆڵەی میدیا و کەیخەسرەوین...

میرات واژەیەکی کوردییە کە لە چاوگی وشەی «مردن» گیراوە، سەربەش، پاشماگ.

مێرخاس جوانمێر، جەوانمەرد، مرۆڤی چاک و مەزن، مەردایەتی، مێرخاسی یا جوانمێری و مەردبوون لە زمانی کوردی هەم پیاو دەبێت هەم بۆ ژن.

مێرگ چیمەن، گیاجاڕ

میزۆپوتامیا بە زاراوەی ڕەسەنی کوردی ژووروو دەبێتە «مەزروبۆتان»، بە زمانی ڕۆژئاواییەکان دەبێتە میزوپاتامیا، هەریمێکی پان و بەرینە کە لە باکووری کوردستان دەست پێ دەکات و لە باشووری کوردستان کۆتایی پێ دێت.

مێگەڵ ڕانەمەڕ، گەلەی پەز، ڕەوەی مێ

مێهر ئەڤین، خۆشەویستی، گراو، سەودایی، دۆسایەتی، (عاشق، وفا)، لە زمانی کوردی مێهرەبان و مێهرەوان دەوترێت.

مێهرەبان مێهرەوان، دڵنەرم، بەبەزەیی

مێهرگا قوربانگا، شوێنی سەربڕینی ئاژەلەکان لە ئایینی ڕۆژپەرستی.

مینوویی مەینەڤی، جەوهەری، (معنوی)، ڕازبەر، پەرۆستی، بە واتەی ژیانی مینووی.

ناشایست (حرام)، ئەو شتەی کە مێشکی مرۆڤی ژیر بە ڕاستی نازانێت و زیانی بۆ خۆی و دەور و بەر هەیە.

ناوێزە دەگمەن، دانسقە، بەتایبەت

نفرین (لعنت، لەحنەو)

نموودی شتێک کە مان و پایەدار نەبێت.

نوێژ لە دینی بەهدینی پێنج جار لە ڕۆژ نوێژ دەکرێت، یەکەم: لە کاتی «هاوینگا» کە دەکاتەی سپێدەی بەیان، واژەی «فراوین» یا «هاوەنی» لە زاراوەی کرمانجی ژوورو نانخواردنی بەیانییانە. دووهەم: «ڕاپیتۆنگا» لە کاتی خۆرهەڵاتن تاکوو نیوەڕۆ. سێهەم: «ئۆزەیرەنگا» کە دوانیوەڕۆیە. چوارەم: «شێوانگا» لە کاتی ئێوارادا کە بە نوێژی شێوان ناو دەبرێت. پەنجەم: «نوێژیشەو» کە شەو دادێت. نوێژێکی تر هەیە کە بە ناوی «کێمنە» کە تایبەتە و زۆر دوور درێژە و پیرۆز دەژمێردرێت کە لە کاتی ڕوودا، یا کاتی دیاریکراودا دەخوێنرێتەوە و لە زمانی هەورامی ماوە. نوێژەکان بە تاک و کۆ دەخوێنرێتەوە. بێگومان پێش نوێژ، دەستنوێژ دەگرێت و پاشان ڕوو لە ڕۆژ یا ئاگر یا ڕووناکی دەکات و نوێژ دەخوێنرێت. زۆر گرینگە ئەمە بوترێت کە بەهدینان ئاگرپەرست نین و ئاگر ناپەرسترێت، ئاگر و ڕووناکی

بەشێکە لە دیاردەکانی ئەهۆرا مەزدای دلۆڤان. لە ڕوانگای دینی بەهدینی 5 جۆر ئاگری جیاواز هەیە: یەکەم بۆرزیسەوە، کە لە پێشگای پیرۆزی ئەهۆرا مەزدا هەیە. دووهەم وەهوفەرِیانە، کە لە ناو لەشی مرۆڤ و گیانلەبەرانی دی هەیە. سێهەم ئاوروازیشتە، کە لە ناو گیادایە. چوارەم وازیشتە، لە ناو هەوردایە. پێنجەم سپەنیشتە، کە بۆ بەکارهێنانی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ بەکار دێت و لە هەمان کاتییشدا بە نیشانەی ڕووناکی و پاکی و زانایی لە هەمبەر تاریکی و ناپاکی و نادانی پێناسە دەکرێت.

نۆژەن	نووژەن، تازە، نوێ

نۆژەنکاری	گۆڕانکاری، تازەگەری، نوێخوازی، (مۆدرنیسم).

نەرین	ڕوانگا، بیروبۆچوون، دیدگا، تێڕوانین

نەوازشت	نەوازش، بە هەورامی نەوازشن، لاونا.

نیایشت	نیایش، (دعا)

نییر	نیلە، نیرک، یووغ، یووخ، دارێک کە لە کاتی کێڵاندنی زەوی، دەیکەنە ملی گا و لە ئاشدا دەیکەنە ملی هێستر یا ئەسپ تا بەردی ئاسیاو بسورێنێت.

نیلوفەڕ	نیلوپەڕ، ناوی گوڵێکی سپییە کە لە سەر ئاوی ئەستێردا سەوز دەبێت و گەڵاکانی پانە.

وابەستە	پەیوەند، هەڵواسراو

وام	(قەرز، دەین)

وڕینە	وڕێنە بە ئاڤێستایی «وەرینە»، ئەو وتە و وێردانە کە جادووگەران لە کاتی پیشەی جادووگەری دەیخوێنن.

وزە	هێز، زۆر، توانا

وسیار	زۆر، فرە

وەرزش	وەرزشت، جووڵەی لەش بۆ بەهێزبوونی بەدەن و چالاکبوونی لەش.

وەرزیدەکردن	ڕاهێنان و ئامادەکردن

وەرزێر	جووتیار، کشتکار، جووتبەندە، کەشاوەرز.

وەرف	بەرف، بەفر

وەوی	بووک

وەهمەن ئەمێشەسپێنت	بەهمەن ئەمشاسپەند، وەهومەن، وەهمەن، بەهمەن، بێمەن. هاندەری کامەرانی و بەختەوەری و پاکی و جاویدانی، سوودگەیەنەری نەمر، ئاگاداری ڕێکوپێکی جیهان.

ویناو	چاوی دڵ

هاڤی	نامۆ

هایدار	ئاگادار

هۆرمۆزشید	ڕۆژی پێنجشەمە لە هەفتە.

هۆشەنگ پێشدادی	هوشەنگ، بە ئاڤێستایی «هەئوشینگە» بە واتەی چێکەر و وەستای خانوبەرە و هەروەها بە واتەی کوڕمردوو. هۆشەنگ کوڕی «فەرواک» کوڕی «سیامەک» کوڕی «مەشی» کوڕی «کەیومەرد، کەی‌مەرت»،

گوایه لە سەردەمی ئەو ئاسن ناسرا و ئاگر کەوتە ڕاژەی مرۆڤ و جەژنی سەدەی بنیات نا و لە پێستی گیانلەبەران پۆشاکی دروست کرد.

هۆڵمان ویژدان، هێزی نەهێنی، هێزی ژوورو

هۆماڵ ڕەقیب، هاوچاو

هەئورتات ئەمێشەسپێنت ئەمشاسپەند خۆرداد، شادی و ئاوەدانی

هەپتە هەفتە، حەوتە، حەفتە، حەوتو، بە ئاڤێستایی «هەپتە» بووە، بە هۆی تێپەڕبوونی کاتێکی زۆر گۆڕانی بە سەردا هاتووە، وشەی حەفتە لە هەپتە گیراوە، پیتی «هـ» بووە بە «ح» و پیتی «پ» بووە «ف». پیتی «ح» لە ئالفابێتی زمانی ئافێستاییدا نییە.

هەرزەن ئەرزەن، دانەوێڵەیەکە کە زۆر وردە

هەرمانی جاویدانی، هەمیشەیی، لە بوونەوە، (ازلی)

هەژیر هێژا، زیرەک، بەڕێز، پەسەنی

هەستی بوون، هەموو جیهان و گەردوون، بوون بە واتەی گشتی، هەستی واژەیەکی کۆنی هەورامییە.

مەولەوی لە دیوانەکەی دەفەرمێت:

دایم دڵ ڕەنجوور هیجران یارم

زنجیر جەفای زولف نیگارم

خسووس شەرارەی دووری زۆر کەردەن

مەزرەعەی «هەستی»م وای سەبوون بەردەن

کەس بە وێنەی من پڕ مەینەت نەبۆ

گورفتار دۆس بێ بەینەت نەبۆ

هەمبەر ئاست، بەرانبەر

هەموارە هەردەم، بەردەوام

هەنجار (هارمۆنی)، ڕێگا، ڕەوش، خووخدە، ڕێگای ڕاستی، (مادە، قانون، ئەسووڵ)، فەرهەنگی خاڵ، بەرگی3.

هەنجاری گشتی ڕێکوپێکی ڕەها، (هارمونی تەواو، نەزمی مۆتلەق).

هەوشار 7 شار، 7 کیشەوەر کە لە ئاڤێستا ئاماژەی بۆ کراوە، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەڵکەوتووە و «دەشتی هەوشار» هەریمێکی پان و بەرینە و بە جۆرە کە لە ئاڤێستا ئاماژەی پێ کراوە، ئێستاش زۆر ساردە.

هەیڤ مانگ

هیمبوون تێگەیشتن

هیندسە واژەیەکی کوردی کە «ئەندازە» گیراوە کە لە باری زانستی شێوە و سووچ و ئەندازەگرتن دەدوێت.

هێزی ئەولەکاری هێزی ئاسایشت

یاوەر بریکار، یاریدەر، هەڤاڵ، پشت و پەنا

| | |
|---|---|
| یوز | یوزپڵەنگ، یوزپڵنگ، دڕندەیەکە کە پچووکترە لە پڵنگ لە سەردەمی خۆی لە کوردستان هەبووە. |
| یەگانە | تاک، یەک |
| یەل | بێ باک، نەبەز |

# سەرچاوەکان


**کوردی:**

**جوغرافیایی تاریخی کوردستان. جەلالالدین شافعی کوردی**

**دیوانی مەولەوی. مەلا عبدالکریم مدرس**

**ڕۆژەژمێری کوردی ئاڤێستا 2002 ـ 2003**

**زمانی ئاڤێستا. محمدامین هەورامانی**

**زەرتەشت. عبدالله قەرەداخی (مەلا علی)**

**زەردەشت. احمد الشنتاوی. شاکر فتاح**

**سەرنجدانێک لە میتولوژیای کورد. جەمال نەبەز**

**فەرهەنگی خاڵ بەرگی 1. شێخ محمدی خاڵ**

**فەرهەنگی خاڵ بەرگی 2. شێخ محمدی خاڵ**

**فەرهەنگی خاڵ بەرگی 3. شێخ محمدی خاڵ**

**فەرهەنگی کردی فارسی. هەنبانە بۆرینە. هەژار**

**فەرهەنگی ناوی کوردی. سیروان کاروانی**

**فەرهەنگی نوێ. برهان قانع**

**فەرهەنگی وشە دووانەکانی زمانی کوردی. تەها فەیززادە**

**قورعان بە کوردی. محمدسالح ابراهیمی**

**گەوهەری گەرمسێر 2. نعمتعلی سایە**

**گەوهەری گەرمسێر 3. نعمتعلی سایە**

**مێژووی کورد و کوردستان. مەردوخ**

**مێژووی وێژەی کوردی 1. سدیق بۆرەکەیی**

**مێژووی وێژەی کوردی 2. سدیق بۆرەکەیی**

**نڤیژین ئیزیدیان**

**فارسی:**

**آتش در ایران باستان. موبد اردشیر آزرگشسب**

آتش نیایش. ترجمه اورنگ
آناهیتا در اسطوره‌های ایرانی. سوزان گویری
آیین گنوسی و مانوی. ابولقاسم اسماعیل‌پور
آیین مهر میترائیسم. هاشم رضی
آیین زرتشت و تاثیر و نفوذ آن در شرق و غرب. مهرداد مهرین
آیین راستی یا یکتاپرستی زرتشت. مهرداد مهرین
ادیان آسیا (تائو. مزدایی، ادیان باستانی هند، شیوا، هندو، سیک...) عبدالرحیم گواهی
ادیان بزرگ جهان. هاشم رضی
ارداویراف نامه. ژاله آموزگار
احوال شخصیه از دیدگاه قوانین (زرتشتی، کلیمی، مسیحی) یوسف بهنود
اسطوره زندگی زرتشت. ژاله آموزگار - احمد تفضلی
اشاوهیشتا یا پیام زرتشت. مهرداد مهرین
اورمزد و اهریمن. ژ. دوشمن گیمن. عباس باقری
اوستا. هاشم رضی
اوستا. (برگردان سرود سوم از گاتای زرتشت هات سی از یسنا) دکترعباس ساسانفر
اوستا. هات سی از یسنا. دکترعباس ساسانفر
بررسی مختصری از ادیان کردان. توفیق وهبی
برگردان گات‌ها. موبد رستم شهزادی
بندهش. مهرداد بهار
بندهش هندی. رقیه بهزادی
بینش زرتشت. خداداد خنجری
پژوهش در فرهنگ باستانی و شناخت اوستا 1. مسعود میرشاهی
پژوهش در فرهنگ باستانی و شناخت اوستا 2. مسعود میرشاهی
پژوهش در فرهنگ باستانی و شناخت اوستا 3. مسعود میرشاهی
پژوهشی در فرهنگ زرتشتی. دکتر حسین وحیدی
پیام زرتشت (چنانکه از سرودهای آن پاکمرد بر می‌آید). دکتر جعفری
پیر مغان. ابولقاسم پرتو
تاریخ زرتشتیان (فرزانه‌گان زرتشتی). رشید شهمردان
تاریخ کیش زرتشت. مری بویس. همایون صنعتی‌زاده
تاریخ ماد. دیاکونوف. کریم کشاورز
تاریخ ماد و منشا نظریه دیاکونوف. محمدعلی خنجی
تاریخ مشاهیر کرد (علما، ادبا، شعرا) 1. بابامردوخ روحانی (شیوا)
تاریخ مشاهیر کرد (علما، ادبا، شعرا) 2. بابامردوخ روحانی (شیوا)
تاریخ مشاهیر کرد (علما، ادبا، شعرا) 3. بابامردوخ روحانی (شیوا)
تاریخ مطالعه دینهای ایرانی. هاشم رضی
جغرافیای غرب ایران - کوه‌های ناشناخته اوستا. عمادالدین دولتشاهی
چنین گفت زرتشت. داریوش آشوری
خرده اوستا (جزوی از نامه مینوی اوستا). پورداود

خود پتت. ابراهیم میرزای‌ناظر
دانشنامه مزدیسنا. جهانگیر اوشیدری
دین بهی (فلسفه دین زرتشت). مهرداد مهرین
دین پایه زرتشتی. دکترحسین وحیدی
دینهای ایران باستان. سیف‌الله نجم‌آبادی
رازوری در آیین زرتشت (عرفان زرتشتی). شیوا کاویانی
رمزپردازی آتش. ژان پیربایار. جلال ستارت
زبان پهلوی ادبیات و دستور آن ژاله آموزگار
زبان و ادبیات پهلوی (فارسی میانی). ج. تاوادیا. س. نجم‌آبادی
زبور مانوی. ابولقاسم اسماعیل‌پور
زرتشت سیاستمدار یا جادوگر. کامران فانی
زرتشت مزدیسنا و حکومت. جلال‌الدین آشتیانی
زرتشت نیچه (شرحی بر پیش گفتار چنین گفت زرتشت). بهروز صفدری
زرتشت نیچه کیست؟. محمدسعید حنایی‌کاشانی
زرتشت و تعالیم او. هاشم رضی
زرتشت و جهان غرب. مسعود رجب‌نیا
زروان. تیمور قادری
زمان زرتشت. کیخسرو کشاورزی
زن در آیین زرتشتی. کتایون مزداپور
زن در ایران باستان. هدایت‌الله علوی
سرزمین زرتشت رضائیه. علی دهقان
سرود هات 29 گاتها (در آغاز پیامبری زرتشت). دکترحسین وحیدی
سرود هات 30 گاتها (دو نیروی همستار). دکترحسین وحیدی
سرود بنیاد دین زرتشت. دکتر محمد مقدم
سوشیانس. پورداود
شایست ناشایست. کتایون مزداپور
شناسایی زرتشت (گفتارهای به فارسی و انگلیسی). مهربان مهرخداوندی
شهر روشن زرتشت. دکترحسین وحیدی
عروس سرخ‌پوش (داستانهای اسطوره‌ای کردی). محمدرئوف مرادی
فرهنگ بهدینان. سروش سروشیان
فرهنگ پارسی و ریشه‌یابی واژگان. مصطفی پاشنگ
فرهنگ پهلوی. بهرام فره‌وشی
فرهنگ نامهای اوستا 1. هاشم رضی
فرهنگ نامهای اوستا 2. هاشم رضی
فرهنگ نامهای اوستا 3. هاشم رضی
فرهنگ نوشیروان. نوشیروان دادگر
فرهنگ واژه‌های اوستا 1. احسان بهرامی
فرهنگ واژه‌های اوستا 2. احسان بهرامی

فرهنگ واژه‌های اوستا 3. احسان بهرامی
فرهنگ واژه‌های اوستا 4. احسان بهرامی
فرهنگ واژه‌های تازی به پارسی
فلسفه زرتشت. دکترفرهنگ مهر
فلسفه نیچه. استنلی مک‌دانیل. عبدالعلی دستغیب
گاتها سرودهای زرتشت 1. موبداردشیر آذرگشسب
گاتها سرودهای زرتشت 2. موبداردشیر آذرگشسب
گاتها سرودهای مینووی زرتشت. موبدفیروز آذرگشسب
گاتها یا سرودهای آسمانی زرتشت. موبداردشیر آذرگشسب
گاهشماری جشنهای ایران باستان. هاشم رضی
گزارش زادگاه زرتشت و تاریخ اساطیری ایران. ج. منفرد
لغزشهای در شناخت کیش زرتشتی. دکترحسین وحیدی
مانی و تعلیمات او. گئوویدن گرن. دکترنزهت صفای اصفهانی
مجموعه اوستا (گاثاها) سرودهای زرتشت. پورداود
مراسم مذهبی و آداب زرتشتیان. موبداردشیر آذرگشسب
مردم گیاه (پژوهش در فرهنگ باستان و شناخت اوستا)
مزداپرستی در ایران قدیم. دکترذبیح‌الله صفا
مزدایسنا و ادب پارسی 1. دکتر معین
مزدایسنا و ادب پارسی 2. دکتر معین
مقام زن در ایران باستان. موبداردشیر آذرگشسب
نوشته‌های مانی و مانویان. ایرج وامقی
نیاکان باستانی کرد در تاریخ و اسطوره‌ها 1. ج. منفرد
نیاکان باستانی کرد در تاریخ و اسطوره‌ها 2. ج. منفرد
واژه‌نامه ادیان. عبدالرحیم گواهی
واژه‌نامه پهلوی، پازند (فرهنگ پهلوی). سعید عریان
واژه‌نامه کردی، فارسی. دکترابراهیم‌پور
واژه‌نامه فارسی، کردی. دکترابراهیم‌پور
واژه‌های همانند در پهلوی و کردی. صدیق صفی‌زاده (بوره‌که‌یی)
وندیداد (قانون ضد دیو) 1. هاشم رضی
وندیداد (قانون ضد دیو) 2. هاشم رضی
وندیداد (قانون ضد دیو) 3. هاشم رضی
وندیداد (قانون ضد دیو) 4. هاشم رضی
وهرود وارنگ. ژوزف مارکوات. داود منشی‌زاده
ویرانه‌های تخت سلیمان و زندان سلیمان. رودلف ناومان. فرامز نجدسمیعی
ویسپرد. پورداود
یاداشتهای گاثاها. پورداود
یسنا 1. پورداود
یسنا 2. پورداود

**یشتها 1. پورداود**
**یشتها 2. پورداود**

*Lekolin. Instito Berlin*
*Avesta. 21/22.11.2001 In Berlin*
*Avesta. Ved Kaj Bar end Jes Asmussen*
*Politikens Bog Om De Store Filosoffer*
*De religiøse ideers Historie. Mircca Eliade. Bind 1*
*Religion Livsanskuelse. Gyldendals Religionsleksikon Redaktion Finn Stefansson og Asger Sørensen*

# پێرست:

تێبینی:

زۆربەی وێنەکان کە لەم پەرتووکە بە کار هاتووە، لە ڕێگای سایتی ئینترنت لە موزەخانەکانی بریتانیا، فەرانسە و ئەمریکا وەرگیراوە.

# گاتا

## سرووده پیرۆزەکانی زەردەشت

تەرگومان و درووێنەکردنی
بابان سەقزی

**به ناوی ئەهۆرا مەزدای دلۆڤان**

چاکە تۆیی، ئەی ئاگری خاوێن..!
ئەی گەورەترین بەخشێنراوی ئەهۆرا..!
ئەی بڵێسەی سوور، کە بایەخی پەسنیت..!
لە بەرت ڕادەوستم بۆ پاڕانەوە.
ئەی ئەهۆرا..!
هێوەری و هێمنی و دڵنیایمان پێشکەش بکە،
فرەیی ڕۆژیی،
پاکی و ڕاوەستان لە سەر باوەڕ،
زبانی بێگیر و دەنگی خۆشمان دەیە و پاشانیش زانست،
زانستێ کە بەرەو ژیانێکی چاک ڕابەریمان بکات.
ئەی ئەهۆرا..!
باشترین ئاکار و دلێری و جەنگاوەری و بەهێزی و زارۆڵەی وەکار و چاکمان بدەرێ،
تا ڕێگای دۆستایەتی و ئاشتی و زانست و
بیر و گوتن و ڕەوشتی چاک تێ بکۆشین،
گیان و ڕەوانمان بەدی بێنە،
تا باکمان نەبێ و
دڵمان هێوەر و هێمن بێت،
تاکوو ڕێگای پاکی و یەکێتی بگرینە بەر.
ڕێز و سپاس بۆ تۆ ئەی ئاگری ئەهۆرا..!
سپاست ئەکەین بۆ ئەم گڕ و پرشە و ڕووناکییە کەوا بۆ ئێمە ئاشکرایە،
هێزمان دەیە تا خاوێنترین هزر و چاکترین وتن و ڕێکترین ئاکارمان هەبێت،
یارمەتیمان بدە تا بەرهەڵستی پیسی و ناڕاستی بدەینەوە و لەتەکیدا بە جەنگ بێین،
ڕەوانی ئێمە، لە پیسی و ڕێگای بێئاکام بپاڵێوە،
تا بە ئەو پەڕی باوەڕ ئەهۆرای مەزن بپەرستین.

شەوێکم دی، مریەم بۆ عیسا ئەگەڕا
شەوێکم دی، خەلیفەکان بۆ پێغەمبەریان ئەگەڕان
منیش چەپکێ گوڵە گڕم کردە دیاری و
لە دەوری زەردەشتم گێڕا
**لەتیف هومەر**

# کورد و ئایین

نیشتمانی ئاری بە گشتی و میزۆپاتامیا (مەزرۆ بۆتان) بە تایبەتی، نیشتمانێکی پڕ لە فەڕ و پڕ لە داهاتی جۆراجۆرە، کە مرۆڤ وابەستەی خۆی دەکات و ناتوانێت دەستبەرداری بێت. نیشتمانێکە، پڕە لە جوانی و ئەڤینی مەزدا ئەهۆرایی بە وێنەی ئەو بەهشتە بەرین و ڕازاوە و شیرینە، کە لە ئایینەکانی سامی باسی لێکراوە.

بە درێژایی مێژوو ئەم نیشتمانە جێگەی حەوانەوە و داڵدەدانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بووە. بە هەزارها کانی و سەرچاوەی ئاوی شیرینی لێ هەڵئەقوڵێت و بە چڕوپڕی هەموو جۆرە دیارییەکانی پەروەردەگاری تیا دەبینرێت، کە بە خەڵات بۆ مرۆڤی دروست کردووە. لە هەمانکاتدا لێوالێوە لە ئەفسانە و داستان و دیرۆکی هەمە جۆر، کە مرۆڤی ئەمڕۆ دەخاتە ئەندێشەی بێسەر و بن و بێکۆتایی و گەڕیان و پشکنینەوە.

هەروەها سەرزەمینی میزۆپاتامیا یەکەم ماڵۆچکەی ژیان و خۆشەویستی تیا هەڵچنراوە و دیرۆک و کەسایەتی مرۆڤی ئاریایی پاراستووە. لەم نیشتمانە قەشەنگ و ڕەنگینەی کورد دا جۆرەها دین کە بەدیهێنەری مرۆڤ بووە هاتوتە ئاراوە.

هەر لە دەستپێکی دیرۆک، کوردستان مەزنترین و پڕپێزترین سەرچاوەی هزری مرۆڤایەتی و فەرزانەیی بووە. پێش لە هاتنی ئایینی زەردەشت «بەهدینی» باوەڕ و دینی فراوان لە ناوچەکەدا باو بووە، ئەفسانە و چیرۆک و داستان و ڕاز و ئەستورەکان دەوری گرینگیان لە رامان و هزری دانیشتوانی نیشتمانی کوردستان بینیوە. بەم هۆیەوەیە کە هەر دینێک تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی و جوگرافیایی دیاریکراوی خۆی هەبووە، بۆیە خودبەخود لە هۆکارەکانی هزریی و داب و نەریتەکانی باوی ناو کۆمەڵگای سەردەم نیشانە و کاریگەریی وەرگرتووە.

کە وابوو هەر ئۆلێک لەگەڵ تایبەتمەندی و هۆکارەکانی دەوروبەری خۆی و میراتی کۆمەڵایەتی زێدی خۆی، ڕاستەوخۆ پەیوەندی هەیە. دەتوانین بەم شێوە بێژین: نیشاندەری تایبەتمەندی ئەو ژێنگەیە کە لە نێو ئەودا هەستاوە، نرخاندنی هەر دینێک، چەشن و چۆنیەتی پێوانەی کۆمەڵایەتی ئەو وڵاتەیە کە پشتاوپشت بە وچەکانی گەیشتووە.

خۆی بە هەڵسەنگاندن و بەراوەردکردنی ئەو هۆکار و تێگەیشتن و ئەرزش و بەهاکانە، کە دەتوانرێت شێوەکانی ڕەوشت و پەیوەندیەکانی مرۆڤایانەی کۆمەڵگاکانی جیاواز شیرۆڤە بکرێت. بۆ نموونە تایبەتمەندی خودای هەر ئۆلێک لەتەک ئەوی دی، جیاوازی فرەیان هەیە.
ئارمانجی سەرەکی ئەو ئایینانە کە پێش هاتنی دینی زەردەشت هاتن ئەوە بوو کە مرۆڤیان بۆ سەدان ساڵ بەرەو نەزانی و تاریکی ڕاپێچ کردووە و هەر یەکەشیان لایەنگیر و پاڵپشتی خۆی هەبوو. دەستەڵاتداران تێر و خاوەن فەرمان بوون، هەموو هەژاران و بێدەرەتانانیش، کۆیلە و دیل و ملکەچی ئەو داب و ئایین و نەریتانە بوون کە بە سەریاندا ترس و مەرگیان سەپاندبوو و لە ژێر باری گرانیدا دەیان نالآند. بەندەی دەستەوسانی خواکانی ئەو ڕۆژگارە ڕەشانە بوون، کە زۆردار و خاوەن هێز و ساماندار، «خوا» بووە و فێڵبازانیش دام و دەستەی سەرکوتکەر و چەوسێنەر بوون.
تاکوو زەردەشت بە زانایی و بیردۆزی خۆی، هاتە گۆڕەپانی خەباتەوە و دژیان ڕاوەستا و ئاگری پیرۆزی خۆی هەڵگرساند، ئاگرێک بۆ ڕووناککردنەوەی پێش چاوی ئەو مرۆڤە ستەمدیدە و کۆیلانە، کە ملکەچی خوداوەندە جۆراجۆرەکانی باوی ئەو سەردەمە بوون، کە لە پچوکترین مافی خۆیان بێبەش بوون.
ئۆلی زەردەشت جیاوازییەکی فرەی لەتەک ئۆلەکانی تردا هەبووە. بڕوای تەوای بە بوونی ئەهۆرا مەزدای تاک و تەنیا بووە، کە یەگانە ئافەریدەگار هەستی و گەردوون و زەوی و ئاسمان و گیانلەبەر و جیهانی ئەنبوژەنی و مینەڤییە. هەر ئەویشە کە بەدیهێنەری شادی و بەختیاری مرۆڤە، کە توڕە نابێت و ئازاری هاوڕێی (مرۆڤ) خۆی نادات، ڕک و کینەی لە لا نییە و داوای بەرتیل و قوربانییان لێ ناکات.
لە بەر ئەمانە بوو زەردەشت، نەیاری زۆر زوو بۆ پەیدا بوو. بە هەموو شێوەیەک ویستیان لە ناوی ببەن و ڕێگەی لێ بگرن و بیشێوێنن و نەهێڵین گەشە بکات، سەدان جۆر ناونیتکە و بانگەشەی ناجۆر و ناڕاستیان بۆ هەڵبەست و دژایەتیەکی خەست و خۆڵی دوژمنانەی یارانی زەردەشتیان کرد، کە ئەویش بە هۆرە و فەرمووده شیرینە پڕ بایەخەکانی، بەرپەرچی نەیارانی دەدایەوە.

# چۆنیەتی سەردەمی زەردەشت

زۆر گرینگە کە مرۆڤ هەست بە گرینگی ڕاپەڕین و بەرخۆدانی زەردەشت لەو چاخ و سەردەمە بکات. بۆ ئاشنایی بە چۆنیەتی و شێوەی بارودۆخی ئەو سەردەمە و ئەرزشی ئەو ڕاپەڕینە لەگەڵ کاوییەکان و کەرپانەکان و جادووگەران کە لە نێو ئایینەکانی میتراپەرستی و مێهرپەرستی و زەروانیسم خۆیان دەبینیەوە و هەروەها ئەرزشی هەوڵ و کۆششەکانی زەردەشت بۆ لابردنی پاوەن و زنجیرەکانی کۆیلەتی ڕەنجبەران و شوان و گاوان و ڕەشایی، وامان لێ دەکات کە لە نزیکترین ڕێگەوە بگەڕینەوە بۆ ئەو سەردەمە، زەمانی زەردەشت، بەم جۆرە مرۆڤ دەتوانێت لە ئاستی بەرزی پەیامهێنەری زەردەشت تێ بگات.

پێم وابێت پێویستە سەرەتا کەمپیوتەر و تەلەڤیزیون و ڕادیو و مۆبایلەکانمان بکوژێنینەوە و سیمی تەلەفۆنەکانمان دەربهێنین و پەردەکان دابەینەوە و چاوەکانمان ببەستین و دوای ماوەیەک بێدەنگی بە ئەندازەی پێویست، بە هەموو هێز و تواناوە مێشکی خۆمان چڕ بکەین و هەموو ئەو زاگۆن و دەستوورانە و هێزی ئاسایش و دیاردە سوودمەدانەی زانست و کۆمەڵایەتی و هەموو ئەو ئەرزشە مادی و مینووییانە، کە بە لانی کەمەوە بە درێژای شەش هەزار ساڵ، لە گەلانی جیاواز بەدی هاتوون و گەشە و پەرەیان سەندووە، لە مێشک و ئەندێشەی خۆمان دەریان بهێنین. ئینجا، تەنیا مانگ و خۆر و ئەستێرەکان و زەوی دەمێنێتەوە لەتەک ڕووناکی و تاریکی، سەرما و گەرما، تێری و برسیەتی، ساخی و نەخۆشی، زەویەکی سەخت لەتەک ئاژەڵی جیاواز و دڕندە و درەختی، گەر گەنم و جۆیەکیش هەبێت ئەوە بە زەبری شان و پەنجە بە بار دێت.

مرۆڤیش بە هەمووی ئەمانەوە، مرۆڤێکی بێناسنامەیە و لە وڵات و خانووی خۆی غەریب و لانەوازە. دەیان خودای جۆراجۆر دەوریداوە، خۆ ئەگەریش نەبوایەتن ئەوە هیچ ڕووداوێک نەدەقەوما. لەم ناوە تەنیا چوارپێکانیانن کە دەوری سەرەکی بۆ سەرچاوەی ژیان دەبینن و پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی هەیە لە نێوانی زیندەگی مرۆڤ و ئاژەڵەکان. ئاژەڵەکان بە دوای ئاو و گیا و لەوەڕگای نوێن، لە دەشتێکۆ بۆ داوێنی کێوێک و لە شیوێک بۆ هەردێک. کاتێک بەفر بۆران دەکات، ژیانیش تۆف دەکات. کاتێک خۆر بەتین دەبێت، ژیانیش دەسوتێت و دەبێتە خۆڵەمێش. دەبێت مرۆڤ لەتەک سەرما و گەرما خۆی بگونجێنێت و لە بەردەم ڕەشەباشدا خۆڕاگر بێت. بە کورتی مرۆڤ دەبێت بە دەستی چۆڵەوە خۆی لەتەک سرووشتدا بگونجێنێت.

پیت و بەهرەیەک کە بە دەستی لانەوازان و هەژاران و ڕەنجبەران بە دەست دەکەوێت، زۆرینەی دەبێتە بەشی تاقمێکی زۆردار و ملهور و دەسەڵاتدار، کە ئەمانەش بۆ خۆیان نیوە یەزدان و خودایەک بوون. ئەم تاقمە بە سەر لەش و ڕەوانی کۆمەڵان فەرمانڕەوای دەکەن و خۆیان بە خاوەنی زەوی و ئاژەڵ و تەنانەت ئەو خەڵکەشی لە شێوەی نەبووانن، دەزانن. جادووگەران و کەرپانەکان و میران، ئەمانە هەر یەک بۆ خۆیان نیوە خودایەکن، هاوکات لەتەک بەرژەوندی

و نیازەکانی خۆیان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، بە هێز و توانای یەزدانەکانیان زیاتر دەکەن. سەیر ئەویە هەر چی مەردم فرەتر هەژار و کلۆڵ و سەرگەردان و چەوساوەتر دەبن، ئەوە ترسیشیان کە ترسێکی دەستکردە، فرەتر دەبێت و دەستی جادووگەر و کەرپان و میرانیش ئاواڵەتر. ئەو ترسە هەموو لەش و مێشکیانی داگرتە.

چەواشەکانی کۆمەل، ترسێکی هەرە مەزنیان لە خوداکان لە مێشکی بەتاڵ و پووچی ڕەش و ڕووتان بەدی هێناوە. جەنگی خوداکان لەتەک یەکدی بە خۆیان و گەردوونەکانیان لە ئاسماندا، مێشکی خەڵکی هەژاری دەلەرێنێتەوە، ئینجا با بەڵێن و گفتی خوداکانیش با بمێنێت، کە لە ڕێگای کەرپانەکانەوە پەڕ و باڵی پێ دەدرێت. هەژارانیش بەو هیوایەن کە گۆشایشێک لە دەرد و ئازاری هەژاریان بەدی بێت. کەس توانا و بوێری ئەوەی نییە کە گلە و گازەندەی خۆی ئاڕاستەی خوداکان بکات، نەوەک هەتاو هەموو شتێک بسووتێنێت و یان بەفر و سەرما، ڕەقیان بکاتەوە و یان نەخۆشین خۆیان و ئاژەڵ و مەڕ و ماڵاتیان لە ناو ببات...

نەزانی و گێلی پچووکترین ڕێگا بە بیرکردنەوە و کات بۆ زانست نادات. کەرپانەکانیش بۆ زل نیشاندن و مەزنبوونی دام و دەستگای خوداکانیان، گەرەک بوو کە مەردوم قوربانی بکەن، تەنانەت چاوپۆشیان لە گای لاواز و لاتی شوانی هەژار و کلۆڵ، یا کۆچەرێکیش نەدەکرد. لە قوربانگای خوێنئاوی و پڕ لە مێش و مەگەسەکانیان، ئاژەڵەکان بە خاک و خوێن دەکێشرێت. سەیر ئەوەیە هەرچی هەژاری و بەلەنگازی و نائومێدی خەڵک فرەتر دەبێت، نیازیشیان بە خوداکان بەرچاوتر و زەقتر دەبێ...

ئینجا بیهێننە بەر چاوی خۆتان لە ناو ئەم هەل مەرجە، مرۆڤێک بێت و داوای گۆڕاندن و وەرچەرخانی بنچینەیی ئەم هەموو ناڕاستییانە بکات و بیەوێت کە نرخێکی نوێ، دیتنێکی نوێ، رامانێکی نوێ و جیهانێکی نوێ بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی بەدی بێنێت. لەوانەیە، بەمجۆرە لە سەردەم و کات و بار و دۆخی هاتنی زەردەشت تێبگەیین.

# زەمانی هاتنی زەردەشت

خۆی دیرۆک و زەمان و سەردەمی هەموو ئایینهێنەرانی مەزنی جیهان، تەنانەت مێژوو و بەسەرهاتی ژیانیشیان بە کەمێک ئەملا و ئەولا دیار و ڕوونە، سەدان بابەت و پەرتووک و دەیان دەق و بەڵگەنامەیان بۆ پەیدا کردووە و دەیان کورتە فیلم و فیلمی درێژ و شانۆ و مۆسیقایان بۆ دروست کردووە و بۆیان دروست دەکەن، بەڵام تەنیا و تەنیا زەمان و بەسەرهاتی «زەردەشت»ی ئێمەی کوردان بە لەناوچوون و سووتانی دەفتەر و نووسراوەکانمان، کەوتووەتە ناو تەم و مژی گومان و لایەنی ئەفسانەوە و ڕەنگی چیرۆکی بە خۆیەوە گرتووە. کارێکی ئاوایان بە سەر هاوردوە کە مەگر کەمتر کەسێک لە زمانەوان و مێژووناس و ئایینناس بیانی، ئەویش بە مەزنی خۆیان، شتێکیان بۆ نووسیبێت. هەر چەندەش، کاتێک مرۆڤ سەرنجی بابەتەکان دەدات، جیاوازی و ناکۆکییەکی فرەی دەکەوێتە بەرچاو، کە خوێنەر تووشی سەرلێشێوان و سەرگەردانی دەبێت. بۆیە زەمانی هاتنی زەردەشت بە چەندها شێوە باس کراوە.

یەکەمیان: زەمانی زەردەشت بۆ 700 ساڵ پێش زایینی (مسیح) مەزەنە کراوە.

دووهەمیان: زەمانی زەردەشت بۆ 1800 ساڵ تا 2000 ساڵ پێش زایین بەراوەرد کراوە.

سێهەمین: زەمانی زەردەشت بە 6000 ساڵ پێش زایین زانراوە.

ئێستاکە بۆ چوونێکی تازە هاتووتە ئاراوە کە پاڵ لە 30 هەزار ساڵ دەدات.

کاتێک سەرنجەی ڕووداوەکان و بەیەکدادان و کێشەکانی سەردەمی ئاشوورییەکان و بابلییەکان و خوداکانیان یا دوای لەناوچوونی دەستەڵاتیان دەکەین، هیچ کاریگەری و نەخشێکیان ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە سروودەکانی گاتا بەدی ناکرێت. ئەمەش بە واتەی ئەوەیە کە زەمانی زەردەشت زۆر پێشتر لە هەبوونی ئاشوورییەکان و بابلییەکان بووە. کە واتە، زەمانی 700 تا 1500ساڵ پێش زایین بە مسۆگری لەتەک زەمانی زەردەشت ناگونجێت.

بێگومان کاتێک مرۆڤ سەیری ئەو پەرتووک و بابەتانە کە لە بارەی زەمان و سەردەمی زەردەشتەوە نووسراوە دەکات، دەمارگرژی و هێندێک لایەنی کەلەڕەقی و نەیاریەتی ئایینی و ڕەگەزی و رامیاری دەبینێت. لە هەمان کاتیشدا چونکە زەردەشت یەکەمین پەیامبەر و ئامۆژگار بووە کە شێوە و چۆنیەتی یەکتاپەرستی و یەکتاناسی لە ناو ئافراندنی هەستی و هەروەها داهێنەری هەڵبژاردنی هزری ئازاد و رامان و ئەندێشەی چاکە و خراپە لە ڕەوشت و فەلسەفەی بنیاتی ویژدان و سرووشت بووە، بۆیە لە رامان و ئامۆژگاریەکانی ئەو هەموو دینەکانی گەورەی سامی وەک «جوولەکە» و «فەلە» و «ئیسلام» و هەموو قوتابخانەکانی فەلسەفی یۆنان پێش لە «سوقرات» و دوای سوقراتیش،زۆربەیان بە بێ ئەوە دیانیان پیا نابێت و بێ ئەوە ئاماژە بۆ سەرچاوەکەی بکەن، بە کاریان هێناوە. بۆیە پەیڕەوان و لایەنگیرانی ئەو

ئايينانه له تەم و مژاویکردنی رامان و ئەندێشه و زەمانی زەردەشت کەمیان نەکردووه و دەوری بالاّ و کاریگەریان بینیوه.
نووسەران و زانایانی یۆنانی باوەڕیان وایه که زەردەشت پێش 6000 ساڵ پێش زایین بووه.
«ئیکسان توس» (1) کۆنترین نووسەری یۆنانییه که ناوی زەردەشتی هێناوه. ئەم نووسەره له سەدەی پەنجی پێش زایین ژیاوه و نووسەرانی دیی له گوتەکانی ئەو ئادیان کردووه.
«دیوژنس لارتیوس» (2) خەڵکی یۆنان و له ساڵەکانی 210 پێش زایین، بڕێک بابەتی له «ئیکسان توس» هاورده و زەمانی زەردەشتی له دوو بەڵگەی دەستنووسدا به 6000 ساڵ نووسیویه. له نوسراوەی «دیوژنس لارتیوس» ژمارەی 6000 ساڵ به دو هۆ پڕبەهایه، یەکەم ئەوه که لەتەک گوتەی شاگردەکانی «ئەفلاتون» و زانایانی دی که له خوارەوه ناویان دێت، به چاکی گونجاو و جۆر و سازگاره. دووهەمیش «دیوژنس لارتیوس» بێجگه له نووسراوەی «ئیکسان توس»، گوتەیەکی دی له «هەرمودوروس» (3) شاگردی «ئەفلاتون» ناو دەبات که به گوتەی ئەو زەمانی زەردەشت، 5000 ساڵ پێش له جەنگی «ترویا»(4) دەزانرێت. لەم گوتانه ئاوا دەر دەکەوێت که مەبەستی «دیوژنس لارتیوس» له 6000 ساڵ پێش لەشکەرکێشی «خەشایارشا» بۆ یۆنان، ئەوه ئاماژەیەکه بۆ زەمانی زەردەشت. چونکه سوپای «خەشایارشا» که له بەهاری ساڵی 480 پێش زایین بۆ «ساردگرد» هاتبوون، که وابوو زەمانی زەردەشت دەگەرێتەوه بۆ ساڵی 6480 پێش زایین. له لایەکی دی چونکه گرتنی «ترویا» به دەستی یۆنانیەکان له ساڵی 1184 پێش زایین زانراوه، که وابوو بەم ژماردنه، زەمانی زەردەشت له ڕووی گوتەی «هەرمودوروس»، 6184 پێش زایین دەبێت. هەروەها که دەبینرێت لەم دوو بابەته که کەمێک ناسازگاری دەبینرێت، بەلاّم نیشاندەری زەمانێکن که مەزەنەی 6500 ساڵ پێش زایین نیشان دەدەن.
«ئەفلاتوون» فەرزانەی ناوداری یۆنانی بووه که له ساڵی 429 پێش زایین له دایک بووه و له ساڵی 347 مردووه. پەرتووکێکی به ناوی «ئالکیبیادس» (5) هەیه. شاگردەکانی ئەو له ژێرنووسەکانی لاپەڕەکانی ئەم پەرتووکه تێبینی خۆیان نوسیوه، زەمانی زەردەشت به 6000 ساڵ پێش مەرگی ئەفلاتون زانیبووه. ئەم شاگردانه بریتی بوون له «ئەرەستو» یا «ئارستاتاکیس»، «ئەودوکسوس» (6) و «هەرمۆدۆرووۆس» (7). گوتەکانی ئەم زانایانه له پەرتووکی نووسەرانی تر به جێ ماوه، لەوانه «پلینیوس» (8) که ڕۆمی بوو به «پلینیوسی مەزن» دەناسریا، له ساڵی 23 پێش زایین لەدایک بووه و له ساڵی 79 زایینی مردووه. پەرتووکێکی مەزنی له دوای خۆی به جێ هێشتووه به ناوی «دیرۆکی سروشت» (9). «پلینیوس» لەم پەرتووکه دەنووسێت «ئەودوکسوس» و «ئارستاتالیس» زەمانی زەردەشت به 6000 ساڵ پێش ئەفلاتوونیان داناوه. هەروەها دەبێژێت که «موسا» چەند هەزار ساڵ دوای زەردەشت هاتووه.

پلوتارخۆس (10) یا «پلوتارک» خەڵکی یۆنان بوو و لە ساڵی 46 زایینی لەدایک بووە و لە ساڵی 125 زایینی مردووە. پلوتارک زەمانی زەردەشت بۆ 5000 ساڵ پێش لە جەنگی ترویا باس دەکات.
«تئیۆپۆمپوس» (11) لە لاپەڕەی 20 پەرتووکی (پێش گوتارێک لە سەر ئاڤێستا» بەرهەمی «هالێز»ی فەرانسەویی (12) کە «پ. ئا. وادیا» بۆ زمانی ئینگلیزی وەریگێڕاندووە: «تئۆپۆمپوس» خەڵکی «خیوس» (13) بووە، زەمانی زەردەشت بە گوتەی «ئەوسوکسوس» هاوبیر بووە لەوە کە ئایینی زەردەشت پێش لە ئایینی «ئەگوپت» میسریەکانە.
«سوئیداس» (14) سوئیداسی یۆنانی لە ساڵەکانی نزیک بە 970 زایینی ژیاوە. فەرهەنگێکی لێ بە جێ ماوە کە ناوی زۆربەی بەناوبانگانی ڕۆژگاری سەردەم و ڕابردووی تێدا بووە. لەم پەرتووکە لە دوو زەردەشت ناو دەبات. یەکێکیان زانایەکی «میدیایی» بووە کە 5000 ساڵ پێش جەنگی «ترویا» ژیاوە و ئەوەی دیکە ئەستێرەناسێک بووە کە لە زەمانی «نینوس» بووە. «نینوس» هاوسەری «سەمیرامیس» بووە کە لە چیرۆکەکان ناوی شاژنی «ئاسور» یاد کراوە و باژێری «بابل»یان لەو زانیوە.
«بارۆن بونسێن» (15) زانای ئاڵمانی «بارۆن بۆنسێن» لە پەرتووکی خۆی بە ناوی (شوێنی میسر لە ناو دیرۆکی گشتی) (16) زەمانی زەردەشتی میدیایی بە 6500 ساڵ پێش زایین دەزانێت. ئەم پەرتووکە کە لە ساڵی 1859، زانای ئینگلیزی «چارلز کاترێلس» بۆ سەر زمانی ئینگلیزی وەرگەڕاند.
«ڤولتێر» (17) «ڤەلتێر، ولتێر»ی فەرانسەویی بەڕێز و مەزنی ناوی «زەردەشت»ی هێناوە و زەمانی زەردەشت بە پێش لە 6 هەزار ساڵ پێش «گوروش» باس دەکات.
«سپەنسەر» (18) یەکێک لە زانایانی هێندە کە لە پەرتووکی «چەرخەکانی ژیانی ئارياييەکان» (19) کە لە ساڵی 1965 لە «بەمبەئی» چاپ کراوە، لە سەر لێکۆڵینەوەکانی خۆی لە سەر بنەمای ئەستێرەناسی، زەمانی زەردەشت بە 7129 ساڵ پێش زایین دەزانێت.
بەڵام بۆ یەکەمجار کە «چین»یەکان، ناوی زەردەشتیان هێنا بێت، لە ساڵەکانی 571 یا 545 پێش زایین لە بیستویەکەمین ساڵی دەورانی دەستەڵاتداری «لینگوانگ» ئەمپراتۆری چین بووە. پەرتووکێک نووسراوە (20) کە ئاماژە بۆ زەردەشت و ئامۆژگارییەکانی دەکات کە بە زانایەکی مەزنی وڵاتی میدیایی دەزانن کە توانی ئایینی خۆی سەقامگیر بکات. دەورانی پاتشایەتی «لینگوانگ» هاوکات بووە لەتەک لەدایکبوونی فیلسوف «کۆنگفوتسن» یا «کونفوسیوس» لە ساڵی 551 یا 552 پێش زایین لە چین. سەرەتا دینی بەهدینییان بە نێوی «پایهۆئۆ» (21) ناسیوە کە بە واتەی «ئایینی ئاگر»، بەڵام لەدوایدا لە پاش ناسینی زۆرتری ئایینی بەهدینی، دەگۆڕدرێت بۆ ناوی «تاۆ کۆان» (22) بە واتەی «ئایینی ئاسمانی».
بۆ ئاگاداری فرەتر، «بودا» لە ساڵی 560 یا 563 پێش زایین لەدایک بووە و لە ساڵی 480 یا 483 پێش زایین مردووە. هەروەهابە گوێرەی دەقەکانی «تەورات» و ساڵنامەی

جوولەکەکان، لەدایکبوونی «موسا» لە ساڵی 1392 پێش زایین زایین بووە و لە 80 ساڵی بووە بە پەیامبەر. «ئیبراهیم» پەیامبەریش لە 1815 پێش زایین بووە. «نوح» پەیامبەریش لە ساڵی 2705 پێش زایین ژیاوە. کە وابوو مەزەنە دەکرێت، زەمانی زەردەشت نزیک بە 4000 ساڵ پێش ئەم پەیامبەرانە بووە. بێجگە لە «موسا» شوێنگەی لەدایکبوونی زۆربەی پەیامبەرانی سامی، نیشتمانی کۆنی کوردان بووە، لە مێژوودا ئێمە نابینین کە پەیامبەرێک لە ئەرورپا یا ئافریقا یا لە ئەمریکا هاتووبێت، زۆربەیان لە مەزرۆبۆتان (میتسوپاتامیا) لەدایک بوون و گۆڕ و شوێنگەشیان بە ناوی خۆیانەوەیە ئێستا لە کوردستان ماوە.

«نیولی» یەکێکە لە ناوداران و سەرشناسەکانی قوتابخانەی ئیتالی، پەرتووکێکی بە ناوی (زەمان و نیشتمانی زەردەشت) (23) نووسیوە، کە مرۆڤ لەم پەرتووکە، بە پتربوونی بیر و ڕاکان پەی دەبات کە چەندە بۆچوونی جیاواز هەیە.

هەروەها نووسەرێکی فارس بە ناوی «ذبیح بەهرۆز» پەرتووکێکی بە ناوی (دیرۆک و ساڵنامەی ئێران) نووسیوە کە لێکۆڵینەوەکی فرەی کردووە. باوەڕی وایە کە زەردەشت بۆ خۆی ئەستێرەناس بووە و داهێنەری ڕێکوپێکی ساڵی پڕ (کەبیسە) و بناغەی ژماردنی دیاری کردە. ئەو لەم پەرتووکە دەڵێت کە زەردەشت لە 1767 پێش زایین لەدایک بووە.

# بنەماڵە و شوێنی لەدایکبوون و کۆچبەری زەردەشت

بابەتی شوێنی لەدایکبوون و کۆچی زەردەشت، وەک زەمانەکەی لە لای نووسەران جێگای مشت و مڕ بووە. تا ئێستا سەدان پەرتووک نووسراوە، (مەخابن نە بە کوردی) سەدان نووسەر کات و تەمەنیان بۆ تەرخان کردووە و هەر یەک بە توانای بیروبۆچوون و ڕوانگەی هزری خۆی زەمانکیان بۆ دیاری کردووە.

زەردەشت لە دایک و باوکێک بە ناوی «دەخدۆ» (24) و «پورشاسپ» (25) لە دایک بووە. نازناوی خانەدانی زەردەشت «ئەسپێنتمان» (26) کە بە واتەی «سپیڕەگەزە»ە.

بە بڕوای نووسەری کوردی کرماشانی «عمادالدین دەوڵەتشاهی» خودی واژەی زەردەشت، «زەرەثاوشەتەرئائی» (27) بەو واتەیە، کە «زەرە» بە مانای «زێڕ» و تیشکی تەڵایە، «ثاویانتا» بە واتەی «تابان» یا درەوشانەوە، «وەشەتەر» بە مانای بارین و «ئائی» بە مانای «ئایی» یا «هاتن» هاتووە. لە زمانی هەورامی کۆندا دەکاتە «بارین و درەوشاندنی تیشکی زێڕینی ڕۆژ» گوایە ئەم ناوە لە دوایدا وەک نازناوێک بۆ زەردەشت بە کار هێنراوە.

منیش باوەڕم وایە کە ناوی زەردەشت نازناوێکە کە لە لایەن هۆگرانی زەردەشتەوە بۆ زەردەشت بە کار هاتووە. بە گوێرەی تێکستی گرانبەهای «پیر شالیار زەردەشتی» کە لە بەرهەمی پڕنرخی خۆی بە ناوی «ماریفەت» ناوی زەردەشت بە «سیمیار» ناو دەبات، دەفەرمێت

(گۆشت بڕوانە پیر شالیار بۆ

هۆشت چە کیاستەی زانای «سیمیار» بۆ)

(بە وتەی پیری شالیار گوێ بگرە و هۆشی خۆت بدە بە نووسراوەی سیمیاری زانا". فەرهەنگی دێهخودا. بەرگی 13. لاپەڕەی 665.) کە واتە بە گوێرەی بەڵگەکانی کوردی، ناوی ڕاستەقینەی زەردەشت، «سیمیار» بووە.

لە سەر کۆچبەربوونی زەردەشت لێکۆڵینەوەیەکی ورد و زانستی و بێ لایەنانە تا بە ئێستا نەکراوە، بێگومان هۆی تایبەت و دیاریکراوی خۆی هەیە. بەڵام بە گشتی دوو بیروڕا هەیە، یەکەمیان زۆربەی نووسەرانی بیانی بە تایبەت فارس پێ لە سەر ئەوە دادەگرن کە زەردەشت خەڵکی دەوروبەری «ورمێ» گوایە لە (غرب ایران)، ڕۆژهەڵاتی کورستان بوون و کاتێک کە کۆچبەر بووە بەرەو شاری «بەلخ» لە ئەفغانستان چووە، هەڵبەت بڕێک نووسەر بە بێ بەڵگە و بێ سەرچاوە، پێ لەوە زیاتر دادەنێن و دەنووسن زەردەشت لە ڕۆژهەڵاتی ئێران «خۆراسان» لەدایک بووە و لەوێشەوە بۆ شاری بەلخ کۆچی کردووە و گۆڕەکەی لە شاری «مەزارشەریف» دایە. بە باوەڕی من کۆچی زەردەشت بەو جۆرەی کە بێگانەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، کە گوایە لە ڕۆژئاوای ئێران (کوردستان) بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئێران (خۆرئاسان) کۆچی کردە، لەتەک جەوهەر و فەلسەفەی دینی بەهدینی ناگونجێت. بەو واتەیە کە زەردەشت پشت لە کێشەکان بکات و بەجێیان بهێڵێت و وڵات و نیشتمان و کۆمەڵگا، بەو هەموو دەرد و بێچارەییە جێ

بهێڵێت و پشتیان لێ بکات، ئەمە لەتەک ئەوە کە ئامۆژگار و چارەسەریی دەرد و لەناوبردنی درۆ و بنبڕکردنی چەواشەیی و ئاواکردنی کۆمەڵگایەکی ڕاست و بەختیارە، ناگونجێت. بۆیە قەت بەو جۆرەی کە بانگەشە بۆ کۆچی زەردەشت دەکرێت و کوردستانی بەجێ هێشتبێت، ڕاست نییە. ڕاستە لە شوێنی لەدایکبوونی خۆی بەرەو خوارووی کوردستان کۆچی کردە، بەڵام نەک ئەوندە دوور و بۆ هەمیشە غەریب بکەوێت و لە کێشەکانی نیشتمانی هەڵهاتبێت.
بەڵام بیری دووهەم کە لە ئەدەبیات و ئاڤێستای نوێ سەرچاوە دەگرێت و گومانشکێنە، شوێن و جێگای کۆچبەری زەردەشت دیاری دەکات. بۆ نموونە ڕەوانشاد «عمادالدین دەوڵەتشاهی» نووسەری هێژای کرمانشانی لە پەرتووکەکانی (چیاکانی نەناسراوی ئاڤێستا) و (ڕۆستەم و زۆراو بە زمانی ئاڤێستا) بە سەرچاوەگرتنی ئەدەبیاتی زەردەشتی «یەشتەکان»، شوێن و جێگای کۆچبەری زەردەشت بەم چەشنە دەستنیشان دەکات.
یەکەمجار زەردەشت پەنا دەباتە بەر زۆزانی «ئەوشێدرینە» (27) کە بە درێژایی مێژوو ئەم وشەیە بە چەشنی «ئاویدەر، ئاویەر» (28) لە هەریمی شاری «سنە» لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ماوەتەوە. پاشان زەردەشت لەوێشەوە دەڕوات بۆ چیای «هۆگر» (29) کە لە دوایدا دەبێتە چیای «هەژیر، هەجر، هەجیر» (30) ئێستا ئەم ناوچەیە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بە "دینەوەر" بەناوبانگە. لەم شوێنەدا بەشی دووهەمی سروودەکانی گاتا بۆ زەردەشت داهۆنرا. کەی گوشتاسپ کە کۆشکەکەی بە ناوی «گەنگ شا» (31) ناو دەبریا و لە سەر چیایەک دروستی کردبوو، ئایینی ئەوی پەژراند، بوو بە گەورەترین پاڵپشتی زەردەشت و یارانی. ئەم شوێنە ئێستا لە باژێری «سەحنە»یە کە لەو سەردەمە بە «شاهیندژ، شاییندژ، سایيندژ» (32) بە ناوبانگ بوو. زەردەشت هەروەها ئاگرگایەکی (بە ناوی ئاترنۆش، ئاگرنۆش، ئاهیرنۆش، ئازەرنۆش) لە «باکتەریا» (33) دایمزراند. ئەم شوێنە لە دوای هەزاران ساڵ بە ناوی «پارسینە» لە هەریمی «دینەوەر»ی کرماشا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ماوەتەوە. پاشان باکتەریا گۆڕیا بە «باختەر» و ئەم گوندەش ئێستا ماوە. (ڕۆستەم و زۆراو بە زمانی ئاڤێستا، ل. 35 و 36".
نووسەر و زمانەوان «محمدامین هەورامانی» لە هەفتەنامەی «ئاویەر» لە ژمارەی 52 ساڵی 3 لاپەڕەی 12 باسێکی لە سەر ئاویەر نووسیوە کە جێگای سەرنجە: "لە ڕەواڵەتدا ئەم وشە ناساکارەیە «ئاویەر» وەها خۆی دەردەخات، کە فرە کۆن بێت! ئەگەریش وەها بێ، دەبێ بەم جۆرەی خوارەوە لێک بدرێتەوە واتە، وشەی «ئاویدەر» لە هەر دوو دۆخی لێکدانەوەدا لە دوو بەشی سەرەکی پێک هاتووە و ئەوانیش ئەوەی کە دەبێ لەم ڕووەوە بوترێ ئەوەیە کە فەرهەنگە پارسیەکان و جوگرافیاناسانیان هەوڵیان داوە کە سەرپاکی ناوە کوردیەکان بۆ زمانی پارسی وەربگێڕن و ئەمەش جۆرە کارێکە کە دەستی بە سنگەوە ناگیرێ و جۆرە تاوانێکی مێژوویی و جوگرافیایی و ئینسانیشە کە هەرگیز لە بیر ناچێتەوە! پاش ئەم لێکدانەوەیە دەبێ ئەوە لە یاد نەکەین کە ئاویەدەر یەکێک لەو جێگا پیرۆزانە بووە کە زەردەشت لە کاتی

هاتووچۆکردنی لە «شیز»ەوە بەرەو «لوڕستان» بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لە ئاویدەردا ماوەتەوە و ئەوجا بەشی دووەمی ڕێگابڕینەکەی گرتووەتە بەر کە لە هاتن و چوونەوە و گەڕانەوەدا ڕێگاکەی بە قەراغی «سیروان»دا تێپەڕبوە".

بە باوەڕی من گوندی بەڵخە ئێستا لە هەورامان لە سەر سنووری دەستکردی (ئێران و ئێراق) هەڵکەوتووە و ماوە. ئەم شوێنە سەردەمی خۆی باژێڕێکی مەزن بووە و کۆشکی بە ناوبانگی کەی گوشتاسپی لێبووە، هەرچەندە ئێستا لە شێوەی گوندێکە و چەندماڵێکی لێ ماوە، بەو مەرجە کە لە دوای داگیرکاری عەربە موسوڵمانەکان و هێرشی بێبەزیی مەغۆل و تاتارەکان و پاشان سەردەمی عوسمانی و ڕژێمی بەعس ئەم گوندە شتێکی وای لێ بە جێ نەماوە. ئەم گوندە لە نێوانی گوندەکانی «دەڕەی مەڕ، دەرکێ، هانەگەرمەڵە، ڕەشین و دزڵی» و شارەکانی «هەڵەبچە و مەریوان» هەڵکەوتووە. ئەگەر کورد کیانی خۆی هەبێت زۆر بە ئاسانی لە ڕێگەی شوێنەوارە دیرۆکییەکانی، ئەم ڕاستییە دەتوانێت بسەلمێنێت.

# ئاڤێستا و زمانی ئاڤێستا

بیر و بۆچوونیش لەم بارەوە زۆر جیاوازە. زۆربەی نووسەرانی بێگانە باوەڕیان وایە کە ئاڤێستا بە زمانێک هۆنراوەتەوە کە ئێستا هیچ پاشماوەیەک لەو زمانە نەماوە و بە زمانی کۆن نووسراوە و لە زمانە مردووەکان دەدرێتە ژماردن. بەڵام باوەڕشیان وایە کە هێندێک وشە لە ناو زمان و زاراوەکانی ئاریزمانەکان ماوە، هەڵبەت ئەوان بە ئێرانی دەیناسن. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت تا ئێستا گەلی کورد هیچ دەرفەتێکی بۆ هەڵنەکەوتووە، وەک دەوڵەت یاخود وەک سازییەکی ڕێکوپێک لە ئاڤێستا و ئەدەبیاتی ئایینی بەهدینی لێکۆڵینەوە بکات. زۆربەی ڕووناکبیرانی کورد بە گشتی حەزیان لە خۆماندووکردن لەم مژارە نەکردووە.

بە باوەڕی من زمانی کوردی یەکێک لە دەوڵەمەندترین و کۆنترین زمانەکانی سەر گۆی زەوییە، کە دەیان زاراوەی جیاواز و ڕەنگینی هەیە. کاتێک مرۆڤ بەراوەردێکی سادە لە نێوان زمانی کوردی ئیمڕۆ و زمانی هۆرەکانی زەردەشت و ئەدەبیاتی پاش زەردەشت دەکات، ئینجا دەبینێت کە چەندە خۆڕسک نزیکییان هەیە بە یەکەوە. بەڵام گرینگتر ئەوەیە کە دوو زاراوەی سەرەکی زازایی و هەورامی زۆر سەیر لە واژە و ڕێزمانی ئاڤێستایی دەچێت و پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیان بە یەکەوە هەیە، کە دەبێت پسپۆر و زمانەوانی کورد خۆی بۆ ساخکردنەوە و زانستی کردنی ئەم دیتنە تەرخان بکەن.

بە پێی مێژوو، دوای سووتاندنی گەنجینەی چەند هەزار ساڵەی ئاڤێستا بە دەستی «ئەسکەندەری مەکەدوونی»، کۆششێکی فرەی سەدان ساڵە کرا، تا کۆکردنەوەی بەشەکانی ئاڤێستا جارێکی تر بە دەستی پیران و مەوبدەکانی ئایینی بەهدینی لە سەردەمی ئیمپراتۆری ساسانی (کە هەورامی ڕەسەن بوون) بە ئەنجام گەیشت. بە گەواهی مێژوو ئاڤێستا تەنیا پەرتووکێکی دینی نەبووە، بەڵکوو خۆی لە خۆیدا فەرنووسار* بووە کە هەموو بەشەکانی زانستی سەردەمی لە خۆ گرتبوو. لەم کۆکردنەوانەدا بوو کە بڕێک لە بەشەکانی ئاڤێستا کە لەتەک باوەڕی مەوبدەکان یەکی نەدەگرت نەیان نووسییەوە و گوڵبژێری بابەتەکانیان لە 21 بەرگدا داڕشت. پاشان ئەم 21 بەرگەیان لە 3 بەشی جودا ئامادە کرد، کە هەر بەشەیان 7 بەرگی دەگرتە خۆی.

بەشی یەکەم: «گاثاکان» یا گاتاکان کە سروودەکانی خودی زەردەشت بوون، 6 بەرگەکەی دیکە ڕاڤەکردنەوەی گاثاکان بوو.

بەشی دووهەم: دادەکان کە 7 بەرگ بوو و لە بارەی داد و یاسا و چۆنیەتی دەسەڵاتداری و زانست و هونەر و پیشەکانی سەردەم بوون.

بەشی سێهەم: بابەتەکانی شایست و ناشایست و نیایشت و نوێژ کە لە 7 بەرگ داڕشترابوو.

ئاڤێستا بەم جۆرە مابوو تا هێرش و شاڵاوی عەرەبەکانی موسڵمان، کە بۆ جارێکی دی شیرازەی ئاڤێستا بە چەشنێکی جەرگبڕ تێک چوو. نووسەری عەرەب «ابن‌خلدون» دەنووسێت:

کاتێک وڵاتی ساسانییەکان کەوتە دەستی موسوڵمانەکان، گەلێک پەرتووکیان لە پەرتووکخانەکان کەوتە دەست سوپای ئیسلام. «سعدابنوقاص» نامەیەکی لەمەڕ ئەو پەرتووکانەی شاند بۆ «عمرابناخطاب» لە «مدینە». لەم نامەدا «سعدابنوقاص» نووسیبووی و پێشنیاری وەرگێڕانی یا ناردنیان بۆ «مدینە» کردبوو، کە «عمر» لە وەڵامیدا نووسیبووی، ئەگەر ئەو پەرتووکانە شتی باش و ئامۆژگاری تێدایە، ئەوە «الله» قورعانی بۆ ناردین و پێویستیمان پێیان نییە و ئەگەریش بابەتی گومڕێی تێدا بێت، کە الله ئێمەی لێ بپارێزێت. بەم چەشنە جارێکی دی بەرهەم و سەرمایە و کۆششی هەزاران ساڵەی زانست و ئایینی ئێمەی کوردان لە ناو توونی گەرماوەکان سووتێندران.

# گاثاکان، زەند، پازەند

ئاڤێستای ئیمڕۆ لە دوو بەش پێک هاتووە. بەشی یەکەم «گاثاکان» کە سروودەکانی خودی زەردەشتە و بە ئاڤێستای کۆن دەناسرێت. بەشی دووهەم ئاڤێستای نوێیە کە گوایە شاگردانی زەردەشت یان کەسانی دی لە دوای زەردەشتەوە تا کۆتایی ئیمپراتۆری ساسانی و پێش هاتنی سوپای ئیسلام بۆ کوردستان و ناوچە نووسیوویانە. ئەو بەشەی کە من خۆمم پێەوە خەریک کردووە، بەشە کۆنەکەیەتی کە بە گاتاکان بە ناوبانگە. گاتاکانی زەردەشت بریتین لە 17 هات (بەش، فصل). ئەم 17 بەشە خۆی لە 238 «سروود یا هۆرە» پێک هاتووە. هات بە ئاڤێستایی بە مانای کەرت، بەش و لەت هاتووە. هاتەکان ئەو هەڵبەست و هۆرە و سرووشانەن کە بۆ زەردەشت خۆی هۆنراوەتەوە. هاتەکانیش خۆیان لە 896 ڕستە یا دێڕ درووست بوون کە ئەوانیش بە گشتی لە 5560 واژە چێ بوون.

هاتەکان دابەش کراون بە 5 بەش:

1– «ئەهنوەگاثا» لە هاتی 28 دەست پێ دەکات و تا هاتی 34 کوتایی پێ دێت، لە 7 سروود پێک هاتووە کە بە «یەشتگاهان» دەناسرێت.

2– «ئەشتوەدگاثا» لە چوار سروود پێک هاتووە و لە هاتی 43 دەست پێ دەکات تا هاتی 46 کۆتایی پێ دێت.

3– «سپەنتومەگاثا» لە چوار سروود دروست بووە و لە هاتی 47 دەست پێ دەکات تا هاتی 50.

4– «سپەنتومەگاثا»

5– «وەهێشتوئایشتگاثا» هەر کام لەم سروودانە لە یەک هات دروست بوون کە بە هاتی 51 و هاتی 53 بە ناوبانگن.

بەڵام ئاڤێستای نوێ: سەرەتا دەبێت واتەی «زەند و پازەند»ی ئاڤێستا بزانین. گاتاکان سروودی زەردەشتە و بە درێژایی تەمەنی، هەوراز و نشێوی فرەی بە خۆیەوە دیوە. بە هۆی گۆڕانی زمان لە مەودای هەزاران ساڵدا و پەژراندنی ئایینی بەهدینی لە لایەن برێک خەڵک کە شارەزای زمانی کوردی نەبوون و شێوەزاریان جیاواز بووە لەگەڵ زمانی ئاڤێستادا، بۆیە دوچاری گیروگرفت بوون لە تێگەیشتنی قووڵی واتەکانی ئاڤێستا. لە سەرەتا پیرانی ئایینی بەهدینی بۆ ئاڤێستا «زەند»یان نووسی، لە ڕاستییدا ئەم زەندە یارمەتیدەری ئەو کەسانە بوو کە لە زمانی ئاڤێستا تێنەدەگەیشتن. «زەند» خۆی وشەیەکی کۆنی هەورامییە بە واتەی شیروڤە و ڕاڤەکردن، (شرح، تفسیر) و لە چاوگی وشەی «زان» وەرگیراوە و ئێستا لە زمانی کوردیدا ماوە (زانا، زانست، زانین)، خودی واژەی زەند لە ئاڤێستا بە شێوەی «زانتی» (34) بە مانای «زانین و ناسین» هاتووە، ئەم واژەیە لە لای لێکۆڵینەرانی زمان بە واژەیەکی میدیایی دەناسرێت و بە چاوگی وشەگەلی ئێستای زمانی کوردی وەک: «زانا، زانین و زانست»

دەزانرێت. «پازەند»یش لە دوای ساڵانی زۆر بۆ شیرۆڤە و ڕاڤەکردنی «زەند» نووسراوە. جا هەموو ئەم زەند و پازەندانە ئێستاکە بە «ئاڤێستای نوێ» دەناسرێت. باوەڕ وایە کە پاشماوەی ئاڤێستای ئیمڕۆ بە کۆن و نوێیەوە، یەک لە چواری ئاڤێستای پێش هێرشی عەرەبی موسڵمانە. زۆر پێویستە ئەم خاڵە دەستنیشان بکەم کە بڕێک لە ناوەرۆکی ئاڤێستای نوێ، لەتەک ناخ و ئامانجی گاتاکان و ڕەوشت و فەلسەفەی زەردەشت یەک ناکەوێت و دژی ڕێبازی هۆرەکانی زەردەشتە، کە ئەمە خۆی باسێکە تایبەتە. دۆزینەوە دەقی ڕاستەقینەی ئاڤێستا کارێکی سەختە و لە هەمان کاتیشدا دەبێت بە شێوەیەکی زانستی بکرێت. هێندێک هەل و مەرجی گرینگ بۆ ئەنجامی ئەم کارە پێویستە، کە ئەوەش پەیوەندی ڕاستەخۆی بە هەبوونی دەوڵەت و سازی کوردی هەیە، بەڵام تا ئەو کاتە دەتوانین بە بەشی گاثاکانی ئاڤێستای کۆن، دڵنیا ببین.

وەرگێڕان و ناساندنی پەرتووکێکی کۆن وەک ئاڤێستا لەم بارودۆخەدا، کارێکی سەخت و دژوار و مەزنە، بۆیە هەڵە و چەوتکردنی تێدا ئاساییە. دەبێت چەندەها جار وەربگێڕێتەوە و دەیان جار ڕاڤە و لێکۆڵینەوەی لێ بکرێت، لە هەموو گۆشە و دیدەنیگا و بیر و بۆچونەکان بخرێتە ژێر مشتومڕ و گفتوگۆکردن تا سەرئەنجام هەوێن و دەروونی ڕاستەقینەی ڕوون و ئاشکرا ببێتەوە.

# گاثاکان پەیامی زەردەشتە

یەکێک لە گرینگترین ڕووداوەکانی پڕ پێچ و پەنا و پڕاوپڕی ئەو ڕۆژگارە و تەنانەت ئەم ڕۆژگارەی کورد، گۆڕانکاری و نەوژەنسازی ئایینییە کە لە لایەن «زەردەشت» پەیامبەرەوە پەیڕەو کراوە. درووود لە ڕەوان و گیانی نەمری ئەو زانا و دروستکارە، کە یەکەمین مرۆڤی گۆی ئەم زەمینە بووە کە جێگا و سنوور و تایبەتمەندی ئاکار و ڕەوشتی بۆ دین دەستنیشان کردووە و هەمیشە لە هەوڵ و تێکۆشاندا بووە بۆ بەرجەستەکردنی ڕێگەیی ڕاستی و کرداری چاک، کە بناغە و کۆڵەکەی پەرەپێدانی دینی بەهدینی بووە و لە هەمان کاتیشدا بۆ پەرەپێدانی ئامۆژگارییەکانی ئایینی بەهدینی خەریک بووە و بنیاتێکی بنەڕەتی و هەمیشەیی بۆ چاکە بە واتەی پڕاوپڕی خۆی دەستنیشان کردووە.

هەموو ئایینەکانی سەرەتایی و پاشتریش، کۆششی ئەوەیان کردووە کە مرۆڤ پابەندی هێندێک داب و نەریت و هەڵسووکەوتی ڕەواڵەتی بن. زەردەشت بەرجەستەترین پەیامهێنەر بووە کە ڕێگەی ئازادی بۆ مرۆڤ ئاشکرا کرد، ئازادی هەڵبژاردن لە سەر بنەمای ئاکار و ڕەوشت، ڕزگاربوون و ئازادبوون لە کرنۆشبردنی کوێرانە بەرانبەر بە دەستوور و یاساکانی بێبناغە و بێکەڵک، ئازادبوون لە دانی باج بە پەرستشگاکانی جۆراجۆر، کە ئێستاش لە ناو زۆربەی دینەکان شتێکی باوە.

لە مێژووی زۆربەی دینەکاندا دەبینرێت کە مرۆڤ لە ڕووی ترسەوە و بە هیوای گەیشتن بە پاداشت و شتی باش و ژیانێکی چاکتر، دینی بردووە بە ڕێگەوە. هەروەها زۆر هەن بە لاساییکردن و بە تەشریفات و ڕەواڵەتی دین دەڕۆن، کە ئەویش هیچ بنەمایەکی ڕەوشتی زیندوویی لە ناو هزریاندا نییە. جا بۆیە ئەمە یەکێک لەو خاڵانە کە گەورەیی و مەزنی زەردەشت بۆ ئێمە دەردەخات.

ئەویش لەو سەردەمەی کە مرۆڤ کۆیلەی مرۆڤ بووە و توانای فرۆشتنی مرۆڤی دیکەی هەبووە و بڕوامەندانی ئایینی جادوویی و بیر و باوەڕی ناڕاست و ترەوەند هەموو شوێنێکی وڵاتی ئاری داگرووە.

لەو ڕۆژە تاریکانەی نەزانی، زەردەشت هۆرەی ئەمەی دەگوت کە ڕاستی ئایین و دین لە گرینگی ڕەوشت و ئاکاری ئەو شاراوەیە، نەک لە هەڵسوکەوتی ڕەواڵەتی و ئەرزشەکانی لە بنانەبوو. ئەمەش بە واتەی پابەند بوون بە رامان، گوفتار و کرداری پاک لە ژیانی مرۆڤدایە.

زەردەشت هەرگیز سەری بۆ خودای جۆراوجۆر داننەواندوە و زەروانیسم و ڕۆژپەرستی و بتپەرستی کە ئایینەکانی باوی ئەو سەردەمە بوون، لای جێ پەسەند نەبووە. لە منداڵی تا تافی لاویەتی بە پێچەوانەی دەوروبەری، باوەڕی بە خودای تاک بووە. یەکەمین مرۆڤی سەر ئەم گۆی زەویەش بووە کە بڕوای تەواوی بە تاکە خودا، هێناوە و توانیویەتی خۆی لە

گومڕاییان و فریودراوان جودا بکاتەوە و هەوڵ بۆ ئازادی و یەکسانی مرۆڤ لە دەست بێدادی و ستەمکاری بدات.

خواپەرستی زەردەشت بۆ ترساندنی خەڵک و دەستەڵات و بەرژەوندی خۆی نەبووە، بەڵکو هەوڵی داوە مرۆڤایەتی بگەێنتە دوا پلەی ئازادی و لە ژێر باری قورس و سەنگینی کۆیلەتی دەری بهێنێت. هەوڵی داوە جیهانێکی نوێ بە بیری نوێ و کرداری نوێ و ڕەفتاری نوێ دروست بکات.

زەردەشت خاس دەیزانی کامەرانی و بەختەوری تەنیا کاتێک دێتە دی کە گشت کۆمەڵان بە تێکڕایی ڕابن و هەموو ڕوو بکەنە لایەنی ڕاستی. زەردەشت دەیویست مرۆڤ لە ئاستی مرۆڤ سەر داننەوێنێت. زەردەشت لەتەک کەسانی ڕەوشت نزم و چەوت و نارێکدا نەگونجاوە و هەمیشە بانگی ڕاستیی بە گوێیاندا داون و ڕێی ڕاستی بۆ دەستنیشان کردوون.

هۆرەکانی زەردەشت «گاثا»، تەنها پەراوێکی فەلسەفی یا خود ئەدەبی و ئایینی نییە، بەڵکو سەرچاوەی بەدیهێنانی ژیانێکی مینوویی هەمیشەیی و جاویدانییە. زەردەشت مامۆستا بووە و پەیام و ئامۆژگارییەکانیشی جیهانی بووە. هۆرەکانی زەردەشت، پەرتووکێکە هەموو کەس دەتوانێت بیخوێنێتەوە و بۆ ژیانی سوودی لێ وەربگرێت.

سروودەکانی گاتا سادەن و لە هەمانکاتیشدا واتەکانی قووڵ و پڕمانا و نیازی بە شیرۆڤەیە. بێگومان ئەو کەسە هەنگاوی سەرەتایی تێ پەڕاندبێت و هزرە کەونە مردووەکانی لە مێشکدا مراندبێت و هەموو ڕیشەکانی بیری کۆنی لە مێشکدا وشک کردبێت، باشتر بواری سەرهەڵدانی بیری تازەی بۆ دەرەخسێت و واتەی گاتاکانی بۆ ئاسان دەبێت و دەروونی لە ناوەوە ڕووناک دەبێت. گاتاکان، بە پێچەوانەی هێندێک پەرتووکی ئایینی دیکە کە ناوەڕۆکیان پڕ لە مژاری نارێک و دژ بە یەکە، بێگەرد و بێهاوتا و بێخەوشە.

لە گاتاکاندا زۆر بە کەمی لەمەڕ ڕابردوو و دیرۆکی کەون دواوە کە ئایا چلۆن بووە، بەڵام بە ڕوونی و وردی لە بارەی بەسەرهاتی جیهانی دواوە. دەبێت باش بزانین زەردەشت پێش لە هەموو شتێک، مرۆڤێکی زانا و ژیر و فەرزانە بووە. بە هیچ جۆرێک بیر و پڵتەی تەروەند لە ناو گاتاکان نابینرێت. تەنیا شتێک کە لە ئاڤێستادا بە زەردەشت و ئایینی بەهدینی پەیوەندە، گاتاکانە.

لە ئالیەکی دیکەوە بنیادی بیری و فەلسەفی گاتاکان، بنیادێکی گشتی و جیهانییە کە هەر کەس لە هەر زەماندا دەکارێت لە ڕاستی ناوەخنی تێبگات. ئەگەر ویستی دەتوانێت بیپەژرێنێت و ئەگەریش نەیویست نایپەژرێنێت، هەر وەک رامان و ئەندێشەیەکی فەلسەفی. ئازادی رامان و هەڵبژاردنی ڕێگا و ڕەوشت بە پەیڕەوی لە ژیری و خێرەت، یەکێکە لە وانەکانی سەرەکی دینی بەهدینییە. ئەم بنیاتە فەلسەفی و کۆمەڵایەتیانە کە فرەتر لە چوارهەزار ساڵ پێش فێر کراوە و هێشتا ئێستاش کۆمەڵێکی فرە لە مرۆڤانی پێشکەتوو لە بەرزترین ئاستی گەشەکردنی ڕەوشت و ئاکاری کۆمەڵایەتی پێی پابەندن.

گاتاکان دڵنیاترین سەرچاوەی لێکۆڵینەوە و ئاشنایی بە ڕاهێنانەکانی مینوویی و ڕەوشتی زەردەشتە، کە بە چەشنی نووسراوە لە هەزاران ساڵ لەمەو پێش هەڵگیراوە.
گاتاکان، ژیرانە، گونجاو، جیهانی، جاویدانی و مرۆڤانەیە. «فیساغورس» دەڵێت لە سەر ئامۆژگارییەکانی زەردەشت، خوا لەتەک ڕاستی یەکسانە.
زەردەشت دەفەرمێت: "من مامۆستام و کاری من ئەوەیە کە ڕێگا بە کۆمەڵان نیشان بدەم و خێرەت و رامانی کۆمەڵان بۆ بزوان و لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوە و دۆزینەوە هان بدەم تا خۆیان ڕێگای ڕوون بدۆزنەوە و بە ڕاستی و ڕۆشنایی بگەن. من فێر دەکەم، بەربەرەکانێ ناکەم. بەربەرەکانێ من بەس لەتەک نادانی و تاریکییە و بۆ جەنگ لەتەک نادانی و تاریکی خەنجێری بۆ ناکێشم، چرا دادەگرسێنم".
سروودەکانی زەردەشت یەکێکە لە کۆنترین سروودەکانی سەر گۆی زەوی کە بۆ مرۆڤایەتی بە گشتی و بۆ گەلی کورد بە تایبەتی، وەک میرات بەجێ ماوە، کە لە بارەی ئافراندن و گەوهەری بوون و ڕەوشتی بەرزەوە دواوە و بە شێوەیەکی بەپێز و بەچێژ و بەسۆز و بێگرێ و ئاسان باسیان لێوە دەکات. هەروەها بە پێی ئەو گەنجینە پڕ لە داناییە کە لە ئاڤێستادا بۆ کورد و مرۆڤایەتی بەجێ ماوە، ئەتوانین بڵێین کە سەرچاوەی هەموو دینەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئەمڕۆ، دینی پاکی بەهدینیە.
«ل. هە. میلس» (35) دەبێژێت: "دەتوانین بە لێکۆڵینەوەی ئاڤێستا، ناسکترین و پڕبەهاترین خاڵەکانی لە ناو ئەو نووسراوە کۆنەدا پەیدا و دیاری بکەین ــ ئەم دەستوورانە کە هی پێش سێهەزار ساڵە، دەتوانێت ئیمڕۆ ئێمە لە بەند و پاوەنەکان ڕزگار بکات. زۆر سپڵەییە کە ئەگەر ئەوانە بەرچاو نەگرین یان بیانشارینەوە. زەردەشت لە دیرۆکی جیهاندا یەکەمین کەسە کە ئەم دلێریەی هەبووە کە بیر بکاتەوە کە دینی ڕاستەقینە چییە و بە چەشنی سادە و ڕوون دابڕێژێت".
ئەگەر کەسانێک باوەڕیان بە شاکار و پەرجۆ و ئەو کارامەی کە لە دەرڤەی توانای مرۆڤ هەبێت، ڕاوەستاوی و پایەداری و مانەوەی «گاتاکان» لە پاش ئەو هەموو ڕووداو و کارەسات و چەرمەسەرییانە کە بینیویە و زۆربەیان وێرانگەر بوون، خۆی بۆ خۆی ئەمە فەرجوودێکە.
سروودەکانی گاتا، شیرین، ڕەوان و هەڵخرێنەری بیر و ڕاهێنەرە. ئەم سروودانە لە بارەی ئافراندن و ڕەوشتی دروست باس دەکات. هەروەها لەمەڕ گەوهەری هەبوون، ئافراندن، بەدیهێنەر، ڕێگەی ڕەوشتی دروستی ژیان، ئەنجامەکانی جۆراجۆری ڕەفتار و کرداری زیندەگی، هەموو ئەم مژارانە لە گاتاکان لە بارەیانەوە گوتراوە. هەروەها نووسراوە کە هەر کەس لە باوەڕ و هەڵبژاردنی ڕێگای ژیانی خۆی کە بە هەر چەشنێک بێت، سەربەست و ئازادە. سروودەکانی گاتا باشترین نموونەکانی ڕەوشتیی بۆ مرۆڤ سفارشت و ڕادەسپێرێت، چونکە بەختیاریی بۆ هەڵبژێرانی ئەو ڕەوشتانە بە مزگێنی دەهێنێت. سروودەکانی گاتا دەبێژێت: زانایان ڕەوشتی پاک و باش، گێل و چەواشەکارانیش ڕەوشتی بەد و خراپ هەڵدەبژێرن.

سروودەکانی گاتا سروودی کار و کۆشش، سازگەریی و پێشکەوتن و گەشەکردنە. سروودەکانی گاتا گۆشەگیری لە ژیان (خلوەتنشینی) و (قناعت)کردن پەسەن ناکات و ڕاناسپێرێت. سروودەکانی گاتا، کار و هەوڵدان و بەهرە وەرگرتن لە دیاردەکانی ئەهۆرا مەزدا، بە مەرجی ڕزگاری دەزانێت. زەردەشت جیهانی ئەنبوژەنی بە سەرچاوەی بەدبەختی و نەکبەتی نازانێت. کاڵا و شت و متی ئەنبوژەنی بە دیاری خودا دەزانێت و بە هات و باش و جێگای خۆشویستن دەزانێت. خۆشویستن و پشتگیری لە ژین و ژیان و ژینگە بە دەستووری ئایینی دەزانێت.

سروودەکانی گاتا دیوانێکی پچوکە، بەڵام هۆنەرەکەی پڕ هێژا و مەزنە و چاکە و خراپە و دەرئەنجامی هەردووکیانی بە جوانی و ڕوونیی دەناسێنێت. تایبەتمەندیەکی دی گاتاکان لەوەدایە کە بکە و مەکەی تێدا نابینرێت. یەکێک لەو لەمپەرە سەرەکیانە، کە مرۆڤ و کۆمەڵگا باڵبەست و دواکەوتوو ڕادەگرێت و ڕێگە لە بەر گەشەسەندنی بیر و ئەندێشەی دەگرێت، ئەو دەستوورە ئایینیانەیە، کە بکە و مەکە و شایست و ناشایستی تێدایە، ئەو دەستوورانە کە چ بکەین و چ نەکەین، ئەم یاسانە هەر چی بن سەردەمێک لە کاریگەری دەکەون.

مژاری ئامۆژگاریەکانی سروودەکانی گاتا گشتییە و تەڤلی شتە وردەکان نەبووە. ئەم تایبەتمەندیە خۆی لە جوانییەکانی گاتاکانە کە جاویدان و نەمر ڕایدەگرێت. خواردن و خواردنەوەی شتێکی تایبەت یا ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو و یا بەرگریکردنی، ناکات. بەڵام بە گشتی دەبێژێت لە هەر شتێک کە تەندروستی لەش و ڕەوان دەخاتە مەترسی و دەبێتە هۆی ئازاردانی گیان، باش وایە کە مرۆڤ خۆی لێ دوور ڕاگرێت.

ڕاستبوون و درۆنەگوتن، سازگەری و داهێنەری، ئاوەدانکاری، بەسۆزی و مێهرەبانبوون، ئەم جۆرە مژارانەی گشتی لە ناو گاتاکان هاتووە. سروودەکانی گاتا ئەندازەکان دیاری دەکات. بە کارهێنانیشی گرێدراوی باورودۆخی زەمان و جێگا، پێشکەوتن و گەشەسەندنی زانست بە دەستی خودی مرۆڤە کە بە ڕێنوێنی هزر و ژیری دەخرێتە کار.

سروودەکانی گاتا وابەستە بە زەمان و جێگایەکی دیاریکراو نییە. هۆرەکانی زەردەشت جاویدانی و نەمرن. هیچ یەک لە سروودەکانی زەردەشت بە ڕێکەوت نەهۆنراوەتەوە، بۆیە یەکپارچەیی و یەکبوون لە ناو سەرتاسەری سروودەکان دەبینرێت. بەم هۆیەوەیە کە ئامۆژگاریەکانی زەردەشت گشتییە، بۆیە بەکارهێنانی هەمیشە دەبێت رامان و ویژدان و هزری مرۆڤ ڕێنوێنی بێت تا تووشی تەنگ و چەڵەمە و دژواییەک نەبێت. بۆ نموونە بابەتەکانی باجدان و نوێژکردن و شایست و ناشایستەکانی تێدا نییە.

زەردەشت بڕوای وایە کە یەکێک لە ئارمانجەکانی ژیان، شادبوون و بەختیاربوونی مرۆڤە. زیاتر لە 30 جار واژەی خۆشبەختی و شادی لە ناو گاتاکان دووبارە کراوەتەوە. ئەم شادی و بەختیارییە نایێتە دی، مەگەر خۆشبەختی هەمووان مسۆگەر بکرێت، بە هەموو چینەکانی کۆمەڵگا و تەنانەت بە سروشت و هەموو گیانلەبەرانیشەوە.

# 40 ئەستێرەی گەشی ناو گاثاکان

لێرەدا 40 ئەستێرەی گەش، کە لە ناو گاتاکانی زەردەشتدا دەدرەوشێنەوە و مرۆڤ بە ئاسانی دەکارێت ئاماژەیان بۆ بکات، دەیخەمە بەر سەرنجی ئێوەی بەڕێز تا بەشێک لە ناوەڕۆکی سروودەکانتان بۆ ئاشکرا بێت:

1 ـ زەردەشت، بڕوای وایە کە مرۆڤ لە هەڵبژاردنی ڕێگای چاکە و خراپەدا، ئازادە. هەر ئەم ئازادییەشە کە بەرپرسیاری بۆ هەر یەک لەم ڕێگایانە دیاری دەکات. (هاتی 31، سروودی9)

2 ـ زەردەشت بە یارمەتی رامان و ژیریی خۆی، ئەهۆرا مەزدای ناسی. (هاتی 31، سروودی 8)

3 ـ زەردەشت ئافەریدەگار و بەدیهێنەری هەستی بە تاک و یەگانە ئەناسێت. (هاتی 44، سروودی 7)

4 ـ زەردەشت، خواوەندی وەک تیشکێک ناسیوە کە هەموو بەشەکانی گەردوونی درەوشاندوەتەوە، یاخود بڵێین پەروەردەگار لەتەک ئافراندنی خۆی یەکێکە. (هاتی 31، سروودی 7)

5 ـ زەردەشت باوەڕی وایە کە ئەهۆرا مەزدا، جیهانی لە سەر هەنجار و زاگۆنێکی بێگۆڕان چێ کردووە، کە هەستی، بۆ هەمیشە لە ژێر فەرمانیەتی. ئەو ئەم ڕێکوپێکییە، جاویدان و هەمیشە پایەدار و دەسەڵاتدار بە سەر بووندا، بە تریفەی ڕاستی «ئاشا» ناو دەنێت. (هاتی 28، سروودی 2)

6 ـ زەردەشت، ئافراندنی جیهانی هەستی لە سەر پایەی زاگۆنی ڕاستی، لە بەدیهاتنی دوو هێزی ڕاکێشەر و پاڵنەر دەزانێت. (هاتی 30، سروودی1)

7 ـ لە ڕوانگای زەردەشتەوە، دوو گەوهەری لفانە دژ بە یەک لە نێو هەستی و رامانی مرۆڤ، تەواوکەر و پێویستی یەکدین و هەر دەم ئەم دژایەتیە لە ناو بووندا، لە نێو بیری مرۆڤ خۆی دەبینێتەوە، کە بە بیری چاکە و خراپە پێناسە دەکرێت. بەڵام خاڵی سەرەکی و گرینگ ئەوەیە، کە مرۆڤ خۆی بریاری هەڵبژاردنی یەکێک لەمانە دەدات. (هاتی 30، سروودی 3)

8 ـ زەردەشت، مرۆڤ بە بەرپرسیاری چاکە و خراپەی خۆی دەزانێت و کاردانەوەی رامان و گوفتار و کرداری هەر کەس بۆ خۆی دەگەڕێنێتەوە. (هاتی 31، سروودی 20)

9 ـ لە تێڕوانینی زەردەشت باشترین هەبوون و ژیان، دەرئەنجام و کاردانەوەی ڕەفتاری باشی خودی مرۆڤە و خراپترین ژیان و نەبوونیش، ئەنجامی ڕەفتاری نادروستی مرۆڤ خۆیەتی و هەر لەم جیهانەدا بۆی دەگەڕێتەوە. بە واتەیەکی دی، داداری مەزن بەهەشت و دۆژەی بۆ هیچ کەسێک دروست نەکردووە، بەڵام ئەمە خودی مرۆڤە کە لەم جیهانەدا بە دەستی خۆی دروستی کردووە و لە دوای مردنیش لەتەک ڕەوانی بۆ جیهانی تر دەیبات. (هاتی 30، سروودی 4)

10 ـ زەردەشت، یەکێک لە ئارمانجەکانی بەدیهاتنی مرۆڤ، خەباتی هەمیشەیی و بێپشوویی لە دژی درۆیە. درۆ بە سەرچاوەی هەموو بێدادی و ستەمێک دەزانێت. هەنگاوی یەکەم بۆ ئەم

خەباتەش ئەوەیە کە هەر کەس لە ئاستی خۆیەوە لە درۆ پارێز بکات و دوور بکەوێتەوە. (هاتی 30، سرووودی 5)

11 ــ زەردەشت بەهێزکردن و یارمەتیدانی درۆزنان و چەواشەکاران، بە لاوازکردنی لایەنی ڕاستی و هەژاران دەزانێت. (هاتی 31، سرووودی 15)

12 ــ زەردەشت دواهەمین خەباتی مرۆڤ، بە ڕاپەڕین دژی ستەم و چەواشەیی و ناڕاستی دەزانێت. (هاتی 31، سرووودی 18)

13 ــ بە بڕوای زەردەشت مرۆڤ لە خەباتی دژ بە ستەم و درۆ، لە ئەنجامی ڕاست و باشی، سەرکەوتوو دەبێت. (هاتی 30، سرووودی 10)

14 ــ زەردەشت بڕوای وایە کە جەنگی مرۆڤ دژی بێدادی و کۆیلەتی و پەرەپێدانی ڕاستی، بە دوو جۆر پاداشت وەردەگیرێت، یەکەم بە شێوەی تاک و دووهەم بە چەشنی کۆ. (هاتی 30، سرووودی 11)

15 ــ بە باوەڕی زەردەشت پاداشتی کۆتایی، هەمان پاداشتی گشتییە کە هەموو مرۆڤێک بۆ گەیشتن و پەیوەندبوون بە خودا تێدەکۆشێت. ئەو تێکۆشانەی کە لە کۆششی گشتی مرۆڤ دەبێتە هۆی لەناوچوونی کەم و کووڕییەکانی مرۆڤایەتی و دروستبوونی کۆمەڵگایەکی ئازاد و پاک و ڕاست و پڕ لە دادی جیهانی. (هاتی 31، سرووودی 16)

16 ــ لە ڕوانگای زەردەشتەوە، «ئەهریمەن» بە شێوەی بوونەوەرێک واتەی نییە، (بە تایبەت بەو واتانەی کە لە ناو دینەکانی ئیسلام و فەلە و جوولەکە باوە، «شیطان» بوونی نییە). ئەهریمەن لە ئایینی بەهدینی بە واتەی بیری خراپە. واژەی بیری خراپ لە ئاڤێستادا بە چەشنی «ئەنگەرەمینوو» ئەهریمەن هاتووە. خودی وشەی «ئەنگەرە» بە مانای پیس و ناشرین و کەمکەر و لەناوبەر هاتووە و «مینوو»ش بە مانای کردار و هەڵسوکەوت و رامان هاتووە. کەوایە ئەنگەرەمینوو یا ئەهریمەن بە مانای بیر و رامانی بەد و خراپ. (هاتی 30، سرووودی 6)

17 ــ لە ڕوانگای زەردەشتەوە، هیچ مرۆڤێک سرووشتی خراپ نییە و بە بەدی لەدایک نابێت. خراپە، بەرهەمی بیری کاڵ و کرچی خۆیەتی. یا بڵێین هۆکار و بەرهەمی خراپبوون و نەزانی و نائاگایی کۆمەڵ لە هەنجاری زاڵ بە سەر هەستیدا (زاگۆنی ڕاستی، زاگۆنی ڕاکێشەر و پاڵنەر). (هاتی 31، سرووودی 17)

18 ــ زەردەشت، بەختیاریی مرۆڤ پەیوەند بە پلەی زانست و خێرەتی تاکی خودی خۆی دەزانێت. بۆیە زانایان و ڕووناکبیران ڕادەسپێرێت بۆ ڕاهێنان و هۆشیارکردنەوەی ئەوانی دیکە. (هاتی 31، سرووودی 6)

19 ــ لە ڕوانگەی زەردەشتەوە چونکە بەدی بەرهەمی رامانی خراپ و نەگەیشتووی هزری خودی مرۆڤە، بۆیە هەموو گومڕێ و چەواشەکارێک بواری گۆاڕدن و پەروەردەبوونیان هەیە. (هاتی 30، سرووودی 8)

20 ـ زەردەشت، رامان و زانابوونی مرۆڤ لە هەموو بوارەکاندا، بە گرینگترین ژێرخان و ستوونی هەڵسەنگاندن و ناسین دەزانێت. تەنیا دانایان و فەرزانەکانن کە بە ئالیکاری رامان و هزری بەرزی خۆیان یاسای ڕاستی دەبیننەوە و بە یەکخستن و هاوئاهەنگکردنی رامان و گوفتار و کرداری خۆیان لەتەک «ڕاستی» و هۆشیار و ورپاکردنەوەی کۆمەڵ، مرۆڤایەتی بەرەو ئازادی و خەنیبوون و ڕزگاری و کامەرانیی ڕاستەقینە دەگەیێنن. (هاتی 31، سرروودی 3)

21 ـ بە بڕوای زەردەشت رامان و ئەندێشەی مرۆڤ، ئەرزش و بەهای تایبەتی خۆی هەیە. بۆیە هەر مرۆڤێک دەبێت ئازاد بێت تا لە پێوان و هەڵسەنگاندنی ڕێگا جۆراوجۆرەکان، لە ڕێگای رامانی پاک و ئەندێشەی ڕووناکی خۆی، ڕێگای خۆی ئازادانە هەڵبژێرێت. (هاتی 30، سرروودی 3)

22 ـ زەردەشت ئازادی دەربڕینی هزر و ئەندێشە بە مافی سروشتی هەر مرۆڤێک دەزانێت. هەموو کەس دەبێت بتوانێت ئازادانە بیروبۆچوونی خۆی دەربڕێت تا بواری هەڵسەنگاندن و هەڵبژاردنی دروستی هەبێت. (هاتی 31، سرروودی 12)

23 ـ زەردەشت هەڵبژاردنی دین بۆ مرۆڤ بە سەربەستی و ئازادانە دەخوازێت. لە پەرتووکی (مێژووی فەلسەفەی زەردەشت. بل دوبرۆی. پاریس.1984) نووسراوە کە لە هیچ لاپەڕێکی پەرتووکی مێژوویی، مرۆڤ ناتوانێت ئەم خاڵەی بەر چاو بکەوێت کە مرۆڤێک بە زەبر و زەنگ کرابێت بە زەردەشتی، ئەگینا کاتێک میدیاکان بە سەر گەلانی ئاشووری، قبتی، هیندی، یۆنانی سەرئەکەوتن، دەبوایە ئەو گەلانە و هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەهدینی بووایەتن. (هاتی 31، سرروودی 11)

24 ـ زەردەشت بۆ ڕێنوێنی مرۆڤی گومڕێ و چەواشەکار، لە هێزی گوفتار و زمانی شیرینی بەهرەی وەردەگرت. دەتوانین بڵێین تاکە چەکی پەیامبەر لە دژی درۆ و بێدادی و ناڕاستی، گوتاری پڕواتە و دڵنشینەکانی بووە. (هاتی 28، سرروودی 5)

25 ـ زەردەشت لە جەنگ و خوێنڕژتن بێزارە و بڕوای وایە کە چاکان و پاکانی ڕاستەقینە دەتوانن بە خۆشەویستی و مێهرەبانی، یەکیەتی لە نێوانی هەموو کۆمەڵانی خەڵک بەدی بێنن. (هاتی 29، سرروودی 3)

26 ـ زەردەشت، کۆنەپەرستی و پاشڤەرۆیی پەسەن ناکات و تەنانەت چاوەڕوانی و وێستان و (رازی بە بەشبوونیش، قناعت) ڕەوا نازانێت. زەردەشت بڕوای وایە کە رامان و بیر و لەش و جانی مرۆڤ، ناوەندی ژیان، کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، شارستانیەت، چاند و ڕەوشتی مرۆڤ، دەبێت هەمیشە لە باشتربوون و سەرتربوون و گەشەکردن و گۆڕاردن دابێت. (هاتی 30، سرروودی 9)

27 ـ زەردەشت بە فەرجوود (معجزە) بڕوای نییە. ئەو باشترین شاکاری خۆی لە گوتاری کاریگەر و رامانبزوێنەر دەزانێت کە بە هاریکاری «رامانی پاک» ڕێی پێ بردووە و پێی گەیشتووە. (هاتی 28، سرروودی 3)

28 ـ زەردەشت، گرینگی و بایەخدان بە ژینگە، ئاگاداری و ڕاگرتنی سرووشت لە رامانی پاکەوە دەزانێت و بە پێچەوانەوەشەوە کەمتەرخەمی و نەپارازتنی سروشت بە چەواشەیی و گومڕێی دەزانێت. (هاتی 32، سرووودی 10)
29 ـ زەردەشت، نزیکبوونەوە لە خودا لە ڕێگای بەرتیل و کوشتن یا قوربانیکردنی ئاژەڵ و گیانلەبەران بە کارێکی پڕوپووچ و تەروەند و خورافە، نیشانەی گێلی و نەزانی و چەواشەیی دەزانێت. (هاتی 32، سرووودی 14)
30 ـ لە ڕوانگەی زەردەشتەوە مرۆڤ ئەگەر لایەنگری ڕاستی بێت، خوداوەند بە چاوی هاوڕێی خۆی سەیری دەکات و لەمەش فرەتر میوانداری هاوڕێی خۆی دەکات. لە هەندێک ئاییندا مرۆڤ کۆیلە (عبد) یا بە کوڕی (الله، یهوە) دەزانرێت. (هاتی 31، سرووودی 21)
31 ـ زەردەشت بڕوای وایە کە بۆ گەیشتن بە ئارمانجی ڕاستیی و داد، مرۆڤ دەبێت پشوودرێژ و لەخۆبردوو و خۆبەخشکەر بێت. (هاتی 33، سرووودی 14)
32 ـ زەردەشت هەموو مرۆڤێک، چ ژن بێت و چ پیاو، مافیان بەرابەر بە یەک دەزانێت. زەردەشت ڕاستەوخۆ کچان لە هەڵبژاردنی هاوسەر و دەربڕینی بیر و ڕایان بە ئازاد دەزانێت. ئەو بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر دوو پێوانەی خۆشەویستی پاک و زانستی پاک پێشنیار دەکات. (هاتی 53، سرووودی 3)
33 ـ زەردەشت، یەکێک لە کاریگەرترین هۆکارەکانی ئاوەدانی جیهان و پێشکەوتنی زیندەگی و شادی و بەختیاری مرۆڤ، لە کاری بەردەوام و کۆششی بێوچان دەزانێت. زەردەشت کار و خەبات لە درێژەپێدان و هاوڕێی زاگۆنی زاڵ بە سەر بوون «هەنجاری هەستی» و هەڵقوڵیو لە دانایی و رامانی پاکی مرۆڤ دەزانێت. (هاتی 49، سرووودی 1)
34 ـ زەردەشت، پێوانەی بەرزبوون و سەرتربوونی مرۆڤ لە ڕاستبوونیان دەزانێت. لە لای زەردەشت هەژارانی بێسامان بەڕێزترن لە درۆزنانی دارا و زەنگین. (هاتی 47، سرووودی 4)
35 ـ زەردەشت، مرۆڤ بە خاوەنی خۆی دەزانێت و ژیان و چارەنووسیشی لە ژێر دەستەڵاتی خۆی دەزانێت. (هاتی 50، سرووودی 9)
36 ـ زەردەشت، بڕوای وایە کە مامۆستایانی خراپ بە پەند و ڕاهێنانە هەڵەکانیان، هزری مرۆڤ بەرەو ڕەشبوون و لەناوچوون دەبەن. (هاتی 32، سرووودی 10)
37 ـ زەردەشت، ئازادی مرۆڤ بە بناغەی ڕاستی و بواری گەشەسەندنی رامان و هەڵبژاردنی رامان و هەڵبژاردنی بڕوا دادەنێت. (هاتی 31، سرووودی 9)
38 ـ زەردەشت، مرۆڤ وەک بڕوامەندێکی بەهدینی، ویژدان و رامانی بانگهێژ دەکات کە هزر و رامان و بڕیاری خۆی بە ئازادانە هەڵبژێرێت. مرۆڤ ئازادە کە لە سەر بنەمای بیر و ناسین و زانایی خۆی، ئەو شتە و ئەو کەسەی کە خۆی پێی خۆشە هەڵیبژێرێت. (هاتی46. سرووودی15)

39 ـ زەردەشت مرۆڤ بانگهێژ دەکات بۆ تێگەیشتن و وەرگرتنی پەیامی ڕاستی و موژدە و مزگێنی ئەوە دەدات کە بە هەڵبژاردنی چاکە، کە ویژدانی مرۆڤ بریاردەریەتی، بەرەو پێشگا و سەرای پاکان و خاسان هەنگاو بنێت. لێرەدا زەردەشت، ژن و پیاو هەر دوو، هاوکات بە یەک ئاست دێنێتە بەیان کە هەر کەس لە هەڵبژاردندا خۆی ڕێگای بە ئازادانە هەڵدەبژێرێت. بۆیە لە سەر ئەم بنەمایەیە کە زەردەشت هەر کات لە سروودەکانی مرۆڤ بە گشتی دێنێتە گفتوگۆکردن، مەبەست هەم ژن و هەم پیاوە. (هاتی 34. سروودی 7)

40 ـ زەردەشت،گاڤی یەکەم بۆ خواناسی، لە خۆناسیەوە دەزانێت. (هاتی 43، سروودی 12) خودایەک کە زەردەشت دەیناسێنێت تەنیا بەدیهێنەری شادی و باشییە، هەرگیز تورە نابێت، کەسێک ئازار و ڕەنج نادات، هەڤاڵ و هاوڕێی مرۆڤە و هەڕەشەی تۆڵە و سزاسەندن ناکات و داواکاری ئاشتی و ئاسایشتە. جا ئەم تایبەتمەندیانە، هەمان شتە کە کۆمەڵانی دانیشتووی میزۆپوتامیا و کوردستان بە گشتی نیازمەند و داواکاری بوون و هەن. لە شوێنەکانی تر هەر یەک لە پەیامبەران، یان ڕێبەران پێناسەیەکی تایبەتیان بۆ خودا هەبووە کە نیشاندەری ویست و ئارەزوو و داب و نەریتەکانی ئەو نەتەوانە بووە، لە بەراوەردکردنی ئەوانەدا دەتوانین تێبگەیین کە سەرزەمینی مەزرۆ بۆتان و گەلانی ئاریایی، ئامادەیی پەژراندنی گیانی جوانمێری و مێرخاسی، ڕاستی و خێرخوازیی، کۆشش بۆ ژیانێکی باشتر، هاوڕێ لەتەک خۆشییەکان و باشییەکاندا هەبووە. ئەم نیشانە و تایبەتمەندیانە، لە ناو بیر و بۆچوونی هەڵبەستوانان و داستان و چیرۆکی پڕ لە قارەمانییێتی و پاڵەوانانی ناو ئەفسانەکاندا، دەبینرێت.

# ژن و ئاییینی بەهدینی

**ژین، ژیان و ژیار، چاوکانییان ژنە.**

ئەگەر بێژین بۆ یەکەم جار ئەمە ژنان بوون پێش پیاوان، داهێنەر و ئاگادار بە ڕاز و نهێنییەکانی سرووشت و سەرچاوەی شارستانییەت بوون، شتێکی ناڕاستمان نەگوتووە. لە ڕاستییدا ئەمە ژنان بوون کە پیاوانیان لە سەردەمی کێویبوونیی چاخی سەرەتایی بەردەکان، پەلکێشی چەرخی نوێی بەردیی کرد.

تێکڕای لێکۆڵینەرانی مرۆڤناس و ئاسەوارناس، هاودەنگن کە ئەمە ژنان بوون کە داهێنەرانی ژیار بوون. کارەکانی پەیوەند بە خۆراک و خواردن کە بە «کاری ژنانە» بەناوبانگە، لە ڕاستییدا یەکەمین کۆشش و هەنگاوی بەرچاو و گرینگی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بووە، کە ئەم جۆر کارانە داهێنانی خودی ژنان بووە، بۆیە لە ئەنجامدان و بەڕێوبەریشی شارەزایەکی فرەشیان هەبووە.

ئەو شتانەی کە چەرخی بەردی نوێ، لە سەردەمی بەردی سەرەتایی کۆن جودا دەکاتەوە: چێکردنی کاسە و دێزە، چنین و دوورینی بەرگ و ڕاخەر، کشت و کاڵ و دروێنەکردن و ماڵیکردنی گیانلەبەرانە. ئەمە ژنان بوون کە کاری ڕستن و چنینیان بە سەر ئەستۆ بوو و داهێنەری کاسە قوڕینە و دێزە و گۆزە بوون.

ژنان بوون، کە تۆو و دانەیان کۆ دەکردەوە و خێرا یا درەنگ تێ گەیشتن کە ئەو دانەی کە بە ڕووی زەوی دەکەوێت، دەبێتە هۆی ڕووینی گوڵ و گیاکان و بەمجۆرە کشت و کاڵ و شارستانیەتیان داهێنا. ژنان بوون کە خانە و کاشانەیان، بە شوێنکی هێمن و ئاسوودە دەرهاورد. چونکە لە سەردەمی کۆندا، پیاوان زیندەگی ڕۆژانەیان بە ڕاو و شکاری گیانلەبەران دەگوزراند. بۆیە ژنان، بە داهێنەری کشت و کاڵ و چێکەری خانووبەرەی سەرەتایی، لە چەرخی کۆنی دایکسالاری دەژمێردرێن. بۆیە زۆر گونجاوە کە بێژین، ژنان بوونە هۆی خێرا گەشەکردن و پێگەیشتنی بنەما و بنیاتی کۆمەڵگای سەرەتایی.

ژنان هەر لە «هەوشار»ەوە تا «دەشتی شارەزوور»، لە دەریاچەی «وان» تا گۆلی «ورمێ»، لە چیای «ئاگری» تا «تەختی هەورامان»، لە پەرستشگای «ئاناهیتا» تا «ئاگرگەشئەسپ»، و لە ئاستێکی پان و بەرینتر، لە ڕووباری «نیل»ەوە تا دەریای «ڕەش» و «قەوقاز» (کەو و قاز)، دەست و شوێنەواریان بە سەر گوند و شارەکانەوە بەجێ هێشتووە.

ژنان لە «میتسوپاتامیا»، کە بە لانکەی شارستانییەت دەزانرێت، تا ئاستی بەڕێوبەری و کاروباری رامیاری و ئابووری و ئایینی، خۆیان پێ دەگەیاند.

بە گوێرەی نووسراوەکانی کۆنی بەهدینی و قەباڵەکانی هەورامان، کە ئێستا لە مۆزەخانەکانی بریتانیایە، یاکوو بانوو و شازادەی میری «نسیبین»، کە لە پەرتووکی «ئیمپراتۆری

ساسانی» لە نووسینی نووسەری دانمارکی «ئارتوور کریستنسن» ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە چلۆن لە سەردەمی «نۆشیروان» پاتشای ساسانی (سانی سانان) کە کورد بوون، کیژی کوردی زەردەشتی لە دوای مردنی باوکی دەسەڵاتی بەڕێوبەرایەتی وڵاتی گرتووەتە دەست، بەو مەرجە کە برای لە خۆ پچووکتریشی هەبووە.

ژنان لە جڤاکی بەهدینی، خاوەنی کەسایەتیی دەستووریی و ماف بوون و لە دەستەڵات و خاوەنداریەتی و داب و نەریتە ئایینیەکان بە چەشنێکی بەرچاو بەشدارییان دەکرد و لە تەمەنی پیرۆزی پیری و روحانی، 7 گرێی پشتوێنیان دەبەست و بەرپرسیاری ئایینی و چاوەدیری پەرستشگا و داد و وانەگوتن لە بەشەکانی جیاوازی زانستی سەردەم، بە ئەستۆیان بوو...

لە کوردستانی کۆندا، ژنان فێری سوارکاری و تیرهاوێشتن و هونەرەکانی ڕەزمی دەبوون و لە هونەرەکانی بەزمیش وەستای خۆی بوون و لە ڕاو و جەنگیشدا بەشدارییان دەکرد. لە قەباڵەکانی هەوراماندا بە ڕوونی دەردەکەوێت کە ژنان خاوەنی باخ و ڕەز و کێڵگەی خۆیان بوون و لە سوود و قازانج و ئاڵۆگۆڕ و کڕێدان و خاوەندارییەتی، ئازادی تەواویان هەبووە.

ژنان لە سەردەمی میدیاکاندا هەردەم توانیویانە لە جێی پیاو بن و دایک لە جێی باوک بێت، بەلام پێچەوانەکەی دەگمەن بینراوە. زۆر بە دڵنیایی ژنان، تەنیا ئەلمەنت و جەوهەری نەگۆڕ و پایەداری کۆمەڵگا بوون و هەن. زنجیرەی خزمایەتی لە ڕێگای ژن بەردەوام دەبوو، کە ئێستاش ڕەگەکانی ئەم هزرە لەناو کۆمەڵگای کوردەواری بەرچاو دەکەوێت.

لە کاتی تۆژینەوەی ئایینەکانی جۆراجۆری جیهان، یەکێک لەو شتانەی کە سەرنجی لێکۆڵینەرێک بە خۆی ڕادەکێشێت و بۆی باڵکێشە، مژاری ژنە. لە چیرۆکە "بەناوبانگەکەی" «ئادەم و حوا»ی موسا، گوایە ژن لە پەراسووی پیاو چێ کراوە و پاشان کۆتای ئەو چیرۆکە بەم جۆرە دەبێت کە پلەی ژن لە ئاستی پیاو کەمتر دەبێت و تا بە ئیمڕۆ، بە خڵێتێنەر و لاواز و پلە دوو پێناسە دەکرێت.

لە چیرۆکی ئافراندنی «وداکانی سەنسکریتی»، «توشتری» ئاسنگەر (1)، خوداوەندی هێندی، ژنی بەمجۆرە درووست کرد. توشتری دەستی بۆ ئافراندنی مرۆڤ برد، سەرەتا پیاوی بەدیهێنا. ئاگای لێ نەبوو کە هەموو ئەو کەرەسانەی کە پێویست بوو، لە چێکردنی پیاو، بە کاری هێنا و شتێکی بۆ ژن نەما. بۆیە بۆ ئافراندنی ژن، لە شت و مت و بەرماوەکانی، کە بەجێ مابوو، لە چێکردنی ئافەرینشت، کەڵکی وەرگرت و تەڤلی یەکی کرد و ژنی لەم شتانە چێ کرد:

لە گردی مانگی تابان، لە پێچ و خەمی گوڵی لاولاو، لە چەسپینی گیای بزۆک، لە لەرەی شەوەر، لە باریکی قامیش، لە سووکی گەڵاکان، لە نیگای ئاسکان، لە خڕبوونەوەی مێشهەنگوین، لە هەراسی کەروێشک، لە چەهچەهی بولبول، لە تەزینی بەفر، لە نەرمی سینگی توتی، لە سەختی بەردی خارا، لە شیرینی هەنگوین، لە دڕی پڵەنگ، لە گەرمی تیشکی ئاگر، لە دوو ڕوویی مەلی دوڕنا، لە بەئەمەگی قاز، هەمووی ئەمانەی تێکەڵ کرد و ژنی ئافراند.

بەڵام لە ئەدەبیاتی بەهدینیدا، گوایە ژن و پیاو وەک یەک لە ناو گوڵی ڕێواس دروست بوون (مەشی و مەشیانە). خۆی گرینگی ئەم مژارە لە ناو ئایین، لەوەدایە کە چلۆن و بە چ چەشنێک سەیری پلە و پایەی ژن دەکرێت. ڕێز و پلەی تایبەتی ژن لە ناو ئایینی بەهدینی، وەک ئەستێرەیەکی ڕووناک لە ناو ئەم ئایینە دەدرەوشێتەوە.

بێگومان هەر وەک هەموو لا هاوبیرن لەوە کە زەردەشت پێش لەوە پەیامهێنەر بێت، فیلسوف بوو. زەردەشت بۆ دامەزراندنی دروستی ژێرخانی کۆمەڵگا، یەکسانی مافی ژن و خێزانی بۆ مەبەست بووە و مەرجی گەشەکردن و پێشکەوتنی کۆمەڵگای، بە ئازادی و بەرابەری ژن و پیاو زانیوە.

لە ئایینی بەهدینی ژن لە هەموو لایەنێکەوە لەتەک پیاو بەرابەر و یەکسانە. ژن دەتوانێت بە بێ جیاوازی وەک پیاو، داب و نەریتی ئایینی بەڕێوە ببات، سەرۆک و سەرکەردە بێت، بڕیاردەر و ئازاد، وەک پیاو مافی بێجیاوازی هەبێت. زەردەشت هەڵبژاردنی ئازادانەی هاوسەر، بە مافێکی سروشتی و سەرەتایی کچان دەژمێرێت.

لە دینی بەهدینی هەبوونی چەند ژن بۆ پیاو، بە کارێکی ناڕەوا و تاوان دەزانرێت. لە کاتی مردنی هاوسەر، ژن یا پیاو بۆی هەیە هاوسەری تازە هەڵبژێرێت. جیابوونەوەی (طلاق) ژن و مێرد لە ئایینی بەهدینی کارێکی ئاسان نییە، چونکە پەیمانی هاوسەری زۆر بە پیرۆز و بەرز دەژمێریت و چونکە کچ و کوڕ بە ئازادی و خۆشەویستی یەکدی هەڵدەبژێرن، ئەوە دەرفەتی جیابوونەوە و بەردان کەم دەبێتەوە.

«پروفسۆر جەکسن» دەنووسێت: لە ناو زەردەشتیەکان چەند ژنی باوی نییە و پیاوی زەردەشتی بێجگە لە یەک ژن، ژنی دیکەی نییە. پەیمانشکێنی لە ناو ژیانی هاوسەرییان دەتوانین بڵێین نابینرێت و پیشەی لەشفرۆشی لە ناو «بەهدینان» نییە.

یەکێک لە هۆیە سەرەکیەکانی گەشەسەندنی شارستانیەتی «میدیا»کان دەگەڕێتەوە بۆ بەرابەری و یەکسانی مافی ژن و پیاو و ئازادی ژن لەو شارستانیەتەدا. ئازادی ژن لە ناو کۆمەڵگای بەهدینی تا ئەو ڕادە بووە کە کچ دەیتوانی لە سەر حەز و بریاری خۆی، تەنانەت ئەگەر دژی بیری بنەماڵکەشی بێت، هاوسەر بە حەزی خۆی هەڵبژێرێت.

ئەم دابە ئێستاش لە ناو برێک لە هەریمەکانی کوردستان بە چەشنی «ڕەدووکەوتن» ماوە. ڕەدووکەوتن بۆ ئەو کچ و کوڕانە بوو، کە بە جۆرێک لە جۆرەکان، بنەماڵەیان دژی پەیمانی هاوسەریی ئەوان بوون. بۆیە ئەوانیش دابی ڕەدووکەوتنیان دەگرتە بەر و ئەمە دابێکی پەسەن بوو لە کۆمەڵگای بەهدینی. بەڵام ئێستا کوردان لە دوای دابڕان لە ئایینی زەردەشت، مەخابن ئەم دابە، لە لایەن ژنانی مێرددار یا پیاوانی ژندار بە هەڵە بە کار دەهێنرێت.

لە ئایینی بەهدینی ژن دەتوانێت خاوەنی زەوی و زار و باخ و سامان و هەموو ئەو شتانەی کە پیاوێک بۆی هەیە، ببێت. ژن دەتوانێت داوەر بێت و لە دادگاهدا، دادی خەڵک بدات و هاوشانی پیاو لە بەرگری نیشتمانییدا، لە کارزاری جەنگدا بەشداری بکات. هاوسەریی، کارێکی پەسەند

و پێویستە لە دینی بەهدینی. هاوسەریی لە سەر بنەماکان و دەستووری دینی زەردەشتدا، بەرابەر بە یەکسانی و ئازادیی ژنە.
کاتێک مرۆڤ سەیری برێک لە هەریمەکانی جیاوازی کوردستان دەکات، ڕەگێکی مێژوویی لە ئاسەواری ئایینی بەهدینی لە ناو دیمانە و ڕەوشتی ژنانی کورد دەبینێت، هەر چەندە کاریگەری دینی و کلتووری بێگانەکان بێئەندازە کوشەندە بووە، هزر و ڕەوانی پیاو و ژنی کۆمەڵگای کوردەواری لە جەوهەری یەکسانی و بەرابەری ئایینی بەهدینی شۆردوەتەوە، بەڵام ئاسەوەرانەکانی ڕەوشتی بەهدینی لە ناو سیما و ڕەوشتی ژنی بوێری کورد دەبینرێتەوە و لە برێک ناوچەی کوردستان بەرابەری و دەستڕۆیشتووی ژنان بەرچاو دەکەوێت، کە ئەمە لە جەوهەری ئایینی بەهدینی نزیکتر و ڕاستترە.
دەزانین کە میدیاکان پێش 8 سەدەی پێش زایین، ئیمپراتۆرییەکی بە هێزیان هەبوو، بە شێوەیەکی مرۆڤانە دەستەڵاتی میزوپاتامیا و هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان بە دەست گرت. «ئیگۆر میخائیلویچ دیاکۆنۆف» نووسەری «رووس» لە پەرتووکی «میدیا» لە ساڵی 1965، لە زمانی «لنین»ەوە دەنووسێت کە میدیاکان نەتەوەکی ئازادیخواز بوون.
گۆڕانکاری و هزر و رامانی زەردەشت کارێکی ئاواهی کرد کە ژنانی میدیا لە هەموو بەشەکانی ژیان و کۆمەڵگا هاوڕیز و هاوشانی پیاو ببن. ژنان سەربەست و ئازادبوون، بەو جۆرێک کە لە مێژووی هیچ گەل و نەتەوەیەکی ئەو سەردەمە و پاشاتریش، ئێمە ئەو ئازادییە نابینین. لەو سەردەمە یۆنانییەکان لەتەک ژنانی خۆیان وەک کۆیلە هەڵسووکەوتیان دەکرد. تەنانەت ناودارێکی وەک «ئەرەستو» دەیگوت کە (ژن رۆحی نییە). (پەرتووکی مێژووی فەلسەفەی زەردەشت. بل دوبرۆی. پاریس.1984. لاپەڕەی 110)
جێگای خۆیەتی لێرەدا سەرنجێک لە واژەی «دایک» لە ناو زمانی کوردی بدەین. لە زاراوەکانی جیاوازی کوردی واژەی «دایک» بەم 10 جۆرە دەگوترێت: «دایە، دایک، داڵک، دا، ئا، ئۆدا، دێ، جیا، داک، دادە». ناوی دایک بەم جۆرانە لە ناو زاری زارۆکی کورد لە ناو زاراوەکانی جیاوازی کورد دێتە دەر و دێتە بیستن.
وشەی «دایک»، لە وشەی «دا» و «یک» دروست بووە. «دا» لە زمانی کۆنی کوردی، ئاڤێستایی بە واتەی «دان، دایین، بەخشین» هاتووە. (فەرهەنگی واژەکانی ئاڤێستا. بەرگی 2. ل 726/712) و وشەگەلی «داتەر، دادار، دادەر» لێ دروست بووە کە هەمووی بە واتەی بەخشێنەرە و یەکێک لە سەدویەک ناوی ئەهۆرا مەزدایە لە ئایینی بەهدینی.
واژەی «دا» ئێستاکە لە فەرهەنگی زمانی کوردی پتر لە 16 واتەی هەیە، وەک: 1ـ لە پێش وشە بە مانای بەرەوخوار (داکەوتن، داهێنان، داهێشتن) 2ـ نوێ، تازە (ئاوازێک داهاتووە) 3ـ هەتا، هەیا (دا بۆ خۆم دێم، هیچ مەکە) 4ـ دابا، بلا (دەبا، دا با بزانم چییە) 5ـ مات و سەرگەردان (دا مابووم) 6ـ ئەی، هۆی (دا نەشمیلە گیان بێ) 7ـ مەکە، وامەکە (دا بێ دەنە بە با گوێم لێ بێت) 8ـ پێشگری خواستن (دا پێم بە، دا بێ) 9ـ وشەی هاندان (دا دەی، پەلەکە) 10ـ

وشەی ڕێزنان لە کیژی شوو نەکردوو (دا گوڵچین) 11- دەفرایەتی (ئەم جەواڵە چی تێ دایە) 12- چارەسەری نەخۆشین (خەریکی داو دەرمانم) 13- هاوار و گازند (دا لە دەست داگیرکەری بێبەزەیی) 14- لێدان (لە منی دا) 15- بە واتەی بەخشش و بەخشین (دیاری دا بە من) 16- بە مانای دایک، دێ، داک، داڵک. عەرەبیش وشەی «دایە»یان لە زمانی کوردی وەرگرتووە و لە جێگای «مامان» کوردی بە کاری دێنن.

وشەکانی «دایکە» و «دایکەڵە» کە بۆ دواندنی دایک بە زاری خۆشەویستی لە ناو زمانی کوردی ماوە، لە چاوکی وشەی ئاڤێستایی «دا»یە. خودی ناوی «ئەهۆرا مەزدا»، وشەی «دا»ی لە خۆ گرتووە. «ئەهۆرا مەزدا» بە واتەی خودای مەزنی بەخشێنەر. «مەز» لە زاراوەی کرمانجی ژوورو، بە واتەی مەزن وەک خۆی ماوە، «دا» بە واتەی بەخشێنەر و بەدیهێنەر، کە هەر لە زمانی کوردی ئێستا وەک خۆی ماوە.

بۆیە کاتێک مرۆڤ سەرنجی ناوەکانی «خوداوەند، ئەهۆرا مەزدا، دادار، دایک» دەکات لە ناو هەموویاندا، وشەی هاوبەشی «دا» دەبینێت. خاڵی هاوبەشی خودا و دایک ئەویە کە هەردووکیان «بەدیهێنەر» و دروستکەرن. وتمان «مەزدا» بە واتەی بەدیهێنەری مەزن، بۆ پەسن و دواندنی خۆشەویستی لە بەردەم خودایە، «دایکە»ش بە واتەی داهێنەری پچووکە، دایکەڵە بۆ پەسن و دوواندنی خۆشەویستی لە بەردەم دایکە. ناوەکانی کچەکە، کوڕەکە، باوکە و دایکە لە زمانی کوردی هەمووی بە مەبەستی دەربڕینی خۆشەویستی بە کار دێت.

بۆیە زۆر گونجاوە کە ئەگەر بگوترێت لە ناو ئایینی بەهدینی و زمانی کوردی، ڕێزی دایک شان لە شانی خودای مەزدا و دلۆڤان دەدات.

واژەیەکی دی لە زمانی کوردی هەیە، «ئافرەت» کە وەک وشەی «ژن»، هەر کوردییە و لە چاوکی «ئافراندن» دێت. بێگومان واژەگەلی ترمان هەیە کە وەک نازناو یا ڕێزنان، بۆ ژنان و ئافرەتان بە کار دێت، وەک «کەیبانوو»، کە ئەویش سەر بە واژەی ئاڤێستایی «کەی، کاوی» بە واتەی بەڕێز، سەرۆک، پاتشا، میر و خاوەن تاج و تەختە. وشەی کەی لەتەک ناوی زۆر پاتشای دیرۆکی کۆنی کورد، گرێی خواردووە وەک: کەیخەسرەو، کەیقوباد، کەیکاووس. ئایینی «کاکەی» و هەروەهاش واژەی «کاکە» لە چاوکی وشەی «کەی» ئاڤێستایی گیراوە، کەی لە زمانی کوردی سەرناوی ژنان و پیاوانی بەڕێز و پیرە. هەروەهاش واژەی کەی لەتەک وشەی دی لە زمانی کوردی، ئێستاکەش بە کار دێت وەک: (کەیسەرا بە واتەی سەرا و کۆشکی پاتشا)، (کەیبانوو بە واتەی ژنی پاتشا، شاژن، کابان، کە لە ئێستا بە واتەی ژنێکی پاک و خاوێن و کارکەر و دەسڕەنگین بە کار دێت و لە واتەی ڕاستی «کەیێ بانوو» دوورە)، (کەیخوا، کوێخا، کەیخودا بە واتەی پیاوی ژیر و بەمشۆر)، (کەیل بە واتەی سەرکۆمار و سەردار و سەرۆکی ئێڵ و هۆز)، (کەینەک بە واتەی کەنیشک و دۆێترە، کچ).

لە ناو هۆڕەکانی زەردەشتدا، ناوی ژن و پیاو لە یەک ئاست و بە یەک ڕێز هاتووە. لە کاتی ستایشت و نیایشتەکانی ئایینی، لە کاتی جەژنی شاڵپۆشان تەمەنی کچ و کوڕ وەک یەک دیاری کراوە.
مرۆڤ دەتوانێت لە سرووەکانی زەردەشتدا، دوو لایەنی تەواوکەری یەکدی ژن ببینێت. یەکەم ژن وەک بڕوامەندێکی بەهدینی، دووهەم وەک یەکێک لە دوو ڕەگەزی مرۆڤ، کە شوێن و جێگای تایبەتی لە ژیانی جڤاکی هەیە. زەردەشت، ژن وەک نیوەی کۆمەڵگا و بڕوامەندێکی بەهدینی، ویژدان و رامانی مەبەستە، بانگهێژی دەکات کە هزر و رامان و بڕیاری خۆی بە ئازادانە هەڵبژێرێت.
ژن ئازادە کە لە سەر بنەمای بیر و ئەندێشە و ناسین و زانایی خۆی، ئەو شتە و ئەو کەسەی کە خۆی پێی خۆشە هەڵبژێرێت. لە دیتنی دووهەمیش، ژن یەکێک لە ئەندامانی کۆمەڵگایە کە دەبێت دەور و ئەرکی تایبەتی خۆی وەک کیژ، وەک هاوسەر، وەک دایک و وەک ژن لە ژیاندا ببینێت. لێرەدایە کە ئافراندن و شیردانی منالّ بە چەشنێکی سرووشتی دەکەوێتە سەر شانی دایک.
ڕۆژی 12.05 مانگی کوردی، «سپندارمەز» پێنجەم ڕۆژی مانگی «ڕەشەمە، ئەسپەند، ئەسفەند» بەرانبەر بە بیستوچواری فیبرەوری 24. 02 زایینی، هەر لە مێژووی کۆنەوە تا کۆتایی ئیمپڕاتۆری کوردی ساسانییەکان تا هاتنی ئیسلام، ڕۆژی ژنان بووە و جەژن گیراوە. لەم ڕۆژەدا ژنان دیارییان لە هاوسەرانیان وەرگرتووە.

*1– Thshtri*

(بەشێکی هەرە زۆری هاوسەرییەک کە ئێستا لە ناو کوردان باوە و ئەو رامان و دیتن و مافە، کە پیاوی کورد هەیەتی لە هەمبەر ژنان و هەروەها دیتنی بڕێکی زۆری ژنانی کورد سەبارەت بە خۆیان، لەتەک کۆیلەتی جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە. بۆیە دەبێت مرۆڤی کورد، بە تایبەت پیاوی کورد، ئاوڕ بداتەوە لە خۆی و دیرۆکی خۆی، بۆیە بە باوەڕی من: ژین، ژیان و ژیار، چاوکانییان ژنە.)

سەرنج:
بەشێکی ئەم بابەتانە لە ڕۆژەکانی 21 و 22 نوامبری ساڵی 2001 لە «کۆنفرانسی ئاڤێستا»، لە شاری «بەرلین» لە ئاڵمان، کە بۆ ماوەی 2 ڕۆژ لە لایەن «ئەنستیتوی کورد لە بەرلین» بەڕێوە چوو، پێشکەش کرا. خوێندنەوەی ئەم وتارانە، بوو بە هۆی وروژاندنی بیری تازە و جیاواز و گفتوگۆیەکی زۆر لە لایەن زانایانی بەشداری ئەم کونفرانسە. دەقی ئەم وتارە و وتاری زانایان و لێکۆڵینەرانی دی بە زمانەکانی ئاڵمانی و ئەنگلیسی لە ڕێگای ئەنستیتوی کورد لە بەرلین بڵاو کراوەتەوە. زانایانی بەشدار لە کونفرانسەکە بریتی بوون:

*Prof. Dr. Werner Sundermann – Berlin*
*Dr. Sirach Bilgin – Upsala*
*Prof. Dr. Carsten Colpe – Berlin*
*Dr. Memo Ocman – berlin*
*Hosheng Borka – Bielefeld*
*Prof. Dr. Kreijenbork – Gottingen*
*Dr. Zorab Bodi Aloyan – Bermen*
*Prof. Dr. Kesra Vefadari – Paris*
*Baban Seqizî – Kopenhagen*

# گاثاکان

## کۆنترین بەشی ئاڤێستا

## سروودەکانی ئاشوو زەردەشت

# هاتی 28



سەرەتا ،
ئەی مەزدای مینوویی پاک..!
پترکەری چاکە ،
ئێستا بە دەستی بەرزکراوەوە نوێژت بۆ دەکەم و
داوای بەختیاریی گشتی دەکەم.
با بە کردارە پاک و ڕاستەکان ،
کە بە خێرەت و رامانی پاک ئەنجام دەدرێن ،
ڕەوانی ئافراندن خۆشنووت بکەم.
گاتا ، هاتی 28 ، سرووودی 1

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
بە رامانی پاک و دڵی ڕووناکەوە ،
لە بەر تیشکی ڕاستیدا ،
ڕوو لە تۆ دەکەم ،

ئێمە لە پاداشتی ژیانی ئەنبووژەنی و مینوویی،
کە لایەنگرانت بە بەختیاری دەگەیێنێت،
بەهرەمەند بکە.
گاتا، هاتی 28، سروودی 2

ئەی ڕاستی و ئەی رامانی پاک..!
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
سروود بۆ ئێوە دەهۆنمەوە،
سروودێک کە تا ئێستا کەس نەیهۆنیبێتەوە،
تا توانامەندیی مینوویی و پاکی،
لە ئێمەدا پتر بێت.
تکای ئێمە بپەژرێنە و
شادومانی و بەختیاریمان پێ ببەخشە.
گاتا، هاتی 28، سروودی 3

وا من ڕەوانی خۆم لەتەک رامانی پاکدا،
بەرەو سەرای بەرین ڕێنوێنی دەکەم و
بە لەبەر چاوگرتنی ئەو پاداشتەی کە مەزدا ئەهۆرا
بۆ کرداری پاکی دیاریی کردووە،
تا هێز و توانام هەیە،
کۆمەڵان فێر دەکەم کە
لە ڕێگای ڕاستیدا تێبکۆشن.
گاتا، هاتی 28، سروودی 4

ئەی ڕاستی..!
کەی دەتوانم بتبینم؟
ئەی رامانی پاک..!
کەی دەتوانم لە داناییدا بە تۆ بگەم؟
ئەی ئەهۆرای بەتوانا..!
کەی دەتوانم ڕێگات بدۆزمەوە؟
کەی دەتوانم سرووشی یەزدانی ببیستم؟
هیوادارم لە بەر پرشنگی پەیامی بیرخرۆشێنەرت و
هێزی گوفتاردا،
ڕێپیشاندەری گومڕایان بم.
گاتا، هاتی 28، سروودی 5

ئەی ڕاستی و ئەی رامانی پاک..!
بەرەو ڕووی من بێن،
خەڵاتی تەمەندرێژیم پێ ببەخشن.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
بە گوتاری ڕاستی خۆت،
بە زەردەشت و هاوڕێیانی،
وزەی مینوویی و شادومانیمان خەڵات بکە،
تا بە سەر ئازار و ڕکی نەیارانماندا زاڵ ببین.
گاتا، هاتی 28، سروودی 6

ئەی ڕاستی..!
ئەو خەڵاتە بە ئێمە ببەخشە،

که بەهرەی رامانی پاکە.
ئەی پاکی..!
ئارەزووەکانی «گوشتائەسپ» و پەیڕەوانی بە جێ بهێنە.
ئەی مەزدا..!
وزەمان پێ ببەخشە،
تا پەیامی تۆ بە هەمووان ڕابگەیەنین.
گاتا، هاتی 28، سروودی 7

ئەی ئەهۆرا..!
ئەی باشترین و لە هەمووان چاکتر..!
ئەی هاودەمی باشترین ڕاستییەکان..!
لە کانگای دڵەوە تکا دەکەم،
کە جاویدانی و رامانی پاک
بە «فرەشەوشتر»ی دلێر و یارانی ببەخشیت.
گاتا، هاتی 28، سروودی 8

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەی ڕاستی..!
ئەی رامانی پاک..!
بەو بەخششەی کە بۆ من هەتانە،
هەرگیز ئازارتان نادەم،
تێدەکۆشم کە ستایشتی خۆم
بە ئێوە نیاز بکەم،
کە ئێوە و توانای مینوویی ئێوە،

شایانی ستایشتن.
گاتا، هاتی 28، سروودی 9

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئاواتی ئەو کەسانە بەجێ بهێنە،
کە دەیانناسیت و دەزانیت
ڕاستبێژ و بیرچاک و دروستکارن.
من چاک دەزانم
کە تۆ وەڵامی هەر نیایشتێک
دەدەیتەوە،
کە لە کانگای دڵەوە هەڵبقوڵێت و
بۆ ئارمانجێکی چاک بێت.
گاتا، هاتی 28، سروودی 10

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
بە سرووشی خۆت،
من بە نیایشتەکانم،
کە پاسەوانی هەمیشەیی ڕاستی و رامانی پاکم،
فێرم بکە و پێم بێژە:
سەرەتا چۆن بوو و
ئەم بوون و ئافراندنە چلۆن بەدی هاتن؟
گاتا، هاتی 28، سروودی 11

# هاتی 29



ڕەوانیی جیهان لە لای ئێوە (ئەهۆرا مەزدا) گازندەی هەیە:
هاوار.... بۆچی منت ئافراند؟
کێ منی خستە ناو قاڵبی بوونەوە؟
ڕک و تووڕەیی و ستەم و دەستدرێژی و ڕووشی،
منی داگرتووە.
بێجگە لە تۆ پشت و پەنایەکم نییە،
فریادڕەسێکی دڵسۆزم،
پێ بناسێنە،
کە ڕزگارم بکات.
گاتا، هاتی 29، سروودی 1

ئینجا،
کردگاری جیهان (ئەهۆرا مەزدا) لە ڕاستی پرسیی:
ڕابەری تۆ لە جیهاندا کێیە،
تا ئێمە ببینە یاوەر و پشتیوانی و

توانای ئاوەدانکردنەوەی جیهانی پێ ببەخشین؟
دەخوازی چ کەسێک سەرداری جیهان بێت،
تا ڕک و ئازاری چەواشەکاران تێک بشکێنێت؟
گاتا، هاتی 29، سروودی 2

ڕاستی بەرسڤی دایەوە و گوتی:
کەسێکی ئاوا ناناسم،
کە ئازار بە ڕووی جهانەوە نەهێڵت و
یارمەتیدەری ڕندکاران بێت لە هەمبەری خراپەکاران.
بێگومان ئەو کەسە دەبێت،
لە ناو کۆمەڵگادا مێهرەبان و
لە هەموو کەسێک بە تواناتر بێت،
تا ئالیکاریی بکەین.
گاتا، هاتی 29، سروودی 3

بێگومان مەزدا ئەهۆرا،
لە هەموو کەسێک باشتر ئاگادارە،
کە پەیڕەوانی خودایانی درۆ (دێڤ پەرستان و بت پەرستان)،
لە ڕابردوو چییان کردووە و
لە ئایەندەشدا چی دەکەن،
تەنها مەزدا ئەهۆرا داوەرە،
کەوایە، هەر چی ئەو بیەوێت هەر بەدی دێت.
گاتا، هاتی 29، سروودی 4

**من و ڕەوانی ئافەرینشت،**
**بە ڕێز و دەستی بەرزکراوەوە،**
**ستایشتی ئەهۆرا دەکەین،**
**لە ئەو داواکارین**
**کە لە ئالی چەواشەکاران و نەیارانەوە**
**گەزەند بە پاکان و ڕابەرەکەیان نەگات.**
**گاتا، هاتی 29، سروودی 5**

**پاشان،**
**مەزدا ئەهۆرا،**
**کە هۆنینەوە و هۆرەی ژیان،**
**لە دانایی ئەوە، گوتی:**
**ئایا تۆ سەردار و ڕابەرێکی پاک و شایستە ناناسی؟**
**مەگەر تۆ بۆ ئاگاداری و پاراستنی جیهان**
**هەڵبژاردەی پەروەردەگار نیت؟**
**گاتا، هاتی 29، سروودی 6**

**ئەم گوفتارە پیرۆزەی،**
**رامان دەخرۆشێنێت و شادی دەهێنێت،**
**لە پەروەردەگارێکەوەیە،**
**کە خواستی لەتەک ڕاستیدا یەکسانە.**
**مەزدا ئەهۆرا،**
**پاکانی فێر کردووە،**
**بۆ ئاوەدانی و پێشکەوتنی جیهان.**

ئەی رامانی پاک..!
کێیە ئە فریادڕەسەی کە لایەنگری تۆ بێت و
بە ڕاستی هاریکاری خەڵک بێت؟
گاتا، هاتی 29، سروودی 7

تەنیا کەسێک کە من بیناسم و
گوێ لە ڕاهێنانی ئێمە بگرێت
زەردەشت ئەسپێتمانە،
تەنیا ئەوە کە دەیەوێت،
ڕاهێنانەکانی ئایینی ڕاستی و
سروودی ستایشتی مەزدا
بە کۆمەڵان ڕابگەیەنێت.
کە وابێت،
ئێمەش پەیڤی شیرین و دڵپەسەنی گوفتار،
هەر بۆ ئەو ڕەوا دەبینین.
گاتا، هاتی 29، سروودی 8

پاشان،
ڕەوانی جیهان دوبارە بانگی هەڵدا و گوتی:
ئایا دەبێت من پشتیوانی پیاوێکی بێتوانا
بپەژرێنم و گوێی بۆ ڕاگرم؟
بە ڕاستی ئارەزوومەندی سەردارێکی بەتوانا بووم.
کەی کەسێکی ئاوا،
بە دەستانی پڕتواناى خۆی،

**یارمەتیی من دەدات؟**
**گاتا، هاتی 29، سرورودی 9**

**ئەی مەزدا ئەهۆرا..!**
**لە ڕێگای ڕاستی و رامانی پاکدا،**
**هێز و توانایان پێ ببەخشە (زەردەشت و یارانی)**
**تا جیهانێکی پڕ لە ئاوەدانی و ئاسایش،**
**بەدی بێنن.**
**ئەی مەزدا..!**
**من (ڕەوانی ئافرینشت) ئەو**
**بە بەرزترین ئافەریدەی تۆ دادەنێم.**
**گاتا، هاتی 29، سرورودی 10**

**ئەی مەزدا ئەهۆرا..!**
**کەی ڕاستی و رامانی پاک و توانای مینوویی**
**ڕوو لە ئێمە دەکات؟**
**کەی ئەنجومەنی مۆغان،**
**ئەم ئایینەی تۆ دەپەژرێنێت؟**
**ئێستا کە یاوەرێک گەیشتووتە ئێمە،**
**ئێمەش ئامادەی ئاریکاریی ئەوین.**
**گاتا، هاتی 29، سرورودی 11**

# هاتی 30



ئێستا بۆ ئێوه ئەی پەیجۆرانی ڕاستی و
ئەی خەڵکانی دانا دەئاخفم..!
لەمەڕ دوو مژاری گەورەوە،
هەروەهاش شێوەی ستایشتی ئەهۆرا و
رامانی پاک و
زانستی چاک و ئایینی ڕاستی،
تا تیشک و ڕۆشنایی ڕاستەقینە بناسن و
بە ڕەسایی و شادومانی بگەن.
گاتا، هاتی 30، سروودی 1
(دوو مژاری گەورە مەبەست: دوو هێزی نەیار و دژ بەیەکن، یەکەمیان "سپتنامینوو" یان بیری پاک، دووهەمیان "ئەنگەرەمینوو" یان ئەهریمەن بە واتەی بیری خراپ)

کە وایە،
پەیڤە هەرە باشەکان بە گوێی هۆش ببیسن و

**بە رامانی ڕوون بڕوانن،**
**هەر یەک لە ئێوە،**
**یەکێک لەم دوو ڕێگایە بۆ خۆی هەڵبژێرێت و**
**بەر لە بویەری مەزن،**
**ڕاپەڕن و بە دروستی،**
**ئەم ئایینە فێر ببن و پەرەی پێ بدەن.**
**گاتا، هاتی 30، سروودی 2**

**ئەو دوو گەوهەرە لفانە،**
**هەر لە سەرەتاوە،**
**لە ناو رامان و خەیاڵدا پەیدا بوون،**
**یەکێکیان چاکە دەنوێنێت و ئەوی دیکە خراپە،**
**لەو دووانە**
**مرۆڤی ژیر ڕاستی و دروستی هەڵدەبژێرێت،**
**نەزانیش خراپە و چەوتی.**
**گاتا، هاتی 30، سروودی 3**

**لەوساوە،**
**کە ئەو دوو گەوهەرە پێک گەیشتن و**
**ژیان و ناژیانیان بەدی هێنا.**
**یارانی درۆ ناخۆشترین بوونیان هەڵبژارد،**
**ڕاستپەرستانیش خۆشترین.**
**لەوساوە**
**ئەمە بوو بە یاسا و**

**هەتا هەتایەش**
**هەر وا دەبێت.**
**گاتا، هاتی 30، سرووودی 4**
**(ژیان و ناژیان، بوون و نەبوون، هەستی و نیستی، لێرە مەبەست لە ناژیان و نەبوون و نیستی، مەرگ نییە، ناژیان بە واتەی ژیانێکی بێ سوود و بێکەڵک، یان پڕ لە درۆ و دووڕوویی و کرداری ناپەسەنە کە لەتەک هەنجاری ژیان ناگونجێت)**

**لەم دوو گەوهەرە،**
**لایەنگری درۆ**
**کردارە خراپترینەکان هەڵدەبژێرێت،**
**ئەو کەسەی کە پاکترین رامانی هەیە و**
**بە تیشک پایەداری زانست ڕازاوەتەوە،**
**هەر وەها ئەو کەسەی کە**
**بە بڕوای پتەو و کرداری دروست**
**مەزدا ئەهۆرا کەیفخۆش دەکات،**
**ڕاستی هەڵدەبژێرێت.**
**گاتا، هاتی 30، سرووودی 5**

**لەو دوو گەوهەرە،**
**دێڤپەرستان ڕاستی هەڵنابژێرن.**
**چونکە کاتێک کە دوو دڵ و بە گومانن،**
**فریو دەخۆن،**
**بۆیە**

ڕووو لە خراپترین رامان دەکەن و
هەنگاو بۆ تووڕەیی دەنێن و
ژیانی جڤاک بەرەو کاڤلی دەبەن.
گاتا، هاتی 30، سروودی 6

ئەو کەسەی کە ڕێگای چاکە هەڵدەبژێرێت،
توانای مینوویی،
رامانی پاک و ڕاستی دەست دەکەوێت و
پاکی بە تەن و گیانی ئەو،
پایەداری و توانامەندی دەبەخشێت.
بێگومان چونکە ئەو لە لایەنی تۆ بووە،
لە ئەزموونی گرانی ژیاندا
سەر دەکەوێت.
گاتا، هاتی 30، سروودی 7

ئەو کاتەی کە،
تاوانباران ئەنجامی سووچەکانی خۆیان بینی،
ئەوسا، ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
لە ڕێگای رامانی پاکەوە،
شکۆداری و دەستەڵاتی تۆیان
بۆ ئاشکرا دەبێت و
فێر دەبن،
چلۆن بۆ لەناوبردنی درۆ و
سەرکەوتنی ڕاستی و پاکی کۆشش بکەن.

گاتا، هاتی 30، سروودی 8

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئارەزوومەندین خۆمان بدەینە دەستی تۆ و
لەو کەسانە بین کە جیهان بەرەو پێشکەوتن و ئاوەدانی دەبن.
ئەی هەستیبەخش، وا بکە:
ئەو کاتەی کە رامان تووشی بەدگومانی و لاوازی دەبێت،
ڕاستی بە هانامان بگات و
دڵ و رامان،
ئێمە لە یەک نزیک بکەنەوە.
گاتا، هاتی 30، سروودی 9

ئەو کاتەی کە درۆ و
وێرانی تێکدەشکێت،
ئارەزووی ئەوانەی کە بە خۆشناوی خەباتگێڕ و
چاکەکار ناسروان،
بەدی دێت و
لە سەرای درەخشان و خۆشیی رامانی پاکی یەزدانی و
ڕاستی بەهرەمەند دەبن.
گاتا، هاتی 30، سروودی 10

ئەی خەڵکینە..!
هەر دەمێک لەم ئایینە دیاریکراوەی مەزدا بگەن کە:
سزا و ڕەنجی هەمیشەیی بەشی چەواشەکارانە و

**شادی و سوودی بێژمار بەهرەی ڕندکارانە،**
**ئینجا،**
**لە بەر تریفەی ئەم ڕێبازەدا**
**بە بەختیاری و ڕزگاریی ڕاستەقینە دەگەن.**
**گاتا، هاتی 30، سروودی 11**

# هاتی 31



**ئەی پەیجۆرانی دانش..!**
**ئێستا ئەم ڕاهێنان و گوتارانەی،**
**کە تا ئێستا نەبیستراون،**
**بۆتانی ئاشکرا دەکەم.**
**بێگومان، ئەم گوتانە،**
**بۆ ئەو کەسانە ناگەوارە کە،**
**بە ئامۆژگاریی درۆ،**
**جیهانی ڕاستی بەرەو وێرانی دەکێشن و**
**بۆ سەوداسەرانی مەزدا،**
**شادیبەخش و باشترینە.**
**گاتا، هاتی 31، سرووودی 1**
**(مەبەست لە سەوداسەرانی مەزدایی، ئەو کەسانەیە کە بە دڵ ئەڤینداریی خودا دەکەن)**

**چونکە بەم ڕاهێنانە ناڕاستە،**

بواری هەڵبژاردنی ڕێگا،
ڕوون و ئاشکرا نییە،
من، هەر وەک ئامۆژگارێک،
کە هەڵبژاردەی مەزدایە،
بەرەو ڕووی ئێوە دێم،
تا هەر دوو گروو ڕابهێنم،
بەرابەری ڕاستی بژین.
گاتا، هاتی 31، سروودی 2

ئەی مەزدا..!
ئەو بەختیارییەی کە لە بەر ڕووناکیی تیشکی مینوویی،
لە ڕێگای ڕاستییەوە،
بە هەر دوو گروو مزگێنیت داوە و
ئەو ئایینەی کە بۆ فەرزانەکانە،
بە گوفتاری خۆت،
بۆ ئاگابوونەوەی ئێمە، ئاشکرا بکە
تا من، هەموو کۆمەڵان
بۆ لایەنگیری لە ئایینی ڕاستی بانگەواز بکەم.
گاتا، هاتی 31، سروودی 3

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەی جاویدانە پاکەکان..!
ئێمە داواکاری ئەڤین و
ڕاستی و پاکی و

**چاکترین هزر و**
**هێزی مینوویین،**
**تا بە پەروەردەکردن و پەرەپێدانیان،**
**بە سەر درۆ زاڵ ببین.**
**گاتا، هاتی 31، سروودی 4**

**ئەی مەزدا ئەهۆرا..!**
**ئاگادارم بکە،**
**تا لە ڕێگای ڕاستی و ڕامانی پاکەوە،**
**ئەو ئایینە هەڵبژێرم،**
**کە بۆ من باشترینە و**
**بتوانم لە پاداشتی شادیبەخشت**
**تێ بگەم و**
**ئەو شتەی کە ڕوو دەدات و**
**ڕوو نادات، ببینم.**
**گاتا، هاتی 31، سروودی 5**

**ئەو دانایە،**
**کە گوتەی پاک و ڕەسەنی من،**
**کە بۆ کۆمەڵان پێگەیشتن و گەشەکردنی جاویدانی، ڕێنوێنی دەکات،**
**بە گوێیان بگەیەنێت،**
**لە باشترین پاداشت و بەختیارییەکان بەهرەمەن دەبێت،**
**بێگومان مەزدا ئەهۆرا،**

**لە بەر پرشنگی ڕامانی پاکدا،**
**توانامەندیی ئەو کەسە پتر دەکات.**
**گاتا، هاتی 31، سروودی 6**

**ئەوە کە لە سەرەتادا،**
**بە هزری خۆی،**
**ڕۆشنایی بە گەردوون بەخشی و**
**بە خێرەتی خۆی**
**هەنجاری بوونی ئافراند،**
**تا چاوەدێر و پشتیوانی،**
**ڕامانە هەرە باشەکان بێت.**
**ئەی مەزدا ئەهۆرا..!**
**ئەی ئەوەی کە مینای یەکسانیت..!**
**بە هێزی پیرۆزی مینووی خۆت،**
**ڕووناک و سەرفرازمان بکە.**
**گاتا، هاتی 31، سروودی 7**

**ئەی مەزدا..!**
**کاتێک کە لە ڕامانی خۆم ورد بوومەوە،**
**تێگەیشتم کە**
**تۆ سەرەتا و سەرئەنجامی بوونی،**
**تۆ سەرچاوەی ڕامانی پاکیت.**
**ئەو کاتەی کە بە ویناوم تۆم بینی،**
**لەوە گەیشتم کە تۆی**

بەدیهێنەری ڕاستیی،
هەر خۆت داوەری دادگەری هەموو کردارێکی ئەم جیهانەی.
گاتا، هاتی 31، سروودی 8

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
پاکی و بەهدینی لە تۆوەیە.
گەوهەری پیرۆزی مینووی جیهانساز لە تۆوەیە.
تۆ ئازادی هەڵبژاردنی ڕێگات
بە مرۆڤ بەخشیوە.
تا پێشڕەوی ڕاستەقینەی خۆی هەڵبژێرێت و (ڕامانی پاک)
پشت لە ڕابەری درۆ بکات. (هزری خراپ)
گاتا، هاتی 31، سروودی 9

پاشان، لە نێوانی ئەو دووانەدا،
پێویستە مرۆڤ،
ڕابەرێکی ڕاستەقینە بۆ خۆی هەڵبژێرێت
کە دروستکردار بێت و
پترکەری ڕامانی پاک بێت.
ئەی مەزدا..!
هەرگیز ڕابەرەکێکی تەڵەکەباز،
کە خۆی بە ڕاستی و پاکیدا هەلواسیبێت،
ناتوانێت پەیامهێنەری تۆ بێت.
گاتا، هاتی 31، سروودی 10

**ئەی مەزدا..!**
**کاتێک لە سەرەتادا،**
**بە رامانی خۆت،**
**لەش و خێرەت و ویژدانت**
**بۆ ئێمە ئافراند،**
**گیانت بە لەشی ئێمە**
**بەخشی و**
**توانای گوفتار و کردار و ڕابەریت پێ بەخشین،**
**ویستت ئێمە رامانی خۆمان**
**بە ئازادیی تەواو هەڵبژێرین.**
**گاتا، هاتی 31، سرووودی 11**

**لەم ڕووەوەیە کە هەر کەس،**
**چ ڕاستگۆ بێت و چ درۆزن،**
**چ زانا بێت و چ نەزان،**
**ئەو شتەی کە لە دڵ و رامانیدایە**
**بە سەر زاریدا دێت و ئاشکرای دەکات،**
**هەر کاتیش کە**
**رامان دوچاری پرسیار و سەرگەردانی و دڵەڕاوکێ بێت،**
**ئەوە پاکی**
**بە هانای ڕەوانی دێت و**
**ڕێنوێنی دەکات.**
**گاتا، هاتی 31، سرووودی 12**

ئەی مەزدا..!
کاتێک کەسێک،
بە ئاشکرا یا نهێنی،
پرسیارێکت لێدەکات
یا کەسێک بۆ گوناهێکی پچووک
سزایەکی مەزن دەبینێت،
تۆ بە چاوی وردبینی خۆت و
لە ڕێگای ڕاستیەوە،
هەموو شتێک دەبینێت و لە گشتی ئاگاداریت.
گاتا، هاتی 31، سروودی 13

ئەی مەزدا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم:
لە کارنامەی ژیانی مرۆڤ و
لە ئەنجامی
ئەو شتەی بەسەر چووە و
ئەو شتەی بەسەر دەچێت،
پاداشت و سزای لایەنگیرانی
ڕێگای ڕاستی و چەواشەیی چی دەبێت؟
گاتا، هاتی 31، سروودی 14

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
سزای کەسێک،

که وزەی چەواشەکار پتر دەکات
چی دەبێت؟
کەسێک که له ژیاندا
بێجگه له ئازاردانی ڕێبەرانی دروستکردار و
پەڕەوازەکردنی ڕەنجبەران له ئەوان،
کارێکی دیکەی لێ ناوەشێتەوە،
چ سزایەک دەبینیت؟
گاتا، هاتی 31، سروودی 15

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەمه له تۆ دەپرسم،
ئایا کەسێک،
به زانایی و بیرکردنەوەی ژیرانه،
بۆ پتربوون و پێشکەوتنی خانوو و گوند و شار یا وڵاتەکەی و
بۆ پەرەپێدانی ئایینی ڕاستی تێ بکوشێت،
به خەڵاتی دیداری تۆ دەگات؟
کەی و چۆن ئەم ئارەزووەی دێته دی؟
گاتا، هاتی 31، سروودی 16

له بەهدین و چەواشەکار،
کامەیان ڕێگای دروستی هەڵبژاردووه؟
زانای ڕووناکبیر بەرپرسیاره
کۆمەڵان وریا بکاتەوە،
تا نەزان هەڵیان نەفریوێنێت و بەرەو چەواشەیی نەیانبا.

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
بۆ ئێمە،
ئامۆژگار و ڕێپیشاندەری هزری پاک بە.
گاتا، هاتی 31، سروودی 17

کەواتە، با کەس
گوێ لە گوتار و ڕاهێنانەکانی
مرۆڤی چەواشەکار نەگرێت.
چونکە بێگومان چەواشەکار
خانوو و گوند و شار و وڵات
بەرەو وێرانی و لەناوچوون دەبات.
کەوایە، لە دژی چەواشەکاران،
ڕاپەڕن و بجەنگن.
گاتا، هاتی 31، سروودی 18

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
کەوایە با مەردوم
گوێ بدەنە گوتاری دانایەک کە
لە ڕاستی بیر دەکاتەوە و
چارەسەری ژیانی کۆمەڵانە،
ڕاستگۆییەکەی دەرمانبەخشە،
خۆشبێژ و بەتوانایە و
لە بەر تریفەی پرشنگداری تۆ،
شوێنی هەر دوو ئالی دیاری دەکات.

گاتا، هاتی 31، سروودی 19

هەر کەسێک ڕوو لە ڕاستی بکات،
تیشک و ڕووناکی دەبێتە سەرا و هەواری.
بەڵام مرۆڤی گومڕێ،
تا زەمانێکی دوور و درێژ،
ژیانی لە ناو تاریکی و دڵڕەشی و
داخ و خەفەت دەباتە سەر،
سەرئەنجامێک کە
لە کردار و ویژدانی خۆی بەدی دێت.
گاتا، هاتی 31، سروودی 20

مەزدا ئەهۆرا،
بە زانست و سرووشی خۆی
خەڵاتی پێگەیشتن و جاویدانبوون،
ڕاستی و توانامەندیی مینوویی و
یارمەتیی رامانی پاک
بە کەسێک دەبەخشێت،
کە لە رامان و کرداریدا
هاوڕێ و ئەڤینداری بێت.
گاتا، هاتی 31، سروودی 21

ئەم ئایینە،
بۆ مرۆڤی هۆشیار

که بە ژیری لێی تێ بگات و
بە هێزی مینوویی،
بە گوفتار و کرداری خۆی
پشتیوان و چاودێری ڕاستی بکات،
ڕوون و ئاشکرایە.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
کەسێکی ئاوا، لە لایەنی تۆوە
شایستەترین یاوەر و ڕێپیشاندەری مرۆڤە.
گاتا، هاتی 31، سرووودی 22

# هاتی 32



ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
بۆ بەهرەمەندبوون لە مەزنترین خۆشبەختییەکان،
خێشان، هاوکاران و یاوەران،
نوێژ بۆ تۆ دەکەن،
دێڤپەرستانیش بە هەمان مەبەست،
ستایشتت دەکەن.
ئێمە هیوادارین
پەیامهێنەری تۆ بین و
بەدخوازان لە دوژمنایەتی و ئازاردانی لایەنگرانی تۆ
دوور ڕاگرین.
گاتا، هاتی 32، سروودی 1

مەزدا ئەهۆرا،
لە ڕێگای هزری پاک و
بە توانامەندی بە سەر جیهاندا سەروەری دەکات،

لە وەڵامی ستایشتکاراندا فەرمووی:
ڕاستیی پڕشنگدار، کە بۆ پاکی
یاوەرێکی باشە،
بۆ ئێوەم هەڵبژاردووە.
کۆشش بکەن تا هەمیشە
بەشی ئێوە ببێت.
گاتا. هاتی 32، سروودی 2

ئەی بەدئاوەزان..!
هەمووتان و ئەوانەش کە بە خیرەسەری
ستایشتان دەکەن،
هەموو ئەو کردارە دوو ڕووانەتان،
لە درۆ و خۆویستییەوە سەرچاوە هەڵدەگرن،
بۆیە ناوتان لە هەفت شاردا*
بە بەدناوی و خراپەیی
زڕاوە.
گاتا، هاتی 32، سروودی 3

ئەی چەواشەهزران..!
رامانی کۆمەڵتان
ئاوەها پەریشان کردووە و شڵەژاندووە،
کە خراپترین هەڵسوکەوت دەکەن،
لە رامانی پاک دووری دەکەن و
ڕوو لە دۆستایەتی خراپەکاران دەکەن و

لە هزری ئەهۆرایی و
ڕاستی و پاکی ڕادەکەن.
گاتا، هاتی 32، سروودی 4

ئەی بەدئاوەزان..!
ئێوە بەم چەشنە،
جڤاکتان خاپاند
بە کرداری گومڕێیانە،
بە رامان و گوفتار و کرداری نالەبارانە و
مژدەی سەروەری و مەزنی،
ئەوانتان لە ژیانێکی خۆش و
بەختەوەرانە بێبەهرە کرد.
گاتا، هاتی 32، سروودی 5

لەوانەیە تاوانبارێک،
بە کرداری ناشیرینی خۆی،
بە سەرکەوتنێک بگات و ناودار ببێت،
بەڵام ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
تۆ کە هەموو شتێک لە یاد دەمێنێت،
لە باشترین رامان ئاگاداری و
دەشزانی کە لە ئەنجامدا،
لە بەر تیشکی شکۆداری تۆدا،
ئایینی ڕاستی فەرمانڕەوا دەبێت.
گاتا، هاتی 32، سروودی 6

هیچ یەک لەم تاوانبارانە،
لە مانای پڕنرخی کار و گەشەسەندنەکەی،
ناگەن،
مەگەر ژیان بە ئەزموونی تاوێنەری خۆی
فێریان بکات.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
تۆ باشتر لە هەموو کەس
لە ئاکامی ئەم کەسانە ئاگاداریت.
گاتا، هاتی 32، سروودی 7

یەکێک لەم سووچدارانە،
جەمشید ڤیەونگەهانە.
ئەو کەسەیە کە بە هەوا و هەوەسی خۆی،
پەروەردەگاری جیهانی بە پەست دانا.
ئەی مەزدا..!
من بە داوەریی کۆتایی تۆ
لەمەڕ گوناهکاران بێگومانم.
گاتا، هاتی 32، سروودی 8

ئامۆژگاری خراپ،
گوتە پیرۆزەکانی ئایینی هەڵدەگێڕێتەوە و دەیانشێوێنێت،
بە ڕاهێنانەکانی
ژیانی ژیرانەی مرۆڤ لە ناو دەبات.

بەم چەشنە،
گەل لە سەرمایەی گرانبەهای
ڕاستی و ڕامانی پاک بێبەش دەکات.
ئەی مەزدا و ئەی نموونەی ڕاستی و پاکی..!
بەو گوتانەی کە لە دڵمەوە هەڵدەقوڵێن
سکاڵا دەکەم و هانات بۆ دێنم.
گاتا، هاتی 32، سروودی 9

بە ڕاستی ئامۆژگاری خراپ،
گوتە پیرۆزەکان هەڵدەگێڕێتەوە و دەیانشێوێنێت.
سەیرکردنی زەوی و هەتاو بە چاوی ڕێزەوە
بە خراپترین گوناه دەژمێرێت.
هزرچاکان بەرەو گومڕایی هان دەدات،
کێڵگەکان وێران دەکات،
لە ڕووی پاکان چەک بە کار دێنێت.
گاتا، هاتی 32، سروودی 10

ئەی مەزدا..!
ئەو کەسانە
ژیان لە ناو دەبەن،
کە چەواشەکاران بە مەزن دەژمێرن،
ناهێڵن ژنان و پیاوانی مەزن
بە کامی دڵ بگەن و
خەڵاتی یەزدانیان پێ ببڕێت،

پاکان و ڕاستانیش
لە پاکترین رامان
دوور دەخەنەوە ئازاریان دەدەن.
گاتا، هاتی 32، سروودی 11

ئەمانە بە ڕاهێنانەکانیان
دەبنە لەمپەر لە نێوان گەل و کرداری شایستەدا...
ژیانی گەل بە گوفتاری فریوکارانە لەناو دەبن،
لە جیاتی پاکان،
فرەتر ڕێزی گەراهما و کەرپانەکان دەگرن و
بۆ پەیڕەوانی درۆ
هێڤیی سەروەری دەخوازن.
بەڵام مەزدا،
بۆ ئەم کەسانە و کارە خراپەکانیان،
سزایەکی سەختی دیاری کردووە.
گاتا، هاتی 32، سروودی 12

هەر هێزێک کە «گەراهما»
لە پەنای هزرە خراپەکان
ئارەزووی بەدەستهێنانی دەکات،
سەرئەنجام ژیانی خودی خۆی
بەرەو لەناوچوون دەبات.
ئەی مەزدا..!
بەڵام ئەو کاتە دێت

کە بە ناڵە و گریانەوە،
داخوازیی بیستنی پەیامی پەیامهێنەری تۆ دەبێت.
ئەو پەیامهێنەرەی،
کە لە هەمبەر هێرشی دوژمناندا،
ڕاستی دەپارێزێت.
گاتا، هاتی 32، سرووودی 13

لە مێژەوەیە،
«گەراهما» بە یارمەتیی کاوییەکان،
هۆش و توانای خۆی،
بۆ شەکەت کردنی پەیامهێنەر
دەخاتە کار و
جیهان بەرەو نابووتی ڕاکێش دەکات و
لە گێلیی گومڕێیان یارمەتی وەردەگرێت و دەبێژێت:
بە کوشتنی گیانلەبەران و (قوربانی کردن)
خواردنەوەی هەئومەی جاویدانی،
نەخۆشی و مردنمان لێ دوور دەبێتەوە.
گاتا، هاتی 32، سرووودی 14

لە ڕاستیدا،
کەرپانەکان و کاوییەکان،
هەر بە دەستی ئەو کەسانەی کە هیچ کاتێک
ژیانێکی ئازاد و دڵخوازیان
پێ ڕەوا نەبینیوون،

شکست دەخۆن و لەناو دەچن.
کەسانێک کە لە بەر پرشنگی گەشەکردن و جاویدانیدا،
بەرەو کۆشکی هزری چاکی ڕێگا دەبیننەوە.
گاتا، هاتی 32، سروودی 15

بە ڕاستی،
ڕاهێنانی ڕاستەقینە و هۆشمەندانەی مرۆڤی پاک و زانا،
لە هەموو شتێک چاکترە.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
تۆ توانای تێکدانی پیلانی ئەو کەسانەت هەیە،
کە بە دوای ئازاری منەوەن.
منیش دەکۆشم،
پێڕەوان و دڵبەختکەرانی تۆ،
لە دوژمنی و ڕکیی چەواشەکاران ڕزگار بکەم.
گاتا، هاتی 32، سروودی 16

# هاتی 33



هەموو مرۆڤێک لەم جیهانەدا،
پێویستە کردارەکانی لە سەر پایەی ڕاستی بێت،
چونکە ڕاستی بنیاتی ئاییني ژیانە.
پێویستە ڕابەری دادگەر،
لەتەک چەواشەکاران و ڕاستکاران و
هەروەها لەتەک ئەوانەی کە کرداری چاکە و خراپەیان
تەڤلی یەکدی کردووە،
بە گونجاوترین ڕەوشت هەڵسوکەوت بکات.
گاتا، هاتی 33، سروودی 1

هەر کەسێک بە رامان و گوفتار و کردار،
دژی چەواشەکاران بجەنگێت و
نەخشەکانیان تێک بشکێنێت،
یا خۆیان و لەیەنگرانیان،
بۆ ڕێگای ڕاست ئامۆژگاری بکات و

بۆیانی ڕوون بکاتەوە،
بە ڕاستی ئەو مرۆڤە،
بە باوەڕ و بە دڵ و گیان،
خواستی خواوەندی بەجێ هێناوە.
گاتا، هاتی 33، سروودی 2

ئەی ئەهۆرا..!
کەسێک کە لەتەک ڕاستڕەوان،
چ خێش بێت و چ هاوکار و چ یاوەر،
باشترین ڕەفتاری هەبێت و
هەر کەسێک کە بە کۆششی
خۆی جیهان ئاوەدان بکاتەوە،
بە ڕاستی ئەو کەسە،
لە سەرای ڕاستی و رامانی پاک بەهرەدار دەبێت.
گاتا، هاتی 33، سروودی 3

ئەی مەزدا..!
دەتپەرستم و لە بەرت دەپاڕێمەوە:
کە نافەرمانیکردن و بیری خراپە لە ناو بچێت،
لە خێشان، دڵپیسی و خیرەسەریکردن،
لە هاوکاران، درۆ و دوژمنی خزمان،
لە یاوەران، جنێودان و ناسزاگوتن،
لە گشت جیهانیشدا،
ڕابەری خراپ و درۆزن لە ناو بچێت.

گاتا، هاتی 33، سروودی 4

کە وابێت،
بۆ ئەوەی بە نجامی کۆتایی بگەم،
بۆ ئەوەی تەمەنم درێژ بێت و
لە کۆشک و سەرای رامانی پاکدا بگرسێمەوە..
ئاوازی سرووشم پێ ببەخشە،
کە سەرتۆپی هەموو ئاوازەکانە،
هاریکارم بە و
ڕاستی و پاکی بکە بە پاڵپشتم..
تا بتوانم ڕێگای بەهدینی،
بەرەو بارەگای شکۆداری مەزدا ئەهۆرا بدوزمەوە.
گاتا، هاتی 33، سروودی 5

کە وایە من،
وەک سرووودبێژێک کە متمانەی بە ڕاستییە،
بە باشترین هزرەکان و
بە ئەوینی تۆ،
بەو جۆرە لە تۆ دەخوازیت،
داواکاری ڕابەریی جڤاکم.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
خواستم ئەویە:
بتبینم و ببم بە هەڤاڵی تۆ.
گاتا، هاتی 33، سروودی 6

ئەی لە هەموو باشترین..!
ئەی مەزدا..!
بەرەو ڕووی من وەرە و
خۆتم بۆ ئاشکرا بکە،
تا لە بەر تریفەی ڕاستی و رامانی پاکدا،
گوتەکانم لە دەرەڤەی ئەنجومەنی مۆغان،
بە گوێی پەیڕەوانم بگەیەنم.
ئینجا بەرپرسیاریی و ستایشتی پێویست،
کە شیاوی تۆیە،
بۆ ئێمە ڕوون و ئاشکرا ببێت.
گاتا، هاتی 33، سروودی 7

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئارمانج و ئەرکەکانم پێ بناسێنە،
تا لە بەر پرشنگی رامانی پاکدا،
ئەنجامیان بدەم.
ئەی مەزدا..!
هەڵبەستی ستایشتم
کە لە دڵێکی ڕاستەوە سەرچاوە دەگرێت، بپەژرێنە،
خەڵاتی هەمیشەیی،
گەشەکردن و جاویدانبوونم
پێ ببەخشە.
گاتا، هاتی 33، سروودی 8

ئەی مەزدا..!
دوو گەوهەری پترکەری مەزنیی و ڕاستی:
گەشەکردن و جاویدانبوون،
کە لە تۆوەوەیە،
بە زانست و دڵێکی ڕووناک بە دەست دێت.
هیوادارین
لە بەر تریفەی باشترین هزرەکاندا،
لە بەخششی ئاسمانیی
ئەم دوو مینووی هاوکردار و یەکسانە،
کامەران ببین.
گاتا، هاتی 33، سروودی 9

ئەی مەزدا..!
هەموو چاکی و خۆشیەکانی ژیان،
کە هەبوون و هەن و دەشبن،
هەروەها هەموو ئەوانە کە لە تۆدایە،
بە مێهرەبانی خۆت بە ئێمەی ببەخشە،
تا لە بەر تریفەی رامانی پاک و
توانامەندی مینوویی و ڕاستیدا،
تەندروستی و بەختیاریی ئێمە پترتر بێت.
گاتا، هاتی 33، سروودی 10

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!

ئەی بەتواناتر لە هەمووان..!
ئەی پاکی..!
ئەی ڕاستیی گەردوونگێڕ..!
ئەی رامانی پاک..!
ئەی توانای مینوویی..!
گوێم لێ بگرێ،
ئەو دەمەی کە پاداشتی هەر کەسێک دەدەی،
بۆ منیش بەخششت هەبێت.
گاتا، هاتی 33، سروودی 11

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
خۆتم بۆ ئاشکرا بکە.
بە هێزی پاکی
ڕەوانم توانامەند بکە،
بە مینووی پاک و پترکەری خۆت
وەڵامی نیایشتەکانم بدەرەوە.
بە یارمەتیی ڕاستی،
لە هێز و توانای فراوان
بەهرەمەندم بکە.
بە رامانی پاک
گەورەییم پێ ببەخشە.
گاتا، هاتی 33، سروودی 12

ئەی ئەهۆرا مەزدای فرە بینا..!

**بۆ بەهرەداربوون لە خۆشبەختی و شادمانی،**
**بەخششی بێهاوتات**
**کە لە شکۆداریی تۆ و رامانی پاکەوەیە،**
**بۆ منی ئاشکرا بکە.**
**ئەی پاکی..!**
**لە بەر تریفەی ڕاستیدا،**
**ویژدان و ڕووناکیی دڵ**
**بە من ببەخشە.**
**گاتا، هاتی 33، سروودی 13**

**زەردەشت ئامادەیە**
**لەش و گیانی و**
**هەڵبژاردەی سرووده پیرۆزەکانی،**
**کە هەڵقوڵیو لە رامانی پاکیەتی**
**پێشکەشی مەزدا بکات.**
**هەروەها کردار و وتار و وریایی و**
**هەموو توانای مینوویی خۆی،**
**پێشکەشی راستی بکات.**
**گاتا، هاتی 33، سروودی 14**

# هاتی 34



ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کردار و گوفتار و نیایشتانە،
کە بە مرۆڤ
جاویدانی و ڕاستی و
هێزی گەشەکردن دەبەخشێنێت،
پێشەکی هەموویان
بە تۆ پێشکەش دەکەین.
گاتا، هاتی 34، سروودی 1

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
مرۆڤی پاک و خۆپارێزی بیرچاک،
کە ڕەوانی لەتەک ڕاستیدا ئاوێتەیە،
هەموو رامان و کرداری خۆی
بە تۆ پێشکەش دەکات،
هیوادارم بتوانم،

بەو سروودە پیرۆزانە
دەیهۆنمەوە
هەروەها بە نیایشتەکانم،
لێت نزیک ببمەوە.
گاتا، هاتی 34، سروودی 2

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو شتەی کە شیاوی تۆ و لە ڕێگای ڕاستیدایە،
بە ڕێزەوە بۆ تۆ
بە جێی دەهێنین و
پێشکەشی تۆی دەکەین،
ئارەزوومەندم کە هەموو کۆمەڵان،
لە بەر تریفەی رامانی پاک و شکۆداری تۆدا،
بە پێگەیشتن بگەن.
ئەی مەزدا..!
بە دڵنیایی مرۆڤی دانا
هەمیشە لە وزەی مینوویی تۆ خەنی دەبێت.
گاتا، هاتی 34، سروودی 3

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئێمە لە بەر تیشکی ڕاستیدا،
پرووسکەێ پرشنگدار و پڕتوانای تۆ دەخوازین.
ئەو تریفە جاویدان و بەتوانایە،
کە ئاشکرا پاڵپشتی پەیڕەوانی ڕاستییە و

مەبەستی پیس و ئازار و دوژمنی نەیاران
ئاشکرا دەکات.
گاتا، هاتی 34، سروودی 4

ئەی مەزدا..!
چەندە بە شکۆیە فەرمانڕەوایی و توانامەندیی تۆ.
چەندە ئاواتەخوازم
کە لە ڕێگای تۆدا خەبات بکەم و
بە تۆ پەیوەند ببم،
بە هێزی ڕاستی و رامانی پاک،
یار و هاریکاری ئەویندارانی تۆ بم.
تۆ لە گشت کەس مەزنتر و بانتر دەناسم،
هەروەها بێزاریی خۆم لە خودایانی درۆیی و
مەردمی گومڕێ دەردەبڕم.
گاتا، هاتی 34، سروودی 5

ئەی مەزدا..!
ئەی ڕاستی..!
ئەی رامانی پاک..!
لە ڕاستیدا من تێگەیشتم
کە ئێوە بانتر و بە تواناتر لە هەمووانن.
ئارەزوومەندم لە سەرتاسەری گۆڕانکارییەکانی ژیان،
ڕێنوێنیم بکەن.
تا بە ستایشت و نیایشتی دڵ،

بەرەو ڕووتان بگەڕێمەوە.
گاتا، هاتی 34، سروودی 6

ئەی مەزدا..!
لە کوێن ئەو دڵدارانەی تۆ،
کە لە بەر تریفەی رامانی پاک
ئاگادار لە ڕاهێنانە پڕبەهاکانی تۆ
ڕوویان لێت هەڵنەگەڕێنەوە و
لە چاخی خۆشی و سەختی
بە هۆشمەندی بە کار بێنن و
بۆ پەرەپێدانی پەیکی پیرۆزی تۆ بکۆشن؟
بێجگە لە تۆ کەسێکی تر ناناسم،
کە وایە، لە بەر تریفەی ڕاستیدا
پشت و پەناهم بە.
گاتا، هاتی 34، سروودی 7

ئەی مەزدا..!
بەڕاستی، چەواشەکاران بە کرداریان
ئێمەیان هەراسان کردووە،
ئەمانە بۆ جڤاک،
بێجگە لە تێکدان و وێرانکردن
شتێکی دیکەیان نییە.
سامانداراانیان بە سەر هەژاراندا ستەم دەکەن و
لەتەک ئایینی تۆدا نەیاری دەکەن،

هیچ کاتێک بیر لە ڕاستی ناکەنەوە،
لە رامانی پاک
ڕادەکەن و ڕوویان هەڵدەماڵن.
گاتا، هاتی 34، سروودی 8

ئەی مەزدا..!
ئەو کەسانەی کە
بە کرداری ناپەسەند و بە نائاگایی لە رامانی پاک،
ئەڤین و پاکی جوانمەردی،
کە لای زانایانی تۆ بێ ئەندازە پلەمەندە،
لە دەست دەدەن.
هەر بەو جۆرەی کە وێرانکاران
پشت لە ئێمە دەکەن،
لە ڕاستیش دوور دەکەونەوە.
گاتا، هاتی 34، سروودی 9

مرۆڤی ژیر دەبێژێت:
لە سەر بنەمای هزری پاک
خەبات بکەن،
جوانمەردی کە بنیاتی ڕاستییە
بیپارێزن،
دڵنیاش بن کە هەمووی ئەمانە،
لە بەر تریفەی پڕتیشک و شکۆداری
مەزدا ئەهۆرا پەیدا دەبێت.

گاتا، هاتی 34، سروودی 10

ئەی مەزدا..!
دوو خەڵاتی پێگەیشتن و جاویدانبوونی تۆ،
مرۆڤ بەرەو ڕووناکی ڕێنوێنی دەکات.
هەروەهاش رامانی پاک و ڕاستی و جوانمەردی،
بەرخۆدان و توانامەندیی مینوویی پترتر دەکەن.
هەمووی ئەمانەیە،
سەرکەوتن بە سەر نەیاراندا،
مسۆگەر دەکات.

گاتا، هاتی 34، سروودی 11

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئایین و خواستی تۆ چییە؟
ستایشت و پەرستشی شایانی تۆ کامەیە؟
ببێژە و بۆمانی ئاشکرا بکە،
تا لە پاداشتی دەستوورەکانی تۆ تێ بگەین و
لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
ڕێگای خۆناسی و ڕەوشت پاکی بناسێن.

گاتا، هاتی 34، سروودی 12

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەم ڕێگایە کە بۆ منت دیاری کردووە،
ڕێگای رامانی پاک و دەستوور و راهێنانی سوشیانسەکانە،

ڕێگاکەش بەم چەشنەیە:
تەنها کرداری پاکە
لە بەر تریفەی ڕاستیدا
ئەنجامی شادمانی و گەیشتن بە تۆ دەگەیەنێت،
ئەو پاداشتەی کە بە زانایان دەیبەخشیت.
گاتا، هاتی 34، سروودی 13

ئەی ئەهۆرا..!
بێگومان لەش و گیانی کەسێک
لەو پاداشتی مزگێنیدراوە بەهرەمەند دەبێت،
کە بە رامانی پاک خەبات دەکات و
بۆ ئاوەدانی و پێشکەوتنی جیهان تێ بکۆشێت،
لە بەڕ تیشکی ڕاستیدا
ئایینی هزری پیرۆزی تۆ پێش بخات و
خواستی تۆش بە جێ بهێنێت.
گاتا، هاتی 34، سروودی 14

ئەی مەزدا..!
لە باشترین زانست و کردارەکان
ئاگادارم بکە،
تا بە بیری چاک و بە پاکی و ڕاستی،
ستایشتت بکەم.
ئەی ئەهۆرا..!
بە خواست و شکۆداریی خۆت،

**لە ژیانێکی نێو و سەرپڕ لە ڕاستی،**
**کامەرانم بکە.**
**گاتا، هاتی 34، سرووودی 15**

# هاتی 43



مەزدا ئەهۆرای بە توانا
بەم چەشنە دایناوە:
خۆشبەختی بە ئەو کەسەیە
کە بەختیاری بە کەسێکی دی ببەخشێت.
من بۆ پێشکەوتن و ڕاگرتنی ئایینی ڕاستی،
داوای پایەبەرزی و توانامەندی
تەن و ڕەوانم دەکەم.
ئەی وزەی خۆبەختکاری..!
لە ئەو تریفەیە
کە پاداشتی ژیانی ڕەوشت پاکانە،
بەهرەدارم بکە.
گاتا، هاتی 43، سروودی 1

باشترین پاداشت بۆ مرۆڤێکە،
کە پەیجۆری ڕووناکییە و

ڕۆشنایش بە کۆمەڵ دەبەخشێت.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
بە خێرەتی پیرۆز و ئاگای خۆت،
لە بەر تریفەی تیشکی ڕاستییدا،
ئەو زانستەم پێ ببەخشە
کە لە رامانی پاک وەشابێتەوە،
تا لە تەمەنێکی درێژ و
پڕ لە خۆشی و شادکامی بەهرەمەند ببم.
گاتا، هاتی 43، سروودی 2

بە دروستی باشترین بەهرەکان
دەبێتە بەشی مرۆڤێک
کە لە ژیانی ئەنبووژەنی و مینوویی،
ڕێگای ڕاستی بەختیاریمان
پێ فێر بکات،
ئەو ڕێگایە کە ئێمە بەرەو بارەگای ئەهۆرایی دەگەیەنێت.
ئەی مەزدا..!
لە ئاکامدا
لە بەر تیشکی زانستی باش و پاکی و جوانمەردیدا،
دڵدارانت بە تۆ پەیوەند دەبن.
گاتا، هاتی 43، سروودی 3

ئەی مەزدا..!
ئەو کاتە تۆم بە پاکی و بە توانامەندی ناسی،

کە زانیم تۆ بە هێزی خۆت
خواستی ئێمە بە جێ دەهێنی،
سزا و پاداشتی
چەواشەکار و ڕندکاران دەدەیتەوە.
ئاواتەخوازم بەوتیشکە کە لە ڕاستی وزە دەگرێت
گەرما ببەخشیتە دڵەکانمان و
لە هەبوونی رامانی پاک
بێ بەهرەمان نەکەیت.
گاتا، هاتی 43، سروودی 4

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کاتە تۆم بە ڕندی ناسی،
کە تۆم لە سەرەتای ژیاندا بینی،
زانیم کە بۆ گوفتار و کردار
پاداشتت دیاری کردووە.
چاکە بۆ چاکەکاران و
سزاش بۆ خراپەکاران.
ئەم دەستوورە
لە بەر پرشنگی زانست و هونەری تۆ،
تا ئەنجامی ئافراندن و کۆتایی ژیان
دەمێنێتەوە.
گاتا، هاتی 43، سروودی 5

ئەی مەزدا..!

ئەو دەمەی کە خێرەتی پاکی تۆ،
بێتە خوارەوە،
هێزی مینوویی و رامانی پاک،
بە کاردانەوەیان،
جیهان بەرەو ڕاستی و پێشکەوتن دەبەن.
پاکی، دڵی مێرخاسان ڕووناک و
بەرەو ڕاستی ڕێنوێنییان دەکات.
کەس توانای خاپاندنی تۆی نییە.
گاتا، هاتی 43، سروودی 6

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کاتە تۆم بە پاکی ناسی
کە رامانی پاک رووی کردە من و پرسیی:
تۆ کێیت و
لە چ خانەدانێکی؟
لە هەمبەر پرسیار و دوو دڵییەکانی ڕۆژانە،
لەمەڕ جیهان و خۆت،
چ ڕێگایەک هەڵدەبژێریت و
چ ڕێگایەک دەناسیت؟
گاتا، هاتی 43، سروودی 7

منیش بەم چەشنە بەرسیڤم دایەوە:
من زەردەشتم،
تا ئەو جێگایەی کە لە توانامدایە،

دوژمنی سەرسەختی درۆزان و
پەنای بە هێزی ڕاستگۆیانم،
ئەی مەزدا..!
داواکارم، تا ئەو کاتە ستایشتگەر و درووددبێژی تۆم،
هەمیشە لە وزەی بێکەرانی تۆ،
بەهرەمەند بم.
گاتا، هاتی 43، سرووودی 8

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کاتەی تۆم بە پاکی و پیرۆزی ناسی کە،
رامانی پاک رووی کردە من و پرسیی:
نوێژ بۆ کێ دەکەیت؟
وەرامم دایەوە:
بۆ تیشکی پیرۆز و ڕەخشەندەی مینووی مەزدا نوێژ دەکەم و
هەتا بڕست و توانام هەبێت
پشت بە ئایینی ڕاستی دەبستم.
گاتا، هاتی 43، سرووودی 9

ئەی مەزدا..!
کەوایە بەرەو ڕاستیی دڵخوازم
ڕێنوێنیم بکە،
تا بە پەیڕەوکردنی،
پاکی ببینمەوە.
پرسیار و ئازموونی خۆتم ئاراستە بکە،

**کە پرسیار و تاقی کردنەوەی تۆیە،**
**هێز و دلێری**
**بە ڕابەران دەبەخشێت.**
**گاتا، هاتی 43، سروودی 10**

**ئەی مەزدا..!**
**ئەو دەمە تۆم بە پاکی ناسی کە،**
**رامانی پاک ڕووی تێ کردم و**
**منیش لە گوتاری تۆوە فێر بووم و زانیم کە،**
**هەرچەندە پەرەپێدانی ئایینی تۆ،**
**لە ناو مەردۆم دژوارە،**
**بەڵام من ئەو شتە بە ئەنجام دەگەیەنم،**
**کە بە لای تۆوە باشترینە.**
**گاتا، هاتی 43، سروودی 11**

**دوای ئەوە کە بە منت فەرموو،**
**بەرەو ڕاستی بڕۆم**
**تا زانا بم،**
**هەروەها تێ بکۆشم**
**سرووش لە دڵم دەنگ بداتەوە،**
**تا لە بەر تیشکی ڕۆشنایی ئەودا تێ بگەم**
**کە هەر دوو دەستەی چاکەکار و خراپەکار،**
**پاداش و سزای پێویست دەدرێن.**
**گاتا، هاتی 43، سروودی 12**

ئەی مەزدا..!
ئەو کاتە تۆم بە جوانی ناسی
کە رامانی پاک بەرەو ڕووی من هات و
منیش پێم گوت:
بۆ گەیشتن بە ئامانجم،
ئارەزووی ژیانێکی پڕتەمەن دەخوازم،
ئەو ژیانە دڵخوازە کە،
تەنها تۆ دەیبەخشی و
لە توانا و دەستەڵاتی تۆدایە.
گاتا، هاتی 43، سروددی 13

ئەی مەزدا..!
بە هەمان چەشن کە مرۆڤی جوامێر و ئازا،
بە هاوڕێی خۆی شادمانی دەبەخشێت،
تۆش بە شکۆداریی خۆت و
لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
بە لایەنگیرانم شادومانی
خەڵات بکە.
من و هەموو ئەو کەسانەی
کە هۆنەری هۆرەی رامانجۆشێنەری تۆین،
ڕادەپەڕین و پاڵپشتی ڕاهێنانەکانی تۆ دەبین.
گاتا، هاتی 43، سروودی 14

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کاتە تۆم بە زەریفی ناسی،
کە رامانی پاک بەرەو ڕووی من هات و
منی فێر کرد کە،
باشترین ڕێگای گەشەکردنی مینوویی،
بیرکردنەوە لە ناو هێمنیدایە و
ڕابەر هەرگیز نابێت هەوڵی کەیفخۆشیی چەواشەکاران بدات،
چونکە هەمیشە ئەوان لە دژی ڕاستگۆیانن.
گاتا، هاتی 43، سروودی 15

ئەی مەزدا..!
کە وایە زەردەشت
پاکترین رامان بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت.
بەو هیوایەی
کە لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
ژیانی ئەنبووژەنیمان بە هێز بێت،
خۆبەختکاری و توانایی مینوویش
دڵی ئێمە ڕووناک بکات و
رامانی پاک،
بە کارەکانمان پاداشتی چاکە بدات.
گاتا، هاتی 43، سروودی 16

# هاتی 44



ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
چلۆن سەوداسەرانی تۆ،
بە خاکساری بتناسن؟
ئەی مەزدا..!
کەی ئەم ڕێگایە
بە هاوڕێیەکی وەک من
فێر دەکەی؟
کەی لە بەر تریفەی ڕاستی دڵخواز،
یارمەتیدەری من دەبێت،
تا رامانی پاک بەرەو ڕووی ئێمە بێت؟
گاتا، هاتی44، سروودی 1

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
سەرەتا و سەرچاوەی باشترین ژیان چییە؟
کەسێک کە
کۆششیان بۆ بکات،
چ پاداشتێک وەردەگرێت؟
ئەی مەزدا..!
ئەو کەسەی کە هەڵبژاردەی هەمووانە،
چلۆن لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
بە پاکی
هاوڕێ و چارەسەرکەری ژیان و
پارێزەری هەموو کارەکانی مینوویی دەبێت؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 2

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
کێیە لە سەرەتادا،
بەدیهێنەر و سەرچاوەی ڕاستی؟
کێ ڕێگای ڕاستی خۆر و ئەستێرەکانی
دیاری کردووە؟
کێیە ئەوەی،
کە جارێک مانگ پڕ و گەشاوە دەکات و

جارێکیش کز و نادیار؟
ئەی مەزدا..!
من داواکاری زانینی ئەمانە و گەلێ شتی دیکەم.
گاتا، هاتی 44، سروودی 3

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
کێیە ئەوەی زەویی لە ژێرەوە و
ئاسمانی بێ هەورازی لە سەرەوە ڕاگرتووە؟
کێیە ئەوە،
ئاو و گیا و ڕووەکی ئافراندووە؟
کێ وزەی تێپەڕین و توندڕۆیشتنی
بە با و هەوری ڕەش داوە؟
ئەی مەزدا..!
کێ بەدیهێنەری رامانی پاکە؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 4

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە درووستی بە من بێژە،
کێیە وەستای بەدیهێنەری
ڕووناکی و تاریکی؟
کێژان وەستا،

خەو و بێداریی دروست کرد؟
کێیە ئەوەی،
سپێدەی بەیان و نیوەڕۆ و شەوی دیاری کرد
تا مرۆڤی ژیر،
ئاگای لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی بێت؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 5

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
ئایا ئەو شتەی
کە دەبێژم و فێری دەبم،
بە گشتی هەمووی ڕاستە؟
مەگەر پاکی بە کاردانەوەی خۆی،
ڕاستی پتر ناکات و
لە بەر تیشکی رامانی پاکیشدا،
شکۆداری تۆ بەدی دێت؟
ئەی مەزدا..!
ئەم جیهانە پڕ پیت و فەڕ و شادە
بۆ کێ پێک هێنراوە؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 6

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،

بە دروستی بە من بێژە،
چ کەسێک،
توانامەندی مینوویی لەتەک جوانمەردی ئافراندووە؟
کێیە بە فەرزانەیی خۆی
ڕێزی باوکی خستە دڵی کوڕەوە؟
ئەی مەزدا..!
کۆششم ئەوەیە،
بە رامانی پاک و ئەم پرسیارانە،
تۆ کە بەدیهێنەری هەموو بوونیت، بناسم.
گاتا، هاتی 44، سروودی 7

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
من کە لە ڕاهێنانەکانی تۆ بیر دەکەمەوە و
بە رامانی پاک پرسیار دەکەم،
چلۆن لە بەر رتیشکی ڕاستیدا،
لە گەشەکردنی ژیان
بەهرەمەند ببم؟
ئەی مەزدا..!
چلۆن لە ئاسایش و شادمانیی ڕەوان
بەهرەدار و سەرفەراز ببم؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 8

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
چلۆن ویژدانی خۆم پاک بکەمەوە و پێشکەشی تۆی بکەم؟
هێڤیدارم بە فەرمانبەریی لە تۆ و
بە دانشێک کە
لە بەر پرشنگی شکۆمەندی تۆ فێر دەبم و
بە هێزی مینوویی و بە ڕاستی و ڕامانی پاک،
بەرەو بارەگای تۆ ڕێگا بدۆزمەوە.
گاتا، هاتی 44، سروودی 9

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
چییە ئەو ئایینەی تۆ،
کە بۆ مرۆڤ باشترینە و
هاوڕێ لەتەک ڕاستیدا،
مرۆڤ بەرەو پێش دەبات و
لە بەر تریفەی خۆباختکاریدا،
کارەکان بەرەو ڕاستی ڕێنوێنی دەکات؟
ئەی مەزدا..!
من بە خواست و زانستی خۆم،
بەرەو ئایینی تۆ ڕوو دەکەم.
گاتا، هاتی 44، سروودی 10

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
ئەو کەسانەی کە ئایینی تۆ فێر بوون،
لە بەهرەی پاکی خۆبەختکاری،
بەهرەمەند دەبن؟
ئەی مەزدا..!
بۆ ئەم کارە من یەکەم کەسم
کە لە لایەن تۆوە هەڵبژێردراوم و
لایەنگرانی ئایینی تۆم خۆش دەوێت و
هەموو ئەو کەسانەی کە پەیڕەوی درۆزنانن،
بە چەواشەکار دەیانناسم.
گاتا، هاتی 44، سرووودی 11

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
لە ناو ئەو کەسانەی کە من دەیاندوێنم،
چ کەسێک ڕاستکردار و
چ کەسێک چەواشەکارە؟
ڕوو لە چ کەسێک بکەم؟
ئەوەی خراپەی بینیوە،
یا ئەوەی کە بەرەو خراپە چووە؟

چلۆن ئەو چەواشەکارە،
بە خراپ نەژمێرم کە
لە هەمبەر بەخششەکانی تۆ،
لەتەک مندا بەربەرەکانێ دەکات؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 12

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
چلۆن خۆمان لە درۆ دوور ڕابگرین؟
چلۆن پارێز بکەین
لەو کەسانەی کە سەرکێشن و
تێ ناکۆشن لەتەک ڕاستی پەیوەست بن و
ڕێڕەوی ڕێگا ڕاست ناکەن و
پەیجۆری رامانی پاک نین؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 13

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
چلۆن درۆ بسپێرینە دەستی ڕاستی؟
تا بە فێرکردنی پەیامی پیرۆز و رامانبزوێنەری تۆ،
پاک ببێتەوە و
بەم چەشنە،

شکستێکی گران بە چەواشەکاران بگات و
فریو و ئازاری ئەوان لە ناو بچێت؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 14

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
هەروەک چۆن تۆ بەتوانایت و
لە بەر تیشکی ڕاستیدا پەنای ڕاستانی،
کاتێک کە دوو لایەنی نەیار بە یەک دەگەن و
بە پێی ئەو ئایینەی کە تۆ داتمەزراندووە،
بە چ لایەنێک و لە کوێ
سەرکەوتن دەبەخشێت؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 15

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
کێیە ئەو داوەرەی،
کە لە بەر پرشنگی ڕاهێنانەکانی تۆدا،
بە سەرکەوتن دەگات و
دەبێتە هانای مەردم؟
ئەی مەزدا..!
ئەو ڕابەرە زانا و چارەسازەی ژیانە

به من نیشان بده و
سرووش و رامانی پاک،
به ئەو یا هەر کەسی دی
که ویستی تۆیه، خەڵات بکه.
گاتا، هاتی 44، سروددی 16

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمه له تۆ دەپرسم،
به دروستی به من بێژه،
چلۆن به ڕێنوێییەکانی تۆ،
هەست به خۆشی و شادیی دلۆڤانیت بکەم و
به تۆوه پەیوەند بم؟
ئەی مەزدا..!
چلۆن گوتەکانم بگاته ناو دڵان و
بەو پەیامەی که له ڕاستییەوه سەرچاوه دەگرێت،
گەلان بەرەو گەشەکردن و جاویدانی ڕێنوێنی بکەم؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 17

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمه له تۆ دەپرسم،
به دروستی به من بێژه،
چلۆن له بەر تیشکی تریفەی ڕاستیدا،
ده هێزی دەر و ناوەوەی من،
بەدیهێنەر و توانامەند و داگرساو دەبن؟

ئەی مەزدا..!
چلۆن بکەم تا بەمانە (دە هێز)
بە گەشەکردن و جاویدان بوون بگەم و
منیش ئەم دووانە پێشکەشی کۆمەڵان بکەم؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 18
(مەبەست لە دە هێزی دەرەوەوە و ناوەوەی مرۆڤ ئەمانەن: بیستن، بینین، چێژتن، بۆنکردن، هەستکردن، توانامەندبوون، داهێنان، خێرابوون، تێگەیشتن، دووربینبوون یان پێشبینی کردن)

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
بە دروستی بە من بێژە،
ئەو کاتەی داماوێکی ڕاستگۆ،
دەچێتە لای کەسێکی زەنگین و
ئەو زەنگینە یارمەتی پێویستی پێ نادات،
سزای ئێستای ئەو مرۆڤە چییە؟
من باش ئاگاداری ئەو سزایەم،
کە پێی دەگات.
گاتا، هاتی 44، سروودی 19

ئەی ئەهۆرا..!
ئەمە لە تۆ دەپرسم،
چلۆن ستایشتکارانی دێوان (دێڤیەسنایان)،

دەتوانن دەستەڵاتدارانێکی باش بن؟
ئەمانە کە
بە یارمەتی کەرپانەکان و کاوییەکان،
جیهانیان بەرەو ناخۆشی و نەفرەت کێشاوە و
گەلانیان بە ئاهونالّە دەرهێناوە،
گەلۆ ئەمانە دەتوانن
لە سەر پایەی ڕاستی و دروستی،
بۆ پێشکەوتن و ئاوەدانی و
ئاشتی و ئاسایشتی گشتی تێ بکۆشن؟
گاتا، هاتی 44، سروودی 20

# هاتی 45



ئێستا دەدوێم،
گوێ بگرن و ببیستن،
ئەی ئەو کەسانەی کە داواکاری بیستنن..!
ئەی ئەو کەسانەی کە لە دوور و نزیکەوە هاتوون..!
هەمووی ئەم گوتانە بە چاکی بە یاد بسپێرن،
نەکا ئامۆژگاری خراپ،
جارێکی دی،
ژیانی ئێوە لە ناو ببات و
چەواشەکار بە گوتە و بڕوا نادروستەکانی،
ئێوە بەرەو چەواشەیی ببات.
گاتا، هاتی 45، سروودی 1

ئێستا لەمەڕ ئەو دوو مینووەوە دەدوێم،
کە هەر لە سەرەتای ئافراندنەوە هەبوون،
لە دوو مینوویە،

مینووی پاک بە ئەوی دیکەی گوت:
لە ئێمە دووانە،
نە ڕامان و نە ڕاهێنان،
نە خێرەت و نە باوەڕ،
نە گوفتار و نە کردار،
نە ویژدان و نە ڕەوانمان،
لەتەک یەکتردا سازگار و هاوڕێن.
گاتا، هاتی 45، سروودی 2

ئێستا لەمەڕ بنەمای ئایینی ژیان دەدوێم،
ئەو شتەی کە مەزدا ئەهۆرای دانا،
بە منی گوتووە:
ئەو کەسانەی کە
ئەم گوتار و پەیامە پیرۆزانە،
بەو جۆرەی من فێری بووم،
بە کاری نەهێنن و پەیڕەوی نەکەن،
کۆتایی ژیانیان،
لەتەک پەشیمانی و ئەفسۆس دەبێت.
گاتا، هاتی 45، سروودی 3

ئێستا لەمەڕ ئەو شتەی کە لە ژیاندا باشترینە دەپەیڤم،
ئەمەش لە بەر تریفەی ڕاستییدا تێگەیشتم:
مەزدا بەدیهێنەری ڕاستییە،
مەزدا سەرچاوەی ڕامانی پاکە،

رامانی پاکیش بۆ تێکۆشانە.
مەزدا پەروەردەگاری خۆبەختکارییە،
خۆبەختکاریش سەرچاوەی کرداری چاکە.
مەزدا لە هەموو شتێک بینایە و
ناتوانرێت بخاپێنرێت.
گاتا، هاتی 45، سروودی 4

ئێستا لەمەڕ ئەو شتانە دەدوێم،
کە مەزدا ئەهۆرای پاک بە منی گوتووە،
ئەو گوتانەی کە بۆ هەموو کەسێک بیستن و بە کارهێنانی باشترینە:
ئەو کەسانەی کە ڕاهێنانەکانی من لە دڵەوە ببیستن و
ڕێزی بۆ دابنێن و بۆ کاری بهێنین،
بە گەشەکردن و جاویدانبوون دەگەن،
هەروەها بەو کردارانەی کە لە رامانی پاک سەرچاوە دەگرێت،
لە پرشنگی ڕووناکبەخشی ئەهۆرا،
بەهرەمەند دەبن.
گاتا، هاتی 45، سروودی 5

ئێستا لەمەڕ ئەوە دەدوێم،
کە لە هەمووان مەزنتر و بانترە و
بە ڕاستییەوە ستایشتی دەکەم،
ئەو سەروەری زانا و
هەموو جاویدانە پاکەکانی.

**هیوادارین کە مەزدا ئەهۆرا،**
**بە خێرەتی پاکی خۆی ستایشتی ئێمە ببیستێت.**
**تا بە مێهر و خۆشەویستیەوە**
**لە بەر تیشکی رامانی پاک**
**بە ئەو پەیوەند ببین.**
**ئومیدوارین بە خێرەتی خۆی،**
**ئەو شتەمان فێر بکات، کە باشترینە.**
**گاتا، هاتی 45، سرووودی 6**

**ئەو کەسێکە کە هەمووان**
**ڕزگاریی خۆیان لەو دەخوازن،**
**چ ئەوانەی کە پێشتر بوون،**
**چ ئەوانەی کە هەن و**
**چ ئەوانەش کە دەبن.**
**ئەمەش بزانن کە ڕەوانی پاکان**
**هەمیشە سەرفەراز و کامەران دەبن و**
**چەواشەکاریش هەمیشە بە دەرد و ڕەنجەوە سەر دەنێتەوە.**
**ئەمەش یاسایەکە،**
**مەزدا ئەهۆرا بە شکۆداریی خۆی دایمەزراندووە.**
**گاتا، هاتی 45، سرووودی7**

**بە ستایش و نیایشتەکانم**
**ڕوو لە مەزدا ئەهۆرا دەکەم و**
**بە وێنام دەیبینم،**

به رامان و گوفتار و کرداری پاک و
له بەر پرشنگی ڕاستیدا،
ئەو به پەروەردەگاری دانای مەزنی دەناسم،
بۆیه نزاکانم به ئەو و
به بارەگای سروودی ئەو،
پێشکەش دەکەم.
گاتا، هاتی 45، سروودی 8

به رامانی پاک
مەزدا ئەهۆرا دڵخۆش دەکەین.
ئەو به خواستی خۆی،
شادی و کاری بۆ ئێمه ئافراندووه.
هێڤیدارین مەزدا ئەهۆرا،
به توانامەندیی خۆی،
هێزی کارکردن به ئێمه ببەخشێت،
تا له بەر تیشکی رامانی پاک و
ڕاستی و زانستی دروست،
له ڕێگای ڕاست و پێشکەوتنی مرۆڤدا تێ بکۆشین.
گاتا، هاتی 45، سروودی 9

به ڕێز و پاکی ستایشتی ئەو دەکەین و
بەرز دەیبینین.
ئەوه که هەمیشه به
هەستیبەخشێنەری دانای مەزن نێو دەبرێت،

**لە بەر پرشنگی ڕاستی و ڕامانی پاکدا**
**بە توانامەندی و شکۆداری خۆی،**
**مژدەی گەشەکردن و نەمربوونی بە مرۆڤ داوە،**
**هەروەهاش تەندروستی لەش و**
**پایەداریی ڕەوانیان پێ دەبەخشێت.**
**گاتا، هاتی 45، سروودی 10**

**ئەو کەسانەی کە،**
**دوژمنی لەتەک دێڤپەرستان و لایەنگرانیان دەکەن و**
**ڕێگاشیان جودایە لەوانەی،**
**کە بە سووکی دەڕواننە مەزدا ئەهۆرا و**
**خۆیان بە جوانی بیر لە مەزدا ئەهۆرا دەکەنەوە و**
**سوشیانسەکانی زانا و یاوەرانی ئایینی**
**بە دروستی دەناسن،**
**مەزدا ئەهۆرا،**
**بە چاوی هاوڕێی خۆی و**
**بۆیان وەکوو برا و باوک دەبێت.**
**گاتا، هاتی 45، سروودی 11**

# هاتی 46



ڕوو بکەمە کامە ئاخ؟
بۆ کوێ بڕۆم؟
لە کەس و خێش و هەڤاڵانم دوورم دەخەنەوە،
هیچ دڵخۆشییەکم لە هاوکارانیش نییە،
میرانی وڵاتیش لایەنگیریی درۆ دەکەن.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
چلۆن دەتوانم خۆشنوتت بکەم؟
گاتا، هاتی 46، سروودی 1

ئەی ئەهۆرا..!
دەزانم بۆچی لاوازم،
دەنگی من کز و کەسانیشم کەم.
هانا بۆ تۆ دێنم،
بە چاکی لێم بڕوانە،
داخوازی ئەو ئەڤینە دەکەم،

که دڵدار به خۆشەویستەکەی دەبەخشێت.
ئەی مەزدا..!
له بەر تریفەی ڕاستیدا،
من له وزەی پڕتوانای رامانی پاک
زانا بکه.
گاتا، هاتی 46، سروودی 2

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
کەی سپیدەی ئەو ڕۆژە دەبینرێت،
که ڕاستی بۆ پاسەوانی جیهان بدرەوشێتەوە؟
کەی سوشیانسەکان،
به ڕاهێنانی پترکەری و زانایانەی خۆیان دێن؟
رامانی پاک
هاریکاری چ کەسێک دەکات؟
ئەی ئەهۆرا..!
تەنها من ڕاهێنان و ئایینی تۆ دەپەژرێنم.
گاتا، هاتی 46، سروودی 3

ئەو چەواشەکارەی که،
به کرداری دوژمنانه و زیانباری خۆی
به خراپەکاری ناوی زڕاوە،
لایەنگیرانی ڕاستی
له پێشکەوتنی ژیانی گەل،
له شار و وڵاتدا پاش دەخات.

ئەی مەزدا..!
ئەو کەسەی کە بە دڵ و گیان
بەرامبەر بە چەواشەکار بجەنگێت،
مرۆڤ و جیهانی ئافەرینشت،
بۆ ڕێگای زانست و ویژدانی پاک
پێش دەخات.
گاتا، هاتی 46، سروودی 4

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەگەر توانامەندێکی دانا،
کە بە ڕێگای ڕاست دەژی،
لە سەر بنچینەی ئایینی بەهدینی،
یان لە ڕێگای سۆزی مرۆڤایەتیەوە،
گومڕایەک کە داوای یارمەتی بکات،
بە گەرمیەوە بەرەو هانای بچێت،
دەتوانێت بە هۆشمەندی خۆی
ئەو لە چەواشەیی و زیانمەندی ڕزگار بکات و
بەرەو خۆناسیی بگەێنێت.
گاتا، هاتی 46، سروودی 5

بەڵام، ئەگەر ئەو توانامەندە
یارمەتی ئەو کەسە نەدات،
کە داوای ئاریکاری لێ کردبوو،
ئەوە خۆی دەکەوێتە داوی فریو گومڕاییەوە،

چونکە، لە سەر یاسای ئایینی مەزدا ئەهۆرا،
کە هەر لە سەرەتاوە دایمەزراندووە،
کەسێک کە سەرکەوتن بۆ گومڕێ بخوازێت،
خۆی گومڕێیە،
ئەو کەسەش کە بۆ ڕاستکرداران ڕێز دابنێت،
خۆی لە ڕاستکردارانە.
گاتا، هاتی 46، سروودی 6

ئەی مەزدا..!
ئەو کاتەی کە چەواشەکارئامادەی ئازاری منە،
بێجگە لە تریفەی تۆ و ئەندێشە بە تۆ،
چ کەسێک هانای من دەدات؟
ئەی ئەهۆرا..!
لەو دوو پرشنگی زانایی و ڕووناکییە،
کە ئایینی ڕاستی دەکەوێتە کار،
کە وایە سرشت و ویژدانی من
لەو ئایینە ئاگادار بکە.
گاتا، هاتی 46، سروودی 7

ئەی مەزدا..!
ئەو کەسەی کە
لە ئەندێشەی ڕماندنی جیهاندایە،
بێگومان بەو کردارە ناپەسەندانەی
زیانێک بە من ناگەیەنێت،

بەڵام ئەو کردارە دوژمنانەیەی،
بۆ خودی خۆی دەگەڕێتەوە و
لە ژیانێکی خۆش پاش دەخات و
ژیانی بەرەو خراپی دەچێت.
گاتا، هاتی 46، سروودی 8

کێیە، ئەو جوانمێرە بە شکۆیە
کە پێشتر من فێر بکات،
کە زیاتر لە هەمووان
تۆ شایستەی ستایشتی و
تۆ سەروەری ڕاستی و داوەری پاکی کردارەکانی؟
هەمیشە ئارەزوومەندین کە بە رامانی پاک،
لە ئایینی ڕاستی و
لە هەموو ئەو شتانە کە تۆ لە بارەیەوە گوتووتە،
ئاگادار بین.
گاتا، هاتی 46، سروودی 9

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
هەر کەس چ پیاو بێت چ ژن،
ئەو شتەی کە تۆ لە ژیاندا بە باش و پەسەند دەیژمێریت،
بە جێی بێنێت،
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
لە پاداشتی ڕاستی و بەهرەی مینوویی
کامەران دەبێت.

من ئەو کەسانە
بۆ ستایشتی ڕێگای تۆ ڕێنوێنی دەکەم و
لە تێپەڕگای داوەری دەیانپەڕێنمەوە.
گاتا، هاتی 46، سروودی 10

کاوییەکان و کەرپانەکان،
بە هێزی یەکگرتوویان و
بە کرداری ناشیرینیان،
ژیانی مەردم لە ناو دەبن.
بەڵام ڕەوان و ویژدانی ئەمانە،
لە کاتی گەیشتن بە تێپەڕگای داوەری،
لێیان دێتە خرۆش و
بۆ هەمیشە نوقمی سەرای درۆ دەبن.
گاتا، هاتی 46، سروودی 11

کاتێک کە
زارۆک و نەوەکانی فەریانەی تۆرانی
ڕوو بکەنە ڕاستی و
بە خۆبەختکاریی،
بۆ پێشکەوتن و ئاوەدانیی جیهان تێ بکۆشن،
پاشان مەزدا ئەهۆرا،
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
ئەوان بە یەکەوە پەیوەند دەدات و
ڕزگاری و خۆشبەختییان،

بۆ ئاشکرا دەکات.
گاتا، هاتی 46، سروودی 12

هەر کەس لە ئەنجامدانی خەباتی
زەردەشت ئەسپنتمان
یارمەتی و خۆشنوتی بکات،
ئەوە بە مرۆڤێکی دروستکار ناوبانگ دەردەکات و
مەزدا ئەهۆراش ژیانی جاویدانی دەبەخشێتە ئەو مرۆڤە و
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
گێتی ئەو پتر دەکات و
هەمووانیش بە دۆست و هەڤاڵی
ڕاستی دەیانناسن.
گاتا، هاتی 46، سروودی 13

ئەی زەردەشت..!
کێیە هاوڕێی ڕاستکرداری تۆ؟
کێیە ئەوەی بە ڕاست
بۆ پەرەپێدانی خۆشناوی و سەرفەرازیی ئەنجومەنی مۆغان
کۆشش دەکات؟
لە ڕاستیدا ئەو کەسە
تەنها کەیگوشتاسپی دلێرە.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
خەڵک بەو گوتارانە بانگەواز دەکەم،
کە لە رامانی پاکەوە سەرچاوەی وەرگرتبێت،

تا ڕێگە بە بارەگای تۆ ببیننەوە.
گاتا، هاتی 46، سروودی 14

ئەی ڕۆڵەکانی «هێچدئەسپ ئەسپێنتمان»..!
بۆ ئێوە دەئاخفم،
گوێ بدەنە ئەو شتانەی
کە بۆ ئێوە باشترینە،
تا بە پێی ئەوە، زانا لە نادان جوێ بکەنەوە و
بە کرداری خۆتان
ببن بە خاوەنی ئەو ڕاستییە
کە بنەمای ئایینی ئەهۆرایە.
گاتا، هاتی 46، سروودی 15

ئەی فرەشەوشتر هیۆگۆە..!
لەتەک یارانی بڕوامەندی خۆت،
کە ئێمە هەر دوو بۆیان،
ڕووناکی و بەختیاریی هەمیشەییان ئاواتەخوازین،
بەرەو ئەو جێگایە بڕۆ،
کە تێیدا ڕاستی لەتەک خۆبەختکاری پێکەوە پەیوەستن،
لەوێ، رامانی پاک و توانامەندی،
فەرمانڕەوایی دەکەن و
شکۆمەندیی مەزدا ئەهۆرا ئاشکرایە.
گاتا، هاتی 46، سروودی 16

**ئەی جامئەسپ هیۆگە..!**
**ئەی زانا..!**
**ئێستا بە هۆنراوە فێرت دەکەم،**
**تا بە دڵ وەری گری و پەرستیاری بیت،**
**کار و کۆشش لە سستی و تەوەزنی بڵندپایەترە،**
**هەر کەس دانا لە نادان**
**جوێ بکاتەوە،**
**مەزدا ئەهۆرا،**
**لە بەر پرشنگی ڕاستیدا،**
**بە توانای خۆی ئاگاداری دەبێت.**
**گاتا، هاتی 46، سروودی 17**

**ئەو کەسەی کە ببێت بە هاوڕێم،**
**من بۆ ئەو باشترینم و**
**لە بەر تریفەی رامانی پاک،**
**مزگێنیی باشترینەکانی پێ دەدەم.**
**ئەو کەسەی کە لەتەک مندا ڕاستترە**
**منیش لەتەک ئەودا ڕاستترم.**
**ئەی مەزدا..!**
**من بە ڕاستیی،**
**خواستی تۆ بە جێ دێنم،**
**ڕێگایەک کە خێرەت و هزری من**
**هەڵیدەبژێرێت.**
**گاتا، هاتی 46، سروودی 18**

**کەسێک بەڕاستیی،**
**خواستی زەردەشت بە جێ بهێنێت،**
**کە داواکاری درووستکردنی**
**جیهانێکی تازەیە،**
**لە پاداشتی ژیانی جاویدانە بەهرەمەند دەبێت و**
**لەم جیهانە پڕبەهرە و بەپیتەدا،**
**هەموو ئارەزووەکانی دڵی دێتە دی.**
**ئەی مەزدا..!**
**هەمووی ئەم شتانە**
**تۆ بۆ من ئاشکرا و فێرت کردووم.**
**گاتا، هاتی 46، سروودی 19**

# هاتی 47



مەزدا ئەهۆرا،
بە شکۆمەندی و مێهری خۆی،
پێگەیشتن و جاویدانبوون
بە کەسێک دەبەخشێت،
کە کردار و گوفتاری،
لە بەر تریفەی رامانی پاک و
باشترین ڕەوشتدا و
لە سەر پایەی ڕاستی بێت.
گاتا، هاتی 47، سروودی 1

کەسێک کە لە بەر تریفەی پاکترین راماندا،
باشترین ڕێگا دەگرێتە بەر،
زمانیشی گەواهی رامانی پاکە و
دەستی بۆ کاری چاک ئاواڵەیە،
تەنیا یەک ئارمانجی هەیە:

**مەزدا ئەهۆرا،**
**پەروەردەگار و بەدیهێنەر و سەرچاوەی ڕاستییە.**
**گاتا، هاتی 47، سروودی 2**

**ئەی مەزدا..!**
**لە ڕاستیدا، تۆ ئافەریدەگاری رامانی پاکی،**
**ئەو کاتەی کە کۆمەڵان لەتەک رامانی پاکدا،**
**پرس و ڕایان دەکرد،**
**تۆ بۆ ئەوان،**
**ئەم زەوی و جیهانە شادیهێنەرەت ئافراند و**
**بۆ ئاوەدانی و ڕابەریشی،**
**خۆبەختکاریت کردە دیاری.**
**گاتا، هاتی 47، سروودی 3**

**ئەی مەزدا..!**
**ئەو چەواشەکارانەی**
**کە پشت لە رامانی پاک دەکەن،**
**با ڕەنج بکێشن و ئازار بچێژن.**
**ڕاستکاران کە وا ناکەن، ئەوە نەبینن.**
**ڕاسترەو هەرچەندەش هەژاریش بێت،**
**لە لای ڕاسترەوان هەر خۆشەویستە،**
**چەواشەکاریش،**
**هەرچەندە زەنگین و توانامەندیش بێت،**
**بێ ئەرجە.**

گاتا، هاتی 47، سروودی 4

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
تۆ لە بەر تریفەی رامانی پاک،
مژدەی باشترین خەڵاتت
داوەتە ڕاستکرداران.
بەڵام چەواشەکار
لە مێهری تۆ بەهرەمەند نابێت.
چونکە چەواشەکار،
رامان و کرداری
ناشرین و نادرووستە.
گاتا، هاتی 47، سروودی 5

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
لە بەر تریفەی رامانی پاک و
لە بەر پرشنگی تۆدا،
ئاکامی دوو لایەنی چاکە و خراپە،
ڕوون دەبێتەوە و
بە پەرەگرتن و پتربوونی ڕاستی و پاکی،
فرە لە پەیجۆران،
ڕێگای تۆ هەڵدەبژێرن.
گاتا، هاتی 47، سروودی 6

# هاتی 48



**ئەی ئەهۆرا..!**
**لە کاتی پاداشت و**
**ئەو کاتەی کە سەرکەوتنی ڕاستی بە سەر درۆدا**
**مسۆگەر دەبێت و**
**فریوی ئەکۆمەن (بیری خراپ) و لایەنگرانیان**
**بۆ هەمیشە ئاشکرا دەبێت،**
**ئەوسا، لە بەر پرشنگی بەخشایشت،**
**ستایشتی تۆ و**
**خۆشەویستی بە تۆ پتر دەبێت و**
**بەر و بەهرەی بەختیاری بە ئاکام دەگات.**
**گاتا، هاتی 48، سروودی 1**

**ئەی مەزدا ئەهۆرا..!**
**پێش ئەوەی مێشکم ئاڵۆز بێت،**
**ئاگاداری ئەو شتەم بکە کە دەیزانیت.**

گەلۆ ڕاستکرداران بە سەر چەواشەکاراندا،
سەرکەوتوو دەبن؟
ئەو سەرکەوتنەی
کە سەرئەنجامی خۆشی ژیان دەبێت.
گاتا، هاتی 48، سروودی 2

ئەو ڕاهێنانەی کە،
مەزدا ئەهۆرای دانا،
لە بەر تیشکی ڕاستیدا،
مەردمی ژیری پێ فێر دەکات،
باشترین ڕاهێنانە.
بەو ڕاهێنانەیە کە
پاکان و هۆشیاران و مامۆستایانی ڤیدایی
لە بەر تیشکی زانست و ڕامانی پاکدا،
سەوداسەر و ئەڤینداری تۆ دەبن.
گاتا، هاتی 48، سروودی 3

ئەی مەزدا..!
ئەو کەسەی کە ڕامانی
باش یا خراپ بێت و
هەر چییەک کە هزری بە ئازادی هەڵیبژێرێت،
ویژدان و گوفتار و کردار و بڕواشی
پەیڕەویی لێ دەکات.
بەڵام لە ئەنجامدا،

ئەمە خێرەتی تۆیە
کە چاکە و خراپە لە یەکدی جیا دەکاتەوە.
گاتا، هاتی 48، سروودی 4

هیوادارین کە پاتشایانی چاک،
بە کرداری باش و بە زانست و جوانمەردی،
فەرمانڕەوایی ئیمە بکەن،
نەک پاتشایانی خراپ.
پاکی بۆ کۆمەڵ،
لە چاخی لە دایکبووندا بەهرەیە.
بۆ ئاوەدانیی جیهان دەبێت تێ بکۆشرێت،
دەبێت جیهان بە دروستی سەرپەرشتی و پەروەردە بکرێت و
بەرەو ڕووناکی ببردرێت.
گاتا، هاتی 48، سروودی 5

بە ڕاستی زەوی
پەنایەکی باشە بۆ ئێمە.
زەوی دوو دیاری،
توانامەندیی لەش و هێزی ڕەوان بە ئێمە دەبەخشێت.
مەزدا ئەهۆرا،
لە سەرەتای ئافراندن و لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
لە سەر زەوی گیا و ڕووەکی ڕواندووە.
گاتا، هاتی 48، سروودی 6

ئەی ئەو کەسانەی کە بە رامانی پاک و سۆزەوە پەیوەستن..!
لە کین و توڕەیی پارێز بکەن،
لە هەمبەر ستەم بەرخۆ بدەن.
بۆ پەرەپێدانی ڕاستی،
لەتەک جوامێرانی پاکدا،
هاوپەیمان بن،
تا ڕێگە بۆ بارەگای ئەهۆرا بدۆزنەوە.
گاتا، هاتی 48، سروودی 7

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
چییە خواستی شکۆداریی باشی تۆ؟
چییە بەخشش و پاداشتەی تۆ
بۆ من یارانم؟
چەندە بە ئاواتم،
کە لە ڕێگای ڕاستییەوە،
ئێوە بۆ باوەڕمەندانت ئاشکرا ببیت،
تا بە هاریکاریی رامانی پاک،
بۆ پێشبردنی کارەکانی خۆیان تێ بکۆشن.
گاتا، هاتی 48، سروودی 8

ئەی مەزدا..!
چۆن بزانم
کە ئێوە لە سەر بنەمای ڕاستی،
بە سەر هەمووی ئێمە و

ئەوانیش کە بە دوای ئازاری مندا دەگەڕێن،
فەرمان دەدەی؟
چۆنیەتی رەوشتی رامانی پاکم
بۆ ئاشکرا بکە.
ڕزگارکاریش
لە پاداشتی کار و خەباتی ئاگادار بکە.
گاتا، هاتی 48، سروودی 9

ئەی مەزدا..!
کەی مەردم لە ئایینی تۆ تێدەگەن؟
کەی دەست لەم ژەهراوی دێوانەکەرە هەڵدەگرن؟
ئەو شتەی کە کەرپانەکانی وێرانگەر
گەلی پێ فریو دەدەن و
میرانی ستەمگەر و لادەریش،
دەستەڵاتداریەتی وڵاتانی پێدەکەن.
گاتا، هاتی 48، سروودی 10
(مەبەست لەو ژەهراوە، شتێک بووە کە لە شیرەی گیا یان شتێک لە تیرەی بەنگ دروست دەکرا و لە کاتی خواردنەوەیدا، مرۆڤ لە خۆی بێخود دەبوو و کەیفی بە کوشتنی ئاژەڵ و خراپەکاری دەهات.)

ئەی مەزدا..!
کەی ڕاستی و پاکی و
خۆبەختکاری و وڵاتی پڕ لە کێڵگەی پان و بەرین و

**خانومانی جوان و ئاوەدان،**
**بە دی دێت؟**
**کێن ئەو کەسانە،**
**لە هەمبەر چەواشەکارانی دڵڕەش**
**پشتیوانمان دەبن؟**
**کێن ئەو کەسانە،**
**کە لە زانست و تێڕوانینی رامانی پاک،**
**بەهرەمەند دەبێت؟**
**گاتا، هاتی 48، سروودی 11**

**ئەی مەزدا..!**
**سوشیانسەکانی وڵاتان،**
**ئەو کەسانە دەبن کە**
**بە پێڕەوکردنی رامانی پاک،**
**ئەرک و بەرپرسیاریی خۆیان بە ئەنجام دەگەیەنن.**
**کرداریان لە سەر پایەی ڕاستی و ڕاهێنانەکانی تۆیە،**
**لە ڕاستیدا بۆ سەرکەوتن و**
**تێکشکاندنی ڕک و کینە ڕاسپێردراون.**
**گاتا، هاتی 48، سروودی 12**

# هاتی 49



ئەی مەزدا..!
لە مێژە کە «بێندو»،
لە کرداری نادروستی خۆی شادمان و سەرمەستە و
لە هەمبەری من نەیاریەتی دەکات.
ئەی بەخشێنەری دلۆڤان..!
بە پاداشتی چاکە بەرەو ڕووی من وەرە،
تا بە رامانی پاک،
ئەو لە چەواشەیی ڕزگار بکەم.
گاتا، هاتی 49، سروودی 1

ئەی مەزدا..!
ئارمانجی سەرەکیی «بێندو»
درۆ و فریو و سەرلێشێوانی مرۆڤ و
دوورکەوتن لە ڕاستییە،
پابەندی سۆز و بەڵێنی خۆی نییە و

رامانی لەتەک پرسیار و بەرسیڤ بێگانەیە.
گاتا، هاتی 49، سروودی 2

ئەی مەزدا..!
ئەم باوەڕ و ڕاهێنانەت بە دروستی
بۆ هەمووان دیاری کردووە،
کە ڕاستی ئازادیبەخش و سوودمەندە
درۆش زیانبار.
لەم ڕووەوەیە
کە ئارەزوومەندم هەمووان،
پەیوەندیی خۆیان لەتەک رامانی پاک پتر بکەن و
تێکەڵی خۆیان لەتەک چەواشەکار و لایەنگرانی درۆ بپسێنن.
گاتا، هاتی 49، سروودی 3

ئەو کەسانەی کە
بە بیری چەپەڵ و زمانی پیسیان،
ڕک و تووڕەیی و بەرچاوتەنگی پەرە پێ دەدەن و
دەبنە کۆسپی بەر ڕێگای مەردمی سازکەر و پەروەردەکار،
هەروەها بەو کردارە ناشیرینانەیان
بیر لە داهێنان و کاری خاس ناکەن،
ئەمانە دێڤانێکن
کە دەروون و ویژدانی گەل،
بەرەو درۆ و شاشی دەبەن.
گاتا، هاتی 49، سروودی 4

ئەی مەزدا..!
تەنیا ئەو کەسانە دەتوانن
دل و گیان و کەسایەتیان،
لەتەک رامانی پاکدا پەیوەند بدەن،
کە لە ڕێگەی جوانمەردی و ڕاستی و زانایی
هەنگاڤیان نابێت،
لە ئاکامدا ئەم کەسانە،
جیهانی جاویدانیی تۆیان
پێ دەبەخشرێت.
گاتا، هاتی 49، سروودی 5

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەی ڕاستی..!
چییە ئەو شتانە کە لای تۆ پەسەندە؟
داواکاری زانینی هزر و رامانتانم،
تا بتوانم بە ڕاستی و دروستی،
ئایینی ئێوە بناسم و
بۆ هەمووانی ئاشکرا بکەم.
گاتا، هاتی 49، سروودی 6

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
هیوادارم کە کۆمەڵان
بە رامانی پاک و دڵی ڕوون،

**پەیامی من ببیستن،**
**تۆش گەواهبە**
**کە لە هاوڕێیان و خێشان**
**هەر کامیان بە پێی ئایین ڕەفتار دەکات،**
**تا بۆ هاوکاران ببێت بە**
**ئامۆژگارێکی چاک.**
**گاتا، هاتی 49، سروودی 7**

**ئەی مەزدا ئەهۆرا..!**
**لە تۆ داواکارم کە،**
**گەشەسەندن و شادمانی**
**لەتەک پەیوەستبوون بە ڕاستییەوە،**
**بە فرەشەوشتر خەڵات بکەی و**
**بە شکۆداریی و مەزنی خۆت،**
**هەر ئەم پاداشتەش**
**بە هەڤاڵانی دیکەم ببەخشی،**
**هێڤیدارم کە بۆ هەمیشە،**
**وەک ئەڤینداری تۆ بمێنینەوە.**
**گاتا، هاتی 49، سروودی 8**

**ئەی جامئەسپی دانا..!**
**ئەو خەباتکارە کە بۆ ڕزگاریی کۆمەڵان دیاری کراوە،**
**ئەبێت بەم پەندە بە ژیری گوێ بدات:**
**هەرگیز مرۆڤی ڕاستگوفتار،**

بیر لە هەڤاڵبەندیی
مرۆڤی گومڕێ و چەواشەکار ناکاتەوە،
ئەو کەسانەی کە کەسایەتیان
لەتەک ڕاستیدا پەیوەستە،
لە باشترین پاداشتەکان بەهرەمەند دەبن.
گاتا، هاتی 49، سروودی 9

ئەی مەزدا..!
من رامان و ڕەوانی پاکی ڕاستکاران،
لە بارەگای تۆدا
بە ئێوە دەستپێرم،
تا ئاگاداری ئەوان بیت.
هەروەهاش ستایشتی جەوانمەردی و
خواستەکانی دڵ دەکەم،
ستایشتی تۆش دەکەم،
چونکە پاتشای
مەزنیی و پایەداریی و جاویدانیت.
گاتا، هاتی 49، سروودی 10

ڕەوانی میرانی ستەمکار و
بەدڕەوشتان و دڵڕەشان و
لایەنگرانی درۆ و چەواشەکاران،
نیشتەجێیانی سەرای درۆن،
چونکە ناخیان لە ڕووناکیەوە

بەرەو تاریکی چووە و
لە ڕاستی دوور کەوتوونەتەوە.
گاتا، هاتی 49، سروودی 11

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
لە بەر تیشکی ڕاستی و ڕامانی پاکدا،
زەردەشت کە ستایشتگەری تۆیە،
چ یارمەتییەکی دەدەی؟
من بە دروستی و بە هۆرە و ئاوازی شایستە،
ستایشتت دەکەم،
ئارەزوومەندم ئەو شتەی کە لای تۆ پەسەندە و
بە باشی دەزانی،
بە منی ببەخشی.
گاتا، هاتی 49، سروودی 12

# هاتی 50



ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کاتەی کە لە دڵەوە
بانگت دەکەم،
بێجگە لە ڕاستی و
رامانی پاکی تۆ،
چ کەسێک یارمەتیی ڕەوانی من دەدات؟
کێ پشتیوانی من و
یارانم دەکات؟
گاتا، هاتی 50، سروودی 1

ئەی مەزدا..!
ئەو کەسانەی کە بۆ جیهان
هێمنی و شادومانی دەخوازێت و
هەمیشەش خوازیاری ئاوەدان بوونەوەیەتی،
چلۆن ژیانی لە بەر تیشکی ڕاستی و

پڕشنگی درەخشاندا دەباتە سەر؟
چلۆن لە نێوانی ڕاستکاران و
سەرای هۆشیاراندا
جێگای دەبێتەوە؟
گاتا، هاتی 50، سروودی 2

ئەی مەزدا..!
بە دڵنیایی
ئەو کەسە ڕوو لە ڕاستی دەکات،
کە توانامەندیی مینووی و رامانی پاک،
ئامۆژگاری بێت،
هەر لە بەر پرشنگی ئەم بەخششانەدایە،
کە ئەگەر چەواشەکاران دەوریشان تەنیبێت،
هەر لە ئاوەدانکردنەوەدایە.
گاتا، هاتی 50، سروودی 3

ئەی مەزدا..!
ئیسە ستایشتی تۆ و ڕاستی و
پاکترین هزرەکان و
توانامەندیی مینوویی دەکەم،
دەمەوێت لە ڕێگای ڕاستدا بم و
لە سەرای سروود،
گوێ بۆ سەوداسەرانی تۆ،
بگرم.

گاتا، هاتی 50، سروودی4

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەی ڕاستی..!
بە هۆنەری سرووود و
بەستەی رامانبزوێنەری خۆتان،
بە مێهرەبانییەوە ڕووی تێ بکەن و
یار و پشتیوانی بن،
تا ڕێنوێنی کۆمەڵان بکات
بۆ ڕێگای ڕووناکی.
گاتا، هاتی 50، سروودی 5

ئەی مەزدا..!
من، زەردەشت
لایەنگری ڕاستی،
بە ئاوازێکی بڵند و ڕێزەوە
ستایشتی تۆ دەکەم،
ئارەزوومەندم هەمیشە
زمانم بۆ ڕێگای ژیریی بوێژ بکەیت و
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
ئایینی خۆتم بۆ ئاشکرا و فێرم بکەیت.
گاتا، هاتی 50، سروودی 6

ئەی مەزدا..!

**من بە،**
**بەخرۆشترین سروودەکانم و**
**بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن،**
**ستایشتت دەکەم و**
**بە تۆ پەیوەند دەبم.**
**تا لە بەر پرشنگی ڕاستی و رامانی پاکدا،**
**پشتیوان و ڕێپیشاندەرمان بیت.**
**گاتا، هاتی 50، سروودی 7**

**من،**
**بەو هۆرە بە جۆش و گەرمانە**
**کە لە دڵمدا هەڵمبەستوون،**
**دەستەوتکا،**
**ڕوو لە تۆ دەکەم،**
**بە ڕاستی و بە لەخۆبوردوویی مرۆڤێکی خۆبەختکار،**
**بۆ تۆ نوێژ دەکەم و**
**لە بەر تریفەی باڵکێشی رامانی پاکدا،**
**لە تۆ نزیک دەبمەوە.**
**گاتا، هاتی 50، سروودی 8**

**ئەی مەزدا..!**
**بەم سرووده پیرۆزانە و**
**لە ڕێگای ڕاستەوە و**
**بەو کارانەی کە لە رامانی پاک هەڵدەستێت،**

بەروەپیریی تۆ دێم،
تا گەیشتن بە ئارمانجی دڵخوازی خۆم،
هەروەها تامەزرۆی وەرگرتنی زانستی چاکە دەبم.
گاتا، هاتی 50، سروودی 9

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کارانەی کە لە ڕابردوو ئەنجامم داون و
ئەو کارانەی کە لە داهاتوودا ئەنجامی دەدەم و
ئەو شتەی کە رامانی پاک دەوەشێتەوە،
هەر وەک تیشکی هەتاو و
گزینگی بەرەبەیان،
کە بە دیدەی تۆ شایستەیە،
هەمووی لە ڕێگای ڕاستی و
بۆ نیایشت و ڕێزلێنان و
فەڕ و شکۆی تۆ بووە و دەشبێت.
گاتا، هاتی 50، سروودی 10

ئەی مەزدا..!
تا ئەو کاتە کە لە بەر تیشکی ڕاستیدا
تاو و توانام هەیە،
ستایشتی تۆم کردووە و هەر ستایشتت دەکەم.
هیوادارم ئەی ئافەرینەندەی جیهان..!
لە بەر تیشکی ڕامانی پاکدا،
یەکەمین و باشترین خواستی دروستکرداران،

**کە تازەسازیی جیهانە،**
**بە جێ بهێنێت.**
**گاتا، هاتی 50، سروودی 11**

# هاتی 51



توانامەندیی پاکی مینوویی،
بەهرەیەکی بەرز و پڕبەهای ئاسمانییە،
کە لە بەر پرشنگی ڕاستیدا،
لە دڵی سەوداسەرانی ڕێگای مەزدایی دادەگرسێت،
تەنهاش بە ئەنجامدانی
باشترین کارەکان بە جێ دێت
منیش
ئیسە و هەمیشە
تەنیا لەم ڕێگایەدا تێدەکۆشم.
گاتا، هاتی 51، سروودی 1

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
هەموو ئەم کارانە
سەرەتا بە تۆ و
بە ڕاستی و بە خۆبەختکاریی پێشکەش دەکەم.

شکۆمەندی خۆتم بۆ بنوێنە و
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
بە باوەڕمەندانت ڕزگاری ببەخشە.
گاتا، هاتی 51، سروودی 2

ئەی مەزدا ئەهۆرا..!
ئەو کەسانەی کە
بە کرداری پاک و گوفتاری ڕاست
ئارەزووی پەیوەندبوونیان لەتەک تۆدا هەیە،
ئەو کەسانەن،
کە تۆ لە سەرەتادا
یەکەمین ئامۆژگاریان بوویت.
گاتا، هاتی 51، سروودی 3

ئەی مەزدا..!
مێهری بێئەندازەت لە کوێیە؟
کەی بەخششی تۆ،
باوەڕمەندانی بەئەمەگ دادەگرێت؟
لە کوێ ڕاستی دەست دەکەوێت؟
ئەڤین و جەوانمەردیی پاک لە کوێیە؟
باشترین رامان لە کوێیە؟
سەرچاوەی میری و شکۆمەندیی ئێوە لە کوێیە؟
گاتا، هاتی 51، سروودی 4

هەمووی ئەمانە دەپرسم:
چلۆن ڕابەرێک
کە دروستکار و لەخۆبردووە و
خاوەنی هزرێکی پاک و
دادگەر و ئامۆژیاری ڕاستییە،
هەروەهاش توانامەند و بەخشایشگەرە،
دەتوانێت جیهان بەرەو
ئاوەدانی و پێشکەوتن بگەیەنێت؟
گاتا، هاتی 51، سروودی 5

مەزدا ئەهۆرا،
بە شکۆمەندی و مەزنی خۆی،
بەو کەسەی کە خواستی ئەو بە جێ بهێنێت و
بۆ ئاوەدانی و پێشکەوتنی جیهان تێ بکۆشێت،
پاداشتی باشتر لە باشی پێ دەبەخشێت،
بەڵام ئەو کەسەی کە بەدکردار و ناڕاستە و
خواستی ئەو ئەنجام نەدات،
لە ئەنجامی ژیانیدا
بە کەیفەری کرداری خۆی گرفتاری دەکات.
گاتا، هاتی 51، سروودی 6

ئەی بەدیهێنەری زەوی و ئاو و گیا..!
ئەی مەزدا..!
لە بەر پرشنگی پیرۆزی خێرەتی خۆتدا،

پێگەیشتن و جاویدانیبوونم پێ ببەخشە و
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
تاو و توانامەندیی لەش و ڕەوان و
پایەداریی ژیانی نوێم پێ ببەخشە،
هەروەهاش لە ڕاهێنانەکانی خۆت
کامەرانم بکە.
گاتا، هاتی 51، سروودی 7

ئەی مەزدا..!
ئێستا پەیامی تۆ
بۆ مرۆڤی زانا ڕوون دەکەمەوە:
سەرئەنجامی خراپ بەشی چەواشەکارانە،
بەختیاریش بۆ کەسێکە
کە پابەندی ڕاستییە.
بێگومان شادومانیش هەر بەشی ئەوە،
چونکە ئەم پەیامە ڕامانخرۆشێنەرە
بۆ دانایان ئاشکرا دەکات.
گاتا، هاتی 51، سروودی 8

ئەی مەزدا..!
ئێوە لە ڕێگای ئاگری بڵێسەدار و
ئازموونی تاواندنی مینوویی،
هەر دوو لایەنی ڕاستکردار و چەواشەکار
تاقی دەکەیتەوە و پاداشت دەدەیتەوە.

لەم ڕێگایەوەیە
کە ئایینی ژیان ئاشکرا دەکەی:
ڕەنج بۆ چەواشەکاران،
سوود و شادی بۆ ڕاستکرداران.
گاتا، هاتی 51، سروودی 9

ئەی مەزدا..!
کەسێک کە بێجگە لەم ئایینە،
لە ڕێگای وێرانکردنی جیهاندا تێ بکۆشێت،
لە خێڵی درۆ و
لەو کەسانەیە کە
چەوت بیر دەکەنەوە و گێلن.
هیوای ڕاستی
بۆ خۆم و یارانم دەخوازم،
تا بەرەو ڕووی ئێمە بێت و
بە پاداشتی چاکەمان بگەیەنێت.
گاتا، هاتی 51، سروودی 10

ئەی مەزدا..!
هاوڕێی زەردەشت ئەسپنتمان کێیە؟
کێیە ئەو کەسەی
کە لەتەک ڕاستیدا خەریکی پرسیار و ڕاوێژە؟
کێیە ئەوەی کە ڕووی لە پاکییە و
بە ڕاستی و رامانی پاک و خۆبەختکارییی،

**لایەنگری ئەنجومەنی هەڤاڵەتیی مۆغانە؟**
**گاتا، هاتی 51، سروودی 11**

**خاپێندراوانی دەبستانی میریی،**
**هیچ کاتێک بە درێژایی ژیانیان،**
**«زەردەشت ئەسپێنتمان»یان**
**دڵخۆش نەکردووە،**
**چونکە ئەمانە،**
**بەختیاریی لە کردەوەی ئەنبووژەنی دەبینن،**
**نەک لە جۆش و خرۆشەکانی مینوویی.**
**گاتا، هاتی 51، سروودی 12**

**بەم جۆرە،**
**چەواشەکار،**
**کە بە سەرپێچی کردن لە ڕێگای ڕاستی**
**ویژدانی خۆی بەرەو نابووتی کێشاوە،**
**لە تێپەڕگای داوەری و**
**لە هەمبەر ئاشکرابوونی کرداریدا،**
**گرفتاری سەرزەنشتی ویژدانی دەبێت.**
**چونکە بە کردار و گوفتاری خۆی،**
**لە ڕێگای ڕاست لایداوە.**
**گاتا، هاتی 51، سروودی 13**

**کەرپانەکان،**

هیچ کاتێک لە داد و ئایین و ئاوەدانکردنەوە
پێڕەوی ناکەن،
ئەمانە بە ڕاهێنان و کردارەکانیان،
زیان بە ئاوەدانکارانی جیهان دەگەیەنن.
بەڵام، هەر ئەم ڕاهێنان و کردارانەیە،
کە لە ئاکامدا
بەرەو سەرای درۆ دەیانگەیێنێت.
گاتا، هاتی 51، سروودی 14

پاداشتێک کە زەردەشت
بە ئەنجومەنی مۆغان مژدەی داوە،
سەرای هۆرە و ستایشتە،
ئەو جێگایەیە کە هەر لە سەرەتادا،
جێگای گەیشتن بە مەزدا ئەهۆرا بووە.
من ئەم پاداشتە،
کە لە بەر تریفەی رامانی پاک و ڕاستیدا
وەدەست دێت،
بە ئێوە مزگێنی دەدەم.
گاتا، هاتی 51، سروودی 15

کەی گوشتاسپ،
لە بەر تریفەی هێزی ئەنجومەنی مۆغان و
ئەو سرووده پیرۆزانە،
کە لە رامانی پاک گرساوە و

بە پەیڕەویکردن لە ڕاستی،
بە پاداشتی زانستی دەروونی گەیشت.
بە پێی ئەو زانستەیە،
کە مەزدا ئەهۆرا
ڕێنوێنیی بەختیاریمان دەکات.
گاتا، هاتی 51، سروودی 16

فرەشەوشتر هیۆگۆە،
گەوهەری بە شکۆی بوونی خۆی،
بە دڵێکی پاک و بۆ ئایینی بەهدینی
سپاردیە دەستی من،
هیوادارم کە مەزدا ئەهۆراش
ئاواتی ئەو
کە گەیشتن بە ڕاستییە،
بە جێ بهێنێت.
گاتا، هاتی 51، سروودی 17

«جامئەسپ هۆگۆ»ی دانا،
کە خوازیاری ڕۆشنبوونەوە بوو،
لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
ئەو زانستەی هەڵبژارد و
بە رامانی پاکەوە
بە توانامەندیی مینوویی گەیشت.
ئەی مەزدا ئەهۆرا..!

ئەو زانستەش
بە هەموو ئەوانەی کە سەوداسەر و
داڵدەی تۆن ببەخشە.
گاتا، هاتی 51، سرروودی 18

مەیدیا مانگ،
کە لە دودەمانی ئەسپنتمانە،
لە دوای ناسینی ئۆلی بەهدینی،
بە دڵ و گیان بۆ پێشکەوتنی ئەم ئۆلە
ژیانی خۆی سپاردەتە دەستی من.
ئەو بە فێربوونی ئایینی مەزدا،
بە کردار لە ڕێگای هەرچی باشتربوونی تیدەکۆشێت.
گاتا، هاتی 51، سرروودی 19

ئەی ئەمێشەئەسپێنتەکان..!
هەمووتان پێکەوە،
ڕاستی و رامانی پاک،
کە لە خۆبەختکاریی
وەدەست دەکەوێت،
بە ئێمە ببەخشن.
ستایشتی ئێوە دەکەین و
لە مەزداش
داوای بەختیاری دەکەین.
گاتا، هاتی 51، سرروودی 20

مرۆڤی باوەڕمەند و پاک،
بە زانست و گوفتار و کردار و ویژدانی خۆی،
ڕاستی پتر دەکات.
مەزدا ئەهۆرا بەم کەسە،
لە بەر تریفەی رامانی پاکدا،
توانامەندیی مینوویی دەبەخشێت.
منیش بۆ ئەو
پاداشتی چاکە* ئاوات دەخوازم.
گاتا، هاتی 51، سروودی 21
(مەبەست لە پاداشتی چاک، هێمنی رامان و ویژدانێکی ڕووناک و دڵێکی بینا و توانامەندی مینوویی و بێنیازبوون لە هەوا و هەوەس و خۆشنووتی هەمیشەییە)

مەزدا ئەهۆرا،
ئەو کەسانە دەناسێت،
کە لە ڕووی ڕاستییەوە،
باشترینی پەرستشەکان بە جێ دەهێنن،
چ لە ڕابردوودا بووبێت و
چ لە ئێستادا بێت.
من ئەو کەسانە ستایشت دەکەم و
بە ڕێز ناو و یادیان دەکەم و
بە هۆرە و درووودەوە بەرەو پیرییان دەچم.
گاتا، هاتی 51، سروودی 22

# هاتی 53



باشترین ئاواتەکانی زەردەشت ئەسپنتمان
بەدی هاتووە،
چونکە مەزدا ئەهۆرا،
لە بەر تریفەی ڕاستیدا،
ژیانێکی خوڕەمی بۆ هەمیشە پێ بەخشیوە.
هەروەها ئەوانەش
کە لەتەکی نەیارییەتیان دەکرد،
ئێستا گوفتار و کرداری ئایینی بەهدینی
پەیڕەو دەکەن.
گاتا، هاتی 53، سروودی 1

ئەوەی کە دەبێتە هۆی
خۆشی و شادومانیی مەزدا،
کە بە رامان و گوفتار و کرداری پاک،
ستایشتی مەزدا بکەن و

**لە ناساندنی ئەو تێ بکۆشن.**
**هەروەها کە کەیگوشتاسپ بە لایەنگری لە زەردەشت و**
**فرەشەوشتر بە رامانی،**
**ڕێگای ڕاست و ئایینێکیان هەڵبژاردووە،**
**کە ئەهۆرا بۆ سوشیانسی ئاشکرا کردوە.**
**گاتا، هاتی 53، سروودی 2**

**ئەی پوورەچیستای ئەسپنتمان هێچدسپان..!**
**ئەی جەوانترین کچی زەردەشت..!**
**مەزدا ئەهۆرا،**
**ئەو کەسەی کە بە هزری باش و**
**بە پاکی و ڕاستییەوە پابەندە،**
**وەک هاوسەرێکی باش بۆ تۆ دەدات.**
**کە وایە لەتەک بیری خۆت ڕاوێژ بکە و**
**بە ئەڤینی پاک و زانستی باش ڕەفتار بکە.**
**گاتا، هاتی 53، سروودی 3**

**بێگومان ئەو کەسەی،**
**کە بۆ ئەندامەتی هاوڕێیان و خانەوادە،**
**هەروەک باوک و سەروەر هەڵبژێردرابێت،**
**خۆشم دەوێت و هەڵیدەبژێرم.**
**هیوادارم کە تریفەی رامانی پاک،**
**بەر منیش کەوێت و**
**ژنێکی جەوانمەرد و داوێنپاک و شایستە بم لە ناو پاکاندا.**

ئارەزوومەندم مەزدا ئەهۆرا،
بۆ هەمیشە لە ئۆلی بەهدینی
کامەرانم بکات.
گاتا. هاتی 53، سروودی 4

ئەم گوتانە بۆ ئێوە دەڵێم،
ئەی تازەبووکان و تازەزاوایان..!
پەندم بە رامان ببیستن و بە یادی بسپێرن و
بە ویژدانێکی ڕۆشن وەری بگرن و بە کاری بهێنن:
هەمیشە ژیانتان بە رامانی پاک ببەنە سەر و
کۆشش بکەن کە لە ڕاستیدا،
پێشبڕکێی یەکدی بکەن،
تا لە ژیانێکی پڕ لە خۆشی و بەختیاریی
بەهرەمەند ببن.
گاتا، هاتی 53، سروودی 5

ئەی پیاوان و ژنان..!
ئەمە بە چاکی بزانن کە لە لەم جیهانەدا،
درۆ خاپێنەرە،
خۆتانی لێ بپارێزن و پەرەی پێ مەدەن.
ئەوەش بزانن کە،
ئەو خۆشیەی کە لە خراپەکاری و چەواشەکردنی ڕاستی و
بێچارەکردنی کۆمەڵان وەدەست دەکەوێت،
ئاکامی پەژارییە.

ئەو چەواشەکارانەی کە ڕاستی لە ناو دەبەن،
ژیانی مینوویی خۆیان لە ناو دەبەن.
گاتا، هاتی 53، سروودی 6

پاداشتی ئەنجومەنی مۆغان،
تا ئەو ڕۆژە بۆ ئێوە دەبێت،
کە لە ژیانی هاوسەریی خۆتاندا،
چ لە هەبوون و چ لە نەداریدا،
لەتەک یەک سازگار بن و بە مێهرەبانی بژین.
بەڵام ئەگەر ئەندێشەی درۆ بە سەرتاندا زاڵ بێت و
ئایینی ئەنجومەنی مۆغان ڕەها بکەن،
ئەنجامەکەی تەنیا خەم و ڕەنج و ئەفسۆس دەبێت.
گاتا، هاتی 53، سروودی 7

بە دڵنیایی لە ئاکامدا،
چەواشەکاران و خراپەکاران،
فریو دەخۆن و گاڵتەیان پێ دەکرێت و سەرزەنشت دەبینن،
بەڵام لە ژێر ڕێبەرایەتی دروست و دادگەردا،
ژنان و پیاوان لە گوند و شاریاندا،
بە ئاشتی و ئاسایشت دەگەن.
خراپەکاریی و فریوکاریی
کە وەک زنجیرێک
گرێدراوی مەرگن،
لە ناو دەچن.

مەزدا ئەهۆرا، کە لە هەمووان مەزنترە،
ڕوو لە ئێمە دەکات.
گاتا، هاتی 53، سروودی 8

گومڕێیانی بەدکار،
کە کۆیلەی هەوەسن و لە ڕاستی بێزارن،
لە پاکان زویرن و پایەبەرزان بە سووک دەژمێرن،
هەمیشە لەتەک خۆشیاندا
لە گەرمە و کێشە و ململانێدان.
کێیە ئەو پێشەوا جەوانمەردە
لەو پەڕی ئازادیدا،
بە دڵ و گیان و بەو چەشنە کە خواستیەتی،
لە دژ ئەو جۆرە بەدکارانە بجەنگێت؟
ئەی مەزدا..!
تەنها شکۆمەندیی مینوویی تۆیە،
کە دەتوانێت یار و یاوەری دەروێشانی دروستکردار بێت و
لە باشترین پاداشتەکان بەهرەمەندیان بکات.
گاتا، هاتی 53، سروودی 9

# فەرهەنگۆک

ئاتر ئاگر، ئایر، ئازەر، ئاهیر
ئاترگا به زمانی هەورامی ئاهیرگه، هورموزگا، جەمخانه، ئاتەشگه، ئەو شوێنەی که بەهدینان بۆ ڕاز و نیاز و گرتنی کۆڕی و ئاهەنگی ئایینی تێدا کۆ دەبنەوه، وەک کەنیسا و مزگەوت.
ئاترەخش به ئاڤێستایی: ئاتر + ڕەخشان = ئاترڕەخشان، ئازەرەخش، به واتەی پرشەی ئاگر، تیشکی ئاگر (ڕەخشان، ڕەخشندە، ڕەخشن ناوی کچانه له زبانی کوردی).
ئاخ زەوی، زێد، خاک، نیشتمان
ئافەراندن دروستکردن، بەدیهێنان، چێکردن، خولقاندن
ئافەریده دروستکراو، بەدیهاتوو
ئافەریدەگار خودای بەدیهێنەر
ئافەرینش ئافراندن، بەدیهێنان، داهێنان، خولقاندن
ئافەرینشت بوون به واتەی گشتی، هەستی
ئارمان ئارمانج، ئامانج
ئارمەئیتی ئەسپەند، ئەسفەند، یەکێکه له ئەمێشەسپێنتەکان، ئەسفەند ڕاکێشەری هەموو هەستییه. له هەستیدا دوو ڕاکێشەر فەرمان دەدەن، «دوورکەر» و «کێشەر» که له هەستیدا به هەموو دیاردەکانیەوه کار و کاردانەوەیان دەبینرێت. له هەر دیمەن و نموونەیەکی بووندا، ئەم کار و کاردانەوه و کێشەر و دوورکەرەوه هەیه و ئەمه دەبێته مایەی

بالاکردن و گەیین و گەڕیانی ئەو دیاردەیە. کێشان و دوورخستەوە و کار و کاردانەوە و ڕەنگ و ڕەنگدانەوە لە مرۆڤدا بە چەشنی ئەڤین، لەخۆبوردن، داد، بەخشش، رامانی دروست، هەڵسەنگاندنی ڕاست، خۆپارێزی و پاکی و خاسی دەبینرێت، کە ئەمانە دەبێتە مایەی خۆشی و شادومانی و کەیفخۆشیی دڵەکان و گیانەکان، لە بڕێک شوێندا بە واتەی (موراد) و جوانمێریش هاتووە.

ئاری چاوگی وشەی ئاری لە «ئایر» هاتووە، ئەو گەل و نەتەوانە کە ئاگر بە لایەنەوە پیرۆز بووە، ئەو گەلانەی کە باوەریان بە ئایینی بەهدینییە.

ئاشا واژەیەکی ئاڤێستاییە کە بە واتەی ڕاستی، ماف، دروستی، دادگەری، سامانی جیهان، یاسای ئافەرینش، ڕێکوپێکی، سازگاری، سەقامگیری، سازیی و دامەزراوی تەواو، بەشێکی سەرەکیی لە ناوی ئەمێشەسپێنت «ئاشا»وەهێشتایە، لەم ڕووەوەیە کە لێکۆڵینەرانی دینی بەهدینی واژەی ئاشا بە بێوەرگێڕان لە ناو نووسراوەکانیاندا بە کار دێنن، ئاشا یەکێک لە کۆڵەکەکانی بناغەیی و گرینگی دینی زەردەشتە کە لە سەرتاسەری ئاڤێستا هەمیشە دێتە گوتن و دەتوانرێت ببێژین کە هەموو ڕێگاکانی ڕزگاری بە ڕاستی یا ئاشا کۆتایی پێدێت کە هەمانا ڕاستییە.

ئاشاوەهێشتا ئەمێشەسپێنت ئاشاوەهێشتا یان ئۆردیبەهەشت، جیهانی بووندا ڕێکوپێکی و هەنجارێکی پتەو و گران فەرماندەرە و هیچ شتێک لە دەرەڤەی فەرمانی هەنجار و ئۆردیبەهەشت نییە. هەنجار لە ڕەوانی مرۆڤدا، ڕاستی و

پاکییە. دوژمنی هەرە مەزنی ڕاستی و داد و مرۆڤ، درۆیە. ڕاستی لە ڕەوانی مرۆڤ، مایەی خۆشی و خوڕەمی و شادمانییە و هەر چاکەیەک کە لە جیهاندا هەیە، لە ڕاستی هەڵدەستێت، ئۆردیبەهەشت، فریشتەی ڕاستی و دروستی و پاکی.

ئاشوو مرۆڤی پاک و بە ویژدان، جوانمێر، پیرۆز، هاف، (حەزرەت)

ئاگر لە ڕوانگای دینی بەهدینی پێنج جۆر ئاگری جیاواز هەیە: یەکەم بۆرزیسەوە، کە لە پێشگای پیرۆزی ئەهۆرا مەزدا هەیە. دووهەم وەهوفەڕیانە، کە لە ناو لەشی مرۆڤ و گیانلەبەرانی دی هەیە. سێهەم ئاوروازیشتە، کە لە ناو گیادایە. چوارەم وازیشتە، لە ناو هەوردایە. پێنجەم سپەنیشتە، کە بۆ بەکارهێنانی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ بەکار دێت و لە هەمان کاتییشدا بە نیشانەی ڕووناکی و پاکی و زانایی لە هەمبەر تاریکی و ناپاکی و نادانی پێناسە دەکرێت.

ئالی لایەن، لا

ئالیکاری ئاریکاری، هاریکاری، یارمەتی

ئامۆژگار ئامۆژیار، ئامۆزگار، مامۆستا، فێرکار

ئامەرتات فریشتەی تەندروستی و تەمەندرێژی، ئەمێشەسپێنت ئامۆرداد بوونی جاویدانییە. هێزی ئافراندن هەمیشە لە کاری ئافراندن و زایین و مردندایە و ئەم کاروبارە هەمیشەیی و جاویدانییە. مرۆڤ جیهانێکی پچووکە لە جیهانی مەزن و لە ژێر کاریگەری و فەرمانی یاساکان و زاگونەکانی جیهانی و ئەمێشەسپێنتەکان. جا ئەگەر تیشکی ئەمێشەسپێنتەکان بە سەر ڕەوان و زیندەگانی ئەو بکەوێت،

ئەوە شادی و بەختیاری و خوڕەمی ژیانی ئەو دادەگرێت و دەبێتە ئاوێنەیەک بۆ دیمەنی هەستی، ئاوەزی گشتی، تیشکی درەخشان، هێندسە، هەنجاری بوون و ئەهۆرا مەزدا. ئەمێشەسپێنتەکان لە گۆڕەپانی ڕەوان و ژیانی مرۆڤدا، هەنگاوەکانی پالآفتن و ڕازانەوەی ڕەوانن کە لە رامانی پاکەوە دەگرسێت و دوای پێوانی هەنگاوەکانی ڕاستی، داد، خۆپارێزی، لێبووردیی، ئەڤین، پاکی، گەشەسەندن و پشکووتن بە ئامورداد بە واتەی جاویدانی دەگات.

ئاویدەر ئاویەر، بە ئاڤێستایی «ئەوشێدرینە»، لە سەر کۆچبەربوونی زەردەشت لێکۆڵینەوەیەکی ورد و زانستی و بێ لایەنانە تا بە ئێستا نەکراوە، بێگومان هۆی تایبەت و دیاریکراوی خۆی هەیە. بەڵام بە گشتی دوو بیروڕا هەیە، یەکەمیان زۆربەی نووسەرانی بیانی بە تایبەت فارس پێ لە سەر ئەوە دادەگرن کە زەردەشت خەڵکی دەوروبەری "ورمێ" لە ڕۆژهەڵاتی کورستان بووە و کاتێک کە کۆچبەر بووە بەرەو شاری "بەلخ" لە ئەفغانستان چووە، هەڵبەت برێک نووسەر بە بێ بەڵگە و بێ سەرچاوە پێ لەوە زیاتر دادەنێن و دەنووسن زەردەشت لە ڕۆژئاوای ئێران "خۆراسان" لەدایک بووە و لەوێشەوە بۆ شاری بەلخ کۆچی کردووە و گۆڕەکەی لە شاری "مەزارشەریف" دایە. بەڵام بیری دووهەم کە لە ئەدەبیات و ئاڤێستای نوێ سەرچاوە دەگرێت و گومانشکێنە، شوێن و جێگای کۆچبەری زەردەشت دیاری دەکات. بۆ نموونە ڕەوانشاد "عمادالدین دەوڵەتشاهی" نووسەری هێژای کرمانشانی لە پەرتووکەکانی "چیاکانی نەناسراوی ئاڤێستا" و "رۆستەم و

زۆراو بە زمانی ئاڤێستا" بە سەرچاوەگرتنی ئەدەبیاتی زەردەشتی "یەشتەکان"، شوێن و جێگای کۆچبەری زەردەشت بەم چەشنە دەستنیشان دەکات. یەکەمجار زەردەشت پەنا دەباتە بەر زۆزانی "ئەوشێدرینە" کە بە درێژایی مێژوو ئەم وشەیە بە چەشنی "ئاویدەر، ئاویەر" لە هەریمی شاری "سنە" لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ماوەتەوە. پاشان زەردەشت لەوێشەوە دەڕوات بۆ چیای "هۆگر" کە لە دوایدا دەبێتە چیای "هەژیر، هەجر، هەجیر" ئێستا ئەم ناوچەیە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بە "دینەوەر" بەناوبانگە. لەم شوێنەدا بەشی دووهەمی سروودەکانی گاتا بۆ زەردەشت داهۆنرا. کەی گوشتاسپ کە کۆشکەکەی بە ناوی "گەنگ شا" ناو دەبریا و لە سەر چیایەک دروستی کردبوو، ئایینی ئەوی پەژراند، بوو بە گەورەترین پاڵپشتی زەردەشت و یارانی. ئەم شوێنە ئێستا لە باژێری "سەحنە"یە کە لەو سەردەمە بە شاهیندژ، شاییندژ، سایيندژ" بە ناوبانگ بوو. زەردەشت هەروەها ئاگرگایەکی (بە ناوی ئاترنۆش، ئاگرنۆش، ئاهیرنۆش، ئازەرنۆش) لە "باکتەریا" دایمزراند. ئەم شوێنە لە دوای هەزاران ساڵ بە ناوی "پارسینە" لە هەریمی "دینەوەر"ی کرمانشا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ماوەتەوە. پاشان باکتەریا گۆڕیا بە "باختەر" و ئەم گوندەش ئێستا ماوە. "ڕۆستەم و زۆراو بە زمانی ئاڤێستا". نووسەر و زمانەوان م. ئە. هەورامانی لە هەفتەنامەی "ئاویەر" لە ژمارەی 52 ساڵی 3 لاپەڕەی 12 باسێکی لەسەر ئاویەر نووسیوە کە جێگای سەرنجە: "لە ڕەواڵەتدا ئەم وشەیە ناساکارە "ئاویەر" وەها خۆی دەردەخات، کە فرە کۆن بێت! ئەگەریش وەها بێ،

دەبێ بەم جۆرەی خوارەوە لێک بدرێتەوە واتە، وشەی "ئاویدەر" لە هەر دوو دۆخی لێکدانەوەدا لە دوو بەشی سەرەکی پێک هاتووە و ئەوە شایانی باسە کە دەبێ لەم ڕووەوە بوترێ ئەوەیە کە فەرهەنگە پارسیەکان و جوگرافیاناسەکان هەوڵیان داوە کە سەرپاکی ناوە کوردیەکان بۆ زمانی پارسی وەربگێڕن و ئەمەش جۆرە کارێکە کە دەستی بە سنگەوە ناگیرێ و جۆرە تاوانێکی مێژوویی و جوگرافیایی و ئینسانیشە کە هەرگیز لە بیر ناچێتەوە! پاش ئەم لێکدانەوەیە دەبێ ئەوە لە یاد نەکەین کە ئاویەدەر یەکێک لەو جێگا پیرۆزانە بووە کە زەردەشت لە کاتی هاتووچۆکردنی لە "شیز"ەوە بەرەو "لوڕستان" بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لە ئاویدەردا ماوەتەوە و ئەوجا بەشی دووەمی ڕێگابڕینەکەی گرتووەتە بەر کە لە هاتن و چوونەوە و گەڕانەوەدا ڕێگاکەی بە قەراغی "سیروان"دا تێپەڕبوە". بە باوەڕی من گوندی بەڵخە ئێستا لە هەورامان لە سەر سنووری دەستکردی "ئێران و ئێراق" هەڵکەوتووە و ماوە. ئەم شوێنە سەردەمی خۆی باژێرێکی مەزن بووە و کۆشکی بە ناوبانگی کەی گوشتاسپی لێبووە، هەرچەندە ئێستا لە شێوەی گوندێکی چەند ماڵی لێ ماوە، بەو مەرجە کە لە دوای داگیرکەری عەربە موسوڵمانەکان و هێرشی بێ بەزیی مەغۆل و تاتارەکان و پاشان سەردەمی عوسمانی و ڕژێمی بەعس ئەم گوندەی شتێکی وای لێ بە جێ نەماوە. ئەم گوندە لە نێوانی گوندەکانی «دەڕەی مەڕ، دەرکێ، هانەگەرمەڵە، ڕەشین و دزڵی» و شارەکانی «هەڵەبجە و مەریوان» هەڵکەوتووە.

ئاهیرنۆش ئاتەشگای ئاهیرنۆش، ئاترنۆش، ئاگرنۆش یان ئازەنۆش بە دەستی زەردەشت لە هەورامان لە بەڵخە دروست کرا، هەڵبەت مامۆستا دەوڵەتشاهی باوەڕی وایە کە ئەم ئاگرگایە لە "باکتەریا" دامەزراوە، ئەم شوێنە لە دوای هەزاران ساڵ بە ناوی "پارسینە" لە هەرێمی "دینەوەر"ی کرمانشا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ماوەتەوە. پاشان باکتەریا گۆڕیا بە "باختەر" و ئەم گوندەش ئێستا ماوە. "رۆستەم و زۆراو بە زمانی ئاڤێستا".

ئەرچاسپ ناوی پاتشای تۆراوەکان بوو و هەروەهاش برازای ئەفراسیاو بوو، لە دوو واژەی ئاڤێستایی ئەرج + ئەسپ، دروست بووە بە واتەی ئەسپی پڕبەها، بەڵام لە ئەدەبیاتی زەردەشتی ناوی لەتەک درۆ و دوژمنی سەرسەختی زەردەشت یاد دەکرێت، لە هێرشێ بۆ سەر شاگوشتاسپ گوایە دوو کچی پاتشای بە ناو «هۆما و وەهئافەرید» بە دیل گرت. پاشان براکەیان «ئەسپەندیار» هێرشی بردە سەر ئەرچاسپ و خۆشکەکانی ڕەها کرد و ئەرچاسپی کوشت و دینی بەهدینی گەشە پێ دا. دانشنامەی مەزدایەسنا. جیهانگیری ئۆشیدەری.

ئەسپێنتمان نازناوی بنەماڵەی زەردەشتە، لە واژەی سپی گیراوە بە واتەی سپی ڕەگەز و ناوی نۆهەمی پشتی زەردەشتە.

ئۆل دین، ئایین، کیش

ئەرمەغان دیاری، پێشکەشی، کەونە شارێکی کوردانە لە کوێستاندا. کوردستان. گیوی موکریان.

ئەستوورە واژەی ئەستوورە واژەیەکی هیند و ئەوروپییە. لە زمانی سانسکریتیدا ستوورە بە واتەی داستانە،

هەڵبەت لە داستانەکانی بوودایی فرە جار بە کار هاتووە، لە زمانی یۆنانی وەک هیستوری بە واتەی گەڕیان و لێکۆڵینەوە و ئاگاییە. لە زمانی فەرانسەوی و ئەنگلیسیشدا بە دوو جۆری ستوری بە واتەی چیرۆک و داستان و پەندی دیرۆکی و مانای مێژوو، گوزارش و بابەتی دیرۆکی.. بە کار هێنراوە. بەڵام لە واتەی تەعریبکراوی زبانی عەرەبی بە واتەی گوتەی پڕوپووچ و ئەفسانە و شتی بێ بناغە مانا کراوە. لە زمانی کوردی بە چەشنی سادەی خۆی بە کار هاتووە.

ئەکۆمەن لە ئاڤێستادا بە «ئەگەمەنگە» و بە مانای بیری خراپ و بەد و کرداری ناحەز هاتووە، لە سەردەمی ئیمپراتۆری ساسانیەکان، ئەکۆمەن واتەی ناوی دێوێکی گرتە خۆی.

ئەمێشەسپێنت واژەی «ئەمێشە» بە واتەی هەمیشەیی و جاویدانی و زیندوویی و بێمەرگیی. «سپێنت»یش بە مانای پاک و پیرۆز و پترکەر و دەرمانبەخش. کۆی ئەمێشەسپێنت دەبێتە ئەمێشەسپێنتەکان، پترکەرانی سوودگەیەنێر و پاکانی پیرۆز و دەرمانبەخشانی هەتاهەتایی. کە بریتین لە شەش ئەمێشەسپێنت: وەهومەن (وەهمەن، بەهمەن، بێمەن)، ئاشاوهێشتا (ئۆردیبەهەشت)، خشترەئیریە (شەهریوەر)، سپەنتئارمەئیتی (ئەسپەند، ئەسفەند)، هەئورتات (خۆرداد) و ئامەرتات (ئامۆرداد) کە بە ئەهۆرا مەزداوە دەبنە 7. بۆیە ژمارەی 7 لای جڤاکی بەهدینان پیرۆز دەژمێردرێت. کاردانەوی پیرۆزی ژمارەی 7 لە سەر زۆربەی دینەکان و داب و نەریتەکانی گەلانی جیهان بە چەشنێکی بێ وێنە دیار و بەرچاوە، ژمارەی 3

و 7 لە دینی بەهدینی پیرۆز دەژمێردرێت. ژمارەی سێ لە بەر سێ دروشمی بەناوبانگی زەردەشت: رامانی پاک، گوفتاری پاک و کرداری پاک، ژمارەی هەفتیش بە بۆنەی شەش ئەمێشەسپێنەکان و ئەهۆرا مەزدا پیرۆزی تایبەتیان هەیە. لەم سەردەمەی ئیمڕۆ بە شێوەی جۆراجۆر ڕەنگدانەوەی ژمارەی 7 لە ژیانی کوردان و کۆمەڵان و ئایینەکانی جیهان و تەنانەت لە ناو سرووشت و زانست و موسیقا دەبینرێت، بۆ نموونە:

موسوڵمانان لە کاتی سووڕ بە دەوری «کعبە» 7 جار سووڕ دەخۆن ـ لە کەنیسەی جوولەکەکان هەموو مۆمدانەکان هەفت پایەی هەیە، لە سەری ساڵی زایینی لە بەر پەنجێرەی خانووەکان 7 مۆم دادەگرسێنن، خوارنەوەیەک هەیە بە ناوی «سڤێن‌ئاپ» لە سەر ئەو واتەیە کە گوایە ئاوی 7 کانی تێکەڵ بە یەک دەکرێت و هەر کەس بیخواتەوە، ئەوە تەمەنی جاویدانی دەبێت (ئاو بە ئاڤێستایی دەبێتە ئاپ)، نۆتی موسیقا 7 دانەیە، باڵەبان کە ئامێرێکی کوردییە، 7 کونی هەیە، لە سەر گۆی زەوی 7 کیشوەر هەیە، مناڵی 7 مانگە وەک منالی نۆ مانگە دەتوانێت بژیت لێ دوای لەدایکبووندا، زانستی پزشکی سەلماندوویەتی کە مناڵ لە ناو سکی دایکی بە ناو 7 قۆناخ تێ دەپەرێت، ئینجا لە دایک دەبێت، گوایە ئاسمان و زەوی 7 تەبەقەیە، کۆڵەکەزێرینە یان پەلکەزێڕینە 7 ڕەنگە، 7 ئەستێرە لە ئاسمان هەیە وەک پیتی ک بە ئالفابێتی ئارامی، کە بە هەوتبرالە یا حەوبرا ناسراون، هەفتە 7 ڕۆژە، لە ناو کوردەواریدا مناڵ دوای 7 ڕۆژ ناوی دەنێن، مردو دوای 7 ڕۆژ، هەفتەی بۆ دەگێرێت، هێندێک لە چێشتەکانی کوردی لە هەفت

جۆر شت دروست دەکرێت وەک هەوترەنگە، شەلەم، پشتوێن لە تەمەنی رۆحانی و پیربووندا 7 گرێی لێ دەدەن، زەماوەن وا باو بوو کە هەفت شەو و هەفت ڕۆژ دەگیریا، هەرێمێکی پان و بەرین لە ڕۆژهەلاتی کوردستان هەیە بە ناوی هەوشار، خوانی نەورۆز 7 شتی تێدا هەیە، بووک لە کاتی گوازتنەوە، مامە یا خاڵۆی زاوا دێت و بە نیشانەی پەیمان 7 گرێ لە پشتوێنەکەی دەدات، میدییەکان کە پێشنیانی نەتەوەی کوردن، 7 هۆز بوون... "حەفتە" بە زمانی ئاڤێستایی «هەپتە» بووە، بە هۆی تێپەڕبوونی کاتێکی زۆر گۆڕانی بە سەردا هاتووە، وشەی حەفتە لە هەپتە گیراوە، پیتی «هـ» بووە بە «ح» و پیتی «پ» بووە «ف». پیتی «ح» لە ئالفابێتی زمانی ئافێستاییدا نییە.

ئەنبووژەن شینبەر، کەرەسەیی، واتەیی، (مادی)

ئەنجومەن هەنجەمەن، هەنجومەن، کۆڕ، دانیشتن، نشست، کۆمەڵە، یانە

ئەنجومەنی مۆغان ئەنجومەنی پیری مۆغان کۆمەڵێک لە یارانی زانا و ژیری زەردەشت بوون کە لە سەر داوای زەردەشت ئەم ئەنجومەنەیان دروست کرد، بۆ چاودێری و پەرەپێدانی دینی بەهدینی. ئەنجومەنی پیری مۆغان کەسانێک بوون کە باوەڕی تەواویان بە ڕاهێنانەکانی زەردەشت هەبوو و لە ژێر سەرپەرشتی زەردەشت بنیاد نرا بۆ گەشەپێدان و ئاوەدانکردنەوە و هەروەها بەرگری بکات لە لادانی دین بەرەو ڕێگای ناڕاست. ئەندامانی بە ناوبانگی ئەنجومەنە کە لە ناو ئاڤێستا ناویان هاتووە ئەمانەن: مەدیامانگ، جامئەسپ، فرەشەوشتر، گۆشتاسپ.

ئەوشێدرینە ناوی ئاڤێستایی چیای ئاویەرە، لە شاری «سنە» لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

ئەهۆرا ئەهورا، ئاهورا، ئاهۆرا، ڕەوانشاد بابا مەردۆخ لە پەرتووکی مێژووی کورد و کوردستان لاپەڕەی 60 دەفەرمێت: ئاهورا لەتەک ئاهیر مانای یەکە، «ئا» لە زبانی کوردی کۆندا بە مانای «هات» و «ور» بە مانای ئاورە ئەو ڕووناکییە کە لە ئاورەوە پەیدا ئەبێ... مەولەوی،یش دەفەرمێت:

ئازیزم، ئاهیر دووری باڵای تۆ
جەستەم کەرد وە بوول، شەماڵ بەرد پەی کۆ
ورشەی پرشەی تاو کوورەکەی جوستەم
شەرارەی لوولەی پێشەی شکستەم ..، دیوانی مەولەوی

خۆی موسوڵمانانیش باوەڕیان وایە کە (الله نوورە).

بڕست توانا، وزە، هێز

بوت بت، خودای دەستکرد بە شێوەی پەیکەر

بوردبار بوردەبار، وشەیەکی کۆنی هەورامییە، لەسەرخۆ، هێمن، مەولەوی دەفەرمێت:

تۆ تیرە کەی وێت ـ وە زامداریی وێم!
تۆ بێ باکیی وێت ـ «بوردەبار»یی وێم
ئەو وەخت پای کاو هەرد دڵ تەم بۆ
ئەساسەی دووریی ئازیزان جەم بۆ .... دیوانی مەولەوی.

بویەر ڕووداو

بەدخوو نەگونجاو، بێئاکار

بەرسڤ وەرام، وەڵام

بەرووومەند بەرووومەن، بەرووومەت، وەرومەند، «بەر» بە واتەی بەری میوە و «مەند، مەن»یش بە واتەی خاوەن، سەنگین و پشوو لەسەرخۆ، ئەم دو وشە بە سەر یەکەوە دەبێت: سوودمەند، بەهرەمەند، بارەدار، میوەدار، کامەران، گیای مەندۆک، مەندێ، مەنێ، (مەندێ لە هەمان کاتدا ناوی ماندانا کیژی دواهەمین پاتشای میدیاکان، ئاستیاگ بوو کە بووە بووکی ماڵە پارسووەکان و گوایە هەخامەنشەکان بەرەی ئەم دایکەن)

بەرەوپیری پێشوازی

بەڵخە بەلخە، گوندی بەڵخە ئێستا لە کوردستان لە هەورامان لە سەر سنووری دەستکردی "ئێران و ئێراق" هەڵکەوتووە و ماوە. ئەم شوێنە لە سەردەمی خۆی باژێرێکی مەزن بووە و کۆشکی بە ناوبانگی کەی گوشتاسپی لێبووە، هەرچەندە ئێستا لە شێوەی گوندێکی چەند ماڵی لێ ماوە و لە دوای هێرشی عەربی موسوڵمان و هێرشی بێ بەزیی مەغۆلەکان و تاتارەکان و پاشان لە سەردەمی ڕژێمی بەعس ئەم گوندەی شتێکی وای لێ بە جێ نەماوە. ئەم گوندە لە نێوانی گوندەکانی "دەڕەی مەڕ، دەرکێ، هانەگەرمەڵە، ڕەشین و دزڵی و شارەکانی هەڵەبچە و مەریوان" هەڵکەوتووە.

بەهـی بە واتەی چاکی، بەهـ لە زمانی کوردیدا وشەی پەسەنکردنە و لە زمانی ئاڤێستایی «وەهـ» بووە. زۆر وشەی کوردیمان هەیە کە بە «وەهـ» یا «بە» دەست پێدەکات، وەک: بەهبەهـ، بەها، بەهر، بەهەشت، بەهدین، بەهدینان، بەهمەن، بەهزاد، بەهرۆز.. ئێستاش لە بڕێک شوێنی کوردستان هەر بە

چەشنی وەهـ بە کار دێت، وەک: وەفر بووە بە بەفر یان بەرف، واران بووە بووە بە باران، وەهار بووە بە بەهار.

بەهدینی دینپاکان، بڕوامەندانی ڕێبازی زەردەست، بەهدینان، تەنیا شوێنێکی جۆگرافیایی کە نێوی دینی زەرەشتی پێوە ماوە، هەریمی بەهدینان لە باشووری کوردستانە، ئەمە خۆی بەڵگەیەکی موتمانەدارە بۆ سەلماندنی ئەوە کە ئایینی زەردەشت لە کوردستانەوە سەری هەڵداوە.

بەهر بەش

بەینەت ئەمەگ (وەفا)

بیردۆزی بیروڕای زانستی، (تیۆری، نەزەریە)

بێندۆ بە ئاڤێستایی بەنداڤ، ناوی یەکێک لە دوژمنانی سەرسەختی زەردەشت و هاوپەیمانی گراهمای ئاژاوەچی بووە.

بێکەران بێسنوور، بێکۆتایی، بێئەندازە

بیرناسی فەلسەفە

پاداشتیچاکە مەبەست لە پاداشتی چاک، هێمنی رامان و ویژدانێکی ڕووناک و دڵێکی بینا و توانامەندیی مینوویی و بێنیازبوون لە هەوا و هەوەس و خۆشنووتیی هەمیشەییە.

پاقژ پاکژ، پاکیزە، پاک، خاوێن

پایان کۆتایی، ئەنجام

پرس پەیمان، بەڵێن، گفت

پشتوێن شاڵ، پژبێن، پشتێن، پشتان، کەمەربەند، قەیوەن، هەموویان یەک واتەن و بۆ یەک مەبەستن. پشتوێن یەکێک لە بەشەکانی بەرگی کوردییە کە بەستنی بۆ مرۆڤی

بەهدینی پێویستە. لە دینی زەردەشتی گەورەترین ڕووداو بۆ هەر مرۆڤێک بەستن و پۆشینی شاڵ و شەپک یا کەمەربەندە. هەر لاوێک چ کچ بێت و چ کوڕ، کە تەمەنی گەیشتبێتە تەمەنی پانزە ساڵی، دەتوانێت لە ئازادی تەواودا، دینی بەهدینی بۆ خۆی هەڵبژێرێت و ببێت بە یەکێک لە ئەندامانی کۆمەڵگای بەهدینی. ئارمانجی ئەم کارە لە ڕوانگەی دینی زەردەشتەوە لەدایکبوونێکی نوێیە، لەدایکبوونێکی ئۆلی و مینوویی بۆ گەنجی بەهدینی، بەو واتەیە کە لەمەولا ئەو کەوسە خۆی ناسیوە و دەتوانێت سەربەخۆ لە چارەنووسی خۆی ئازاد بێت و خۆی بریار بدات، تەنانەت لە هەڵبژاردنی هاوسەریش. واتەیەکی دیکەی ڕەمزی پشتوێنەکە ئەویە کە بە بەستنی پشتوێنەکە لەشی مرۆڤ بە دوو بەشی خوارەوە و سەرەوە دابەش دەبێت. بە شێوەیەکی ڕەمزی بەشی سەرەوە بریار دەدات بۆ هەموو لەشی. لە کاتی بریاردانی نەودین کە دەیەوێت بێتە سەر دینی بەهدینی، ئەوە لە کاتی بەستنی پشتوێن، سێ گرێ لە پشتوێنەکە دەدات. بە نیشانەی پەیمان بە سێ دروشمی زەردەشت: رامانی پاک و گوفتاری پاک و کرداری پاک. کە هەڵبەت لە تەمەنی پیری کە پلەی پاکی و زانستی گەیشتە ئاستی مرۆڤێکی فەرزانە، ئەو کات دەتوانێت 7 گرێی لێ بدات، یان گرێچنی بکات. پشتوێن نابێت ڕەنگی ڕەش بێت، شاڵی نەودین لە کاتی جەژنی هەڵبژاردنی دینی بەهدینی، دەبێت ڕەنگی سپی یان ڕۆشن بێت. بە خۆشیەوە هێشتا لە زۆر ناوچەی کوردستان داب و نەریتی جوانی گرێچنین هەر باوە، بەڵام ناوەرۆک و مەبەستی ڕاستەقینەی ئەم دابە لە بیر کراوە. بەو هیوایە کە لاوانی کورد داب و نەریتی جوان و ڕندی ئەم

ئایینە بە ناوەرۆکی ڕاستی خۆیەوە زیندوو بکەنەوە. مێژووی بەستنی پشتوێن گوایە دەگڕێتەوە بۆ سەردەمی زۆر کۆنتر لە هەبوونی ئایینی زەردەشت، سەردەمی جەمشید، بەڵام زەردەشت وەک دابێکی ڕەمزی ئایینی پەرەی پێدا. ئەم دابە پاشان لە ناو هیندوەکانیش بینرا و لە دواییدا لە ناو جوولەکەکانیش باو بوو کە پێی دەڵێن «سیسیت» و وەک زەردەشتییەکان چێی دەکەن. پاشان لە دینی فەلەکان، خاچپەرستەکانیش بوو بە باو، کە بە «زنار» بەناوبانگە.

پوورەچیستا بە ئاڤێستایی: پورئورچیستەر، ناوی کچی پچووک و سێهەمی زەردەشتە و هاوسەری جامئەسپ بوو. بابەتی زەماوەندەکەی لەتەک جامئەسپ لە نێو سروودەکانی گاتا هاتووە.

پورشئەسپ پوورەئەسپ ناوی باوکی زەردەشتە کوڕی پترئەسپ، بە ئاڤێستایی بە واتەی خاوەنی ئەسپی زۆر.

پۆتک چەکوشی ئاسەنگری، ئاسنکوت، پتک

پەتەت پەئیتیتە واژەیەکی ئاڤێستاییە بە واتەی (توبە)، پاشگەزبوونەوە

پەژراندن قایلبوون، (قبول)کردن

پەسن (سفەت، تاریف)، ئەمەگ، وەفا

پەیڤین وتووێژ، گفتوگۆ، قسەکردن

پەیجۆر شوێنگێڕ، تۆژەرەوەر، لێکۆڵەر، مینەکار، تۆژینەر

پیر، پیرەک پێشەوا، ڕێنما، (شێخی تەریقەت، مرشد)، ڕابەری دینی بەهدینی و بەرزترین ئاستی ئایینیی لە ناو دینی

زەردەشت، کە دەتوانێت ژن بێت و هەم پیاو، لە هێندێک
هەرێمی کوردستان بۆ ژنی پیر، دایکی باوک، دایکی دایک،
مامان، پیرەک دەگوترێت. (سان، بەرزترین پلەی ڕامیاری و
سەربازی لە کۆمەڵگای بەهدینی)

پیری مۆغان موغ، مەغ، ناوی مەوبدە، پیری مۆغان، سرووشی زەمان، سوشیانسی وڵاتانن کە دەبێت لە هەموو سەردەمێکدا هەبن و بەرپرسیاری ئایینی خۆیان بە ئەنجام بگەیەنن. پیران و دانا و بەرپرسیارانی ئایینی بەهدینی کەسانێکن کە بە فەلسەفە و ئامۆژگارییەکانی زەردەشت شارەزا بوون و بێجگە لە بابەتی ئایینی، شارەزای زانستی سەردەمیش بوون، وەک : کشت و کاڵ، مەتەمەتیک، کیمیا، ئەستێرەناسی، کەشناسی، پزشکی.. لە دیرۆکی کوردان، کەسێک بە پاتشایی نەدەگەیشت مەگەر لە لای مۆغان خوێندنی تەواو نەکردبایەت. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەر بەردنووسەکانی بێستون، چەندین جار ئەم وشەیە نووسراوەتەوە. یەکێک لە 7 هۆزی میدیاکان، هۆزی مۆغەکان بووە، کە لە دوای هێرشی ئیسلام، بەشی زۆریان لە هەورامان گرسایەنەوە، 99 پیری هەورامان ئێستاش هەر بەناوبانگە. واژەی مۆغ لە ناو هەموو زمانەکانی ئەورووپی هەیە. یۆنانیەکان ئەمەیان بە لاوە سەیر بوو کە مرۆڤێک شارەزایی ئەم هەموو زانستە بێت، بۆیە بڕێکیان پێیان وابوو ئەمانە جادووگەر یا زۆر خەڵکێکی مەزن و سەیرن و ناوی مۆغ بۆ ئەوان بە مانای ئاوەڵناوی جادووگەر یا مرۆڤێکی فرە بەڕێزە. تا ئێستاش بە هەر دوو واتە لە زمانی ڕۆژئاوای بە کار دێت. لە ڕۆژئاوا وشەکانی «مەجیک» بە واتەی جادوو و یا

«مەجستیک» یا «مەجیستی» بە واتەی مەزنی و گەورەیی بە کار دێت کە لە واژەی مۆغ گیراوە. «دینۆ» نووسەری یۆنانی لە پەرتووکی «پەرسیا» ئاماژەی بۆ ئەو خاڵە دەکا کە مۆغەکان لە جادووگەری بێزار بوون و هەرگیز ڕوویان لە جادوو نەکردە. کاتێکیش مرۆڤ سەیری ئاڤێستا دەکات، زەردەشت ڕاستەوخۆ دژایەتی جادوو و جادووگەری دەکات. مۆغ لە زمانی یۆنانی بەم شێوە هاتووە: «ماگۆ» و هەروەها لە لاتینیش بەم جۆرە هاتووە: «ماگی» و لە زمانی ئەرمەنی «مۆگ»، عەرەبەکانیش لە ئەوانیان وەرگرتووە، بەڵام چونکە لە زمانی عەرەبی پیتی «گ» نییە، بۆیە ئەوان «مەجوس»ی پێ دەڵێن. لە قورعان، سورەی «حج»، ئایەی هەڤدە، ناوی مەجوس هاتووە. بۆیە تا ئێستا موسوڵمانەکان بە هەڵە بە مرۆڤی بەهدین دەڵێن «مەجووس». شایانی باسە کاتێک کە عەرەبەکان نیشتمانی میدیا (کوردستان)یان داگیر کرد، دینی مەجووسیش وەک دینەکانی جوولەکە و خاچپەرستی ڕێزی لێ دەگیرا و تەنیا باجیان (جزیە) وەردەگرت و ئایینی بەهدینی ئازاد بوو، بەڵام کە دەستەڵاتی ئیسلام پتەو بوو، بە بیانووی ئەوە کە ناوی زەردەشت لە قورعان نەهاتووە، ئەم ئایینەیان (یاساخ) کرد و بۆختانی ئاگرپەرستیان سەپاند بە سەر ئۆلی بەهدینی. زۆر زانا و هەڵبەستوانی هێژای کورد لە نێو هەڵبەست و پەخشانی خۆیان ناوی پیری مۆغانیان بە کار هێناوە، وەک زانای فەرزانە مەولەوی:

ئازیزم، ئامای، ئای بێ قەرار و وێم!
ئای ئای چەمەڕا، ئای ئەنتزار وێم!

مەوتەنە کەی چەم دیدەش ها نە ڕێت
غەریبی تا کەی، بۆ وە ماوای وێت
های ساقی! بازار جلیوەی دڵدارەن
سەودای خریدار، دانەی دیدارەن
یەکێ وە مایەی گەنج (کەی)ەوە*
چون منیچ وە تای فەرتووت نەیەوە
ئەو سەد هەر کەسێ پەی وێش وە راوەن
وە قیمەت نی یەن، ئەخلاس حەساوەن
مایل کەر باڵای وەی لادا چون نەی
دەسێوت دەف بۆ، ئەو دەس جام مەی
با بێدار کەرۆ تا کەی بۆ غافڵ
دەف وە سەدا گیان، جام وە ڕەشحە دڵ
با کلافە بۆ، ئاخر لەوانم
خاک پای حەزرەت «پیر موغان»م
چون دەف، بەرگ پۆس ئیرادەت پۆشم
غولام بەر دەس حەڵقە نە گۆشم
خۆم ئاسا خەیلێن وەتن مەیخانەم
چون پیاڵەی واق شیشەی پەیمانم ...... دیوانی مەولەوی

پێواژۆ — پێڤاژۆ، ڕێتکە، قۆناخ، (مەرحەلە، پرۆسە)
پێوانە — هەندەسە، پیاڵەی مەی، قاپی بەراوەردکردن
تاب — توانا، (تاقەت و تەحەمول)
تاڤێنن — دەروشینەوەی مانگی تابان، تاڤ، مانای تیشکی مانگ، تاڤ هەیڤ بە واتەی تیشکدانەوەی مانگ کە لە ڕاستیدا تیشکی هەتاوە، تاودان.

تۆم توو، تۆو، توخم، دانە

تەوەزەل تەوەزن، تەمبەڵ، تەپ

تەڤلیبوون تێکەڵبوون

جاڕ کێڵگەی گەنم

جان گیان، (رۆح)

جاویدان (جان لە بەدەن)، ژابیدان، واژەیەکی کۆنی میدییە کە گۆڕانێکی فرەی بە سەر هاتووە و وشەگەلی ژن و ژیانی لێ بە جێ ماوە، واژەی ژاویدان گوزارە لە هەمیشە، پایەندە، پایەدار، هەرگیز نەمردن، هەرمان و نەمری و جان لە بەدەن دەرنەکردن (ئەبەدی) دەکات. بەرابەر بەم واژەیە «یەئێتڤان» بە ئاڤێستایی هەیە.

جڤاک کۆمەڵگا

جماندن جوڵاندن

جوانمەردی جوانمێری، مرۆڤی باش و مەزن، مەردایەتی، مێرخاسی، جوانمەردی و مەردبوون هەم بۆ ژنە و هەمیش بۆ پیاوە.

جەمشید جەمشیدی پێشدادی کە بە ئاڤێستایی «جەمیویوەنگەهان» یان «ییمە» هاتووە. جەم لە ئاڤێستادا بە چەند جۆر پەسنی هاتووە، وەک «خشەئیتە» کە بووە بە «شیت» کە لەواژەی خۆرشیت، خۆرشید دەبینرێت و بە واتەی درەخشان یا شاوێنە هاتووە. جەمشید لە ئەفسانەکانی نەتەویی وەک یەکێک لە گەورەترین پاتشاکانی چەرخی پێشدادیان دەژمێردرێت. دوای جەمشید «تەهمورس» هاتووە. جەمشید داهێنەر و فێرکاری بەرگدرووی و هەلاجی و کەشتی و پزشکی و

خەڵکی فێری دەرهێنانی گەوهەر لە کانەکان کردووە، هەروەها داهێنەری برێک کەلوپەلی جەنگی و دامەزرێنەری شاری «شیز» شوێنی لەدایکبوونی زەردەشت بووە. هەروەها دەبێژن جەژنی نەورۆز دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جەمشید. مەی (شەراب) لە سەردەمی ئەو بە ڕێکەوت چێ بووە. گوایە 650 ساڵ دەستەڵاتداری کردووە و لە ماوەی 300 ساڵ پاتشایەتی ئەو هیچ جۆرێک نەخۆشی و مردنێک نەبووە. لە سەردەمی ئەو بە هۆی خۆشبوونی کەش و هەوا، گیانلەبەران و باڵندەکان زۆر دەبن، بەڵام بە هۆی دەستپێکردنی زستانێکی سارد و بەردەوامبوونی ئەو سەرمایە، دژێک ساز دەکات بۆ داڵدەدانی خەڵکەکەی و گیانلەبەران، کە بە «وەرجەمکەرت» بە ناوبانگ دەبێت. ئەوی کە لە سەرچاوەکان دەردەکەوێت جەمشید لە دواییدا تووشی لوتبەرزی و لەخۆبایبوون دەبێت و ڕوو لە ستەمگەری و بێدادی دەکات. بۆیە فەڕی یەزدانی لێی دەڕمێ و مەردومیش پشتی لێ دەکەن و دژی ڕادەپەڕن و ئەویش، گوایە بەرەو وڵاتی «چین» هەڵدێت، کە خەڵک دەیدۆزنەوە و پاشان لە ناو درەختێک کە خۆی شاردبووەوە، بە ئەڕەیەک لەتەک دارەکە دوو کەرتی دەکەن. پاشان دوای ئەو فەڕ دەگەڕێتەوە بۆ لای «فەرەیدوون». خۆی ڕەنگدانەوەی ئەفسانەی جەمشید لە ناو میتۆلۆژی دینەکانی سامی لە چیرۆکی «سولەیمان» دەبینرێت. وەک ئەوە ئەو پاتشایە زۆر شتیان وەک یەک دەچێت، بە خزمەتگرتنی دێو و جنۆکە و بەرزبوونەوە و گەڕیانیان لە ئاسماندا. لە زمانی عەرەبی جەمشید بە

«مەنوشلەخ» بە ناوبانگە. لە کوردیدا جەمشیر، جەمشێر و جەمشید دەگوترێت.

چاڤ چاو

چاکوێژ زمانپاک، ڕەوشتپاک، درووستکار، دڵپاک

چاند فەرهەنگ، خوێندەواری، ڕۆشنبیریی

چت شت

چتێک شتێک

چەمک مەبەست، واتە، (مفهوم)

چەمەک (لۆژیک، مەنتق)

چلۆن چۆن

چەواشە شاش، ناڕاست، دژ، پێچەوانە، تێکچوو، شێویاگ

چەواشەکار گومڕێ، لادەر، زیانکار، چەواشەکاران ئەو کەسانەن کە لە ڕێگەی گومڕێی و چەوتی کۆمەڵگا هەنگاو دەنێن، کە بریتیشە لە درۆ و زیانمەندی و ئازاردان و ناپاکی و وێرانی و کاولکردنی ژێرخانی کۆمەڵگا، لە ئاڤێستادا درۆ بە چەشنی «دۆڕگوەنت» هاتووە.

چەندوچوون کردن (حیساب)کردن

چێرە «چڕ» کورتکراوەی چێرەیە، چڕوچاو، چێهرە، ڕوومەت، (ڕەنگی چێهرەیی بە واتەی ڕەنگی پەمەیی)

خاپاندان فریودان، لەخشتەبردن، هەڵخەڵتاندن

خاپوورکردن لەناوبردن، نابووتکردن، سامانساکردن (سامانساکردن، لە ناوی سەلمانسەر پاتشای وێرانکاری ئاشوورەوە هاتووە)

خارا بەردی خارا، بەردی ڕەقی گرانیت
خاس باش
خاسەکی تایبەتمەندی
خاکسار بێفیزبوون، بێهەوایی‌بوون، خۆبەزلنەزان، خاکی
خاکی مرۆڤێکی بێفیز و سادە و خۆبەزلنەزان
خواست ویست، ئارەزوو، نیاز، خواستک، هەناو، هەوا، (نفس)
خۆشنووت ڕەزامەند، قایل
خۆویستی خۆپەسەنی، لەخۆڕازی، گورێخی
خۆرداد مانگی جۆزەردان، جۆخێنان، بەختەباران یا زەردان، مانگی سێهەمی بەهار
خۆردادڕۆژ نێوی شەشەم ڕۆژی مانگەکانی ئاڤێستایی
خیرەسەر خودسەر، کەلەڕەق، دەمارگرژ
خێرەت خیرەت، خرەد، ئاوەز، زانایی، زانست، هۆش
خێرەتی سپەند زانایی پاک و پیرۆز
خێش خۆمانە، خۆیی، خزم. وشەکانی (خێش و هاوکار و یاوەر) وەرگێڕاوی واژەگەلی ئاڤێستایی «خائێتوش» و «ڤێرزنەم» و «ئائیریەمنا»یە، ئەم کەسانە دۆست و یار و هاوڕێی نزیکی ئاشوو زەردەشت بوون و لە لایەن پاکی و جوانمێری و بڕوامەندی لە هەمووان بەرچاوتر بوون. ئەم کەسانە بە زانابوون و زاڵبوون بە سەر هەوەس و دەروونی خۆیاندا و بە لە خۆبردوویی و بەئەمەگی بەناوبانگ بوون.

ئەندامانی ئەنجومەنی پیری مۆغان لەم سێ دەستەیە درووست دەبوون. خێشەکان لە هەموو لایەنەوە وەک زانست و تێڕوانین و پاکی و ڕاستی و خۆپارێزی شایستەتر بوون و فرەتر بە زەردەشت نزیک بوون و جێگای ستایشتی زەردەشت بوون. ئەمانە لە ڕێگای دینی بەهدینی ئامادەی بەختکردنی گیانی خۆیان بوون.

دادار خواوەند، یەکێک لە سەدویەک ناوی ئەزدان لە ئۆلی بەهدینی

دانش زانست

درووود درووت، ستایش، پەسن، (سڵاو، دۆعا مەدح، تاریف، ڕەحمەت)

دۆزەخ دۆژە، ناخۆش

دوغدۆ دەغدۆ، دەغدو، «فەڕهومەرڤان» ناوی دایکی زەردەشتە. دەغدۆ دایکی زەردەشت لە گوندی «لەج، ڕەج» لە «شارویران»ی «مەهاباد» لەدایک بووە، «لەج»ێی ئیمڕۆ پێشتر بە زمانی ئاڤێستایی «رگا» بووە. واتەی دوغدۆ بە ئاڤێستایی «شیردۆش، بێریڤان» دەگرێتەوە. واژەی «دادۆ»ی ئێستا لە زمانی کوردی کە بە واتەی دایک لە زاراوەی کرمانجی سەروو بە کار دێت لە وشەی ناوی دایکی زەردەشت گیراوە. هەروەهاش واژەی «دادە» لە زۆر شوێنی جیاوازی کوردستان بۆ دایک و خۆشک و ژنی مەزن و بۆ ڕێزنان بە کار دێت، لە ناوی دایکی زەردەشت گیراوە. گۆڕی دایکی زەردەشت لە گوندی «ئەمبێ، ئەمبە» لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان نزیکی باژێری «ورمێ»یە.

دوودەمان خانەدان، هۆز، خێڵ

دە هێزی دەر و ناڤ      مەبەست لە دە هێزی دەر و ناوەوەی مرۆڤ ئەمانەن: بیستن، بینین، چێژتن، بۆنکردن، هەستکردن، توانامەندبوون، داهێنان، خێرابوون، تێگەیشتن، دووربین بوون یان پێشبینی کردن، هەموو مرۆڤێک خاوەنی ئەم دە هێزەیە مەگەر ناساخ بێت.

دێویەسنان       دێڤیەسنایان، دێوپەرستان، داسنی، ئەو کەسانەی کە ستایشتگەرانی دێویان لا پیرۆزە، کورتکراوەکەی لە زمانی کوردی دەبێتە «داسنی». مانای واژە دێڤ بە پێچەوانەی ئەوی کە لە سەر زاری مەردوم باوە کە گوایە دێڤ شتێکی نارێک و قەبە و نالەبار یان گیانداریکی شاخداری ئەفسانەیی، «دێڤ» لە زمانی ئاڤێستایی دەکاتە درەخشان و ڕووناکدانەوە و تاباندن. واژەی «یەسنا»ش دەبێتە نیایشت و پەرستش، کە بە سەر یەکەوە دەکاتە «ستایشتگەرانی ڕۆشنایی» یا بە زمانێکی سادەی ئیمڕۆیی «ڕۆژپەرست». (پەرتووکی واژەگەلی ئاڤێستایی، بەرگی 3)

ڕابن       ڕابوون، ڕاپەرین، شۆڕش

ڕاژە       ئوودە، (خزمەت، خدمت)

رامانی پاک       بیر و هزری پاک و چاک، کە بە ئاڤێستایی دەکاتە «هوومەتە»، یەکەمین دروشمی زەردەشتە بۆ هەر مرۆڤێک

ڕک       ڕق، کینە، (پیتی ق لە زمانی ئاڤێستایی نییە، ڕک یان ڕق لە زمانی عەربی، بووتە چاوکی وشەی ڕەقیب و کۆمەڵێ وشەی تر)

ڕۆژەڤ       بابەت، بابەتی ڕۆژ، (بابەتی ئەکتۆئیل)

ڕۆژەکانیمانگ      لە ئۆلی زەردەشتی هەموو ڕۆژەکانی مانگ نێوی تایبەت بە خۆیانیان هەیە، نێوی ڕۆژەکان بەمجۆرەن:
1 ـ «هورمزد»، کورت کراوەی ئەهۆرا مەزدا، گیان بەخشی یەگانە و لە گەورەیی و زانایی بێهاوتایە.
2 ـ «بەهمەن»، وەهمەن، رامانی پاک
3 ـ «ئەردیبەهەشت»، باشترین پاکی
4 ـ «شاریوەر»، ئاشاوەهێشتا، پاتشایەتی بەهێز
5 ـ «سپندارمەز»، سپەنتەئارمەئیتی، ئەسفەند، لەخۆبوردوویی و مێهرەبانی
6 ـ «خۆرداد»، هەئورتات، تەندروستی و ڕێکوپێکی (ڕۆژی لەدایکبوونی زەردەشت)
7 ـ «ئەمورداد»، ئامورداد، ئامەرتەت، بێمەرگی، جاویدانی، هەتاهەتایی
8 ـ «دەیبەئازەر»، دادار، دادپەروەر، بەدیهێنەر
9 ـ «ئازەر»، ئایر، ئاتر، ئاگر، تیشک
10 ـ «ئاوان»، ئاپان، ئابان، ئاوەکان، کاتی ئاو
11 ـ «خۆر»، هۆرەخشیتم، خۆرشیت، هەتاو
12 ـ «مانگ»، مانگ، هەیڤ
13 ـ «تیر»، تیشتریە، ئەستێرەی باران
14 ـ «گەئوش»، گۆیی زەوی، گێتی، ژیان، بوون (زۆربەی نووسەران بە هەڵە بە گا یان مانگا وەریانگێڕاوە)
15 ـ «دەیبەمێهر»، دەتهۆش، دادپەروەر
16 ـ «مێهر»، میترا، سۆز و دۆستایەتی و پەیمان و بەڵێن و هەڤاڵبەندی

17 ـ «سرووش»، فەرمانبەرداری لە ئۆلی ئەزدانی
18 ـ «ڕەشەن»، دادگەری
19 ـ «فەروەردین»، فەڕەوەشی، فەڕوەهەر، هێزی پێشکەوتن و پاسەوان و ڕەوان و جەوهەری کەرەسەی ئافراندنی گەردوون
20 ـ «وەهرام»، وەرەهرام، بەهرام، وێرێترەغنە، سەرکەوتن
21 ـ «ڕام»، ڕامە، ئاشتی و ئاسایشت و خۆشی و هێمنی
22 ـ «با»، وات، هەوا، با
23 ـ «دەیبەدین»، بەدیهێنەر، دادپەروەر
24 ـ «دین»، ڕوانینی دەروون، ویژدان
25 ـ «ئەشی»، ئارد، بەختەوەری، سامان و ویست و داواکارای
26 ـ «ئەشتاد»، ئارشتاد، ڕاستی و دروستی
27 ـ «ئاسمان»، ئاسمان
28 ـ «زامیاد»، زەوی
29 ـ «مانترەسپەند»، مێهرسپەند، گوتەی پیرۆز، وتەی چاکە
30 ـ «ئەنارام»، ئەنغرە ڕەئۆچە، تیشک و ڕووناکی بێپایان و هەتاهەتایی

ڕۆژانی هەفتە کوردەکان لە کۆندا، ڕۆژەکانی حەوتوویان بە نێوگەلی ئەستێرەکان دەژمارد. ئەوروپاییەکان، ئەم کردەوەیان لە کوردەکان وەر گرت و ئێستاکە نێوی ڕۆژەکان لە زبانە ئەورووپیەکاندا لە نێوگەلی ڕۆژانی هەفتەی کوردی کەونئاراوە گیراوە. 1(کەیوانشید = شەممە)، 2(مێهرشید = یەکشەممە)، 3(مانگشید = دووشەممە)، 4(بارامشید = سێشەممە)، 5(تیرشید = چوارشەممە)، 6(هورمزشید =

پێنجشەممە)، 7(ناهیدشید = هەینی) ڕۆژەژمێری کوردی ئاڤێستا. فاروق بۆرەکەیی

ڕەمز نیشانە، (سەمبول)

ڕەوان جان، گیان، (روح)، هەر شتێک کە لە ڕۆیشتندایە و نەگات و وێستانی نەبێت وەک ئاوی ڕەوان، خوێندنەوەی ڕەوان و بێگرێ

زات واژەیەکی ئاڤێستاییە، زات، دارا، خاوەن، بوون، ڕاستی هەر شتێک، جەوهەر

زاگۆن زاکۆن، یاسا، بەربەست

زایشت بەدیهاتن، زایین، لەدایکبوون

زەردەشت لە سەر ناوی زەردەشت منیش بڕوام وایە کە پێشتر زەردەشت ناوی ڕاستەقینەی «سیمیار» بووە و نازناوی «زەردەشت» لە دواییدا پێی دراوە. پیری شالیاری زەردەشتی لە بەرهەمی خۆی «ماریفەت» ناوی زەردەشت، بە «سیمیار» ناو دەبات، پیرشالیاری زەردەشتی دەفەرمێت: **(گۆشت بڕوانە پیر شالیار بۆ / هۆشت جە کیاستەی زانای «سیمیار» بۆ)**، مانای: "بە وتەی پیری شالیار گوێ بگرە و هۆشی خۆت بدە بە نووسراوەی زانای سیمیار". فەرهەنگی دێهخودا. بەرگی 13. «سیمیار» لە دوو واژەی سیم و یار دروست بووە، دەزانین سیم بە واتەی زێوە و بەشێک لە ناوی زەردەشت، واژەی زێڕی تێدایە، کە ئێستاش نرخی زێڕ لە زێو زیاترە، بۆیە ڕێی تێدەچێت کە ناوی سیمیار بۆ زەردەشت کەم بووبێت، بۆیە لە پاشان نازناوی زەردەشتیان پێ داوە. عمادلدین دەوڵەتشاهی ناوی زەردەشتی بەمجۆرە لە یەک داوەتەوە:

زەرەساوشەتەرئائی، «زەرە» بە مانای زێڕ و تیشکی تەڵا، «ساویانتا» بە واتەی درەوشانەوە و تابان، «وەشەتەر» بە مانای بارین، «ئائی» بە مانای هاتن یا ئایی هاتووە، کە بە سەر یەکەوە دەکاتە «بارین و درەوشاندنی تیشکی زێڕینی ڕۆژ»، زەردەشت نازناوی «سیمیار» بووە. (ڕۆستم و زۆراو بە ڕەوایەتی ئاڤێستا.)

زەروان ناوی خوای زەمەنی بێکەران، خودای بەش و بەهر و چارنووس و بەخت و ناوچاوان، پاتشای جیهان و گەردوون، لە زەروانیسم بڕوا وایە کە هەموو شتێک لە سەر خواست و ویستی زەروان ئەنجام دەدرێت، هیچ شتێک ناگۆڕدرێت، مەگەر لە سەر ویستی زەروان نەبێت. زەروان نەمر و هەمیشەیی، ویستی لە هەموو شتێک بەرزتر و بە سەر هەموو شتێکدا زاڵ و بەدەسەڵاتدارترە. زەروان چارەنووسەکان دەنووسێت و یەکیشیان دەخات. زەروان بەدیهێنەری ژیان و بوونە. زەروان خۆشیسێنەر و درووێنەکەری ژیان و بوونەکانە. زەروان گاسنەکەی لە دوو کەڵی ڕەش و سپی بەستووە و بە سەر کێڵگەی ژیان دەیکێشێنێت و تۆی ژیانی پێدا دەپژێنێت، بەڵام درەنگێکی پێ ناچێت لە بەرگی درووێنەکارێکی ڕدێنسپی بە تەمەن، بە داسێکی تیژ دێتە سەر ڕێگا و ڕیشەی ژیان لە چاوترووکاندنێکدا دەبڕێت. ئاوازی خۆشی گاسنەکەی لە کاتی جووتکردن و چاندنی تۆی ژیان و هاڕەی وشکی داسەکەی لە کاتی درووێنەکردنی ژیان، لە گوێی زەرواندا یەکێکە و هیچکام لەم دووانە هەستێک لە دڵی زەروان نابزوێنێت. کاتێک کە مرۆڤ شاد و دەم بە پێکەنینە و کاتێک کە دەردەدار و نەخۆشە، زەروان

هەر دووکیان دەبینێت و دەبیسێت، بەڵام بە بێ ئەوە ناڵەکان و شادیەکان بتوانێت ئەو دابچڵەکێنێت. کەس توانای ڕاوەستان و بەربەرەکانێی لە بەرانبەری زەروان نییە، مرۆڤ گەرەکە ملکەجی خواست و فەرمانی ئەو بیت و چارەیەکیش نییە. لە ناو عەربەدا بە (دەهریە) بە ناوبانگە و دینی ئیسلام زۆر کەوتەتە ژێر کاریگەری زەروانیسم، بابەتی (قەزا و قەدەر) ڕاستەوخۆ لە زەروانیسم گیراوە. مرۆڤ بە گشتی لەم ئایینە بێدەسەڵاتە، چونکە زەروان لە ڕۆژی یەکەمەوە هەموو شتێکی بۆ مرۆڤ دیاری کردووە و هەموو ڕووداوەکان لە سەر (قەزا و قەدەر) ڕوو دەدات و دەکرێت و دەبێت. واژەی زۆر و زۆران و زەمان لە کوردیدا، لە چاوگی زەروان گیراوە. سەردەمێک زەروانیسم یەکێک ئایینیەکانی باوی کوردستان بووە و لە سەر زۆربەی ئایینەکان کاریگەری خۆی هەبووە.

زەند ڕاڤە، شیروڤە، شیکردنەوە، لێکۆڵینەوە، (تفسیر)

زەنگین دارا، سامانداار، دەوڵەمەند

ژیار شارستانیەت، (تمدن)

ژیان و ناژیان ژیان و ناژیان، بوون و نەبوون، هەستی و نیستی، لێرە مەبەست لە ناژیان و نەبوون و نیستی، مەرگ نییە، ناژیان بە واتەی ژیانێکی بێ سوود و بێکەڵک، یان پڕ لە درۆ و دووڕوویی و کرداری ناپەسەنە، کە لەتەک هەنجاری ژیان ناگونجێت.

سپڵە بێئەمەگ، بێ (وەفا، سفەت)

سپەند پاک، پیرۆز، خاوێن، بێخەوش، پاکژ

سرووش ئاوازی ویژدان، خۆرپەی دڵ، بەدڵاهاتن
سوێند سوێن، سۆند، سۆکەند، هەموویان لە یەک ڕیشەی واژەی سوکەندی ئاڤێستایی گیراوە کە دەکاتە کەرەسەیک کە ئێستا بە «گۆگرد» دەناسرێت. کاتێک مرۆڤ لە ڕێزمانی زمانی کوردی ورد دەبێتەوە، دەبینێت کە واژی سوێند لەگەڵ وشەی خواردن بە یەکەوە بە کار دێت (سوێندخواردن) و لە ڕاستیشدا سوێن، شتێک نییە وەک نان و میوە بخورێت. ئەما بۆ وا دەڵێن؟ لە سەردەمی زنجیرە پاتشایەتی کەیانی و میدیاکان سوێندخواردن بەم شێوەی ئیمڕۆ نەبووە، بەڵکوو هەر کات پێویست بوایە کە کەسێکی تاوانبار بۆ دڵنیاکردنی دادگا ڕاستی بسەلمێنێت، دەبوایەت جامێکی «سۆکەند»ی (سۆدەی گۆگرد) دەخواردەوە، جا ئەگەر لە سەر ڕاستی بوایە، ئەوە بێگومان هیچ زیانێکی پێ نەدەگەیشت، بەڵام ئەگەر سوێنی بە درۆ بخواردایەتەوە، ئەوە سۆکەندەکە هێدی هێدی لەشی لە ناوە دەسووتاند و هەلاهەلای دەکرد. ئەگەریش بێتاوان ببوایەت، ئەوە وەک دەروێشەکانی ئیمڕۆ، بێزیان لە تاقیکردنەوە دەهاتە دەرەوە. ئەم جۆر ئازموونە بۆ ئەو سەردەمە بۆ ڕەوابوونی قسەی گومانلێکراو زۆر باو بووە. بۆیە ئێستا لە زمانی کوردی سوێندخواردن وەک دەستەواژە ماوەتەوە، بەڵام خودی کارەکە لە بیر کراوە. هەڵبەت ئازموون و تاقیکردنەوی دی لەو زەمانە هەبووە وەک تێپەڕبوون بە ناو کۆمای ئاگر یان ڕژاندنی ئاسن یا مسی تاواو بە سەر پشتی گومانلێکراو بۆ ڕاستبوون یا ناڕاستبوونی. لە ئەفسانەی باوکی «کەیخەسرەو» پاتشای مێژووی ئێمە کوردان «سیاوەش»، بۆ بەرپەرچدانەوەی

بوختانێک کە لە لایەن باوەڕنەکەی بۆی هەڵبەسترابوو، بۆ سەلماندنی ناڕاستبوونی قسەی زڕدایکی بە ناو کۆمای ئاگرەکە تێپەڕی و بە بێزیان لەو دیو ئاگر هاتە دەرەوە.

سوشیانس ڕزگارکەر، ڕێپیشاندەر، پێشەوا، پەیامبەر، ئازادیخواز، سوودگەیەنەر

سەوداسەرانی مەزدا ئەو کەسانەی کە بە دڵ ئەڤێنداریی

شاڵ شەپک، سێتەرە، بەرگی سپی بێملیوانی مرۆڤی نەودینە کە لە کاتی هەڵبژاردنی ئۆلی بەهدینی بە واتەی بەرگی رامانی پاک دەیکاتە بەر. لە هەورامان شاڵ و لە بۆتان شەپک دەگوترێت، شەپک و شاڵی بۆتان و هەورامان ئێستاش لە کوردستان بەناوبانگە. لە بڕێک شوێن، بە نێوەکانی ڕەنک و چۆخەش ناو دەبرێت. شاڵپۆشان لە ئۆلی بەهدینی بە واتەی لەدایکبوونی نوێیە. ناوی دیکەی شاڵ بە زبانی لۆڕی «سێتەرە»یە. لە کاتی بەجێهێنانی جەژنی شاڵ یا سێتەرەپۆشی سروود و ئافەرینگانی تایبەت بۆ هەڵبژاردنی دین دەخوێندرێت و داب و نەریتی تایبەت ئەنجام دەدرێت.

شالیار شەهریار، پێشکار، وەزیر، پیری شالیاری هەورامان

شایست (حلال)، ئەو شتەی کە لە ڕوانگای هزر و رامان ڕەوایە

شەیدا ئەویندار، شێتی ئەوڤین، ڕووناکی، (بەشێک لە ناوەکانی خۆرشید و جەمشید لە شید یا شەید دروست بووە، کە بە واتەی هالاو و گەرما و ڕووناکییە).

شیز شیز، هورمزگای ئاگرگەشئەسپ، ئازەرگەشسپ، یان تەختی سولەیمان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە نێوانی شارەکانی «سەقز» و «تیکاب» و «سایەنقەڵا، شاهیندژ» هەڵکەوتووە. شوێنی پیرۆزی دیرۆکی زەردەشتییەکان بووە و شوێنی لەدایکبوونی یەکەمین پەیامهێنەری مەزنی دینی یەکتاپەرستی ئاشوو زەردەشتە. تا بە ئێستا لە سەر شوێنی لەدایکبوونی زەردەشت لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆ نەکراوە و زۆربەی بۆچوونەکان لەمەڕ شوێنی لەدایکبوونی زەردەشت لە پشت تەم و مژدا، خۆی حەشار داوە، کە بە باوەڕی من، دەستێکی ئەنقەزی تێدا دەبینرێت. هەر چەندە برێک لە ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی ڕۆژئاوایی وەک: دارمستێر، نۆلدکە، هرتسفیلد، برونوهنینگ، راولینسۆن و... لە سەر ئەم بڕوان کە زەردەشت خەڵکی باشووری دەریاچەی «ورمێ»یە و لە وڵاتی میدیاکان لەدایک بووە. بەڵام بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و ئاکادامی لەم بارەوە، کاری پێویستیان نەکردووە. باشووری ورمێ دەکاتە ناوچە و گوندەکانی «بەردەزەرد» و «مەمێند» و «شارویێران» لە ڕۆژهەڵاتی ئیمڕۆی کوردستان. «جەکسۆن» گومانی وایە کە زەردەشت لە دەوربەری گوندێکی وەک «خوڕخوڕە» ژیابێت، ئەم گوندەش لە چەند شوێنی هەرێمەکە هەر بەم ناوە هەیە، یەکێکیان لە باکووری مەهاباد لە ناوچەی شارویێران. شادڕەوان «مەردووخی کوردستانی» زەردەشتی بە خەڵکی میدیا زانیوە. (مێژووی وێژەی کوردی. سدیق بۆرەکەی. مێژووی زانایانی کورد. بابامەردووخی رۆحانی شیوا)

فەڕ گەورەیی، شکۆ، دەبدەبە، جوانی، تیشک، پیرۆزی، هۆیشانازای، بەهرە، (خێر)، پێچەوانەکەی بەدفەڕ، بیٚفەڕ

فەڕی جەمشیدی فەڕ نیشانەیەکی یەزدانییە، ئەو فەڕەیە کە جەمشیدی کیانی پاتشای وڵاتی ئاریایی خاوەنی بوو، بەڵام بە هۆی لەخۆباییبوون و ڕووکردن لە درۆ و تووشی خۆپەرەستی و نەخۆشینی «من» بوو و فەڕی یەزدانی وەک مەلێک لیٚ دوور کەوتەوە.

فەرزانە لە دوو وشەی «فرە و زانا» دروست بووە، مرۆڤی زانا و جیهاندیدە

فەرزانەیی زانایی، دانایی

فەروەردین مانگی خاکەلێوە، نەورۆزمانگ، مانگی یەکەم لە ساڵی کوردی و زەردەشتی

فرەشەوشتر بە ئاڤێستایی بە مانای خاوەن وشتری کارامەد و پشودرێژ، فرەشەوشتر برای جامئەسپ، هەر دوو شالیاری شاگوشتاسپ بوو، هەر دوو ئەندامی ئەنجومەنی پیری مۆغان بوون.

کاربین زانا، پسپۆڕ

کارزار مەیدانی جەنگ، لە پێشدا واژەی «کار» بە واتەی «جەنگ» بە کار دەهات

کرداری پاک کردە و ڕەوشتی پاک و چاک کە بە ئاڤێستایی «هڤەرشتە» دەگوترێت و سێهەمین دروشمی زەردەشت لە ئۆلی بەهدینییە. بۆیە سێهەمین دروشمە، مەرج نییە هەر کەس رامانی پاک بێت و گوفتاری پاک، دەتوانێت کرداریشی

پاک بێت، بۆیە کرداری پاک سەنگی ترازووی رامان و گوفتاری پاکە.

کاوی کەی، میر، پاتشا، دەسەڵاتدار

کرِوکاش لەدووکەوتن، لێکۆڵینەوە، لەشوێنگەڕیان، دۆزینەوە، پەیجۆری

کەرپان مەلا یا کیشبانی ئایینی ڕۆژپەرستی، دوژمنی سەرەکی زەردەشت بوون و دژایەتی ڕاستییان دەکرد

کەرپە بەخشش، (خێر، احسان)

کەرپەککاران کەسانێک کە کە کاری باش (احسان) دەکەن

کەی کاوی، بەڕێز، سەرۆک، پاتشا، میر و خاوەن تاج و تەخت، توێژی دەسەڵاتداری سەردەمی زەردەشت کە بڕێکیان زۆر بە توندی دژایەتی ئۆلی بەهدینییان دەکرد. وشەی کەی لەتەک ناوی زۆر پاتشای دیرۆکی کورد گرێی خواردووە، وەک: کەیخەسرەو، کەیقوباد، کەیکاووس. کاکەی ئیمرۆی زمانی کوردی لە چاوگی وشەی «کەی» ئاڤێستایی گیراوە. کەی لە زمانی کوردی سەرناوی ژنان و پیاوانی بەڕێز و پیرە. هەروەهاش واژەی کەی لەتەک وشەی دی لە زمانی کوردی ئێستاکەش بە کار دێت وەک: کەیسەرا بە واتەی سەرا و کۆشکی پاتشا، کەیبانوو بە واتەی ژنی پاتشا، شاژن، کابان، کەیخوا، کوێخا، کەیخودا بە واتەی پیاوی ژیر و بەمشۆر، کەیل بە واتەی سەرکۆمار و سەردار و سەرۆکی ئێڵ و هۆز، کەینەک بە واتەی کەنیشک و دۆێترە، کچ. مەولەوی نەمر لە دیوانەکەی ئاماژەی بە «کەی» کردە:

غەریبی تا کەی، بۆ وە ماوای وێت
های ساقی! بازاڕ جیلوەی دڵداران
سەودای خڕیدار، دانەی دیدارەن
یەکێ وە مایەی گەنج «کەی»ەوە
چون منیچ وە تای فەرتووت نەیەوە
ئەو سەد هەر کەسێ پەی وێش ڕاوەن
وە قیمەت نی یەن، اخلاس حەساوەن

کەیگوشتاسپ کاوی ویشتاسپە، پاتشایەکی ناوچەی هەورامانی ئیمڕۆ بوو کە هانای زەردەشتی دا و پاشان دینی زەردەشتی پەژراند. ناوەکەی بە ئاڤێستایی بە مانای پاتشای خاوەن ئەسپی ئامادە.

کین قین، ڕک

گازندە گازنج، گلەیی، بناشت، (شکایەت)

گوفتاری پاک وتە و گوتەی پاک و باش، بە ئاڤێستایی «هۆختە»، دووهەمین دروشمی ئۆلی بەهدینییە.

گومانچنین خەیاڵبافی

گرۆ دەستە، پۆل، پەل، گروپ، گرۆ، گروهـ واژەیەکی کۆنی هەوراماییە.

گۆشەنشینی (خەڵوەت)نشینی

گەشەکردن پێگەیشتن، هەراشبوون، لێرە مەبەست (تکامل).

لۆهراسپ کەیگوشتاسپ کوڕی لۆهراسپ یان لهرائەسپە، کە پاتشایەکی کۆنی ناوچەی هەورامانی ئێستا

بووە. دەقی ناوەکەی بە ئاڤێستایی "ئەئۆروەت ئەسپە" کە بە واتەی خاوەن ئەسپی توندڕەو.

مامۆستا هیربۆد، ئاهیربۆد، مەوبۆد، ئامۆژگار، ئاهیربۆد لە مەوبۆد گەورەترە.

مانی ماندوو، شەکەت، وشەی کوردی ماندوو پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە «مانی» پێغمبەرەوە هەیە. کاتێک لە زمانی کوردی بە کەسێک کە کارێکی زۆری کردبێت و زۆر شەکەت بێت، دەبێژن مانی نەبی، یان ماندوو نەبی، بە واتەی ئەوەیە وەک «مانی»ت بە سەر نەیەت، یا وەک مانیت لێ نەیەت. کە ئەمەش پەیوەندی بە بەسەرهات و چارەنووسی تاڵ و ناخۆشی مانیەوە هەیە. مانی بناغەدانەری ئایینی مانی‌یە. بڕێک سەرچاوە دەڵێن خەڵکی شاری هەمەدان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووە و بڕێکی دی لەسەر ئەو باوەڕەن خەڵکی شاری ماردین لە باکووری کوردستانە، کە ئەو سەردەمە پایتەختی «سلوکیەکان» بووە. مانی لە ساڵی 215ی زایینی لەدایکبووە و لە ساڵی 273 یان 276ی زایینی لە «گوندی‌شاپوور، جوندی‌شاپوور» لە سەر دەروازەی شار بە ئازارێکی زۆر هەڵواسرا. مانی کوڕی «پاتەک، فاتەک» لە بنەماڵەیەکی خانەدان بووە، هەر لە تەمەنی لاوی فێری زانست لە هەموو بەشەکانی ئەو سەردەمە بووە. لە دینەکانی بەهدینی و بودایی و جوو و عیسایی و ئایینەکانی ئەو سەردەمە لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراوانی کردووە، پاشان لە تەمەنی 24 ساڵی خۆی وەک پەیامهێنەرێکی نوێ ناساند. سەرەتا لە میزۆپاتامیا (بین‌النهرین) دەستی بە بڵاوکردنەوەی دینەکەی کرد، پاشان بە

بۆنەی «فەیرۆز» برای «شاپوور» کە پاتشا بوو و دینەکەی پەژراندبوو، بە شاپووری ناساند و یەکێک لە پەرتووکەکانی بە ناوی «شاپوورگان» پێی پێشکەش کرد. شاپوور لە سەرەتادا فرە ڕێزی گرت و لایەنگرانی مانی بە ئازادی خەریکی چالاکی و پەرەپێدانی دینەکەیان بوون، بەڵام پاشان شا پشتی تێ کرد و کەوتە بەر بێمێهری شاپوور و لە وڵات دووریان خستەوە و دەریانی کرد. مانی لە کاتی ئاوارەبوونی لە هیندوستان و تەبەت و چین، سەردانی کرد و دوای مردنی شاپوور لە ساڵی 272ی زایینی گەڕایەوە بۆ ناو وڵات. «هورمز» جێنشینی شاپوور زۆر بە ڕێزەوە پێشوازی لێ کرد و دیسان ئازادی خۆی لەمەڕ بڵاوەپێدانی دینەکەی وەر گرتەوە. مانی لە ناو فەلەکانی میزۆپاتامیا لە باشووری کوردستانی ئیمڕۆ خەریکی پەرەدانی دینەکەی بوو تا کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی هورمزشا. ئینجا «وەهرام» یان بەهرامی یەک، هاتە سەر تەخت و مانی قۆڵبەست کرد و فەرمانی هەڵواسینی مانی دا، برێک سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن تا پشتوێنەی مانییان لە ناو خاک چاڵ کرد و پەیڕەوەکانیشی لە بەر چاوی خۆی بە پێچەوانە بە سەرەوە لە ناو زەوی تا پشتوێنە چاڵیانی کرد. مانی دەسنووس و پەرتووکی فرەی نووسی، بۆ خەڵکی نەخوێندەواریش ئامۆژگارییەکانی بە چەشنی نیگار و وێنە دەکێشا، بۆیە بە «مانی نیگارکێش» یش بەناوبانگە. پەرتووکە هەرە بە ناوبانگەکانی «ئەرژەنگ یا ئەرتەنگ» بوو. بە کوژتنی مانی لایەنگرانی مانی هەر مانەوە و بە ناو جیهاندا بڵاو بوونەوە و دەورێکی سەرەکییان بینی لە پێشکەوتن و پەرەگرتنی و

بڵاوەپێدانی چاند و هەنەر و پیشەسازی میزۆپاتامیا لە جیهانی ئەو سەردەمە. دینی مانی تا سەردەمی خەلیفەکانی بەغدا مابوو، بەڵام خەلیفەکان فتوای بنبڕکردنی ئەم دینەیان دا. هەر لە تەبەت و چین، تا باشووری فەرانسە ئەم دینە تەشەنەی کرد، بە چەشنێک کە لەرزی خستە پشتی کۆڵەکەکانی مەسێحییەت، بەو جۆرە تا سەدەکانی 13 و 14، لقەکانی ئایینی مانی لەتەک مەسێحییەت کێبەرکێی دەکرد. مانی بێجگە لە زمانی کوردی دایکی خۆی، باش شارەزای زمانەکانی ئارامی و سەریانی و یۆنانی بوو. دەڵێن لە مانی شەش پەرتووک بە سەریانی و پەرتووکێک بە زازایی کۆن ماوە. (بەشێکی ئەم زانیارییانە لە: فەرهەنگی دێهخودا. بەرگی 43 وەرگیراوە).

مەردوم مەردۆم، خەڵک، کۆمەڵگا

مەزدا مەزن، گەورە، بەشکۆ، وشەی مەزدا کە پەسنی ئەهۆرایە، ئێستا لە زمانی کوردی وەک «مەزن» ماوە کە بە واتەی گەورە و بەرز و بەشکۆیە.

مەزدایەسنایی مەزدایەسنایی، مێزدیسەنی، ستایشت و پەرستشی ئایینی ئەهۆرا مەزدا، پێچەوانەکەی دەبێتە «دێویەسنایی»، مامۆستا گیو موکریانی باوەڕی وایە کە مەزدایەسنەیایی لە سێ وشە دروست بووە: «مە» بە واتەی گەورە، «زدا» بە واتەی زانای بێ هاوتا، «یەسنە» بە واتەی پەرستن، دەبێتە زانای بێهاوتای، پەرستنییە بە تایبەتی بۆ ئایینی زەردەشتی (فەرهەنگی کوردستان)

مۆغ (لە پیری مۆغان واتەکەی نووسراوە)

**میدیاما** میدیا، میدیامانگ، ئامۆزای زەردەشت و سەرۆکی یەکێک لە مەزنترین هۆزەکانی میدیاکان بووە، لە سروودی نەتەوەی کورد هاتووە: ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەیخەسرەوین...

**میزۆپوتامیا** بە زاراوەی ڕەسەنی کوردی ژووروو دەبێتە «مەزروبۆتان»، بە زمانی ڕۆژئاواییەکان دەبێتە میزوپاتامیا، هەریمێکی پان و بەرینە کە لە باکووری کوردستان دەست پێ دەکات و لە باشووری کوردستان کۆتایی پێ دێت.

**مێهر** ئەڤین، خۆشەویستی، گراو، سەودایی، دۆسایەتی، (عاشق، وفا)، لە زمانی کوردی مێهرەبان و مێهرەوان دەوترێت.

**مینوویی** مەینەڤی، جەوهەری، (معنوی)، ڕازبەر، پەرۆستی، بە واتەی ژیانی مینووی.

**ناشایست** (حرام)، ئەو شتەی کە مێشکی مرۆڤی ژیر بە ڕاستی نازانێت و زیانی بۆ خۆی و دەور و بەر هەیە.

**نوێژ** لە دینی بەهدینی پێنج جار لە ڕۆژ نوێژ دەکرێت، یەکەم: لە کاتی «هاوینگا» کە دەکاتەی سپێدەی بەیان، واژەی «فراوین» یا «هاوەنی» لە زاراوەی کرمانجی ژوورو نانخواردنی بەیانییانە. دووهەم: «ڕاپیتۆنگا» لە کاتی خۆرهەڵاتن تاکوو نیوەڕۆ. سێهەم: «ئۆزەیرەنگا» کە دوانیوەڕۆیە. چوارەم: «شێوانگا» لە کاتی ئێوارانداا کە بە نوێژی شێوان ناو دەبرێت. پەنجەم: «نوێژیشەو» کە شەو دادێت. نوێژێکی تر هەیە کە بە ناوی «کێمنە» کە تایبەتە و زۆر دوور درێژە و پیرۆز دەژمێردرێت کە لە کاتی ڕوودا، یا کاتی

دیاریکراودا دەخوێنرێتەوە و لە زمانی هەورامی ماوە. نوێژەکان بە تاک و کۆ دەخوێنرێتەوە. بێگومان پێش نوێژ، دەستنوێژ دەگرێت و پاشان ڕوو لە ڕۆژ یا ئاگر یا ڕووناکی دەکات و نوێژ دەخوێنرێت. زۆر گرینگە ئەمە بوترێت کە بەهدینان ئاگرپەرست نین و ئاگر ناپەرسترێت، ئاگر و ڕووناکی بەشێکە لە دیاردەکانی ئەهۆرا مەزدای دلۆڤان. لە ڕوانگای دینی بەهدینی 5 جۆر ئاگری جیاواز هەیە: یەکەم بۆرزیسەوە، کە لە پێشگای پیرۆزی ئەهۆرا مەزدا هەیە. دووهەم وەهوفەڕیانە، کە لە ناو لەشی مرۆڤ و گیانلەبەرانی دی هەیە. سێهەم ئاوروازیشتە، کە لە ناو گیادایە. چوارەم وازیشتە، لە ناو هەوردایە. پێنجەم سپەنیشتە، کە بۆ بەکارهێنانی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ بەکار دێت و لە هەمان کاتییشدا بە نیشانەی ڕووناکی و پاکی و زانایی لە هەمبەر تاریکی و ناپاکی و نادانی پێناسە دەکرێت.

نۆژەن — نووژەن، تازە، نوێ

نۆژەنکاری — گۆڕانکاری، تازەگەری، نوێخوازی، (مۆدرنیسم).

نەرین — ڕوانگا، بیروبۆچوون، دیدگا، تێڕوانین

نەوازشت — نەوازش، بە هەورامی نەوازشن، لاونا.

نیایشت — نیایش، (دعا) دەیخوێنن.

وزە — هێز، زۆر، توانا

وەهمەن ئەمێشەسپێنت — بەهمەن ئەمشاسپەند، وەهومەن، وەهمەن، بەهمەن، بێمەن. هاندەری کامەرانی و بەختەوەری و

پاکی و جاویدانی، سوودگەیەنەری نەمر، ئاگاداری ڕێکوپێکی جیهان.
ویناو چاوی دڵ
هۆرمۆزشید ڕۆژی پێنجشەمە لە هەفتە.
هۆشەنگ پێشدادی هوشەنگ، بە ئاڤێستایی «هەئوشینگە» بە واتەی چێکەر و وەستای خانوبەرە و هەروەها بە واتەی کوڕمردوو. هۆشەنگ کوڕی «فەرواک» کوڕی «سیامەک» کوڕی «مەشی» کوڕی «کەیومەرد، کەیمەرت»، گوایە لە سەردەمی ئەو ئاسن ناسرا و ئاگر کەوتە ڕاژەی مرۆڤ و جەژنی سەدەی بنیات نا و لە پێستی گیانلەبەران پۆشاکی دروست کرد.
هەئورتات ئەمێشەسپێنت ئەمشاسپەند خۆرداد، شادی و ئاوەدانی.
هەپتە هەفتە، حەوتە، حەفتە، حەوتو، بە ئاڤێستایی «هەپتە» بووە، بە هۆی تێپەڕبوونی کاتێکی زۆر گۆڕانی بە سەردا هاتووە، وشەی حەفتە لە هەپتە گیراوە، پیتی «هـ» بووە بە «ح» و پیتی «پ» بووە «ف». پیتی «ح» لە ئالفابێتی زمانی ئافێستاییدا نییە.
هەستی بوون، هەموو جیهان و گەردوون، بوون بە واتەی گشتی، هەستی واژەیەکی کۆنی هەورامییە. مەولەوی لە دیوانەکەی دەفەرمێت:
دایم دڵ ڕەنجوور هیجران یارم
زنجیر جەفای زولف نیگارم
خسووس شەرارەی دووری زۆر کەردەن
مەزرەعەی «هەستی»م وای سەبوون بەردەن

کەس بە وێنەی من پڕ مەینەت نەبۆ
گورفتار دۆس بێ بەینەت نەبۆ

| | |
|---|---|
| هەنجار | (هارمۆنی)، رێگا، ڕەوش، خووخدە، ڕێگای ڕاستی، (مادە، قانون، ئەسووڵ)، فەرهەنگی خاڵ، بەرگی3. |
| هەوشار | 7 شار، 7 کیشەوەر کە لە ئاڤێستا ئاماژەی بۆ کراوە، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەڵکەوتووە و «دەشتی هەوشار» هەریمێکی پان و بەرینە و بە جۆرە کە لە ئاڤێستا ئاماژەی پێ کراوە، ئێستاش زۆر ساردە. |
| هێزی ئەولەکاری | هێزی ئاسایشت |
| یاوەر | بریکار، یاریدەر، هەڤاڵ، پشت و پەنا |
| یەگانە | تاک، یەک |
| یەل | بێ باک، نەبەز |

# سەرچاوەکان

**کوردی**
زمانی ئاڤێستا. محمدامین هەورامانی
زەرتەشت. عبدالله قەرەداخی (مەلا علی)
زەردەشت. احمد الشنتاوی. شاکر فتاح

**فارسی**
اوستا. هاشم رضی
اوستا. (برگردان سرود سوم از گاتای زرتشت هات سی از یسنا) دکترعباس ساسانفر
اوستا. هات سی از یسنا. دکترعباس ساسانفر
برگردان گاتها. موبد رستم شهزادی
جغرافیای غرب ایران ـ کوه‌های ناشناخته اوستا. عمادالدین دولتشاهی
خرده اوستا (جزوی از نامه مینوی اوستا). پورداود
زبان و ادبیات پهلوی (فارسی میانی). ج. تاوادیا. س. نجم‌آبادی
زمان زرتشت. کیخسرو کشاورزی
سرود هات 29 گاتها (در آغاز پیامبری زرتشت). دکترحسین وحیدی
سرود هات 30 گاتها (دو نیروی همستار). دکترحسین وحیدی
سرود بنیاد دین زرتشت. دکتر محمد مقدم
فرهنگ بهدینان. سروش سروشیان
فرهنگ پهلوی. بهرام فرەوشی

فرهنگ نامهای اوستا 1. هاشم رضی
فرهنگ نامهای اوستا 2. هاشم رضی
فرهنگ نامهای اوستا 3. هاشم رضی
فرهنگ واژەهای اوستا 1. احسان بهرامی
فرهنگ واژەهای اوستا 2. احسان بهرامی
فرهنگ واژەهای اوستا 3. احسان بهرامی
گاتها سرودهای زرتشت 1. موبداردشیر آذرگشسب
گاتها سرودهای زرتشت 2. موبداردشیر آذرگشسب
گاتها سرودهای مینووی زرتشت. موبدفیروز آذرگشسب
گاتها یا سرودهای آسمانی زرتشت. موبداردشیر آذرگشسب
مجموعه اوستا (گاثاها) سرودهای زرتشت. پورداود
واژەنامه پهلوی، پازند (فرهنگ پهلوی). سعید عریان
وندیداد (قانون ضد دیو) 1. هاشم رضی
وندیداد (قانون ضد دیو) 2. هاشم رضی
وندیداد (قانون ضد دیو) 3. هاشم رضی
وندیداد (قانون ضد دیو) 4. هاشم رضی
ویرانەهای تخت سلیمان و زندان سلیمان. رودلف ناومان. فرامز نجدسمیعی
ویسپرد. پورداود
یاداشتهای گاثاها. پورداود
یسنا 1. پورداود
یسنا 2. پورداود
یشتها 1. پورداود
یشتها 2. پورداود

*Lekolin. Instito Berlin*
*Avesta. 21/22.11.2001 In Berlin*
*Avesta. Ved Kaj Bar end Jes Asmussen*
*Politikens Bog Om De Store Filosoffer*
*De religiøse ideers Historie. Mircca Eliade. Bind 1*
*Religion Livsanskuelse. Gyldendals*
*Religionsleksikon Redaktion  Finn Stefansson og Asger Sørensen*

# پێرست:



www.kurdavesta.tk
avesta1@msn.com
avesta1@ofir.dk
kurdavesta@msn.com